زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
کتێبی سەردەم ژمارە (٢٧٠)

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی

# ڕێگوزەری بیری سیاسی

بابەت : فەلسەفەی سیاسی
نووسینی : سفێن- ئێرك لیدمان
وەرگێڕانی : ئاسۆس کەمال
بەڕێوەبەری هونەری : شیروان تۆفیق
چاپی یەکەم: سوێد / ئاپێك ١٩٩٧
چاپی دووەم: سلێمانی / ٢٠٠٤
تیراژ: ٨٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٦١٤ی ٢٠٠٤



www.sardam.info

ناوی ئەم کتێبە بە زمانی سوێدی :

Fran Platon till Kommunismens fall

De politiska ideernas historia

واتە لە ئەفلاتونەوە هەتا ڕمانی کۆمیونیزم، ڕێگوزەری بیری سیاسی

# ناوەڕۆک

* * *

## ئەم تەرجەمەیە

زاراوە و ڕستەسازیی زمانی خزمەتکراو تەگەرەن و دینە ڕێی تەرجەمە کردنی بەرهەمی لەم بابەتە. ڕەواندنەوەی ئەم کۆسپانەش مەگەر بە هەوڵدانێکی چوستی تەرجەمە کردنی شابەرهەمی زمانە لەپێشەکان بێت، دەنا سەختە.

لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا سوودم لە دوو بەرهەمی کوردی وەرگرتووە و دەبێ ناویان بهێنم، یەکەم: لیستەی زاراوە زانستییەکان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی چوارەم، (بەغدا ١٩٧٦). دووەم: زاراوەسازی پێوانەی مامۆستا مەسعوود محەمەد (بەغدا ١٩٨٨). ئەوەندەم زاراوە و دەربڕینی تازە لەو دوو بەرهەمە - بەتایبەتی لە دووەمیان- خواستووە کە نەدەکرا یەک بە یەک ئاماژەیان بۆ بکەم، بەرەکەتیان تێ کەوێت، بەبێ ئەو دوو بەرهەمە سەنگینە پێم وا نییە ئەم کارە بەم شێوەیە بە من ئەنجام بدرایە.

لەم کتێبەدا وشە هەن، دەکرا بە جۆرێکی دیکە بکرێنە کوردی، هەم ساکار و هەم ڕەوانتر دەبوون. بەڵام من پتر پەرۆشی نەبوونی وشەکە خۆی و دەستەخوشکەکانی بووم و هەوڵم داوە، هێندەی لە دەستم هاتبێت لەو دوو بەرهەمەی سەرەوەدا بۆ چارەیەک بگەڕێم گرفترەوێن بێت. بۆ نموونە بڕوانە وشەی central کە دەکرێ، وەک باوە، بە مەرکەزی لەکۆڵ بکرێتەوە، بەڵام ئەوسا چی لە centralist و centralism و decentralism و dentralization و decentralization و... بکەین. نموونەی وەها هەم زۆرن و هەم فرەجۆرن.

ئەگەر لە جێیەکدا تێبینییەکم هەبووبێ ئەوا خراونەتە نێو دوو کەوانەی لەم جۆرە <...>، دەنا هەر هەمووی نووسینی مامۆستا لیدمانە.

لێرەدا دەبێ سوپاسێکی گەرمی برای هێژا کاک ئەمجەد شاکەلی بکەم کە دڵسۆزانە سەرنەبەری دەستنووسی ئەم کتێبەی خوێندەوە و جوامێرانە تێبینی و سەرنجی خۆی بۆ نووسیم، ماڵی ئاوابێ.

ئاسۆس کەمال
١-٣-١٩٩٦ ستۆکهۆلم

## دیباچە

### بیری سیاسی چییە؟

وەرامی ئەم پرسیارە فرەن و زۆربەشیان لێڵن، یەکلاکەرەوە نین. هەر لەبەر ئەوەشە مێژووی بیری سیاسی بوارێکی سنوور تەماوییە. ئەوەی سەختەڕێی نووسینەوەی باسی سەرانسەری مێژووی بیری سیاسی بگرێتە بەر، خۆی بەرانبەر چەند دووڕیانێکی دژوار دەبینێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، نووسەرێک گەر وێڵ بێت دەتوانێ ڕێچکەی یەکێک لە نەریتە دامەزراوەکان هەڵبژێرێت چونکە هەتا ئەمڕۆ دەستەکتێبێکی بێئەژمار دەربارەی گەشە کردنی بیری سیاسی نووسراوە. دەی بابزانین ئەو ڕێبازانە کامەن کە نووسەرانی مێژووی بیری سیاسی کردوویانە بە ڕاستەڕێ.

ڕێبازی هەرە گەورە و سەنگین بە ئاسانی جودا دەکرێتەوە. بەپێی ئەم نەریتە ئەرکی یەکەمی مێژووی بیری سیاسی ئەوەیە شەجەرەی بیری سیاسیی هاوچەرخ ڕوون بکاتەوە. کامەیە ڕەگو ڕیشەی بیری دیمۆکراتیی ئەم سەردەمە؟ گەر جێپێی بیری یەکسانی هەڵبگرینەوە سەر بە کوێوە دەنێین؟ ئایە هێگل پیری هیتلەر و فاشیستەکان بوو؟ ئایە مەکیاڤیللی و هۆبز پێشبینیی دەوڵەتی تۆتالیتاری ئەم سەردەمەیان دەکرد؟

بەدبەختی ئەم نەریتە لەوەدایە کە وەرامی پرسیارەکان لە نوێنەرێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێن و بەڵگەی ئەم یان ئەو وەرام تەماوی و بزۆزن. یەکێکیان دەڵێ: لە ئەتێن – یۆنان، لە سالانی سێسەد و چوارسەدی پێش زایین، ئەم دنیای بیرە هاتە دامەزراندن و لەو دەمەوە هەتا ئێستا گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. ئەوەی دیکە دەڵێ: بنەمای تێڕوانینی سیاسیی هاوچەرخ دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ناڤین، کاتێک زانایان لەسەر پرسی سەرچاوەی دەسەلات کەوتنە ململانێ: سەرچاوەی دەسەلات لە ژوورە یان لە ژێرە، خودایە یان میللەتە. سێیەم دەچێتەوە بۆ لۆک Locke و سەردەمی ڕۆشناکی enlightenment، چوارەم بۆ ئایدیۆلۆگیستەکانی سەدەی نۆزدەیەم، پێنجەم دەڵێ سیاسەتی سەردەم «ئایدیۆلۆگی بەدەرە» و سەدەی بیستەم بە سەدەیەکی ئازاد و سەربەخۆ دادەنێ.

من نامەوێ بڵێم شەجەرەی بیری سیاسی ناگرنگە، بەلام دەڵێم چەوت دانراوە یان هەر نەبێ خراپ مامەڵەی کراوە دەنا چۆن ئەم هەموو وەرامە یەکنەگرە، جێباوەڕەی دروستی و نادروسییان نادیارە، دەدات بە دەستەوە.

ڕێبازێکی دیکەش هەیە کە، بە تایبەتی لە وەلاتانی ئەنگلۆسەکسۆنی، پێی دەگوترێ

مارکسایەتی. مەبەستی ئەم ڕێبازە ئەوەیە مەسەلەی ڕەگ و ڕیشەی بیری سیاسی بباتەوە سەر پێوەندیی کۆمەڵایەتی و ئابووری واتە دەیەوێ بنچوبناوانی بیری سیاسی ڕوون بکاتەوە. بەم ڕێبازە بێت ئەوا هەموو مێژووی بیری سیاسی بریتییە لە ڕەنگدانەوەی فراژووتنی کۆمەڵایەتی و ئابووری.

ناکرێ بە شی کردنەوەیەکی مایەکی ‹ماددی› ی وەها ساکاری مێژوو بگوترێ شی کردنەوەی مارکسییانە. مەسەلەی بنەمای بیری سیاسی مەودایەکی یەکجار بەرتەسکی هەیە چونکە مێژووی بیری سیاسی مێژوویەک نییە نوێکاری تێدابێت. ئەگەر مرۆڤ بیەوێت بە جیددی مەسەلەی پێوەندی نێوان بیر و باری مایەکی باس بکات ئەوا هەر لە یەکەم هەنگاودا ڕووبەڕووی *جیری و خاویی مێژووی بیری سیاسی* دەبێتەوە. مێژووی بیری سیاسی گەر بە مێژووی کۆمەڵایەتی یان مێژووی ئابووری بەراورد بکرێت ئەوا زۆر لەوان کەمتر ئاڵوگۆڕی تێدایە. ئەو شێوە حوکومڕانییە لە سەرەتادا لە یۆنانی دێریندا هاتە کایەوە و لە شارەدەوڵەت Polis ـ بچووکەکانی یۆنان بە کردەوە دامەزرا، پاشان بووە ڕێنمای بیریارانی وەهایش کە لە ژینگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی تەواو جودا لەوەی یۆنان دەژیان. ڕاوێژەکانی ئەریستۆ دەربارەی کۆیلەتی پاش چەندین سەدەش هەر دەنگی دەدایەوە، ئەگەرچی یەک کۆیلەی زیندوو نەمابوو و دنیا پڕ بوو لە ڕەشەجووتیار ‹جۆتیاری نیمچە ئازاد› و پرۆلیتاری کرێگرتە. بیروڕای *ئازادیی موڵکایەتی* کە لە ئینگلاندی سەدەی حەڤدەم و فرانسەی سەدەی هەژدەیەمدا بە ڕاشکاوی پێڕەوی دەکرا، سەدەی نۆزدەیەمیشی بێکۆسپ بردە سەر. ئەمڕۆش کە باس لە ئازادیی دەربڕین دەکرێ هەر ئەو زاراوانە بەکار دێت کە لە سەردەمی ڕۆشناکی و لیبەڕالیزم liberalism ی زوودا بەکار دەهات، ئەگەرچی واتای ئەو زاراوانە لەم سەردەمە هاوچەرخەدا – کە سەرگەرمی ساز کردنی بیروڕا و دەنگوباسە و ئەو کارەش سەرمایەخواز و تیژڕەو و چوست و بێبەزەییە – تەواو گۆڕاون.

لەبەر ئەوە کێشەی پێوەندیی نێوان بیری سیاسی لە لایەک و فراژووتنی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە لایەکی دیکە زۆر گەورەتر و ئاڵۆزترە لەوەی تەنیا بە کێشەی بنچوبناوانی بیر دابنرێ. کێشەکە بەر لە هەر شتێک کێشەی ئەرکی ئەو بیرانەیە، کێشەی چۆنیەتی خستنەکاریانە، کێشەی چۆنیەتی کارکردنیانە لە بارودۆخی جۆراوجۆردا. دەبینیت یەک بیر لە بواری جیاوازدا خزمەتی بەرژەوەندی جیاواز دەکات، بۆ بەرگری لە چینی جیاواز بەکار دەهێنرێت و دەبێتە هاندەری گەشە کردنی هێڵی جودا. ئەوەی دەبێ ڕوون و شی بکرێتەوە، ئەم بوارە فرەوانە زیندووە فرەناکۆکەیە.

هەڵبەتە بەشێکی بەرتەسکی ئەم بوارە بریتییە لە مێژووی پێوەندیی سیاسی و دەوڵەت و حکوومەتان. ئاشکرایە کە مەودای نێوان دەوڵەت و شێوازی حوکمڕانی لە لایەک و بیری سیاسی لە لایەکی دیکە کورتترە لە مەودای نێوان باری مایەکی و بیر. زۆر جار، مێژووی بیری سیاسی وەک پاشکۆیەکی مێژووی سیاسی تەماشا کراوە و دەکرێ، بەدیی ئەم کارەش لەوەدایە کە مەسەلەی سەرەکی - ئەرکی بیر - تەواو بزر دەبێ.

دەشێ مێژووی بیری سیاسی وەک مێژووی بیر سەیر بکرێت بەڵام لە چوارچێوەیەکی تایبەتدا. بیروڕا دەربارەی دەوڵەت و تاکەکەس، ڕەوا و دەستوور، ئازادی و یەکسانی، پێوەندییەکی پتەویان بە بیروڕای گشتی و بۆچوونی دینی و گەشە کردنی دیمانە فەلسەفی و زانستییەکانەوە هەیە. هەر بۆ نموونە سەرنجێکی چەمکی **سروشت** بدە، بیروڕا دەربارەی سروشتی مرۆڤ و سروشتی دەوڵەت، نۆرە role یەکی نێوەند و گرنگیان لە مێژووی بیری سیاسیدا هەیە. ئەم بیروڕایانە پەیوەستی جیهاننۆڕیی گشتی و دیمانەی زانستی و دەروونناسین. شۆڕشی زانستی، کە لە سەدەی حەڤدەیەمدا گەییە لووتکە، دەستێکی شۆڕشگێڕانەی هەبوو لە بواری بیروڕای سەر بە سروشتی مرۆڤ و کۆمەڵگەدا. بەر لەو کاتە ئەم بیرانە لەگەڵ جیهاننۆڕیی دینەکیی گشتیدا گونجێنرابوون، بەپێی ئەم بۆچوونەش هەموو دیاردەیەک و هەموو خولێک دەبێ بە ڕەچاو گرتنی ئامانجی ئەو دیاردە و خولانە شەرح بدرێن. «سروشتی مرۆڤ» لەگەڵ «مرۆڤ دەبێ وەها بێ» و «خودا مرۆڤی وەها دروست کردووە» بوون بە یەک. کە نۆڕینی میکانیکی جێی خۆی لە بواری زانستیدا کردەوە فەلسەفەی سیاسیش کاری لێ کرا. بیروڕا دەربارەی سروشتی مرۆڤ، مافی سروشتەکیی مرۆڤ و دەستوورە سروشتەکییەکانی گرێدراوی مرۆڤ لە بۆچوونی زانستی دابڕا و توانی ناوەڕۆکی پێوەرەکی normative ی خۆی بپارێزێ. بەڵام لای کەسانێکی وەک تۆماس هۆبز Thomas Hobbes ئەو بیروڕایانە لەگەڵ بۆچوونی میکانەتی mechanism گونجێندران و «سروشتی مرۆڤ» بە «تایبەتمەندییە ڕاستییەکانی بایۆلۆگی و سایکۆلۆگی» لێک دەدرایەوە.

نموونەی وەها زۆرن. بەگشتی ناتوانین لە بیرێکی سیاسی سفت و سۆڵ و باش توێژراو تێبگەین ئەگەر پێوەندی نێوان ئەو بیرە و سەرجەمی ڕەوتی بیرکاریی شارەزا نەبین.

دەشێ وەها بێتە بەر چاو کە مێژووی بیری سیاسی دەبێ باوەش بۆ مێژووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و لە تەک ئەواندا مێژووی گشتیی بیروڕا و مێژووی زانستیش بکاتەوە، بەڵام کێ پارووی وا گەورەی بۆ ئاودیو دەکرێ.

باسێکی سەرانسەری ڕەوتی مێژووی بیری سیاسی کە زانیارێکی سەرەتایی و تاڕادەیەک سەنگین بدات بەدەستەوە دەبێ سەرنج لە چەند بوارێکی دیاریکراودا کۆبکاتەوە. دەبێ بۆچوونێکی تاڕادەیەک ئاشکرای دەربارەی *ناوەندی* باسەکە یان هەر نەبێ *دەراوی* سروشتەکیی باسەکە، هەبێ.

من گومانم لەوە نییە کە ناوەندی مێژووی بیری سیاسی بریتییە لە چەند *تێکست* ێکی کەم. هەڵبەتە دەستنیشان کردنی ئەو تێکستانە ئاسانترە لەوەی بە چەند وشەیەک باس لە تایبەتمەندییەکانی ئەو تێکستانە بکەین: *کۆمار* ی ئەفلاتون Platon و *سیاسەت* ی ئەریستۆ Aristoteles و *شاری خودا* ی ئوگوستینوس Augustinus ... و هەتا دەگەینە *پێریسترۆیکا* ی گۆرباتچۆف Gorbachev، هەرهەموویان کاریگەریی مەزنیان هەبووە بەڵام ئەم گوتەیە تێر ناکات چونکە ڕاستە کاریگەر بوون وەلی هەر یەکە بە شێوەیەک. بەشێکیان بۆ ئەوە بەکار هێنراون کە ڕەوایەتی دۆخێکی سیاسیی دامەزراو بسەلمێنن یان لێی بدوێنن. بەشێکی دیکەیان باس لە خەتوخاڵی ڕێکخستنێکی تەواو نوێی گوزەرانی سیاسی دەکەن. ڕاستە هیچ دەوڵەتێک لەسەر بنەمایەکی وەها دانەمەزراوە بشێت بیبەینەوە سەر بنەماکانی *شاری خودا* ی ئوگوستینوس بەڵام ململانێی نێوان فەرمانڕەوایی دنیایی، بە سەدان ساڵ، لە ژێر تیشکی نۆڕینی شاری خودا و شاری شەیتاندا سەیر دەکرا. *گیانی دەستووران* ی مۆنتێسکیۆ Montesquieu و لەویش ئاشکراتر *دەوڵەت و شۆڕش* ی لێنین ڕێگەیان بۆ تەیار کردنی سیستەمێکی سیاسیی نوێ خۆش کرد.

تایبەتمەندیی ئەو تێکستە نیوەندەکی ‹مەرکەزی› یانەی مێژووی بیر دەبێ لە مەسەلەی کاریگەریەتی زیاتر بێ. ئەو تێکستانە دەبێ خاوەن ڕەوایەتییەکی گشتی و تاڕادەیەکیش لە ڕووی بیروڕاوە ئاڵۆز بن. مەبەست ئەوە نییە کە دەبێ ناخێکی فەلسەفیی مەزنیان هەبێ و یەکڕۆ و ڕوون بن. تەنانەت باسێکی سەرلەبەریش ناتوانی خۆی لە باس کردنی *خەباتی من* - ی هیتلەر لادات. ئەوەی *خەباتی من* لەگەڵ *سیاسەت* ی ئەریستۆدا کۆ دەکاتەوە ئەوەیە کە ئاڵۆزییەکی فیکری تێدا بەدی دەکرێ. دەتوانی بڵێیت ساختارێکی فیکری یان ڕشتەیەکی فیکری تێدایە پێوەی خەریک بیت. کەواتە هەر کاریگەریەتی نییە بڕیاردەربێ لەوەی کام بەرهەم لە مێژووی بیری سیاسیدا بە تێکستێکی نیوەندەکی بژمێردرێ.

گوتەی پڕ لە حیکمەتی کارمەندانی دەوڵەت، بەلاغەتی سەرتیپانی مەیدان، گوتاری کاتی هەڵبژاردن، گوتاری نێو پەرلەمان و زۆرێکی دیکەی لەم بابەتە کە دەشێ کاریگەرییەکی یەکسەر و ئاشکرایان هەبووبێ، ئەگەر ناوەڕۆکێکی فیکری دیاریکراو و هەمەلایەنیان نەبێ ناچنە خانەی بنەمای باسی مێژووکردەوە.

لەم باسە سەرلەبەرەدا هەوڵم داوە لەم خاڵەدا یەکرەو بم. کۆنەوارەتی conservatism ی سەدەی نۆزدەیەم، پاشا و میری بەدەسەڵاتی زۆر بووە بەڵام من گوتاری ئەوانم نەکردووەتە دەراو بەڵکوو نووسراوەکانی فەیلەسووفی سەختنووس هێگل -م بەکارهێناوە.

هۆکەشی ئەوە نییە کە پێم وابێ هێگل لە شاه و میران کاریگەرتر بووبێ بەڵکوو لەبەر ئەوەیە بیروڕاکانی کۆنەوارەتی، لای هێگل نەک لای ئەوان، بە شێوەیەکی هەمەلایەن ڕێک خرا و گەشایەوە.

بەڵام ئەم ڕێبازە ئەنجامی وەهای لێ دەبێتەوە جێی بینەوبەرە بێت. ڕیالیزمێکی خۆشباوەڕانە هەیە لە باس کردنی مێژوودا دەڵێ دیاردەی مەزنی وەک کۆنەوارەتی و لیبەڕالیزم لە دەورانی مێژوودا دروست و ئامادەن و تەنیا چاوەڕێن مێژووناسێک بیاندۆزێتەوە و وەسفیان بکات. کەواتە کۆنەوارەتی و لیبەڕالیزم مەسەلەیەک نین مێژووناس بیانهۆنێتەوە یان بڕیاریان لەسەر بدات، بەڵکوو دەبێ هێندە فرەوان و کراوە باسیان لێ بکات کە بەرانبەر ئەو هەڵکەوتە مێژووکردە بێت کە کاتێک گشتلایەنانە سەیر دەکرێت سرک و بزۆز ڕادەنوێنێ.

بەڵام بەوەش چەمکەکان بە ناچاری کاڵ دەبنەوە. نموونەی وەها لە کۆنەوارەتی و لە لیبەڕالیزمدا هەن کە بەم جۆر نا ئەو جۆر لە سنووری واتای دیاریکراوی خودی ئەو چەمکانە لادەدەن، ئەوجا ئەگەر بە مەبەستی دەرنەچوون لەو سنوورە دیاریکراوە ساکارانە، کەمێک سنووری واتای چەمکەکان بەرفرەوانتر و ئاواڵەتر بکەیت ئەوا دیسان ڕووبەڕووی نموونەی وەها دەبی خۆیان لە سنووری نوێ دەدەن، دیسان بۆ ئەوەی لە ڕێچکەی پێشوو لانەدەی ناچاری فرەواندن دەبیتەوە و... هەتا دەگەیتە ئەوەی چ جیاوازییەک لە نێوان کۆنەوارەتی و لیبەڕالیزمدا نامێنێ. بەو جۆرە دەگەڕێیتەوە بۆ ئەو فرەدیوە نارێک و دەرک نەکراوەی سەرەتا دەتویست زانیارێکی دەربارەوە هەڵچنیت، بەڵام بێ سوود.

من پێم وایە چەمکی وەها دەبێ بە وردی دیاری بکرێن، ئەوە تاکە ڕێگەیە بۆ تێگەیشتنی ئەرک و سوودی بیری سیاسی و پێوەندییان لەگەڵ دۆخی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسیدا. دیاری کردنەکەش هۆنینەوەیەکی ئازادانە نییە پێت وابێ ئەم بڕیارەیان لەوەی دیکە باشتر بێت.

کاتێ دەستم بەم کارە کرد، پێم وابوو باشترین ئاشکرایی و ڕێکوپێکی بەوە وەدەست دێت کە چەند پرسیارێکی نەگۆڕ و دیاریکراو ئاراستەی هەر هەموو ئەو بەرهەمانە بکەم کە کاریان لەسەر دەکەم، هەر لە ئەفلاتونەوە هەتا لینین. بۆ نموونە ئەم یان ئەو نووسەرە چ

نرخێکی داوە بە دۆزە چینایەتی و ئابوورییەکان، دەوڵەت بەلای ئەوەوە چ ئەرکێکی هەیە، چ جۆرە حوکومڕانییەکی پێ باشە، چ جۆرە ئازادییەکی پێ ڕەوایە بۆ هاوزێد و بۆرەپیاوان... هتد. بەڵام هەر زوو بۆم دەرکەوت کە لیستە پرسیاری وەها وێنەیەکی تەواو ناهەڵکەوتەکی <ناواقیعی> دەربارەی ناوەڕۆکی بیروڕاکە دەدات. هەر بۆ نموونە ژمارەیەکی زۆر لە تێکستە نیوەندەکییەکان یان هەر هیچیان دەربارەی دۆزی چینایەتی نەنووسیوە یان شتێکی زۆر کەم. مەسەلەی گرنگ ئەم بێدەنگی یان کەمنووسینەیە، چونکە ڕوونی دەکاتەوە کە پێوەندی چینایەتی ئەو دەمە، لەو دۆکیومێنتە مێژووداریەدا، وەک گیروگرفتێک سەیر نەکراوە. دیمانەی سیاسی یان ئایدیۆلۆگی هێندەی بەو باسانەی لێیان دەدوێ هێندەش بەوانەی لێیان بێدەنگە، دەناسرێ.

### دیباچەی چاپی یازدەیەم

وا یەکیەتیی سۆڤیەت ڕووخا و بەوەش چیرۆکی گۆرباتچۆفیش کۆتا بوو. لە دوابەشی ئەم بەرگەدا هەوڵ دەدەم ئەو شانۆ، نیمچە شەپرێوەی تەوژمی بیری سیاسیی نەوەدەکانی ئەم سەدەیە پێشان بدەم. جگە لەوەش چاوێکم بە هەموو کتێبەکەدا خشاندەوە و کۆمەڵێک وردە گۆڕانکاریم تێدا کردووە.

## ١- شارەدەوڵەتی یۆنانی

بەشێکی زۆری ئەو مەسەلە ئایدیۆلۆگیانەی بیریارانی سیاسەت لە یۆنانی دێریندا سەرگەرمی بوون، هەتا ئەمڕۆش بابەتی گفتوگۆن. سێ سەدە پێش زایین، ناکۆکی چینایەتی و ڕەوایەتیی مولکایەتیی تاکەکەس بابەتی وتووێژی گەرم بوون. ئەفلاتۆن و ئەریستۆ لە ئاست پێوەندیی نێوان ئازادیی تاکەکەس و بەرژەوەندی کۆمەڵگە، ڕای جودایان هەبووە. کۆمەڵێک ئایدیۆلۆگیست ڕای خۆیان، دەربارەی ئەوەی نۆرەی شارەزایان دەبێ چی بێ لە دنیای سیاسەتدا، دەربڕیەوە.

هەر لەبەر ئەوەشە ئەوەی ئەمڕۆ کتێبی ***کۆمار*** ی ئەفلاتۆن و ***سیاسەت*** ی ئەریستۆ بخوێنێتەوە، بابەتەکان دەناسێتەوە و بزەی دێ. بەڵام ئەم ناسینەوەیە بێ گرفت نییە. مرۆڤ دەبێ شتێک دەربارەی ئەو ژینگەیە بزانێت کە فەیلەسووفانی یۆنان کار و ژیانیان تێدا بردۆتە سەر، دەنا ناتوانین سەر لە تەواوی واتای ئەو پرسیار و پێشنیازانەی ئەوان لێی دەدوێن دەربکەین.

پێشەکی دەبێ بزانین کە دەراوی یەکێکی وەک ئەفلاتۆن و ئەریستۆ ئەو ژیانە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەی ***شارەدەوڵەت*** ـەکانی یۆنان بووە. لە دەرەوەی یۆنان، بەربەرستان بووە (وشەی بەربەر لە سەرەتاوە وەک دەنگێکی لاسایی کردنەوەی ئەو کەسانە بەکارهاتووە کە بە زمانێک دوابن یۆنانی لێیان تێنەگەیشتبێ، بەلای یۆنانییەوە وەک ئەوە بووە بڵێی بەر-بەر-بەر).

یۆنانیگەل لە دنیای دەوروبەری خۆیان بێخەبەر نەبوون. جوگرافیاناس و مێژووناسانیان زانیارێکی فرەیان دەربارەی دنیای نایۆنانی کۆکردبۆوە. بەڵام دەوڵەتە هەمەجۆرەکانی بەربەرییەکان نەبووە بەدیلێک لە بواری بیری سیاسیی یۆناندا. بیری سیاسی هەر لەو چوارچێوە بەرینەدا مایەوە کە شارەدەوڵەتەکانی یۆنان دەیبەخشی.

کەواتە پێشەکی دەبێ شتێک دەربارەی شارەدەوڵەت بزانین. شارەدەوڵەت ڕووبەرێکی تەسکی هەبوو، بریتی بوو لە تەنیا یەک شار و کێڵگە خۆراکبەخشەکانی دەوروبەری شارەکە. ژمارەی دانیشتووان لە شارەدەوڵەتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جودا بوو، ئەتێنی بەناوبانگترین شارەدەوڵەت، لە سەدەی پێنجەمینی پێش زاییندا، کە لە لووتکەی گەشە کردندا بوو، ژمارەی دانیشتووانی لە نێوان ٢١٥ هەزا و ٣٠٠ هەزار کەسدا بوو. لە

زەمانی ئەفلاتون و ئەریستودا، لە ناوەڕاستی سەدەی چوارەمینی پێش زایین، ژمارەی دانیشتووانی ئەتین داکەوت بۆ نێوان ١٧٠ هەزار و ٢٢٥ هەزار کەس. هەڵبەت ئەم ژمارانە، وەک دەبینن، زۆر بە نزیکەیی وەرگیراون. ڕووبەری ئەتین لەچاو ئەوانەی دیکەدا تاڕادەیەک فرەوان بوو.

سەرەتای دروست بوونی شارەدەوڵەت بە یەک گرتنی *خێڵ* ی جۆراوجۆر پێک هات. ئەم بنەمایەش هەتا ماوەیەکی دوور ڕەنگی دەدایەوە. بۆ نموونە، ئەتین بەسەر *ئیم* دا دابەش کرابوو، جیاوازی ئەو دیمانە لەگەڵ ئاوایی و ناوچەی ئەم سەردەمەدا ئەوە بوو کە مرۆڤ ئەگەر جێگۆڕکێشی بکردایە هەر سەر بە ناوچەکەی خۆی دەبوو، سەر بە ناوچە بوون بە میرات بۆ مرۆڤ دەمایەوە، بە گواستنەوە نە دەگۆڕا.

هاوزێدەتیی شارەدەوڵەت هەر بە هەمان شێوە زگماک بوو، خەڵکی بە نیشتەجێ نەدەبوونە هاوزێد. هەستی هاوکۆی بایۆلۆگیی پاک بۆ یەک گرتنی هاوزێدانی شارەدەوڵەت مەسەلەیەکی گرنگ بوو. مەسەلەی هاوزێدەتیی کەسێک لە دەوڵەتێکی هاوچەرخدا بابەتێکە دەزگەی ڕەسمی لێی دەکۆڵێتەوە و بڕیاری لەسەر دەدات، لەوێ وەها نەبوو.

ئەم خەسڵەتانە وەهای کرد شارەدەوڵەت، لە دیدەنی ئێمەوە، مۆرکێکی خێزانەکی لێ بدرێت. دۆخی دەسەڵات و دەزگەی سیاسی لە دەمێکەوە بۆ دەمێکی دیکە و دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی دیکە دەگۆڕدرا. ناکۆکیی ئایدیۆلۆگی بەهێز هەبوو، بیروڕای سیاسی تەواو دژ بەیەک هەبوون. بەڵام زۆر مەسەلەی وەها کە پاشان نۆرەیەکی یەکلاکەرەوەیان لە مێژووی بیری سیاسیدا پەیدا کرد، وەک مافی هاوزێدەتی و بەتایبەتی مافی مرۆڤایەتی، بە هیچ جۆرێک لە یۆناندا سەری هەڵنەدا. نەریتی بالادەست پێشدەستی دەکرد و وەرامی ئەو پرسیارانەی دەداوە.

ئەمەی باسمان کرد پێشانی دەدا کە هەر هەموو دانیشتووانی شارەدەوڵەت بە هاوزێدی ئازاد دانەدەنران. لە شارێکی وەک ئەتێندا، کە ناوەندێکی بازرگانیی چالاک بوو و خەڵکێکی زۆر پەنایان بۆ دەبرد، تەنیا سی هەزار - چل هەزار پیاو بۆیان هەبوو بەشداری دنیای سیاسەت بن، ژن هەر بۆیان نەبوو. ئەوانەی خەڵکی جێیەکی دیکەن و لە ئەتین نیشتەجێ بوون پێیان دەگوترا مێتۆییک Metoik و ئەگەرچی پیاوی ئازاد بوون و بە ژمارەش هێندەی هاوزێدان دەبوون بەڵام ئەوانیش لە دنیای سیاسەت کرابوونە دەرێ. جیاوازیی نێوان مێتۆیک و هاوزێدان، جیاوازییەکی سیاسی و قانوونی بوو پتر لەوەی کۆمەڵایەتی بێ. بەشی هەرەزۆری مێتۆییک بازرگان و سەنعەتکار بوون. یەک لەو دوو سنوورە کۆمەڵایەتییە گەورانەی ئەتین و زۆربەی شارەدەوڵەتی دیکە گرووپی هاوزێدانی

دەکرد بە دوو کەرتەوە: ئەریستۆکرات و بازرگان. دەسەڵاتی ئەریستۆکرات لەوەدا بوو کە *زەویدار* بوون. لەو دەوڵەتانەی کشتوکاڵ سەرچاوەی بەشی هەرەزۆری داهات بوو، ئەریستۆکرات دەسەڵاتیان جێگیر بوو، بەڵام لە وەڵاتێکدا کە بازاڕ تێدا سەرچاوەی داهات بوو ئەریستۆکرات دەسەڵاتیان لەدەست دەدا. سپارتا نموونەیەکی کلاسیکی دەوڵەتی ئەریستۆکرات بوو و ئەتێنی ڕوو لە دەرەوە و بازرگانی تەواو پێچەوانەی سپارتا بوو. بەڵام لە سیاسەتی ئەتێنیشدا ناکۆکیی بەژەوەندی نێوان زەویدار و بازرگان، نێوان ***زەوی و ئاو*** (بازرگانیی زەریا گەورەترین بازرگانی بوو) ئاشکرا بوو و هەر ئەوەش بوو بووە دەراوی ئایدیۆلۆگیی ئەفلاتونی ئەریستۆکرات.

سنووره چینایەتییە گەورەکەی دیکە ئەوە بوو کە کۆیلەکانی لە خەڵکی دیکە جودا دەکردەوە. کۆیلە هەر ئەوە نەبوو ئازاد نەبێ بەڵکوو لە ڕوانگەی بیری سیاسیی یۆنانییەوە بە بوونەوەرێکی دیکە دادەنرا، نەک مرۆڤێکی تەواو. هی وا هەبوو کۆیلەی دەخستە ڕیزی ژنانەوە و هی واش هەبوو سووک و باریک بە بەربەرێکی ناژیری دەزانین.

جارویار وەها باس لە کۆمەڵگەی یۆنانی کۆن دەکرێ کە گوایە هەرچی کاری دەستیی هەبوو بە کۆیلەکان کراوە و هاوزێدان هیچ کاریان نەکردووە بەڵکوو هەمیشە یان خەریکی گفتوگۆی بێسەروبەری سیاسەت بوون یان خەریکی هونەر و فەلسەفە بوون. ئەم وێنەیە ڕاست نییە. هەڵبەتە ئەو فەرهەنگە یۆنانییە دروست نەدەبوو ئەگەر هەموو یۆنانییەک خەریکی کاری دەستیی بووایە بەڵام زۆرینەی هاوزێدانی ئازاد سەرگەرمی کشتوکاڵ و کاسبی و بازرگانی بوون. فەرهەنگداران بریتی بوون لە کەسانێکی بێکاری بالاچین.

کۆیلەیەتی یەکێک بوو لەو مەرجانەی بناغەی فەرهەنگی یۆنانی و ژیانی سیاسی نێو شارەدەوڵەتانی یۆنانی پێک دەهێنا. دەستاوێژی بەرهەم هێنان هێندە دواکەوتوو بوو – و هەر وەهاش مایەوە – کە بە ناچاری چینێکی بەرچاوی خەڵک تەنیا خەریکی کاری دەست بوو بۆ ئەوەی دەرفەت بۆ چینێکی دیکە برەخسێ سەرگەرمی فەرهەنگ بێت. کۆیلەیەتی لە یۆنان –وەک لە هەموو کۆمەڵگەیەکی دێرینی دیکەدا– یەکێک بوو لە بەردەبناخەی ڕشتەی ئابووری. هەر ئەوەش بوو وەهای کرد جۆری بەرهەم هێنان، کە لەسەر بنەمای هێزی بازوو بوو، بپارێزرێ، ئەمەش ڕێگەی لەوە گرت پێشکەوتنە زانستی و تەکنیکییە بەرزەکانی یۆنانیگەل، لە بەرهەم هێنانی مایەکیدا، بە شێوەیەکی ئەوتۆ بخرێنە کایەوە.

کۆیلەکان تەواو لە دەرەوەی دنیای سیاسەت بوون. سیاسەت تەنیا کاری هاوزێدی ئازاد بوو و، دیمۆکراتیش دەوڵەتێک بوو زۆرینەی ئەو هاوزێدە ئازادانە، تێیدا دەسترۆ بوون.

کەواتە ئەو دیمۆکراتییە یۆنانییە پێدا هەڵدراوە، تەنێ بۆ پێنجیەکی یان شەشیەکی دانیشتووانی ڕەسیو بوو. بەڵام بۆ ئەم گرووپە چەند ڕێگەیەکی کاریگەریەتی ئاواڵە بوو. بنەمای ئەم دیمۆکراتییە بریتی بوو لەوەی هەموو هاوزێدێکی ئازاد، هەر لەبەر ئەوەی هاوزێدی ئازادە، شیاوی ئەوەیە لە بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتدا بەشدار بێ و هەر هەمووشیان دەبێ، گەر بۆ ماوەیەکیش بێت، کارمەندییەتی ڕەسمی ببینن.

دەزگە سیاسییەکانی ئەتێن هەمەجۆر بوون. سێ دانەیان ئەمانە بوون: ***ئەنجومەنی گەل، ئەنجومەنی کارمەندان و دادگەکان.*** لەوانەیە وەها بێتە بەر چاو کە ئەم سێ دەزگەیە هەر ئەوانەبن لە ئایدیۆلۆگیی سیاسی سەدەکانی ئەم دواییەدا بە دەزگەی دەستووردانەر، بەجێهێنەر و دادپرسان ناویان دەرچووە، بەڵام وەها نییە. لە ئەتێن دەسەڵات وەها ئاشکرا جیانەکرابۆوە.

لەگەڵ ئەوەشدا گومان لەوەدا نییە کە ***ئەنجومەنی گەل*** دەسەڵاتی هەرە بەرزی دەستووردانەر بوو. هەر هاوزێدێکیش تەمەنی لە هەژدە ساڵ تێپەڕ ببوایە مافی ئەوەی هەبوو بچێتە ئەنجومەنی گەلەوە. زۆریی ژمارەی ئەندامانی ئەنجومەنی گەل وەهای دەکرد ناچار بێت بڕیار تەنیا لەسەر ئەو مەسەلانە بدات کە پێشەکی ئامادە و ساز کرابوون. ئەرکێکی دیکەی ئەنجومەنی گەل ئەوە بوو چاودێری کارمەندان بکات لەوەی لە سنووری دەسەڵاتی خۆیان دەرنەچن. گەر ئەنجومەنی گەل بیزانیبایە کەمتەرخەمی و ناپەسەندی لە کاراندا هەیە، لە ڕێگەی دەنگ دانەوە، یەک کەسیان بە تاوانبار دەستنیشان دەکرد و بۆ ماوەی دە ساڵ لە وەڵات دووریان دەخستەوە.

***ئەنجومەنی کارمەندان،*** یان ***ئەنجومەنی پێنجسەد کەسان،*** دەسەڵاتی گەورەتر و کاریگەرتری هەبوو. هەڵبژاردنی ئەندامەکانی بەم جۆرە بوو: دیمەکان پاڵاوتەی خۆیان دیاری دەکرد و لەوانیش ئەو پێنجسەد کەسە بە ناوڕاکێشان دەردەچوون. ئەم پرۆسەیە هەر ساڵێک دووبارە دەبۆوە. تەمەنی پاڵاوتە دەبا سی ساڵ و بەرەژوورتر بێت و کەسیش بۆی نەبوو لە دوو ساڵ پتر ئەندامەتی کردبایە.

ئەنجومەن لەبەر زۆریی ژمارەی ئەندامەکانی دەکرا بە دە بەشەوە، هەر بەشەی دەیەکی ساڵەکە کاری دەکرد. ئەنجومەن هەر ڕۆژ کۆدەبۆوە و هەر ڕۆژیش دەمڕاستێکی نوێی بە ناوڕاکێشان، دیاری دەکرا.

دیمەکان ئەندامیان بۆ ***دادگەکان*** یش دەپاڵاوت. لە نێو پاڵاوتەکاندا، بە ناوڕاکێشان، دەستەیەکی، زۆربەی جار، ٥٠١ کەسی دەستنیشان دەکران. ئەم دادگەیانەی گەل دەسەڵاتێکی زۆریان هەبوو، لایەکی زۆری ئەو ڕاوێژانەی لەسەر خاڵی تاریک و ڕوونی

دیموکراتیی ئەتین هاتنە کایەوە، دەربارەی دەسەڵاتی بەرزی ئەم دادگەیانە بوون کە، بەلای رەخنەگرانەوە، دەرگەی بۆ نارەزۆ و نەزانی ئاواڵە کرد.

خەسڵەتێکی بەرچاوی ئەنجومەنی کارمەندان و دادگەکانیش، وەک باسکرا، ئەوەیە ئەندامانیان زووزوو دەگۆڕان. لەوانەیە پێت سەیر بێت، شارەدەوڵەتی ئەتین چۆن سیاسەتێکی بەردەوام و پتەوی بەو ڕەوتە خێرایەی جێگۆڕکێ بۆ دەبرا بەڕێوە.

هونەرەکە لەوەدایە کە دەستەیەک کارمەند هەبوون بۆیان هەبوو ساڵ دوای ساڵ لە جێگەی خۆیاندا بمیننەوە. ئەم کارمەندانە لە سیاسەتی ئەتیندا دەستێکی باڵایان هەبووە و پێیان دەگوترا *ستراتیگ Strateg*. ئەم ستراتیگانە دە کەس بوون و لە ڕاستیدا فەرماندەی ئەرتەشی بوون (دەشێ ناویان بنێین جەنەڕاڵ)، بەڵام دەسەڵاتیان بەسەر ژیانی مەدەنیشدا هەبوو. پەریکلەس Perikles ناودارترین دەوڵەتگێڕی ئەتین و ستراتیگێک بوو، لە ناو ئەنجومەنی گەل و کارمەنداندا دەسترۆ بوو.

حکوومەتی ئەتین ماوەیەک بەر لە ساڵی پێنجسەدی پێش زایین، فۆرمی خۆی گرت. لەگەڵ ئەوەشدا لە تاوی دەرەکی بەدوور نەبوو. سەختانگ ‹قەیران، ئەزمە› ی هەرە گەورەی ئەتین لە ماوەی شەڕی پەلەپۆنسدا بوو کە بەر لە ساڵی چوارسەدی پێش زایین هەلگیرسا. ئەو شەڕە بەر لە هەر شتێک زۆرانبازیی هێز تاقیکرنەوەی ئەتین و سپارتای ئەریستۆکرات. ئەنجامی شەڕەکە بە شکانی ئەتین تەواو بوو و ئەو ئەنجامەش خرایە ئەستۆی شێوەی حوکومڕانی لە ئەتیندا. دەزگە سیاسییەکان، بۆ ماوەی چەندین ساڵ، لە کار خران و پاشانیش کە دامەزرانەوە نەیانتوانی جێگەی دیاری خۆیان بگرن.

وەک چۆن لە هەموو سەردەمێکی دیکەشدا سەختانگ دەوری لە مێژووی بیری سیاسیدا هەبووە، ئەم سەختانگ و گومڕایی و جیاوازیی بیروڕایە بوونە چلچرایەک بۆ گوتوبێژێکی ئایدیۆلۆگیی گشتگیرانە. هەر لەبەر ئەوەشە کە لە سەدەی پڕ لە ناکۆکیی چوارەمی پێش زاییندا، یۆنانییەکان توانییان گرنگترین بەرهەمیان پێشکەش بە گوتوبێژی بیری سیاسی بکەن. لە سەدەی چوارەمی پێش زاییندا بوو ئەفلاتون و ئەریستۆ بیروڕای سیاسی و ئوتۆپی-یەکانی خۆیان بەبەرهەم هێنا.

### ٢- ئەفلاتۆن

ئەفلاتۆن و ئەریستۆ کاریان لە ڕەوتی بیری ئەورووپی کرد، بەڵام نە کاریگەریەتیی ئەوان تەنیا لە بواری بیری سیاسیدا بوو نە بیری سیاسیش یەکەم بواری کاریگەریەتیی ئەوان بوو. بیروڕایان، کە تاڕادەیەک زۆر لەیەک جودا بوو، دەربارەی سروشتی زانیار، زانست، ئاکار، جوانی و زۆر بواری دیکە ماوەیەکی دوورودرێژ بوو بووە نموونە و ئیدیالی زانایانی ئەورووپا. بیری ئەفلاتۆن ئیلهامبەخشێکی پتەوی زۆر لە بیریاران بوو. ئەریستۆ لە سەردەمی ناڤینداً تەنانەت هەتا سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەمیش، لە بواری زانست و زانستی سروشتدا مامۆستای بێمانەند بوو.

بەڵام ئێمە لێرەدا تەنیا باس لە ئەفلاتۆن و ئەریستۆی بیریاری سیاسی دەکەین. بێگومان نەدەشیا بیری ئەوان لەم بوارەدا، کە تەواو پەیوەستی شارەدەوڵەتی یۆنانی بوو، وەک نموونە لە ئەورووپای فیودالدا بخرێتە گەڕ. لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگە لەوە نەگیرا بەشێکی زۆری بیری ئەوان، لە دۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیی یەکجار جیاوازیشدا، ببێتە سەرچاوەی ئیلهام و بەڵگە.

ئەفلاتۆن و ئەریستۆ، هەردووکیان، زیاتر لە ئەتین کارا بوون، بەڵام وەک کەس پێوەندییان بە شارەدەوڵەتی ئەتینەوە یەکجار جودا بوو.

ئەفلاتۆن ئەتینییەکی زگماک و بە بنەماڵەش ئەریستۆکرات بوو. هەر وەک خۆی دەڵێ ئامانجی ئەوە بوو خۆی بۆ سیاسەت تەرخان بکات، بەڵام بڕوای بە دیمۆکراتی تووشی نوشوستی بووبوو. خۆی وەهای پیشان دەدات کە هۆی بڕوا نەمانی ئەوە بوو کە لە ساڵە شوومەکەی ٣٩٩ ی پێش زاییندا، دادگەیەکی دیمۆکراتیانە هەڵبژێردراو، سۆکراتی مامۆستا خۆشەویستەکەی ئەم، بە تاوانی بڵاوکردنەوەی زڕەباوەڕی خودانەناسانە لە نێو لاواندا، بە سزای مەرگ حوکوم دا. ئەم حوکمەی بەسەر سۆکراتدا درا مەسەلەیەک بوو ئەفلاتۆن زووزوو دەیهێنایەوە پێش و هیچ گومان لەوەدا نییە کە کارێکی توندی لە بیروڕای سیاسیی ئەفلاتۆن کرد. بەڵام دەبێ ئەوەش ڕوون بکرێتەوە کە ئەفلاتۆن لەبەر ئەوەی ئەوەی ئەریستۆکرات بوو، هەڵوێستێکی هەستیارانەی بەرانبەر شێوەی دیمۆکراتیی ئەتین هەبوو. ئەفلاتۆن بە چاوێکی سووک دەیڕوانییە سەنعەتکار و بازرگان و هەر کەسێ هەوڵی سوودی ئابووری بدایە. ئەم دزاندنەش هێند قووڵ و بەرفرەوان بوو کە ناشێ سەرچاوەی لە یەک ڕووداوەوە گرتبێ، با مەزنیش بێ.

بەهەر حاڵ ئەفلاتۆن پشتی کردە سیاسەتی ئەتین و دەستی دایە پەروەردە کردنی دەستەیەکی هەڵبژاردەی سیاسەتمەدار و زانستکاری دواڕۆژ. فێرگەیەکی دامەزراند ناوی

لێ نرا ئەکادیمی، بە ناوی ئەو گەڕەکەی لێی بوو. لەو فێرگەیەدا لاوانی زیرەک بە دەرسدانێکی سەخت ئەوەیان فێردەکرا کە بەلای ئەفلاتونەوە زانستێکی ڕاست بوو. جگە لەوەش دیالۆگە درێژەکەشی بۆ جەماوەری دیکە دانا. لە زۆربەی ئەو دیالۆگانەدا، نۆرەی سەرەکی دراوە بە سۆکرات، دیالۆگەکان بریتین لە ڕاوێژی دوور و درێژی پێچەڵپێچ و زۆر جار توند و تیژ کە تێیاندا سۆکرات بەڵگەی نەسەلێن دژ بە بەرپەرچدانەوەکانی خۆی دەهێنێتەوە و کارێکی وەها دەکات هاوڕاوێژانی بۆخۆیان ڕاستی بدۆزنەوە.

لە لێکۆڵینەوە هەرە فرەوانەکانی دەربارەی ئەفلاتون، مەسەلەی ئایە ئەفلاتون باوەڕەکانی سۆکرات پێشان دەداتەوە یان مامۆستا مردووەکەی تەنیا وەک بێژەرێک بەکار دەهێنێت، بیروڕای تەواو جیاواز هەیە. لێرەدا پێویست ناکات ئێمە هەڵوێست لەو مەسەلەیە وەربگرین، لە بیروڕاکانی ئەفلاتون بدوێین چاکترە، ئەگەرچی بەشێکی زۆری پسپۆران بەشێکی ئەو ڕایانە بە بەرهەمی ئەفلاتون و سۆکرات دەزانن.

دۆزی سیاسی لە بەشێکی زۆری ئەو دیالۆگانە نۆرەیەکی سەرەکی دەبینن. بەڵام ئەفلاتون نۆڕینی سیاسیی خۆی لە *کۆمار* دا ڕوون دەکاتەوە، *کۆمار* بەرهەمێکی مەزنی پتر لە چوارسەد لاپەڕەی ئاسایی چاپە. لەوێدا نیگاری نموونەدەوڵەتی خۆی دەکێشێ و لە هەمان کاتدا دیمۆکراتیی ئەتین و شێوازەکانی دیکەی حوکومڕانی، کە بەلای ئەوەوە کەمبایەخترن، دەداتە بەر ڕەخنەی کوشندە. ئەفلاتون لە دەمەو بنەتای تەمەنی هەشتا ساڵەیدا خەریکی نووسینەوەی بەرهەمێکی دیکە بوو، دەربارەی کۆمەڵگە، بە ناوی *قانوون* لەوێدا مەرجەکانی حوکومڕانیی چاک لەم دنیا خۆگۆڕ و ناتەواوەدا، ئاسانتر کردۆتەوە. وا پێدەچێ دووەم هەرەسی سیاسیی ژیانی لەو وێژینگ (وەهم) ـەی دەرهێنابێ. هەرەسەکەش ئەوە بوو کە لە دوو ماوەی جیاوازدا هەوڵی دا ڕەوتی سیاسی لە شارەدەوڵەتی یۆنانی Syrakusa لە سیسیلیا بگۆڕێت، بەڵام سەرنەکەوت. هێندەی نەمابوو ئەم سەرکێشییەی خراپ بە سەری خۆیدا بشکێتەوە، بە زەحمەت توانی بگەڕێتەوە ئەتین. کۆسپی بێئەژمار هاتنە ڕێی دروست کردنی نموونەدەوڵەتەکەیەوە.

بەردی بناخەی دەوڵەتەکەی ئەفلاتون دەڵێ مرۆڤ لە ڕێگەی فەلسەفەوە دەتوانێ بە ماکی پاکژیی (فضیلة) و ڕەوایەتی بگات. چۆن دەکرێ بەڵگەی سەلێنراو بۆ هاوکێشەی ماتماتیک دابنرێ هەروەهاش دەکرێ بە دڵنیاییەوە بڕیاری ئەوە بدرێت کە مرۆڤ دەبێ *چۆن* بێت، پێوەندی نێوان ئادەمیزاد دەبێ *چۆن* بێت و هەر لەو ڕێگەیەشەوە دەوڵەت دەبێ *چۆن* بنیات نرابێ بۆ ئەوەی بە باشترین شێوەی مومکین بگەڕێت.

ڕاستە ئەفلاتون بڕوای بەوە نەبوو لەم دنیایەدا شتێکی بێگەرد دروست بکرێت، ئەو

دەیگوت دنیای بیری پاک وا *لە ئاسمانە* و ئەوەی لەسەر زەوی هەبێ، کەموزۆر، زایەڵەیەکی ناتەواوە، بەڵام ئەگەر بزانین وێنەی کۆمەڵگەی نموونەیی چۆنە و ڕووەو ئەو مەبەستە ڕێ بکەین ئەوا زۆر چاک ئیمکان هەیە کۆمەڵگەیەکی زۆر باشتر لەمەی ئێستە هەیە، دابمەزرێنین. زانستی ئەم بیر و ئیدیالە سەخت و گرانە، هەموو کەس نایگاتێ. گۆڕین و بەڕێوەبردنی دەوڵەت، بەلای ئەفلاتونەوە، تەنیا بەو کەسانە دەکرێ خاوەنی بەهرەیەکی خۆڕسکی گەورەن و خوێندنێکی یەکجار گشتگیرانەیان هەیە. ئەفلاتون بەمانە دەڵێ فەیلەسووف، واتە ئەوانەی خاوەن توانستێکی بیرکارانە و خوێندنێکی بەرزن.

ئەمەش بوو ئەفلاتۆنی گەیاندە ئەو ناکۆکییە ئاڵۆزە لەگەڵ مەرجەکانی دیمۆکراتیی ئەتین. بەلای ئەوەوە حوکومڕانی کاری کارامەیە یان باشترە بڵێم کارێکی یەکجار ناواز و بەرزە. ئەمە کارێک نییە بدرێتە دەست ئەموئەو و زۆرینەی هاوزێدان. دیمۆکراتیی ئەتین تەنیا مەرجی ئەوە بوو مرۆڤ هاوزێدێکی زگماک بێ، نە داوای بەهرەی دەکرد نە زانست، ئەمەش بەلای ئەفلاتۆنەوە حوکومڕانییەکی سووک و دزێو بوو.

### ٣- ئەریستۆ

بەگشتی، هەم لای ئەفلاتون و هەم لای ئەریستۆ، دوزە ئایدیۆلۆگییە بنەڕەتییەکان هەر یەک بوون. ئەمەش ڕێکەوت نییە، ئەریستۆ شاگردی ئەفلاتون بوو، کاتێکیش بووە خاوەن فەلسەفەیەکی سەربەخۆ، بەلایەوە گرنگ بوو بەرپەرچی بەشێکی زۆری بۆچوونەکانی ئەفلاتون بداتەوە. لەبەر ئەوە، لە *سیاسەت* دا تاڕادەیەک بە وردی بە *کۆمار* و *قانوون* دا دەچێتەوە.

هەڵبەتە ئەفلاتون و ئەریستۆش لە هەمان سەرچاوەی شارەدەوڵەتی ئەتینەوە شارەزاییان پەیدا کردووە و هەمان مۆرکی ژینگەی یۆنانیان پێوە بووە. لەبەر ئەوە پێویستە خاڵ بە خاڵ بۆچوونەکانیان بەراورد بکرێن.

ئەریستۆ لە شارۆچکەی ستاگەیرا Stageira ی ماکادۆنیا Makedonia لە دایک بووە. بە لاوی هاتە ئەتین و بوو بە شاگردی ئەکادیمی. هەڵبەتە نەدەکرا ببێتە هاوزێدی ئەتین و بە مێتۆییک Metoik مایەوە. گەر ئەفلاتۆن بە باوەڕ خۆی لە ژیانی سیاسی دوورخستەوە ئەوا ئەریستۆ ناچار بوو دوورەپەرێز بێ. لەگەڵ ئەوەشدا، لەم بوارە و لە هەر بوارێکی دیکەش بێ، سەرنجدەرێکی چوست بووە، بە وردی باسی لە تایبەتمەندییەکانی سیاسەتی ئەتین کردووە و بە گشتیش هەڵوێستی ئەو زۆر لەوەی ئەفلاتون گەشبینانەتر بووە.

پاش مەرگی ئەفلاتون، ئەریستۆ ئەتێن بەجێ دەهێڵێت و دەبێ بە مامۆستای ئەسکەندەری ئەو دەمە لاو و پاشان بە ئەسکەندەری مەزن ناسراو. لەوێ، زۆر لە نێزیکەوە، سەرنج لە گەشە کردنی مەزنەدەوڵەتێک دەگرێ کە، هەم بە ناوەرۆک و هەم بە فرەوانی، بەرانبەر شارەدەوڵتی نەریتکارانەی یۆنانی، دژ دەوەستا. سەیر لەوەدایە ئەریستۆ لە بەرهەمە سیاسییەکانیدا باس لەم ئەزموونانە ناکات مەگەر بە تێبینییەک کە دەڵێ دەوڵەت دەبێ بە ڕووبەر بچووک و بە ژمارەی دانیشتووان گونجاو بێت.

کاتێک ئەریستۆ گەڕایەوە ئەتێن ڕووی نەکردەوە ئەکادێمی چونکە پاش مردنی ئەفلاتون ئەکادێمیش ڕێگەیەکی گرتبووە بەر لای ئەم ناپەسەند بوو. لەبەر ئەوە فێرگەیەکی نوێی دامەزراند و ناوی نا *لیکیەن* (بە لاتینی *Lyceun*) و لەوێدا زانستی شارەزاکی empirical نۆرەیەکی مەزنتری هەبوو لەوەی لە ئەکادێمیدا هەیبوو.

زۆربەی نووسراوە پارێزراوەکانی ئەریستۆ بە پلەی یەکەم بۆ دەرسگوتنەوەی خۆی بووە نەک – وەک دیالۆگەکانی ئەفلاتون – بۆ جەماوەری بەرینتر بێ. لەبەر ئەوەشە ئەو هونەرکاییە ئەدەبییەی لە بەرهەمەکانی ئەفلاتوندا هەیە لە نووسینەکانی ئەمدا نییە.

*سیاسەت* وەک *کۆمار* کتێبێکی مەزنە، بەڵام وەک *کۆمار* یەکپارچە و سەرلەبەر نییە. بەشێک لە لێکۆڵەوەران پێیان وایە *سیاسەت* هەر هەمووی بەرهەمی ئەریستۆ نییە، هۆی ئەم بۆچوونەش ئەوەیە کە *سیاسەت* وەک هەموو بەرهەمەکانی دیکەی ئەریستۆ، چەند سەدەیەک پاش مردنی خۆی کۆکراونەتەوە. ئەمڕۆ واپێدەچێ وەها باو بێ کە ئەوەی ئێمە پێی دەڵێین *سیاسەت* بریتییە لە دوو بەرهەمی ئەریستۆ، یەکێکیان پتر ئەبستراکت و ئەوەی دیکەیان پتر کۆنکرێتە.

چەند جیاوازییەکی گرنگی نێوان ئایدیۆلۆگیی ئەفلاتون و ئەریستۆ، بەگشتی، پێوەندە بە جیاوازیی فەلسەفەی هەردووکیان. ئەفلاتون پێی وابوو بیر و فۆرم لە دنیای ئەودیودا هەیە، ئەریستۆ پێی وابوو لەم دنیایەدان کە ئێمە هەستی پێ دەکەین نەک دوور لەم دنیایە. هەموو جۆرە شتێک، سروشتێک یان ماکێکی هەیە: بەرد وەهایە، ئادەمیزاد وەهایە، ڕوەک و دەوڵەتیش هەر وەهان. ئێمە دەتوانین لە ڕێی سەرنجدانەوە نەک – وەک ئەفلاتون دەڵێ – لە ڕێی ڕامانی ئەبستراکتەوە لە ماکی جۆراوجۆر بگەین.

لەبەر ئەوەیە هەڵوێستی ئەفلاتون و ئەریستۆ لە ئاست گەڕان بەدوای چۆنیەتی نموونەدەوڵەت – واتە چاکترین دەوڵەتی مومکین – جودایە. بەلای ئەفلاتونەوە ڕێگەی گەیشتن بە ناسینی دەوڵەتی باش ئەوە نییە لەو جۆرە دەوڵەتانە ورد بینەوە کە لە ئارادا هەن بەڵکوو تەنیا بە ناسینی دنیای بیرە، لەو دنیایەدا بیری چاکە لە هەمووان بەرزترە و

وەک «ڕۆژە لە بیرستاندا». بەلام ئەریستۆ پێی وایە بۆ ئەوەی لە ئەرک و مەبەستی دەولەت بگەین دەبێ لە پێشدا ورد بینەوە لەوەی دەولەت لە ڕاستیدا چۆن دەگەڕێ. بێگومان ئەمەش بووەتە هۆکارێکی ئەوەی جیاوازیی نێوان نموونەدەولەتی ئەفلاتۆن و شارەدەولەتە دامەزراوەکانی یۆنان فرەوانتر بێت لە جیاوازی نێوان نموونەدەولەتی ئەریستۆ و ئەو شارەدەولەتانە. هەلبەتە ئەم جیاوازییانە هۆکاری دیکەشیان هەیە. وا لێرەدا خال بە خال، هەلوێستی هەردووکیان بەرانبەر دۆزگەلی چینەکانی کۆمەلگە، مولکایەتی تاکەکەسی، ئازادیی تاک و ئامانجی دەولەت بەراورد دەکەین.

**٤- چینەکانی کۆمەلگە**

لەمەوبەر باسمان لە سێ چینی کۆمەلگەی شارەدەولەتی یۆنانی کرد: زەویداری ئەریستۆکرات، کاسبکاران (جۆتیاری زەویدار، بازرگان و کرێکاران) و کۆیلەکان. ئەم دابەش کردنە لەگەل دابەش بوونی سیاسی بەسەر هاوزێد و ناهاوزێددا دەبێ باش لەیەک جودا بکرێنەوە.

وا پێدەچێ بوونی کۆیلە لای ئەفلاتۆن و ئەریستۆ مەسەلەیەکی ئاسایی بێ، ئەفلاتۆن تەنیا بە سەرپێیی باس لە دیاردەی کۆیلەیەتی دەکات. کاتێک دێتە سەر باسی ساختاری چینایەتی نێو نموونەدەولەتەکەی خۆی ناوی کۆیلە هەر نابات، لەوە دەچێ بوونیان، بەلایەوە، پێویست بە لێدوان نەکات.

بەلام ئەریستۆ بە وردی باس لە سروشتی کۆیلە و ئەرکی کۆیلەیەتی لە کۆمەلگەدا، دەکات. ئەو بە ئەرکی خۆی دەزانێ بیسەلمێنێت کە ئەو نەرێتە ژیرانەیە و دەولەتی باش هەر دەبێ کۆیلەیەتی تێدا هەبێت.

ئەریستۆیش وەک زۆربەی یۆنانی دێرین بڕوای بەوە هەیە جیاوازییەکی گرنگ لە نێوان یۆنانی و بەربەردا هەیە، یۆنانی هۆشلەبەرە، بەربەر بێهۆشە. ئەریستۆ دەلێ لە لایەن سروشتەوە دوو جۆر مرۆڤ هەن، ئەوەی بە زیرەکی خۆی تێدەگات چ کارێک پێویستە بکرێت و ئەوەی بە هێزی لەشی کارەکە جێبەجێ دەکات، ئەوانەی یەکەم بە شێوەیەکی سروشتەکی مرۆڤی ئازادن و ئەوانە دیکەش کۆیلەن. بەربەر هەردەم کۆیلەن و دەولەتەکانیشیان هەر دەبێ کۆیلەستان بێت. تەنیا سەرۆکە هەرە گەورەکانیان زیرەک و پێشبینن و لە ئەنجامیشدا هەموو بڕیارێک دەگرنە دەست و دەبنە تاکفەرمان و گەورەی هەمووان.

هەرچی یۆنانییە ئەوا سەروەرن و کۆیلەکانیشیان لە وەڵاتی بەربەرەکانەوە هێنراون. کاری کۆیلە ئەوەیە ببێتە ئامراز و دەستاوێژی خاوەنەکەی. جیاوازیی ئەو لەگەڵ ئامرازەکانی دیکەدا ئەوەیە ئەمیان ژیندارە. خاڵی گرنگی هاوبەشیشیان جێبەجێ کردنی فەرمان و پیلانی خاوەنەکەیەتی.

ئەریستۆ بەرپەرچی ئەو باوەڕە دەداتەوە کە دەڵێ ژن و کۆیلە هاوسروشتن. ژن - یان وردتر بڵێین ژنی پیاوی ئازاد، ژنی یۆنانی - وەک کۆیلە ئامرازێکی پاسیف <سارد - سست> نییە. ژن و کۆیلە بەشێکن لە خێزان، بەڵام جێگەیان لە خێزاندا تەواو جودایە. بە کورتی، پێوەندیی نێوان ژن و مێرد بۆ زاووزێیە و پێوەندیی سەروەر و کۆیلە بۆ بەرهەم هێنانی مایەکییە. بەڵام ژن نۆرەیەکی هەبێ لە دنیای دەرەوەی خێزاندا، وەک بواری سیاسەت، بیرێک نەبوو بە خەیاڵی ئەریستۆدا بێت.

گەورەترین جیاوازیی چینایەتی بەلای ئەریستۆوە جیاوازیی پیاوی ئازاد و نائازادە، پیاوی سەروەر و کۆیلەیە. دەتوانین بڵێین لەم مەسەلەیەدا بە گیانی دیمۆکراتیانەی ئەتینی دەئاخفێ. سیاسەت کاری **هەموو** پیاوێکی ئازادە. بەڵام ئەفلاتۆن هەر بەحاڵ بە پێویستی دەزانێ باس لە دۆخی کۆیلەیەتی بکات. ئەو سنوورەی ئەو دەیەوێ ڕاییبکێشێ و لە نموونەدەوڵەتدا بیکاتە سنوورێکی لە بڕین نەهاتوو، سنووری نێوان ئەریستۆکراتی هەڵبژاردە و گەلە. ئەوجا ئەفلاتۆن مەبەستی لە ئەریستۆکراتی زگماک و ئەریستۆکراتی خزمایەتی نییە، بەرزیی بۆ ئەو کەسانەیە بە بەهرە و زانین بەرزن و جگە لەوانیش ئەوانەی ئازا و بوێرن. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەفلاتۆن - بە بڕوایەکی ئەریستۆکراتانەوە - دەڵێ خەسڵەتی بەرز زگماکە. کەواتە سروشت ڕێگە لەوە دەگرێ چینگۆڕکێ لە نموونەدەوڵەتەکەی ئەودا زیاد لە پێویست بەهێز بێت.

لەبەر ئەوە کۆمەڵگەی باش، لای ئەفلاتۆن، دەبێ بە دوو بەشەوە، پاسەوانان و کاسبکاران. ئەرکی کاسبکاران ئەوەیە هەوڵ بدەن بۆ وەدەست هێنانی ئەو خێرەی پێویستە بۆ گوزەرانێکی ڕێکوپێکی خەڵک. لەبەر ئەوەشە بێبەزەییانە هەوڵی سوودی مایەکی و ئابووری دەدەن. ئەگەر ڕێگەی ئەم ئارەزووەیان بۆ خۆشیی دنیایەکی بێسنوور بەرفرەوان بکرێ ئەوا ئەنجامی ترسناکی بۆ سەر هەموو کۆمەڵگە دەبێت.

پاسەوانان دوو بەشن، ئازاکان ئەوانەن دەوڵەتەکە دەپارێزن و هەرە ژیرەکانیش ڕێبەری ڕاستین. جەنگاوەر و ئاسایشپارێزان دەوریان لە دەرەوە و ناوەوەی دەوڵەتەکە هەیە. ئەرکی ئەوان هەر ئەوە نییە ڕووبەڕووی دوژمنی بیانی بوەستن بەڵکوو دەبێ هێمنی و ئاسوودەیی ناو وەڵاتەکەش بپارێزن. لەبەر ئەوە یەکجار گرنگە ئەم بەشە بە دیسپلین و

یەکگرتوو بن. گەورە و بچووکی لە نێوانیاندا توند و تۆڵە: گەورەکان بۆیان هەیە بچووکەکان سزا بدەن و هەموو فەرمانێک لە ڕێبەرانی ڕاستی دەوڵەتەوە قانوونە. ئەفلاتوون دەڵێ بە یەک گرتنێکی وەها مەترسیی دووبەرەکی و ئاژاوە «لە بەشەکەی دیکەی کۆمەڵگە» واتە کاسبکاراندا، زۆر کەم دەبێتەوە.

ئەوەی بەڕاستی بەلای ئەفلاتوونەوە مەبەست بێ ڕێبەرەکانن. بەو بێ دەبێ دەوڵەت لە لایەن دەستەیەکی هەڵبژاردەی بیرکار ببرێ بەڕێوە. کەواتە دەبێ ئەو کەسانە هەڵبژێردرێن و پەروەردە بکرێن، بەڵێ، تەنانەت لە ڕووی بایۆلۆگیشەوە دەبێ کاری بۆ بکرێ. ئەفلاتوون ئەو دەمە باسی لەوە کردووە کە ئێمە ئەمڕۆ پێی دەڵێین یوجینی eugenic (زانستی چاک کردنی ڕەگەز). منداڵبوون لە دەوڵەتی باشدا مەسەلەیەک نییە بە ئارەزووی تاکەکەس یان بە ڕێکەوتەوە گرێدرابێ، ڕێبەرانی چاک لە ژن و پیاوی هەرە بەهرەمەند دروست دەبن و دەبێ ڕێگەیان بۆ خۆش بکرێ یەکتر بدۆزنەوە و منداڵ بخەنەوە. ئەفلاتوون پێی وانییە ئەم کارە ئۆتۆماتیکی دەبێتە هۆی ئەوەی نەوەی نموونەیی بێتە بەرهەم بەڵام دەڵێ دەرفەتی بەرهەم هێنانی زیرەکیی دەگمەن پتر دەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ دەرفەتی پێشبڕکێ بۆ منداڵی هەموو پیاوێکی ئازاد ئاواڵە بێ بۆ خوێندنی هەرە باش و پاشانیش بۆ بەرزترین کارمەندی. پاش بژار کردن تەنیا هەرە کارامەکان دەمێننەوە. بەلای ئەفلاتوونەوە خوێندن ئەرکێکی دەوڵەتییە نەک بەرژەوەندێکی تاکەکەسان. لەم بوارەشدا کاتێک ئاوڕ لە مەرجەکانی ناو ئەتێن دەداتەوە دەبینێت – وەک لە زۆربەی خاڵە گرنگەکانی دیکەدا – مەرجەکانی سپارتا پێشکەوتووترە.

لە نموونەدەوڵەتی ئەفلاتووندا ماوەی خوێندنی حوکومڕانان لە هەموو جۆرە خوێندنێکی لە دنیادا هەبووە و پاشانیش داهات، درێژخایەنترە. شاگردان هەتا هەژدە ساڵی خوێندنی ئاسایی یۆنانی دەخوێنن کە بریتییە لە خوێندنەوە و نووسین، وەرزش و پاشان لێکۆڵینەوەی بەرهەمی شاعیران (ئەفلاتوون پێی وابوو دەبێ ئەم بوارە ئەدەبییە لە هەڵە و پەڵەی زیانبەخش پاک بکرێتەوە). پاشان چەند ساڵێک بە ڕاهێنانی ئەرتەشی دەبەنە سەر. ئەوانەی هەتا ئەو دەمە دەیسەلمێنن زۆرترین بابەت فێردەبن، دە دانە ساڵی دیکە سەرگەرمی ماتماتیک دەبن. کاتێک دەگەنە تەمەنی سی ساڵی، ئەو دەستەیەی دەمێنێتەوە ئامادەیە بۆ ئەوەی فێری دیالەکتیک بکرێ، دیالەکتیک بەلای ئەفلاتوونەوە ڕێگەی دروستە بۆ ناسینی دنیای بیر. کاتێک شاگردان لە خوێندنی دیالەکتیک تەواو دەبن، وەک کارمەندێکی بچووک، هەتا تەمەنی پەنجا ساڵان خزمەت دەکەن، ئەوجا ئەو مرۆڤانە دەبنە فەیلەسووفی تەواو کارامە و خوێندوو، ئیدی بۆیان هەیە ئەرکی حوکومڕانی بگرنە ئەستۆ. مرۆڤی وەها،

ئەو دەمە، دەتوانێ کاتی خۆی لە نێوان بیر کردنەوە و سیاسەتدا، دابەش بکات. ئەگەرچی بۆخۆی تێفکرینی لا خۆشترە بەڵام بەشێکی کاتی بەنرخی خۆی پێشکەش بە بەرژەوەندی دەوڵەت دەکات.

خەڵکی دیکەی ناو دەوڵەتەکە دەبێ تەواو ملکەچی فەرمانەکانی ئەم بن.

## ٥- پێوەندی ئابووری

نە ئەفلاتوون نە ئەریستۆ نەیان دەویست بە شێوەیەکی بنەڕەتی ساختاری چینایەتیی شارەدەوڵەتی یۆنانی بگۆڕن. بەڵام بیروڕایان دەربارەی ئەوەی کێ حوکومڕانی بکات تەواو دژ بە یەکە. لە لای ئەریستۆ حوکومڕانی بەرپرسایەتی گشت هاوزێدانی ئازادە، ئەفلاتوونیش پێی وایە تەنیا بۆ هەڵبژاردەیەکە خاوەن گیانێکی هەرەبەرز بن.

خاڵێکی دیکە هەیە لەوانەیە ببێتە جیاوازییەکی بنەڕەتیتر لە نێوان ئایدیۆلۆگیی سیاسیی هەردوو لایاندا، ئەویش مەسەلەیەکە لە ئەتێن زوو زوو دەهاتە پێشەوە و پاشانیش دەم دەم زیندوو دەبۆوە. کێشەکەش دەڵێ ئەگەر مەرجە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەکان هاتنە گۆڕان، ئایە مرۆڤ تا چ ڕادەیەک دەگۆڕدرێت. ئایە ڕاستە سروشتی مرۆڤ، بەگشتی، بەرانبەر ئاڵوگۆڕی دەرەکی نەگۆڕە (ئەوە نییە مرۆڤ هەردەم وەک خۆیەتی)؟ یان کردەوەی مرۆڤ و بۆچوونەکانی، ئاوات و پێویستییەکانی بەر لە هەر شتێک بەرهەمی ژینگەن.

وەرامی ئەم پرسیارە کار دەکاتە سەر بۆچوونی مرۆڤ دەربارەی ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی و سیاسی. ئەوەی پێی وا بێ مرۆڤ تەواو ئامادەی گۆڕانە، بەگشتی، زیاتر بڕوای بە ڕیفۆرم و گۆڕانکاریی شۆڕشگێڕانەیە.

ئەفلاتوون، وەک باسمان کرد، ڕادیکالانەتر لە ئەریستۆ، دەیویست کۆمەڵگەی دامەزراوی ئەتێن گۆڕانکاری بە سەردا بێت. بڕواشی زیاتر هەبوو بە کاریگەریەتی دەست تێوەردانی سیاسی لە ژیان و گوزەرانی مرۆڤدا. ئەم مەسەلەیەش تەواو ئاشکرا دەبێت گەر هەڵوێستی هەردوو فەیلەسووفەکە لە ئاست گۆڕانکاریی ئابووریدا، بەراورد بکەین.

لای ئەفلاتوون دەوڵەمەندی و هەژاری بە توندی کار لە مرۆڤ دەکەن. ڕاستە مرۆڤی ژیر و مرۆڤی ئازا و دلێر خۆ بەسەر مەترسییەکانی ئارەزووی قازانجدا زاڵ دەکەن بەڵام کاسبکاران هەموو ئامانجێکیان ئەوەیە خۆشی ئەم دنیایە بەبەرهەم بێنن و ئەگەر نەخرێنە

ناو هەرەمێکی کۆمەلایەتیی توندەوە، ئەوا هەولدانیان بۆ دەولەمەندی باڵ بەسەر هەموو کۆمەلگەدا دەکێشێ و دەبێتە هۆی ناکۆکیی جیددی.

دیمۆکراتی بەلای ئەفلاتونەوە حوکومڕانییەکە خەباتی ئابووری تێیدا لە سنوور دەرچووە و یەکیەتیی دەولەت کەوتۆتە بەر هەڕەشەی ناکۆکیی نێوان زەنگین و هەژارەوە. ئەفلاتون پێی وایە، ئەگەر جیاوازیی گەورە لە نێوان باری ئابووریی خەلکدا هەبێت، دەولەت بە هیچ جۆرێک ناتوانێ کاروباری خۆی بە جۆرێکی لەبار ببات بە ڕێوە. دەولەت هەر دەبێت لە لایەن کەسانێکەوە ببرێت بەڕێوە کە تەواو لە خەمی سوودی ئابووری بەدوور بن.

لەبەر ئەوە لە *کۆمار* دا، داوا دەکات پاسەوانان تەواو بێ مولکایەتی خۆیی بن و بە هیچ جۆرێک نابێ خاوەنی بەرژەوەندیکی تایبەت بە خۆیان بن. تەنانەت نابێ لەگەڵ ژن و مندالیان ژیانێکی خێزاناسا بەرنە سەر.

کاسب و جۆتیار و بازرگان مافی مولکایەتییان هەیە، بەلام پاسەوانان دەبێ کارێ بکەن کە جیاوازیی ئابووری لە ناو ئەو گروپانەشدا، هەتا دەکرێ، کەم بێ. لە ***قانوون*** دا، کە ئەفلاتون تێیدا ئاستی داواکانی لە کۆمەلگەی نموونەیی دابەزاندووە، دەلێ زەنگینترین هاوزێد هەرگیز نابێ پتر لە پێنج ئەوەندەی هەژارترین کەسی هەبێ.

ئەفلاتون پێی وایە یەکێک لە مەرجەکانی یەک گرتنی کۆمەلگە ئەوەیە بەشێکی زۆری سامان هاوبەش بێ (ئەمەیە ناوەڕۆکی ئەوەی کە زۆر جار و لەسەر بنەمایەکی لاواز پێی دەگوترێ "کۆمیونیزم" ـی ئەفلاتون) و تاڕادەیەکیش دابەش کردنی سامان توند بێ تەنانەت لەناو ئەوانەشدا کە بۆیان هەیە بۆ سوودی خۆیان کار بکەن.

ئەفلاتون لەناو کەسانی هاوزەمانی خۆیدا، لەم بۆچوونانەدا، تەنیا نەبوو. تەنانەت هی وایان تێدا بوو دەیگوت ئەگەر هەر هەموو خاوەنی یەک ستاندەری ئابووری بن ئەوا، لە نێو کۆمەلگەدا، لە قانوون دەرچوون نەدەما. تاوانکاری گرێدراوی جیاوازیی ئابوورییە.

ئەریستۆ لە *سیاسەت* دا یەخەگیری ئەم بۆچوونانە دەبێ و بەلگەکانیشی هەمەجۆرن. ئەو پێی وایە هەولدان بۆ مولکایەتی یەکێکە لە هێزە هەرە گرنگەکانی دنەدەری مرۆڤ — بێ ئەوەی جۆری حوکومڕانی دەخلێکی لەم مەسەلەیەدا هەبێ، ناکرێ مولکایەتیی تاکەکەسی و جیاوازیی دەولەمەندی لابدرێت چونکە ئەو هێزە گۆج دەبێت.

ئەریستۆ دەلێت مرۆڤێک ڕێبەری یەکێکی دیکە بێت و لەبەر ئەوەش لە ئاستیدا دەستڕۆ بێت دەبێ لە باری ئابووریشەوە لەو بەرزتر بێت. دەشلێ پاسەوانانی *کۆمار* چۆن لە جۆتکاران جودا دەکرێنەوە و چۆنیش لە ئاستیاندا سەردەست دەبن.

ئەریستۆ پێی وا نییە یەکسانیی دارایی دەبێتە هۆی سەپاندنی دەستوور و ئاسایش. مرۆڤ هەیە خۆرسک تاوانکارە. ئەوانەی پتر ژیرن و بەرپرسی گەورەن ئەگەر هیچ سوودی مایەکییان پێ نەبەخشرێ ئەوا ئەوان، نەک چینە نزمترەکانی کۆمەڵگە، دەبنە مرۆڤی نەسەلمێن و هەڕەشە لە هێمنی دەکەن. بەلای ئەریستۆوە، هاوسەنگ کردنی ئابووریی خەڵک دەبێتە هۆی ئەوەی خەسڵەتە گرنگەکانی ئاکار هەرگیز نەکەونە بەر ئەزموون و بەرەبەرە دەپووکێنەوە. ئەگەر ڕێگەی ژیانی دەوڵەمەندانە لە مرۆڤ بگیرێ ئەوا ئەویش ناتوانێ بیسەلمێنێ کە یەکەمە. بەختەوەران، لە نێوان خێری مایەکی و دنیای بەرزی گیانەکیدا، ڕێگەی هەڵبژاردنی ئازادیان نامێنێ. لەبەر ئەم هۆیانە، بە بۆچوونی ئەریستۆ، کەم کردنەوەی جیاوازیی ئابووری لە کۆمەڵگەدا، کارێکی نارێکە. چارەی چاوچنۆکی و سامانپەرستی، بەلای ئەوەوە، بە گۆڕینی پێوەندیی ئابووری نابێ بەڵکوو بە پەروەدە کردن دەبێ. بە پەروەردە کردن کار لە سامان ناکرێ بەڵام زۆر چاک کار لە ئارەزوو کردنی سامان دەکرێ.

### ٦- ئازادیی تاکەکەس

لە بیروڕای سیاسیی یۆناندا، دۆزی ئازادیی تاکەکەس لە کۆمەڵگەدا، بەو شێوەیە باسی لێ ناکرێ کە ئایدیۆلۆگییە هاوچەرخەکان دەیکەن. لە شارەدەوڵەتی یۆنانیدا هاوزێدەتی مەسەلەیەکی دەستووری نەبوو و یۆنانییەکان گوتوبێژیان لەسەر ماف و ئەرکی هاوزێد نەکردووە. ئەفلاتون و ئەریستۆ پێیان وایە دەوڵەت دەبێ کارێک بکا پێوەندیی خزمایەتی لە نێو دانیشتوواندا ڕاهێزێنێت. ئەفلاتون دەڵێ، پاسەوان لە نموونەدەوڵەتدا تووشی هەر کەسێک هات دەبێ ئەو کەسە بە خزمی خۆی بزانێ، دەبێ بە چاوی «برا یان خوشک، باوک یان دایک، کوڕی خۆ یان کچی خۆ، باپیر یان نەوە» سەیری ئەو خەڵکە بکات.

ئەریستۆ لە چاو ئەفلاتوندا بە پارێزەرێکی دیمۆکراتیی ئەتین دادەنرێ. بەڵام بە نۆڕینی ئەریستۆ، ڕشتەی دیمۆکراتی ڕشتەی هەرە باشی بەبیردا هاتوو نییە، پاشایەتی هەوە، چونکە پاشا وەک باوکە بۆ ئەوانەی پلەیان لەو نزمترە. بەڵام پاشایەتی بەرەو تاکفەرمانی پەرە دەستێنێ و تاکفەرمانیش لە خەمی بەرژەوەندی گەلدا نییە – وا پێدەچێ مەبەستی ئەریستۆ ئەوە بێ کە پاشایەتی دروست لە زەمانی ئەودا نەمابێ. ئەریستۆ دیمۆکراتی پێ باشترە لە تاکفەرمانی چونکە لادانی دیمۆکراتی لە نموونەدەوڵەت کەمترە

له لادانی تاکفەرمانی. پێوەندیی نێوان دانیشتووان لە دیمۆکراتیدا وەک پێوەندی باوک و کوڕ نییە بەڵکوو وەک برا و برایە. دۆستایەتی نێوان دەستەبرا دەگەشێتەوە «چونکە مرۆڤی هاوشانی یەکتر کاری هاوکۆیان زۆرە».

لەم بۆچوونانەوە دەردەکەوێ کە دۆزی ئازادیی تاک، لە شارەدەوڵەتی یۆنانیدا، بەو جۆرە نەبووە کە لە گوتوبێژی سیاسیی ئەم سەردەمەدا باسی لێوە دەکرێ. پێوەندیی نێوان هاوزێدان وەک پێوەندی نێوان ئەندامانی خێزانێکی باوکفەرمان توند و یەکگرتوو، سەیر دەکرا. ژن ملکەچی فەرمانی مێردە، منداڵان ملکەچی فەرمانی براگەورەن و باوک بەرپرسی هەموو خێزانەکەیە، براگەورە بەرپرسی بچووکانە. لە دەوڵەتێکی دیمۆکراتدا، بە بۆچوونی ئەریستۆ، پێوەندیی باوک و منداڵ لە ژیانی سیاسیدا بزر بووە و پێوەندی نێوان هاوزێدان، پێوەندی نێوان برایانمان دێنێتەوە بیر.

مەسەلەی گرنگ ئەوەیە هەر پیاوێکی ئازاد، وەک ئەندامێک بەشێک بێت لە *شارەدەوڵەت (پۆلیس Polis)*. ئەریستۆ مرۆڤ بە *Zoon politikon* دادەنێ، هەر لە دەمی کۆندا کە شارەدەوڵەتەکان سەنگیان نەما ئەم گوتەیە بەوە لێکدرایەوە کە گوایە مرۆڤ «گیانەوەرێکی سیاسییە» بەڵام لە ڕاستیدا ئەریستۆ مەبەستی ئەوە بوو ماکی مرۆڤ سەر بە *Polis (شارەدەوڵەت)* ـە و لەبەر ئەوە تەنیا ئەگەر وەک مرۆڤێکی ئازاد کاری لە شارەدەوڵەتدا کرد دەبێتە مرۆڤێکی دروست. وشەی *idiot* واتە *تەنیا*، وەک ناونەتۆرەیەکی کوژەر، لەو کەسانە دەنرا کە لە کاروباری شارەدەوڵەت خۆیان دەدزییەوە و لەو ڕێیەوە پێوەندیی کورئاسا و برائاسایان لەگەڵ هاوزێدان دەپچراند. مەبەستیش ئەوە نییە ئەفلاتۆن و ئەریستۆ لە دۆزی ئازادی نەدواون، بەڵام خوێنەری ئەم دواکاتە دەبێ لەوە بگات کە پاشخانی مەسەلەکە جودایە.

ئەفلاتۆن باسی ئازادی لە دەوڵەتی دیمۆکراتدا بە وردی دەکات و دەڵێ دیمۆکراتی لەوەوە پەیدا دەبێ کە مرۆڤ لە ئازادی دەگەڕێ، ئازادیش بەزیادەوە وەدەست دەهێنێ: ئازادیی دەربڕینی بیروڕا و ئازادیی «بەدڵی خۆ کردن». لەبەر ئەوەشە دیمۆکراتی ئەو شێوە حوکومڕانییەیە کە یەکسەر خۆی وەک سەرنجڕاکێشترین شێوە دەهێنێتە پێش. کۆمەڵگەیەکی هەمەڕەنگ و فرەجۆر دەبەخشێت، نە کەس بەرپرسە و نە کەس ئەرکی لەسەر شانە. ئەفلاتۆن ئەم ئەنجامانەی لێ ڕوون دەکاتەوە: لە کۆمەڵگەیەکی دیمۆکراتدا کەسێک نەیەوێ بە زۆر ڕەوانەی شەڕ ناکرێ یا دەوڵەتەکە لە شەڕیشدا بێت، پێچەوانەشی ڕاستە، هەر کەسێک بیەوێت، لە دەمی ئاشتیدا، بۆی هەیە شەڕێکی سەربەخۆ هەڵگیرسێنێ.

بەڵێ، ئەفلاتون پێی وایە دیموکراتی ڕێ نادات پێوەندیی خێزانەکیی نەریتی لە نێوان خەڵکدا بە شێوەی خۆیان بمێننەوە. لە دیموکراتیدا شاگرد لە مامۆستاکەی و بچووک لە گەورە هەڵدەگەڕێنەوە. کاتێکیش بە کۆتا دەگات کە کۆیلە و سەروەرەکەی وەک یەک ئازاد بن و ژن و پیاویش ببنە هاوشانی یەک. ئەمە بەلای ئەفلاتونەوە ئەنجامە هەرە دوورەکانی دیموکراتییە نەک ڕاستیی ئەو پێوەندییانەی هەبووە لەو حوکومڕانییەی ئەو دەیناسی. ئەفلاتون بەو وشانە دەیەوێ پیشانی بدات کە نرخاندنە سەرەکییەکانی دیموکراتی چەند نزم و پووچن. ئەو وای دادەنێ خوێنەر، بەوەی ژن و کۆیلە دەبنە هاوشانی هاوزێدان، سەرسام دەبێ.

ڕادەی گاڵتە پێ هاتنی ئەفلاتون لەوەدا دەردەکەوێ کە باس لە پلەوپایەی ئاژەڵ دەکات لە دیموکراتیدا. دەڵێ ئاژەڵیش لە دیموکراتیدا ئازادن، «پیاو دەڵێ (ئەم سەروەرە، ئەم سەگە) هەروەهاش بۆ ئەسپ و کەر. بە ئازادییەکی شکۆدارەوە بە جادەکاندا دەڕۆن و پاڵ بەو کەسانەوە دەنێن لە سەر ڕێیانن و هەست بەوە ناکەن دەبێ خۆیان لابدەن. هەموو کەسێک و هەموو شتێک بە گیانی ئازادی تێرە».

ئەفلاتون بەم وێنە گاڵتەجارییە دەیەوێ پیشانی بدات کە دیموکراتی موستەحیلە خۆی ڕابگرێ، هەرچی نەریت و دەستوور و ڕێسا هەیە هەڵدەوەشێتەوە. کاتێک بێسەروبەریی ناو کۆمەڵ بە کۆتا گەیشت ئەوجا ڕێگە بۆ تاکفەرمانی ستەمکار خۆش دەبێت. کاتێ دەستووری چۆنیەتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت هەڵوەشایەوە دەبێ تاکفەرمان خێرابەخێرا دەربکەوێت و جڵەوی قانوون بگرێتە دەست. ئازادیی سەرلەبەر بە نائازادیی سەرلەبەر دەشکێتەوە.

هەڵەی بنەڕەتی دیموکراتی، بەلای ئەفلاتونەوە، ئەوەیە چاو لە جیاوازیی نێوان خەڵکی دەپۆشێ. هیچ مەرجێک دانانێ. چاو لە پێویستیی پەروەدە کردن دەپۆشێ. کەچی ئەو کەسەی خاوەن بەهرەی هەرە بەرزە، بێ ئەوەی لە منداڵییەوە ڕابهێنرێ و بێ ئەوەی لە ژینگەیەکی باشدا پەروەردە بکرێ، دەشێ ببێتە مێرخاس. دیموکراتی مرۆڤی چەوت بە بەرهەم دێنێ.

ئەو مرۆڤە چەوتەی دیموکراتی تەنیا بیر لەو چرکەیە دەکاتەوە کە تێیدا دەژی. ئازادی لە دیموکراتیدا دەکاتەوە ئازادیی ئەوەی بە دڵی خۆت بکەیت. خەڵکی هەوڵ دەدەن چێژ لەو دەمە ببینن کە تێیدان. ڕۆژێک سەرگەرمی مەشقن و ڕۆژێکی دیکە بێکارن. ماوەیەک دەرسی فەلسەفە دەخوێنن پاشان دەست دەدەنە سیاسەت. مرۆڤی ڕشتەی دیموکراتی خۆڕاگر نییە، چی بە دڵ بوو ئەوە دەکات و ئەوە دەڵێ.

دیارە ئەفلاتون بۆ وەسفی ئەو کۆمەڵگەیەی هاوزێدان تێیدا ئازادییەکی مەزن نۆش دەکەن، پەکی لەسەر وشە ناکەوێ. بەو پاشخانە فەلسەفییەی هەیەتی دزاندنەکەی تەواو ڕەنگ دەداتەوە و پێی وایە پێوەری کردەوەی خەڵک و فەرمانڕەوایان مەسەلەیەکە زانین بڕیاری لەسەر دەدات، ڕاستە یان چەوتە. ئەگەر خەڵکی بە دڵی خۆیان بکەن و بێ ئەوەی بزانن چی باشە و چی چەوتە، دەستیان لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا هەبێ، ئەوا ڕێگە دەدرێن و تەنانەت دنەش دەدرێن هەڵە بکەن. لە هەموو دۆخێکدا تەنیا یەک ڕێگە هەیە ڕاست بێت و تەنیا ئەوەی پاش خوێندنێکی زێدە بەرفرەوان بە ناسینی دنیای بیر گەیشتووە، دەزانێ ڕێگەی ڕاست چییە. دەی سا جێی خۆی نییە کاری دەوڵەتی بدرێتە دەست مرۆڤی وەها؟

بێگومان دوور نییە ئەم دزاندنەی ئەفلاتون لە ئاست ئازادیی هەڵبژاردندا، جگە لە مەسەلەی زانین، هۆی دیکەشی هەبێت. ئەفلاتون لە دیدەنی بیرکارانەی ئەریستۆکراتانەی خۆیەوە، بە چاوێکی سووک لە *گەل* ی نەزان دەڕوانێ و ڕکی لەو کەسانە دەبێتەوە کە سەرگەرمی پەیدا کردنی پێداویستییەکانی ژیانن. ئەمەش لە بیروڕاکانیدا شاراوە نین.

نموونەدەوڵەتی ئەفلاتون کۆمەڵگەیەکە بە ئاشکرا توێژدارە. ئازادیی توێژی هەرە باڵای فەرمانڕەوا زیاتر نییە لە ئازادیی توێژەکانی ژێرتر. هەر هەموو بە توندی گرێدراوی ئەرکەکانی خۆیانن. هەر یەکەو، بەپێی بەهرەداری خۆی، جێی ئاشکرای خۆی لە هەرەمەکەدا دەگرێ. ئەوەی پلەی نزمە لەسەریەتی فەرمانی لە خۆ بەرزتر بێ ئەملا و ئەولا جێبەجێ بکات و ئەوەی پلەی بەرەو ژوورە بەرپرسە لەوەی فەرمانەکانی دروست بن.

بۆ ئەوەی کەس دوای بۆچوون و نەریتی چەوت نەکەوێت دەبێ ڕێبەران، بە وردی، ئاگاداری ئەو کارانە بن کە دەگاتە خەڵک، ئەمەش هەر لە منداڵییەوە هەتا هەورازتر. نە منداڵ نە مەزن نابێ هەموو بابەتێک بخوێننەوە. بەرهەمی ئەدەبی وەها کە بۆچوونی چەوتی تێدابێ، دەربارەی سروشتی خواوەند یان چی چاکە و چی ڕەوایە، نابێ لە مەکتەبدا بەکار بهێنرێ.

ئەفلاتون بە چاوێکی نزم لە خێر و بەرەکەتی ئازادیی هەڵبژاردن دەڕوانێ. لەم سەدە درەنگانەدا چەمکێکی دیکەی ئازادی، چالاکانە هاتە کایەوە و دەڵێ: ئەو کەسە ئازادە کە دەتوانێ بەهرەکانی خۆی پێش بخات و لە کاروباریدا بتوانێت هیواکانی خۆی جێبەجێ بکات. لەوانەیە چەمکێکی وەها بەلای ئەفلاتونەوە ئاسانتر پەسەند بکرایە. ئەم گوتەیەش لە سنووری (لەوانەیە) دەرناچێ.

ئەریستۆ نرخێکی زیاتر دەدا بەو بوارە سنووردراوەی هەڵبژاردن کە لە شارەدەوڵەتی دیمۆکراتیی یۆناندا بۆ هاوزێدی ئازاد ئاواڵە بوو. ئەو ناچێ وەک ئەفلاتون ئەنجامی

دووره‌ده‌ست له بیری دیموکراتی هه‌لینجینی: له دیموکراتیدا کویله هه‌ر به کویله‌یه‌تی ده‌مینیته‌وه و ژنیش هه‌ر به نارسکاو داده‌نری. کویله که «ئامرازیکی زیندوو» بی دیاره هیچ ده‌رفه‌تیکی نابی خوی بریاری کاری خوی بدات. ژنیش هیچ کاریگه‌رییه‌کی ئه‌وتوی له چاره‌نووسی خویدا نییه. ته‌نیا ئه‌و که‌سه‌ی ده‌توانی حیسابی کرده‌وه‌کانی خوی بکات و ئه‌نجامه‌کانیان لیک بداته‌وه به ئازاد ده‌ناسری.

به‌لام ئه‌م ئازادییه ته‌نیا به چه‌ند مافیکی سیاسی دابین ناکری. وه‌ک باسمان کرد، ئه‌ریستو پیی وایه مولکایه‌تیی تاکه‌که‌سی ده‌بی بپاریزری، به‌لام نابی سامان به یه‌کسانی به‌سه‌ر هه‌موو پیاویکی ئازاددا دابه‌ش بکری، هه‌موو وه‌ک یه‌ک نرخدار نین، پاداشی ئابووری ده‌بی به پیی کارامه‌یی بیت.

مولکایه‌تیی تاکه‌که‌س، به‌لای ئه‌ریستووه نوره‌یه‌کی گرنگ له مه‌سه‌له‌ی ئازادیی هه‌لبژاردندا ده‌بینی. ئه‌وه‌ی خاوه‌ن سامان نه‌بی ناتوانی ئاکاری په‌خشه‌نده‌یی هه‌بیت، ته‌نانه‌ت ناتوانی ژیانیکی مامناوه‌ند به‌رانبه‌ر ژیانی بیناوه‌روکی و به‌ره‌لایی و به‌رزفرپیوی، هه‌لبژیریت. بیگومان ئه‌م ئازادییه، هه‌تا سامان پتر بیت، ئه‌ویش مه‌زنتر ده‌بیت. ته‌نانه‌ت له کومه‌لگه‌یه‌کی دیموکراتیشدا ئازادی پله‌داره.

### ٧- ئامانجی ده‌وله‌ت

جیاوازیی ئایدیولوگیی نیوان ئه‌فلاتون و ئه‌ریستو هه‌ر ئه‌وه تییه نورینی جودایان له ئاست ده‌زگه سیاسییه‌کانی وه‌ک: ئه‌نجومه‌نی گه‌ل و کارمه‌ندییه‌تی به‌رز و... هتد هه‌یه، به‌لکوو مه‌رجه‌کانی مولکایه‌تی و پیوه‌ندیی نیوان چینه‌کانی کومه‌لگه‌ش به‌هه‌مان شیوه ده‌گریته‌وه.

به‌لام بوچوونیان ده‌رباره‌ی سروشت و ئه‌رکی ده‌وله‌ت ویکچووه. ده‌وله‌ت به شیوه‌یه‌کی خورسک له یه‌ک گرتنیکی سنووردراو و ساکاری خیل و خیزان هاته کایه‌وه. ده‌وله‌ت به‌لای ئه‌فلاتونه‌وه، دیارده‌یه‌کی پیویسته له‌به‌ر ئه‌وه‌ی، یه‌که‌م: مروڤ پیویستی به یارمه‌تی یه‌کتره، دووه‌م: مروڤ خاوه‌ن خه‌سله‌ت و توانستی جودایه. له ده‌وله‌تدا کار دابه‌ش ده‌کری و خه‌لکی شاره‌زایی له جوره کاریکدا په‌یدا ده‌که‌ن، هه‌یه سه‌رگه‌رمی کشتوکاله، هه‌یه ده‌بیته سه‌نعه‌تکار و به‌شیکیش روو ده‌که‌نه بازرگانی. بروای هه‌ره به‌ر چاوی ئه‌فلاتون ئه‌وه‌یه کارگیریی ده‌وله‌ت و سیاسه‌ت کاری مروڤی پسپور، یان وردتر بلیم کاری مروڤی ژیر و فه‌یله‌سووفه.

ئەریستۆش پێی وایە کار دابەشین و جیاوازیی نێو خەڵک، کە بە نۆرینی خۆی مەرجێکی خۆرسکی کار دابەشینە، مەرجی بنەڕەتین بۆ دامەزراندنی دەوڵەت. نیشانەی دەوڵەتی باش ئەوەیە لە سەر پێی خۆی ڕاوەستێ و پێوەندی دەوڵەتی دیکە نەبێ و بەو جۆرە دەرفەتی ئاکاربەرزی بۆ دانیشتووانی بڕەخسێنێ. بەڵام بۆچوونی ئەو دەربارەی سیاسەت لە بۆچوونی ئەفلاتۆن جودایە: سیاسەت ئەرکی پسپۆران نییە بەڵکوو ئەرکی هەموو هاوڵێدێکی ئازادە، کە لەبەر لەیەک نەچوون و جیاوازیی ویست و پیشەیان، بەیەکەوە شارەزاییەکی فرەلایەنی پێک دێنن.

دابین کردنی ڕادەیەکی بەرزی گوزەران و زیاد کردنی سامانی مایەکی، نە لای ئەفلاتۆن و نە لای ئەریستۆ بە ئامانجێکی سەرەکی دەوڵەت دانەنراون. دەوڵەت بەر لە هەر شتێک ئامرازێکە بۆ چاک کردن و کامڵ بوونی *ئاکار*ی خەڵک.

بەلای ئەفلاتونەوە، نیشانەی ئەم جۆرە حوکمڕانییە دامەزراوانە، کە خەوشدار و ناتەواون، ئەوەیە مرۆڤی نێو ئەو دەوڵەتانە سەرگەرمی لایەنی دنیایەکین، مرۆڤ لە خۆشیی کاتەکی و جوانی و زەنگینیی گومڕا دەگەڕێ. لە نموونەدەوڵەتدا مرۆڤ هەوڵی دنیای بیر، دنیای ئەودیوی مەرگ دەدات.

لەوانەیە وەها ڕانوێنێ کە ئەفلاتۆن، بە نموونەدەوڵەتەکی خۆی بیەوێت ماشێنێکی خۆشینەویست دروست بکات تێیدا هەر کەس ڕووی لە ئەرکی تایبەتی خۆی بێت. نەخێر، مەبەستی ئەفلاتۆن ئەوە نییە. بە پێچەوانە، ئەو پێی وایە مرۆڤ لەو دەوڵەتەدا شادتر دەبێ. لەو دەوڵەتەدا دادپەروەری جێگیرە: دادپەروەریش لەڕاستیدا هەر بە واتای پێوەندیی دروستی نێوان بەش و چینە جیاوازەکانی دەوڵەت دێت. بەڕەڵایی و ئاکاری نابەجێ وەلاوە نراون. هەر کەس جێ و دەرفەتی خۆی دەزانێ.

بەڵام شادمانیی دروست تەنیا بۆ فەیلەسووفانە کە حوکمڕانی نموونەدەوڵەتن. فەیلەسووف بێخەبەر نییە لە خۆشیی پێشکەوتن و شکۆمەندیی بەڵام ئەو لەبەر ئەوەی ژیرە زاڵە بەسەر ئاواتەکانیدا. فەیلەسووف خاوەنی زانیاری ڕاستینەیە و شارەزای دنیای بیرە. ئەفلاتۆن پێی وایە شادمانیی دروست ئەوەیە دەستت بە هەرە بەرزدا بگات نەک بە خۆشی و ئارەزووی گومڕای نزم.

شادمانی، لای ئەفلاتۆن، ئەو هەستە دەمودەستە نییە کە لە خۆشی و ئارەزووەوە پەیدا دەبێ. لەمەشدا ئەریستۆ ڕاست و ڕەوان لێی دەسەلمێنێ. ئەریستۆ دەڵێ شادمانی eudaimoni'a ژیانێکی چالاکی پاکژییە. ئەو کەسە شادمانە کە هەوڵ بۆ مەبەستێکی بەرز دەدات. ڕابواردنی نایەتی کەمخایەنە و گەر زیادڕۆییشی تێدا بکەیت دەبێتە هۆی پەستی.

شادمانیی هەمیشەکی تەنیا بۆ ئەو کەسەیە ئەرکی خۆی بەجێ دێنێ: بازرگانی دادپەروەر، جەنگاوەری دلێر، سیاسەتمەداری کردە و ژیر. هەتا ئامانجیش بەرزتر بێ شادمانیش بڵندتر دەبێ. ئەریستۆ وەک ئەفلاتۆن پێی وایە زانیاری پاک بەرزترین شادمانی دەبەخشێت. بەڵام ژیری ئەم وەک فەیلەسووفەکەی نموونەدەوڵەتی ئەفلاتۆن ژیانێکی زاهیدانە ناژی، ئەمیان بە خۆشیی دنیایەکی دەوری دراوە بەڵام بە سەنگینی و شەرافەتمەندیی خۆی ژیریی خۆی دەنوێنێ.

نە ئەفلاتۆن نە ئەریستۆ بێپەروا نەبوون بەرانبەر چوستیی ئابووریی دەوڵەت و توانستی دەوڵەت لە ساز کردنی گوزەرانێکی لەبار بۆ دانیشتووانی دەوڵەتەکە. بەڵام ئەم خاڵە، وەک باسمان کرد، نابێتە ئامانجی سەرەکی دەوڵەت. دەوڵەتی هەرە باش ئەوەیە لە جیاوازیی ماکی مرۆڤ، جیاوازیی *سروشتیان*، شارەزایە و ڕێگە بۆ هاوکاریی نێوانیان خۆش دەکات بۆ ئەوەی هەر کەسە ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ کە بۆی دەشێ. بەو جۆرە خەڵکی، بە پێی توانست و بەهرەی جودا، بەو ئاستە ئاکار و شادمانییە دەگەن کە بۆیان دەلوێ.

## ٨- شێوەی بەڵگە هێنانەوە لای ئەفلاتۆن و ئەریستۆ

وەک بەرهەمی گشت بیریارانی سیاسیی دیکە، پەیامگەلی ئەفلاتۆن و ئەریستۆیش دەربارەی دەوڵەت، بریتییە لە خاڵی **سیانەکی** *theoretic* و **پێوەرەکی** *normative*. وا ئێمە لێرەدا، یەکجار بە کورتی، باس لە شێوەی بەڵگە هێنانەوەیان دەگەین.

شارەدەوڵەتی یۆنانی دەراوی ئاسایی هەردوو لایە، بەڵام هەردوو لا بەیەک شێوە مامەڵەت لەگەڵ شارەدەوڵەتی دامەزراودا ناکەن. ئەریستۆی پەیڕەوی شارەزاکیەتی empiricism چەندین ڕاستی دەربارەی نەک تەنیا ئەتێن بەڵکوو سپارتا و کریتاش ڕوون دەکاتەوە. باس لە چۆنیەتی بڕیار گرتن و سامان دابەش کردن، پێوەندیی نێوان چینەکانی کۆمەڵ دەکات. لە *کۆمار* ی ئەفلاتۆندا، بەدەگمەن نەبێ، باس کردنی لەم بابەتە نابینیت. کاتێک ئەفلاتۆن لە حوکومڕانیی دیمۆکراتی دەدوێت ناچێت وێنەی شارەدەوڵەتی ئەو دەمەی ئەتێنمان بۆ ڕوون بکاتەوە بەڵکوو هەوڵ دەدات لە ئەنجامە هەرە دوورەکانی بیر و ماکی دیمۆکراتی بدوێت.

هەم ئەفلاتۆن و هەم ئەریستۆ، چەندین گریمانە دەربارەی مرۆڤ و پێوەندیی مرۆڤ بە گشتەوە... هتد دادەنێن. بە جووتە پێیان وایە مرۆڤ، چ لە لایەن گیان و چ لە لایەن

لەشەوە، یەکجار لە یەک جیاوازن. هەروەها دەڵێن پەروەردە و خوێندنی پتەو مەرجێکی پێویستە بۆ ئەوەی بەهرەی جیاجیا بگەشێتەوە. ئەفلاتون لە ئەریستۆ زیاتر بڕوای بەوە هەیە کە گۆڕانکاریی ئابووری و کۆمەڵایەتی کار لە تاکەکەس دەکەن: ئەگەر مولکایەتیی تاکەکەس سنووردار بکرێ ئەوا تەمای سوود لای تاکەکەس بەرتەنگ دەبێ.

ئەمانە گریمانەی دیمانەکیی گشتین. بەڵام ئەفلاتون و ئەریستۆ نرخاندنی تایبەت بە خۆیشیان هەیە. ئەفلاتون بەوەوە ناوەستێتەوە کە دەڵێ ئەگەر بیری یەکسانی و ئازادیی دیمۆکراتی هەتا سەر پێڕەوی بکرێت ئەوا جیاوازیی نێوان سەروەر و کۆیلە، پیاو و ژن لەناو دەچێ، بەڵکوو ئەوەشی دەخاتە سەر کە دۆخی وەها خراپە و دەبێ بە هەموو شێوەیەک خۆی لێ لابدەین. ئەفلاتون گوتەیەک ئاڕاستەی خوێنەرانی خۆی دەکات و دەڵێ: خۆتان لە دیمۆکراتی لادەن!.

ئەریستۆ باس لە حوکومڕانیی ئەتێن دەکات و بیروڕای گشتگرانەش دەربارەی پێوەندیی نێوان سروشتی مرۆڤ و ئەرک و پایەی کۆمەڵایەتییان دەردەبڕێ. باس لە کۆیلەیەتی دەکات و دەڵێ کۆیلە پتر لەشە نەک گیان، پیاوی ئازادیش پتر گیانە نەک لەش. ئەریستۆ ئەم بۆچوونە گشتییانە بەراورد دەکات بە جیۆرێی کۆیلە و پیاوی ئازادی ناو ئەتێن. بەڵام ئەریستۆ بەمانەوە ناوەستێتەوە بەڵکوو دەشڵێ ئەوە کارێکی ***باشە*** کە کۆیلە هەر کۆیلە بێ و پیاوی ئازادیش لە سیاسەتدا دەستڕۆ بێ.

جودا کردنەوەی خاڵە لەیەک نەچووەکانی ئایدیۆلۆگیی سیاسیی ئەفلاتون و ئەریستۆ کارێکی گرنگە. دەکرێ ئەو وەسفەی دەزگەکانی ئەتێن کە ئەریستۆ دەیکات لەگەڵ ئەو زانیارەی مێژوو بۆی بەجێ هێشتووین دەربارەی ئەو مەسەلەیە، بەراورد بکەین. دەکرێ لە ڕوانگەی هەمەجۆرەوە، هەڵوێست بگرین لە دیمانەکانی ئەفلاتون و ئەریستۆ دەربارەی جیاوازیی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ، کار تێ کردنی جۆرە جوداکانی کۆمەڵگە لە ژیان و شێوەی بیرکردنەوە. بەڵێ دەکرێ ئەو بەراوردانە بکەین بەڵام ئەوە مەسەلەیەکە و بڕیار دان لەسەر نرخاندنەکانی ئەو دووانە لە بابەتی وەک چالاکی و پێوەندییەکانی جۆراوجۆری مرۆڤ یان بیروڕا کەموزۆر ئوتۆپییەکانیان دەربارەی دەوڵەت، مەسەلەیەکی دیکەیە.

**١- لە ئەسکەندەر Alexander ەوە هەتا دەوڵەتی ڕۆمانی**

ئەفلاتون و ئەریستۆ سەرگەرمی ئایدیۆلۆگیی دەوڵەتی بچووک، شارەدەوڵەت، بوون. بیروڕای ئەوان، لە هەموو ماوەی دێریندا، بە شێوەیەکی بەرفرەوان کاریگەر بوو. بەڵام هەلکەوتی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی کە بناخەی بیرکردنەوەی سەر بە سیاسەتن، تەواو گۆڕان و لە جێی ئەوان مەزنەدەوڵەت ساز کرا و بووە دەراوی ئایدیۆلۆگی و سیاست. لە سەرەتادا ئەسکەندەری مەزن و جێگرەکانی و پاشان بۆ ماوەی پێنج سەدە ئیمپەراتۆرییەتی ڕۆمانی هاتە کایەوە.

شارەدوڵەتی یۆنانی وەک ئەتێن بە چەندین گۆڕانکاریی سەختدا تێپەڕی و پێوەندییەکی چالاکی بە دەوروبەری خۆیەوە هەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەم بەرەو دەرەوە و هەم بەرەو ناوەوە، یەکەیەکی داخراو بوو. گرووپی هاوزێدی ئازاد، وێڕای ناکۆکی چینایەتی، هەستیان بە ناوکۆییەکی بەڵگەنەویست دەکرد. سنووری نێوان خۆیان لە لایەک و کۆیلەکان لە لایەکی دیکە هەر وەک سنووریان بەرانبەر گەل و فەرهەنگی دیکە سنوورێکی دیار و بەڵگەنەویستی هەبوو.

بۆ یۆنانییەک کارێکی خۆڕسکانەتر بوو باس لە یۆنانی و نایۆنانی بکات وەک لەوەی باس لە ئادەمیزاد بکات. یۆنانی پتر خۆی بە ئەندامی کۆمەڵێک هاوزێدی خێزاناسا دەزانی وەک لەوەی خۆی بە تاکەکەس بزانێ.

کاروانی داگیرکردنەکانی ئەسکەندەر بوونە دەروازەی ئەو دەمەی پێی دەگوترێ هێلینی Hellenic. یەکە داخراوەکەی جاران گۆڕا بە ئاواڵە بوونێکی شێواو. فەرهەنگی جودا بەیەک دەگەیشتن و لە یەکتردا ڕەنگیان دەدایەوە. خەڵکی بە زمان و فەرهەنگی جوداوە لە شارە کۆزمۆپۆلیتە گەورەکانی زەریای ناویندا، کە لە ناویاندا ئەسکەندەرییە لە هەمووان بەرچاوتر بوو، بە یەک دەگەیشتن. فەلسەفە و زانستی یۆنانی لەناو گەلانی دیکەدا بڵاو بۆوە. لە هەمان کاتدا چەند دینێکی ڕۆژهەڵاتیش سەرکەوتووانە خۆیان ترنجاندە پێشەوە. ململانێی نێوان بیروڕای جیاواز و حیکمەتی جیاوازدا سەخت بوو. ڕاڕای فیکری و ئەو هەوڵدانە گۆجبووەی گەیشتن بە گەشکەی تەواوی زانین، گەورە بوو.

لەو ژینگەیەدا ئایدیۆلۆگیی سیاسیی نوێ شین بوو، ئایدیۆلۆگی ئەو ئەرک و پایەیەی نەما کە لە ئەتێنی سەدەکانی چوارەم و پێنجەمی پێش زاییندا هەیبوو. بەرهەمەکانی

ئەفلاتون و ئەریستۆ چارەی سیاسەتمەندانەیان بۆ دۆزەکانی ئەو دەمە دەدۆزییەوە. ئەو بەرهەمانە پێشانیان دەدا چۆن گیروگرفتی ئەو دەمە لە ڕێی سیاسەتەوە، چارە دەکرێ. هەڵبەتە ئەو بۆچوونانە تارادەیەک گەشبینانە بوون، بەڵام لەو شارەدەوڵەتە بچووکانەدا کە وا باو بوو ژمارەیەکی سنووردراوی هاوزێدان بە تەنیا دەسەڵاتێکی پتەویان هەبێ، ئەو ڕایانە سەیر نەبوون. لە وەڵاتێکی گەورە و بەرفرەواندا، بە نەرێت و بیروڕای دژوەستاو، ڕێنموونی باشترین حوکومڕانی هێندە باوی نەما و هێندەش گەشبینانە نەبوو. ئەفلاتون، لە *کۆمار* دا، پروپاگەندەی بۆ گۆڕانکارییەکی وەها دەکرد کە دەشێ پێی بگوترێ شۆڕشگێڕانە. کاری لەو بابەتە، لە زەمانی هێلێنیدا لە دەگمەن دەگمەنتر بوو. کاری ئایدیۆلۆگی زیاتر بوو بەوەی ڕەوایەتی بە حوکومڕانییەکی دامەزراو ببەخشێ. ئوتۆپیی سیاسی بوو بە ڕێچکەیەکی لەبیرکراو.

بۆ ئەوەی لە بیریارەکانی ئەو دەمە بگەین دەبێ شارەزای ئەو پاشخانە بین کە بریتی بوو لە چەندین ڕێچکەی دژەسیاسەت. بەلای ئەفلاتون و ئەریستۆوە، مەسەلەیەکی بەڵگەنەویست بوو کە سیاسەت ئەگەر ناوەندی سەرنجی مرۆڤی ژیر نەگرێ ئەوا جێگەیەکی نزیک ناوەند دەگرێ. بەڵام لەم بارە تازەیەدا، وەها باو بوو سیاسەت بەگشتی بە کارێکی بێنرخ و گەمژەکارانە دابنرێ، تەنانەت هی وا هەبوو بە گوناهکاری دادەنا.

ئەم بیری دژەسیاسەتە بە چەندین شێوە خۆی نواند. بەشێکیان دەیگوت هێمنی و بڵندیی تاکەکەس ئەوپەڕی چاکەیە و هەموو جۆرە خۆتێوەگلاندنێکی مرۆڤ لە کێشەی دنیایی، بیرسافی دەشێوێنێ. بەڵام دروستاندنی ئایینی باوتر بوو: هەموو ژیانێکی ئەم سەر زەوییە تاوانباری و خراپەکارییەکی بێچارەیە، مرۆڤ دەبێ بە هەموو هێزی خۆی هەوڵ بدات، بە هیوای ژیانێکی باشتری دنیای ئەودیو، لەم بارە ڕزگاری بێت.

ئەنجامێکی خۆڕسکی ئەم بۆچوونانە ئەوەیە کە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیی مرۆڤ دەبێتە مەسەلەیەکی بێنرخ. هەوڵ دان بۆ مەسەلەیەکی ڕووکەشی گێلێتییە! لەدنیای ئەودیودا، دنیای دروست، پێوەندییەکانی ئەم سەرزەوینە بێنرخن. لەبەر ئەوە نابێ مرۆڤ خۆی پێیانەوە هەڵواسێ و ناشبێ دژیان بوەستێ. لە کۆڕی دروستی ئیمانداراندا، کاروباری دنیایی و دەسەڵات پشتگوێ دەخرێ. بیروڕای وەها لە کڵێسەی مەسیحایەتی هەرە زووشدا هەبوو، پاولۆس Paulus ی موژدەگار دەڵێ: «لێرەدا نە جوو نە یۆنانی، نە کۆیلە نە ئازاد، نە پیاو نە ژن...» جیاوازی نێوان جوو و یۆنانی و زیاتریش لە نێوان کۆیلە و ئازاد، ژن و پیاو لە هەموو بوارێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووریدا تەواو بڕیاردەر بووە. بەڵام لە بواری بەرزتردا ئەم جیاوازییانە بێنرخ دەمان.

ئەم چەمکە دەکاتەوە ئەوەی خەڵکی یەک *سروشت* و یەک *ماک* – ن، واتە لە ڕووی ماکەوە وەک یەکن. ئەم دەربڕینە تەنانەت لە بۆچوونی سیاسی وەهاشدا کە سیاسەتی بەرز دەنرخاند، جێگەی بەرچاوی هەبوو. هەتا ماوەیەکی دووریش، لە ژینگەی سیاسی و کۆمەڵایەتیی جۆراوجۆردا، خۆی ڕاگرت. لەبەر ئەوە دەبێ سەرنجێکی لێ ڕاگرین.

ئەم بۆچوونەی سەر بە دنیای دوورەدەست کە باس لە وەک یەکیی سروشتەکیی مرۆڤ دەکات دوو لای هەیە: لە لایەک خەسڵەتێکی تاکەکەسی هەیە و لە لایەکی دیکە ئیدیالێکی جیهانگرانە دەنوێنێ. لە هەردوو ڕووەوە لە گوتە سیاسییەکانی ئەفلاتون و ئەریستووە جودان. بەڵێ بە نۆڕینی چەندین پسپۆڕی مێژووی بیری سیاسی، ئەم مەسەلەیە بە گرنگترین گۆڕانکاریی ئەو بوارە دادەنرێن.

بەڕاستیش لە زۆر ڕووەوە ئەم خاڵە دۆخگۆڕکێ metamorphose یەکی تەواو گرنگە، بەتایبەتی گەر بیر لەوە بکەینەوە کە ئەو مەزنایەتییە سیاسییەی حیسابی بۆ دەکرا، لە قەوارە سنووردراوەکەی شارەدەوڵەتەوە بەرەو وەڵاتێکی بەرفرەوانی یەکجار مەزن ملی نا. ئەو هەستە خۆڕسکییە نزیک بە خزمایەتییە هاوکۆیەی نێوان هاوزێدانی ئازادی شارەدەوڵەت، کە تاڕادەیەکی بەرز، لە بیری سیاسیی ئەفلاتون و ئەریستۆدا ڕەنگی دەدایەوە، وێڵ بوو. لەم بارە تازەیەدا، سەختتر بوو بۆ تاکەکەسێک بتوانێ خۆی لە گرووپێکی کۆمەڵایەتیدا بدۆزێتەوە. جیاوازییە گەورەکانی نێوان خەڵک، دەستە چین و گەلان، بە ئاسانی بە جیاوازییەکی کاتەکی نەک گرنگ دەهاتنە پێش چاو. ئەوەی گرنگ و هاوبەش بوو مرۆڤی تاکەکەس خۆی بوو. لەبەر ئەوەیە مرۆڤ وەک تاکەکەس بووە جێی سەرنج – بەڵام نەک مرۆڤی کۆنکرێت بە پلە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانییەوە بەڵکوو مرۆڤایەتی ئەبستراکت کە لە نێو هەموو خەڵکدا هاوبەشە. ئەگەر ئەمە ناو بنێین تاکەکیەتی individualism ئەوا زۆر گرنگە لەو تاکەکیەتییەی لە سەدەی حەڤدەیەم و بەملاوە نۆرەیەکی یەکجار دیاری دیوە، جودا بکرێتەوە. ئەم تاکەکیەتییە ڕووەو نایەتی و نەکردایەتییە، تاکەکیەتیی سەدەی حەڤدەیەم و بەتایبەتی هەژدەیەم داوای چارەی توند و زۆر جاریش شۆڕشگێڕانە دەکات. هەمان تێبینیش دەربارەی جیهانگرایەتی cosmopolitanism ی سەردەمی هێلینی و ڕۆمانی، ڕاستە. کاتێ دەگوترا خەڵکی هەموو وەڵاتان وەک یەکن، مەبەست ئەوە نەبوو هەموو بەشەکانی دنیا خاوەن یەک پلەوپایەن، مەبەست ئەوە نەبوو نابێ گەلێک بەسەر گەلێکی دیکەدا زاڵ بێت. ئەو تەرزە چەمکانەی سەر بە وێکچوونی مرۆڤ، پێش هەموو شتێک پارێزەرانە بوون، یارمەتی پتەو کردنی ڕشتەی دامەزراویان دەدا.

مەزنەدەوڵەت، لە بواری دیکەشدا توانی بیرکردنەوەی سیاسی بگۆڕێت. پێوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان تەواو لەوە گەورەتر بوون کە لە شارەدەوڵەتانی یۆناندا هەبوون. لە بیرکردنەوەی سیاسیدا، زۆر جار وەها بووە زۆر و کەم ئەو باسانە پشتگوێ خراون، دەتگوت هیچ نرخێکیان نییە.

جگە لەوە ڕووبەری سیاسەتیش گۆڕا. هاوڵاتیبوون لە شارەدەوڵەتێکی یۆنانیدا شتێک بوو و لە ئیمپەراتۆرییەتی ڕۆمانیدا شتێکی دیکە بوو. مەسەلەکە هەر ئەوە نەبوو مەرجی بایۆلۆگی خاو بووە: مرۆڤ لە ڕۆمادا، بۆ ئەوەی ببێتە هاوڵاتی ڕۆمانی، پێویستی بەوە نەبوو لە دایک و باوکێکی ئازاد بێت. ڕووبەری سیاسەت لە ژیانی هاوڵاتیاندا تەسک بووە. پلەی کەسەکی و ئاکاری کەسەکی پێک هات و سیاسەت و دەزگە سیاسییەکان دەستیان پێ نەدەگەیشت. بۆچوونی وەها کە دەڵێ، دەشێ مرۆڤ بەبێ ئەوەی نزیکی سیاسەت بکەوێت ژیانێکی ژیرانە بەرێتە سەر، بوو بە مەسەلەیەکی خۆڕسک.

**٢- ستۆیکیزم**

ستۆیکیزم stoicism ئەو ئایدیۆلۆگییەیە کە لە هەمووان باشتر بووە نیشانەی سەردەمی ڕۆمانییەکان. زۆربەی ئەو لایەنانەی بووبوونە نیشانەی بیروبۆچوونی دژەسیاسەت، بەر لە هەمووشیان ئەو بیرەی دەڵێ مرۆڤگەل سروشتیان هاوبەشە، لە ستۆیکیزمدا بەدەر دەکەوێ. یەکێک لە هێڵە هەرە بەرچاوەکانی ئەم بۆچوونە ئەوەیە دەڵێ کەس بە شێوەیەکی سروشتەکەی کۆیلە نییە، بەڵکوو هەر کۆیلەیەک دەبێ وەک کرێکارێکی هەمیشە کرێگرتە سەیر بکرێ.

بەڵام ستۆیکیزم چالاکیی سەر بە سیاسەت بەرز دەنرخێنێ. پیاوی ژیر خەریکی سیاسەت دەبێ.

فەلسەفەی ستۆیکیزم یەکەم جار لە ئەتێن، دەوروبەری ساڵی سێسەدی پێش زایین، بنیات نرا. لە سەرەتاوە فیکرێکی تایبەت بوو، ڕووی لە زانا و پیاوچاکی هەرە بەرز بوو. کەسێکی خۆی بە ستۆیکیستی ڕاست دانابایە نەدەبوو خۆشی و ناخۆشی ژیان کاری تێ کردبایە. دەبا بە هێمنی بەرگەی چاکە و خراپەی گرتبایە. بەڵام نەدەبا لە ئەرکی دنیایەکی دوورەپەرێز بایە بەڵکوو دەبا ئەو ئەرکەی پێی سپێردراوە بە دەستپاکی جێبەجێ بکات.

بیروڕای سەر بە گوزەران، لە ستۆیکیزمدا، بە دوا کاتەوە فرەوانتر بوو. ئەو زوهدە توندە لەبەردەم باوەڕی پتر دنیایەکیدا چۆکی دا. ئەم شێوازە گەلێرە بووە هۆی ئەوەی، لە

ڕۆما، خەڵک لەم ڕێبازە کۆببنەوە. ئەم بیرە بوو بە ڕێنامەی پاکژی و لە لایەن کارمەندانی دەوڵەت و دەزگەکانەوە پێڕەوی دەکرا و سووکە شێوازێکی پاراستنی ئەو پێوەندییە دامەزراوانەی گرتە خۆ.

لەوانەیە بشێ پانایتیۆس Panaitios ی فەیلەسووفی یۆنانی (دەوروبەری سەدەی دووەمی پێش زایین) بە گرنگترین نوێنەری ئەم جۆرە ستۆیکیزمە دابنێین. پانایتیۆس سەروکارێکی لەگەڵ گەورەپیاوانی ڕۆمای سەردەمی خۆی هەبوو. لای پانایتیۆس، بیری وێکچوونی خۆرسکی مرۆڤ، تەواو ڕەنگین بوو بەڵام ئەویش، وەک ستۆیکیستی دیکە، لابردنی ئەو جیاوازییە کۆمەڵایەتییانەی هەبونو بە گرنگ نەدەزانی. ئەوەی هاوبەش بوو لە نێوان مرۆڤدا دەروونە، جیاوازیی کۆنکرێت دەشێ و دەبێ مەزن بێت.

بۆ ئەوەی لەم بیرە تێبگەین دەبێ شتێک دەربارەی *سروشت*، لە بیری ستۆیکیزمدا، بزانین. مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆڤ بەشێکن لە بوارێکی یەک گرتووی مەزنی سروشت و وەکوو تەنەئاسمانەکی، گیانەوەر و ڕوەک ملکەچی هەمان دەستووری پێویستن. جیاوازیی نێوان قانوونەکانی هەڵسوکەوتی تەن و قانوونەکانی کۆمەڵگە، جیاوازی پلەیە نەک جۆر. چۆن دەستوور بۆ هەموو جۆرە بابەتێک هەیە هەروەهاش دەستوور بۆ ئەو بابەتە سروشتەکییە هەیە کە پێی دەگوترێ مرۆڤ.

ستۆیکیستەکان باسیان لە ***دەستوورگەلی سروشتەکی*** یان ***دەستووری سروشتەکی*** دەکرد کە بۆ هەموو شتێک، بە مرۆڤەوە، دەست دەدات. ئەوان پێیان وایە هەموو مرۆڤێک لە ناخی دەروونیدا دەزانێ چاکە و خراپە چییە.

ڕاستە، دەشێ ئەم زانیارە، لە ڕێی نەزانینی تاکەکەسەوە یان خراپەکارییەوە یان تێکچوونی کۆمەڵەوە، بشێوێنرێ و وەلا بنرێ، بەڵام بە خامۆشیش بێت هەر هەیە و دەکرێ لە دۆخی سازگاردا زیندوو بکرێتەوە.

دەبوو دەستووری سروشتەکی باس لە چۆنیەتی حوکومڕانی دروستیش بکات. چەندین ستۆیکیست لایەنی بیری *دەزگەی تێکەڵاو* یان گرت و هەڵبەتە دەشیان گوت ئەم بۆچوونە پێڕەوی دەستووری سروشتەکی دەکات. ئەفلاتۆن و ئەریستۆ باسیان لە سێ جۆر حوکومڕانی دەکرد: پاشایەتی، ئەریستۆکرات و دیمۆکراتی. هەر زووش دەرکەوت کە باشترین شێوە تێکەڵاوێکی هەرسێکیانە. یەکێک لەوانەی لە هەمووان پتر دەمگەرمی ئەم بۆچوونە بوو پۆلیبیۆس Polybios ی مێژووناسی هاوکاتی پانیتیۆس بوو. ئەو پێی وابوو ڕۆما حوکومڕانییەکی لەو بابەتەی هەیە بۆیە دەستکەوتی سیاسیی وەها مەزنی وەدەست هێناوە. هەڵبەتە ئەم جۆرە دەربڕینە تەواو بە دڵی ڕۆمانییەکان بوو.

سیسێرۆ Cicero لە هەمووان پتر باوەشی بۆ ئەم فەلسەفەیە گرتەوە. لای سیسێرۆ ئەم فەلسەفەیە و بەتایبەتی فەلسەفەی دەوڵەت لای پەیڕەوانی ستۆیکیزم شێوازی خۆی گرت. سیسێرۆ وەک بیریارێکی سیاسی بۆ دنیای پاش خۆی بووە باشترین نموونەی نوێنەرەکیی ئایدیۆلۆگیی مەزنەدەوڵەت. لەبەر ئەوە و تەنانەت لەبەر ئەو دەسەڵاتە مەزنەی سیسێرۆ هەیبوو پێویست دەکات بایەخ بە شی کردنەوەیەکی نووسراوە سیاسییە سەرەکییەکانی ئەو بیریارە بدەین.

### ٣- سیسێرۆ

Murcus Tullius Cicero (١٠٦-٤٣ ی پێش زایین)، سیاسەتمەدارێکی مەزنی ئەو دوا سەردەمە ئاژاوڵەی کۆماری ڕۆمانی بوو. سیسێرۆ زیاتر وەک سیاسەتمەدارێکی بوێژ نەک کردە، ناوی دەرکرد. ئەگەرچی کردارەکانی بە کاری ڕاپا دادەنران بەڵام یەکڕەوییان تێدا بەدی دەکرێ. سەرسەختانە لەسەر حوکومڕانیی کۆنی دەکردەوە، لەبەر ئەوە دەشێ، لە سیاسەتی ڕۆمانی ئەو دەمەدا، بە کۆنەوار conservative دابنرێ.

سیسێرۆ نە توانی ئەو کۆمارە ڕزگار بکات نە بۆشی کرا ئەو گیان و نەریتە زیندوو بکاتەوە کە لە ڕۆما، سەد ساڵ بەر لە سەردەمی خۆی، باو بووە و خۆیشی لە نووسینەکانیدا بە نموونەی دانابوون. بەڵام گوتارەکانی، نامە و گوتوبێژەکانی نۆرەیەکی گرنگیان لە چەندین بواردا بینی و هەتا سەردەمی هاوچەرخیش هەر کاریگەر بوون. زۆر جار دەگوترێ سیسێرۆ وەک نووسەر و بیریارێک بەرهەمی ڕەسەنی خۆی نەبووە. ئەم گوتەیە تاڕادەیەک ڕاستە. یەکێک لەو خزمەتانەی سیسێرۆ ئەوەیە فەلسەفەی یۆنانی گواستەوە ڕۆما، ئاگادارانە هەوڵی دا لاسایی نووسەرە یۆنانییەکان بکاتەوە بەڵام بێ ئەوەی خۆی بەم یان بەو ڕێبازە فەلسەفییەوە ببەستێتەوە.

بیروڕای سیاسییانەی سیسێرۆ لە ستۆیکیزمەوە نێزیکە بەڵام لەو بوارەشدا ستۆیکیستەکان تاکە نموونە نەبوون بۆ ئەم. لە لایەن شێوازەوە هەوڵی دا لاسایی ئەفلاتون بکاتەوە و دیالۆگی بەکارهێنا.

ناوی بەرهەمە فەلسەفی - سیاسییە هەرە گرنگەکانیشی لە ناوی بەرهەمەکانی ئەفلاتون دەچێ: ***کۆمار*** *De republica*، ***قانوونەکان*** *De legibus*، ئەم بەرهەمانە چەندین ئاماژەیان تێدایە بۆ ئەفلاتون. ئاشکرایە کە سیسێرۆ دەیویست هاوشانێکی لاتینی بۆ دیالۆگە ئەفلاتونییەکان دروست بکات.

بەلام ئاخێوەرەکانی *کۆمار* و *قانوونەکان* ڕۆمانین و لە سەدەی دووەمی پێش زاییندا گوزەران دەکەن. کاتۆ Cato (پیرەکەیان)، ئەوە بوو کە ئارەزووی تێکدانی Karthago ی دەکرد و تەواو دلگەرمی پاراستنی نەریت بوو. سکیپیۆ Scipio (لاوەکەیان) و لێلیوس Laelius برادەری پۆلیبیۆسی مێژووناس بوون و هەلسوکەوتی سیاسییان ڕێک لەگەل ئەوەی سیسێرۆ بە ڕاست و دروستی دەزانی، دەگونجا. ئەوان پشتگری زەویداری ئەریستۆکرات بوون و بەوەش دەبوونە لایەنگری سێنات Senat و یەکەم بەرهەلستی بیراز (ڕیفۆرم) ی زەوی بوون، کە لە سالانی ١٣٠ ی پێش زاییندا لە لایەن Tiberius Gracchus ەوە دانرا.

Tiberius Gracchus و پاش ئەویش Gajus ی برای، دژی چڕ بوونەوەی زەویداری - زەوی فرەوان لە چەند دەستێکی کەمدا - بوون و هەولیان دا زەوییەکی بەرفرەوانی دەولەت بەسەر جووتیاری ئازاددا دابەش بکەن، ئەو زەوییانە تا ئەو کاتە دەکرانە خەلاتی فەرماندە سەرکەوتووەکانی جەنگ. هۆی ئەم ڕیفۆرمەش، بە لای ئەم دوو برایەوە، دوولا بوو، لە لایەک زەویداریی مەزن کاریگەر نییە و لە لایەکی دیکەش ئەگەر ئەو زەوییە تەنیا مالی گەورەپیاوان بێت و کۆیلە کاری تێدا بکات ئەوا بۆرەپیاوی ڕۆمانی هەستی بەرانبەر زەویی نیشتمان نەدەما. ئەم بارەش ئەنجامەکەی هەر کاول بوونە. بەلام سکیپیۆی لاو و لێلیوس و خەلکی دیکەش بەگەرمی لەسەر مافە ئەریستۆکراتییەکانیان دەکردەوە و سەریش کەوتن.

بەلام بیروڕاکانی برایانی Gracchus هەر زیندوو بوون و هەتا زەمانی سیسێرۆش پەرەسێن بوون. سیسێرۆ دژیان دەوەستا و مەترسیی ئەو ڕەوتەی وەها دەهاتە بەرچاو: ڕۆما بۆ پەیدا کردنی خۆراک زیاتر و زیاتر ناچاری کۆلۆنییەکانی خۆی دەبوو و دێهاتی ئیتالیا دادەدۆشران. نەداران لە ڕۆمادا کۆدەبوونەوە و دەبوونە مەترسی لەسەر ئەو سیستەمەی سیسێرۆ دەیویست بیپارێزێ. لەگەل ئەوەشدا سیسێرۆ دلنیابوو لەوەی ئەگەر ئەو گیانە سیاسییە کۆنە زیندوو بکرێتەوە ئەوا هەموو کێشەیەکی کۆمەلایەتی چارەسەر دەکرا.

سیسێرۆ لە شامەسەلە سیاسییەکاندا، کە جێی ناکۆکی بوون، خۆی بە میراتگری ئەو کەسانە دەزانی کە لە دیالۆگەکانی خۆیدا کردبوونی بە بێژەر، ناحەقیشی نەبوو. ناوەڕۆکی فەلسەفی دیالۆگەکان بەرهەمی سیسێرۆ خۆی بوون. زۆربەی ئەوەی کرابووە گوتەی سکیپیۆ و لێلیوس و کاتۆ لە خۆیان نامۆ و نەناسراو بووە. سیسێرۆش لەم خالە ئاگادار بووە. کێشەی وەک ئەوەی لە نێوان ئەفلاتۆن و سۆکراتدا هەبووە، لێرەدا بەرچاو ناکەوێت.

**٤- فەلسەفە و سیاسەت**

سیسێرۆ زۆر بە نەرمی هەوڵ دەدات پێشانی بدات کە مرۆڤی ژیر – واتە فەیلەسووف – دەبێ خۆی بە سیاسەتەوە خەریک بکات. لەبەر ئەوە دژی ئەو بۆچوونانە دەوەستا کە سیاسەتیان بە کارێکی بێنرخ دەزانی. ڕاستە ئەوەی خۆی بە کاروباری دەوڵەتەوە خەریک بکات تووشی مەترسیی گەورە دەبێ و زۆر جاریش بە چاکە بۆی ناژمێردرێ، بەڵام هێشتا لایەنە باشەکانی پترە. بەر لە هەر شتێک، کار کردن لە سیاسەتدا *ئەرکی سەر شانی* مرۆڤی ژیرە. لێلیوس لە *کۆمار* دا دەڵێ ئەو زانیارەی لە خزمەتی دەوڵەتدا بەکارە، یەکەم کاری ژیرییە. بەڵام ئەو زانیارە نابێ هەر مات بێت، دەبێ لە چالاکی سیاسیدا خۆی بنوێنێ.

سیسێرۆ ئەو مەسەلەیە ئاوها باس دەکات: مرۆڤ ناشێ تەنیا *پاکژ* بێت دەبێ *پاکژیش بخاتە کار*. بۆ ئەوەی لە دەربڕینەکەی سیسێرۆ بەهەڵەدا نەچین دەبێ بزانین کە «پاکژی» لێرەدا ئەو واتا ساکارەی نییە کە ئەمڕۆ باوە، پاکژی لەوێدا ئەوەیە لە زانستی مەزن، زانستی سروشت بگەیت – کە مرۆڤیش بەشێکە لەو سروشتە – لەو ڕێیەشەوە زانستی دەستووری هەڵسوکەوتی مرۆڤ، چاکە و خراپە، وەدەست دێنێت.

لە ستۆیکیزمدا هەڵسوکەوت نەدەبووە نیشانەی پاکژی، دەشێ کەسێک، بێ ئەوەی پاکژ بێت بەرهەمی باش و بەسوودی هەبێت. بەڵام ئەوەی پاکژ بێت – واتە ژیر بێت – شەپرێوانە کار ناکات و لەبەر ئەوەش مرۆڤی ژیر، لە سیاسەتدا، لە نرخاندن نایەت.

جگە لەوە سیسێرۆ پێی وایە بنەما فەلسەفییەکانی چاکە و خراپە لە لایەن ئەو کەسانەوە *دۆزراونەتەوە* کە دەستوور بۆ دەوڵەتان دادەنێن. کەواتە لە ڕێوڕەسمی سیاسی و قانوونیدا، دەروازەی ژیری ئاشکرا و ئاواڵەیە. دەنا ڕاستی ناسین لە کوێوە دێ؟ بەڵام پیاو تەنیا بەوەی پێڕەوی قانوون بکات، نابێتە مرۆڤێکی ژیر، نموونەش لە شاگردێکی ئەفلاتونەوە دێنێتەوە کە دەڵێ ئەوە ئەرکی فەیلەسووفانە وەها لە خەڵک بکەن بە ڕەزامەندیی خۆیان ملکەچی قانوون بن، واتە خەڵک تێبگەیەنن ئەوەی قانوون دەیڵێ کارێکی ژیرانەیە.

ئەمەش مەسەلەیەکی نیسبی نییە، مەبەستیش لێرەدا ئەوە نییە هەموو دەستوورێکی هەموو دەوڵەتێک هەمیشە دروستن، نەخێر سیسێرۆ وەها ناڵێت. دەستوورەکان نابێ دژی سروشت بن.

کە وەهاش بوو لە گوتەی بێسەروبەر نێزیک دەبینەوە: خەڵک دەبێ فێری ئەوە بن قانوون بەرهەمگەلێکی ژیرانەن (واتە دەستوورگەلێکن لەگەڵ سروشتدا دەگونجێن). بۆ

ئەوەی لەم بێسەروبەرییە ڕزگار بین دەبێ ڕوونی بکەینەوە کە کاری ژیرانە چییە یان بابڵێین فەرمانی سروشت چییە.

لێرەدا نابێ چاوەڕێی وەرامێک بین لە چەشنی پەیمانی مافی مرۆڤ کە لەم زەمانەدا باسی لێ دەکرێ، ئەگەرچی ئەو پەیمانە پێوەندییەکی فیکریی دوورەدەستی هەیە لەگەڵ ئەوەی لە ڕامانی دێریندا پێی دەگوترا دەستووری سروشتەکی. ناکرێ دەستووری سروشتەکی لە شێوەی تێکستی قانوونیی ئەم سەردەمەدا دابڕێژرێ.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە ڕۆما، چەمکی دەستووری سروشتەکی ناوەڕۆکێکی کۆنکرێتی وەرگرت و مایەوە بۆ سیسێرۆ و بۆ پاش نەمانی خۆی و وردوخاش بوونی ئەو سیستەمەی خەباتی بۆ کرد، بۆ ئەو دەستوورناسانە مایەوە کە چەندین سەدەی پاش سیسێرۆ، لە زەمانی قەیسەرەکاندا کاریان دەکرد.

لە سەرەتادا ڕۆما شارەدەوڵەتێک بوو دەشیا بەراورد بکرێ بە شارەدەوڵەتەکانی یۆنان. دەستووری تایبەتی خۆی هەبوو، دەستوورێکی وەها کە بۆ ناڕۆمانی دەست نەدات و لە دەستووری دەوڵەتی دیکە نەدەچوو. بەڵام بە فرەوان بوونی دەوڵەتی ڕۆما خەڵکێکی ناڕۆمانی زۆر کەوتنە ژێر فەرمانی دەسەڵاتداریتی ڕۆمانییەوە. مافە ڕۆمانییەکان ئەمانی نەگرتەوە. جۆرە مافێکی دیکە بۆ گەلانی دیکە هاتە کایەوە و پێی دەگوترا: ***مافی گەلان*** *jus gentium*. ئەو مافی گەلانە، لە ئاستێکی ئەبستراکتدا، بوو بەوەی کە مافی گەل و دەوڵەتی هەمەجۆر کۆدەکاتەوە. واتە مافی گەلان بوو بە دەربڕینێک لە هەست کردن بە ماف یان مافهۆشیاریی هاوبەشی هەموو گەلان.

لەبەر ئەوە کارێکی سەیر نەبوو مافی سروشتەکی بە مافی گەلان بێتە ناسین. بەڵام ئەم پێناسینە کارێکی بێگرێ نەبوو، چونکە بیری مافی سروشتەکی پێوەند بوو بە چەند بنەمایەکی فەلسەفی سەر بە مرۆڤ. لە سەردەمی قەیسەریدا، قانووننناسی وەها هەبوون ئەم دوو لایەنەیان تەواو لە یەک جودا دەکردەوە و پێیان وابوو مافی سروشتەکی و مافی گەلان لە چەند بوارێکدا دژ بە یەکن. بە پێی مافی سروشتەکی هەموو خەڵک وەک یەک بوون. کەواتە کەس بە کۆیلەیەتی نازێت بەڵام بەپێی مافی گەلان دەشیا مرۆڤ بە کۆیلەیەتی بزێت.

بەلای سیسێرۆوە مافی گەلان بەڵگەیەکی توندە بۆ ئەو بیرەی دەڵێ هەموو کەسێک وەک یەک هەست بە ماف دەکەن. سیسێرۆ دەڵێ سروشت وەهای دروست کردووین. لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێ زۆر جار ئەم هۆشیارییە دەشێوێنرێ و تێک دەدرێ. تەنیا هەرە ژیرەکانن بە تەواوی دەزانن ماف چییە. ماف بەرهەمی نەریت نییە بەڵکوو ڕەسەن و هەمیشەکییە.

### ٥- چاکترین دەوڵەت

دەبێ بزانین سیسێرۆ چۆن ئەو بیرە گشتییەی خۆی دەربارەی ماف دەکاتە بیرێکی سیاسیی کۆنکرێت. نموونەدەوڵەتی سیسێرۆ وەک ئەوەی ئەفلاتۆن ئوتۆپی نەبوو بەڵکوو بە ماتی لە حوکومڕانیی ڕۆمانیدا هەبووە، چاکترە بڵێین هەر ئەو حوکومڕانییە ڕۆمانییە بووە کە هێشتا نە تێکدرابوو و نە شێوێندرابوو.

لە *کۆمار* دا سیسێرۆ باس لە چاکە و خراپەی حوکومڕانیی جیاواز دەکات. هەر هەموویان دیوی دزێویان هەیە: لە پاشایەتیدا دەسەڵاتی بۆرەپیاوان یەکجار کەمە، لە ئەریستۆکراتیدا خەڵک ئازادی نییە، لە دیمۆکراتیدا جیاوازییەکی گونجاو لە نێوان بەرز و نزمدا نییە. هەر هەمووشیان لایەنی باشیان هەیە: پاشایەتی، لە ناو خەڵکدا هەستی هاوکۆیی پتەو دەکات، پاشا بۆ گەل لە جێی باوکە. لە ئەریستۆکراتیدا هەرە باش و هەرە ژیر بەسەر ئەوانەی کەمتر باشن و کەمتر ژیرن حوکومڕانی دەکەن. دیمۆکراتی ئازادی بە خەڵک دەبەخشێ، چونکە ئەگەر هەموو ئازاد نەبن ئازادی بوونی نابێ.

لەوانەیە وەها ڕانوێنێ کە سیسێرۆ لەم باسەیدا لەگەڵ بیروڕای خۆیدا ڕاستگۆ نەبێت. سیسێرۆ بەر لە هەر شتێک بڕوای بە ئەریستۆکراتی هەیە. ڕاستە خۆی ئەریستۆکراتێکی ڕەسەن یان *بەگزادە* نەبوو، بەگزادان ئەوانە بوون کە خزمێکی سەردارییان هەبوو. ئەم لەبەر ئەوەی لە توێژی سواران بوو – کە زۆربەیان مرۆڤی فرەدەوڵەمەند بوون بەڵام لە باوانێکی پلە بەرز نەبوون- لە سیاسەتدا *نوێ پیاو* *homo novus* بوو. جگە لەوەش سیسێرۆ لە ئاست ئەو مەیلی ڕمانەی ناو ئەریستۆکراتی دروست چاوکراوە بوو. لە لایەکەوە پێی وابوو مەسەلەیەکی بەڵگەنەویستە کە دامەزراندن و ڕمانی حوکومڕانی بەدەستەیەک لە «هەرەباشەکان» واتە ئەریستۆکراتەکان دەکرێ. لە لایەکی دیکەوشەوە، لە *کۆمار*دا، نایشارێتەوە کە حوکومڕانیی گەلی چەند دەدرزاند، بۆ ئەوەش سوود لە *کۆمار* ی ئەفلاتۆن وەردەگرێ، لەوێدا هاتووە کە لە دیمۆکراتیی تەواودا دەبێ ئازادی بدرێتە گیانەوەر و کۆیلەش. سیسێرۆ لە جێگەی دیکەدا هەڵوێستی خۆی بە وشەی خۆی دەردەبڕێ: لە ڕۆمادا هەردەم دوو لایەنی دژ بەیەک هەبووە، دیمۆکرات و ئەریستۆکرات. دیمۆکراتەکان ئەوانە بوون بە گوتار و ڕەوتار هەوڵی چاکەی کۆیان دەدا، ئەریستۆکرات هەڵوێستیان وا بوو دڵی هەموو پیاوێکی ڕێزدار ڕابکێشن.

وردبوونەوەی سیسێرۆ لە لایەنی چاکە و خراپەی ئەو سێ حوکومڕانییە بۆ ئەوە بووە کە، لەسەر ڕێبازی پۆلیبیۆس، بیسەلمێنێ کە حوکومڕانی تێکەڵاو باشترین شێوەیە و حوکومڕانی ڕۆما وەهایە – یان سیسێرۆ گوتەنی وەها بووە و دەشکرێ دیسان ئەو جۆرە

حوکومڕانییەی تێدا زیندوو بکرێتەوە. کەواتە دەشێ ڕۆما پاشایەتی، ئەریستۆکراتی و دیمۆکراتی بکات بە یەک. ئەمەش نیمچە ڕاستە. پاشایەتی لەمێژ بوو نەمابوو، پۆلیبیوس و سیسێرۆ دەڵێن گوایە ئەو دوو سەردارە - کە بەرزترین کارمەندی دەوڵەت بوون - جێگەی پاشا دەگرنەوە. بەڵام سەردارەکان - کە بۆ ماوەی ساڵێک هەڵدەبژێردران - بۆ گەل لە جێی باوک نەبوون، خەسڵەتێکی پاشایەتی ئەو بوو پاشا جێی باوک بگرێتەوە. ***سێنات*** *Senat* ئەنجومەنی ئەریستۆکرات بوو، تەنیا جێگەی پیاوی خانەدان و سامانداری تێدا دەبۆوە. کاری ئەم ئەنجومەنە لە سەرەتادا تەنێ ئامۆژگارانە بوو بەڵام بە کردەوە تەواو کاری لە، بۆ نموونە، سیاسەتی ئابووری و دەرەوە دەکرد. ڕاستە ئەنجومەنی گەل زیاتر بیروڕای گەلی دەردەبڕی بەڵام ڕێبەرە هەرە بەرچاوەکانی ئەو ئەنجومەنە، گەلێ جار، مەزنزادە بوون لە نموونەی برایانی Gracchus.

بیری حوکومڕانیی تێکەڵاو، بێگومان، دەبێ لە پاشخانی ئەو دۆخەوە سەیر بکرێ کە ڕۆما خاوەن شێوازێکی قالبگرتووی توندی وەها نەبوو کە لەم سەردەمانەدا باوە. ڕۆما بەرهەمی نەرێت بوو، نەرێتەکەش یەکڕەنگ و بێ ناکۆکی نەبوو. ئەم حوکومڕانییە لە ڕاستیدا چۆن کاری دەکرد، تەواو ڕوون نەبوو، تەنانەت لە زەمانی چالاکی سیسێرۆشدا جیاکردنەوەی بواری کارامەییی ئەنجومەنی گەل و سێنات دژوار بوو. دەکرا بە هاوئاهەنگی هاوکاریی یەکتر بکەن، سیسێرۆ پێی وابوو کە، پێش ئەوەی ئەنجومەنی گەل تەمای دەسەلاتی گەورەبێ و دووبەرەکی پەرە بستێنێ، ئەو هاوکارییە هەبوو. بەڵام سیسێرۆش وەک هاوکاتەکانی دیکەی بە پێویستی نەدەزانی بە ڕوونی باس لە چۆنیەتی کارکردنی حوکومڕانیی تێکەڵاو بکات.

هەیە گوتوویەتی حوکومڕانیی کۆمارەکی تەنیا بۆ شارەدەوڵەتی ڕۆما دەستی دەدا بەڵام ناچار بوو بچێتە ژێر باری گرانی ئیمپەراتۆرییەتەوە. بەهەرحاڵ ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کۆمارەکە ناچار بوو ململانێ لەگەڵ کێشەی مەزن و لەوزەبەدەر بکات. بۆ ئەوەی سێنات بتوانێ نۆرەی سەرەکی خۆی بپارێزێ دەبوایە سیاسەتمەداری ئەریستۆکرات کاری بەهێز و یەکگرتوویان بکردایە. مەرجێکی دیکەش ئەوەبوو کە دەبا ئەم دەستەیە، تاڕادەیەک بچووکە، بەسەر کاری یەکجار جۆراوجۆردا زاڵ بن و هەر یەکێک لەوان بتوانێ کارمەندییەتی بەرزی هەمەجۆر بگرێتە دەست. سیاسەت کارێک نەبوو، وەک ئەفلاتون بۆی چووبوو، تەنیا بۆ شارەزایان بێ. سیسێرۆ - لە ڕوانگەیەکی ئاشکرا بەڵام نەسەلمێنراووە - دەیگوت کە ئەریستۆکرات لە هەمووان ژیرتر و زاناتر و لێهاتووترن.

سیسێرۆ باری سیاسی ڕاستەوخۆ بە گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتییەوە نەبەستەوە. بە

مەبەستی روون کردنەوەی خەتوخاڵە سەرەکییەکانی حوکومڕانیی ڕۆمانی، مێژوونامەیەکی دووورودرێژ بە Scipio دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە ڕۆما لە «ڕێگەی سروشت» ـەوە بەو بەرزییە گەیشتووە. لەو باسەدا دەڵێ یەکێک لە پاشا ئەفسانەکردە یەکەمەکان ڕێبازی دەسەڵاتی گەلی بۆ هەتاهەتایە نەخشاندووە و پێشانی داوە کە دەسەڵاتی هەرەمەزن نادرێتە دەست ئاپۆرەی خەڵک. بەگشتیش سیسێرۆ بەردەوام باس لە هەمان یەکە، هەمان نەتەوە دەکات - بێ گوێدان بەوەی چۆن ئەم یەکەیە گۆڕانی بەسەردا دێت و فرەوان دەبێت. ڕامانی ستۆیکیزمانەی سیسێرۆ دەربارەی وێکچوونی هەموو خەڵک ئەو هەستە بەهێزەی بۆ گرنگێتی گەل و نەتەوە خامۆش نەدەکرد. گەل خڕبوونەوەیەکی هەرەمەکی خەڵک نییە بەڵکوو ئەنجامی ڕێککەوتنە لەسەر ئەوەی چاکە چییە و بەرژەوەندی گشتی چییە. یەکەم هۆی یەککگرتنیان لاوازیی تاکەکەس نییە بەڵکوو ئەو گیانە کۆمەڵایەتییەیە کە سروشت لە مرۆڤدا چاندوویەتی.

گەلی ڕۆمانی، لای سیسێرۆ، دەبێ بە دوو بەشەوە: ئەریستۆکرات و ئاپۆرەی خەڵک (سەردارەکان کە گوایە دەسەڵاتی پاشایەتییان هەیە پاش تەواو بوونی ماوەی سەردارەتییان لە سێناتی ئەریستۆکراتدا دەتوێنەوە). ئەم دوو بەشەش لای سیسێرۆ تاڕادەیەک نەگۆڕن. وەسف کردنی ڕشتەیەکی سیاسی بەوە دەبێ کە پێوەندیی ئەریستۆکرات و ئاپۆرەی خەڵک لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیدا ڕوون بکرێتەوە، بەلام لە مێژووی ڕۆمادا، چ ئەریستۆکرات و چ گەل زاراوەیەک بوون زووزوو واتایان دەگۆڕا.

ئەو ئەریستۆکراتانەی، لە دەمی سیسێرۆدا، ئەندامی سێنات بوون، بەشێکی کەمیان لەو بەگزادە ڕۆمانیانە Patrician بوون کە هەر لە سەرەتاوە توێژی ئەریستۆکراتیان پێک دەهێنا. گۆڕانی پێکهاتی گەلی نائەریستۆکراتیش لە گۆڕانی ناو ئەریستۆکراتان زیاتر بوو. لە ڕۆمای کۆندا بەشی هەرە زۆریان جۆتیار بوون، بەلام زۆربەی جۆتیاران، وەک باسمان کرد، دەرفەتی مانەوەیان نەما. سیسێرۆ لە هەڵوێستی سیاسیدا پشتگری ئەم ڕەوتەی دەکرد بەوەی دژی ڕیفۆرمی زەوی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا بەرگری لەوە دەکرد کە جۆتکاران ناوەڕۆکی پاکی گەلن. لە گوتەیەکی بەناوبانگدا دەڵێ جگە لە ئەریستۆکراتی دروست تەنیا جۆتکارانن، ئەوان شەرافەتمەند و بەڕێزن. ماسیفرۆش، چێشتلێنەر، گومرگستێن - وردەکاسب بە گشتی - بە فرتوفێڵ دەژین. تەنانەت بازرگانی گەورەش تەواو ڕێزدار نین.

لەبەر ئەوە سەیر نییە ڕامانی سیسێرۆ لە ئاست گەل و کاریگەرییەتی گونجاوی گەل لە سیاسەتدا باش نەگونجێ لەگەڵ بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی ڕاستەکیی ئەو دەمەی

ڕۆمادا. لە ڕۆما گەل تەواو هەمەجۆر بوو. لە نێو گەلدا هەبوو فرە دەوڵەمەند، ڕاستە تاوی سیاسیی ڕاستەوخۆی ئەو دەوڵەمەندانە کەم بوو بەڵام لە ڕێی هێزی ئابوورییانەوە دەیانتوانی ناڕاستەوخۆ، وەک قەرزبەخش و مەسرەفکێش کاریگەر بن. لە نێو گەلدا بێسامانی گەورەشاریش زۆر بوون، ئەوانە ڕایەکی گشتیی وەهایان پێک دەهێنا بێسەنگ نەبوو بەڵام یەکجار خۆشجڵەو و ڕووگۆڕ بوو.

لە گەمەی سیاسیدا، لە زەمانی سیسێرۆدا، «ڕاکێشانی دڵی گەل» دژی سێنات و ئەریستۆکراتەکان بووە ئامانجی چەندین دەسەڵاتخواز. مەبەستی سەرەکی ئەم دەسەڵاتخوازانەش ئەوە نەبوو بەرژەوەندی خەڵکی هەژار بپارێزن بەڵکوو خەڵەتاندنی ئەو خەڵکە بوو بە ئاهەنگی چەور و تەمسیل و زمانلووسی. لە هەمووشیان سەرکەتووتر، لەم بوارەدا، Caesar بوو کە بەرهەڵستێکی سیاسیی فرەتوانی سیسێرۆ بوو. Caesar ی ئەریستۆکرات ئەو ڕێزە بەرزەی لە دامودەزگەی سیاسی نەرێتەکی نەدەگرت کە سیسێرۆی کەمتر ئەریستۆکرات دەیگرت و تاڕادەیەک خۆی، بەرانبەر سێنات، بە ڕۆڵەی گەل دادەنا. لە زەمانی ئەودا بناخەی پتەوی ئەو پێوەندییانە دارێژران کە پاشان لە سەردەمی قەیسەریدا جێگیر بوون: دیکتاتۆرێکی تاکفەرمان لوتکەی دەسەڵات دەگرێ و لە ژێر ئەویشدا دەستەی سنگدەرپەڕیوو و تاڕادەیەک بێدەسەڵاتی ئەریستۆکرات دادەنیشێ و لە بنەوەش ئاپۆرەی خەڵک کە بە «نان و تەمسیل» کپ دەبن.

سیسێرۆ خەباتێکی ناکامی دژ بەم ڕەوتە کرد. سەیر نییە سیسێرۆ ڕک و ترسی لەو گەلە هەبێ کە بەڕاستی هەبوون و چووبوونە ژێر فەرمانی بەرهەڵستانی سێناتەوە. ئەو گەلەی ئەم لە بەرهەمە ئایدیۆلۆگی و فەلسەفییەکانیدا باسیان لێ دەکات ئەوپەڕی بوونیان لە ڕۆمای دێرزەماندا بووە، ئەو باس لە گەلی پایتەختی ئەو زلهێزە پەرەسەندووە ناکات.

لەوانەیە وەها ڕانوێنێ کە سەرلەبەری بەرهەمی سیسێرۆی بیریاری سیاسی ئەوە بووبێ بە پاڵپشتیی چەمکی فەلسەفیی زادەی ژینگەی نامۆی یۆنانی، هەوڵێکی کەمبایەخی دابێ بۆ زیندوو کردنەوەی دامودەزگە و ئیدیالی سیاسیی ڕۆمای کەم گەشاوە لە ئیمپەراتۆرییەتێکی بەردەوام پەرەسەندوودا.

لە مێژووی بیری سیاسیدا، دالەنگیی نێوان ڕێنوێنی و هەڵکەوتی سیاسی پێوەندییەکی دەگمەن نییە. مرۆڤ نابێ چاوەڕێی ئەوە بێت ئایدیۆلۆگییەکی سیاسیی پەرەسەندوو لەگەڵ بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ناو خەڵک هاوئاهەنگ و کۆک بێ. پێویست ناکات ئایدیۆلۆگی ببێتە ئاوێنەیەکی ئەو دنیایەی تێدا هەڵکەوتووە، وەهاش نەبووە مەگەر دەگمەن. بەڵام بۆ ئەوەی شیاوی ئەوە بێ ناوی ئایدیۆلۆگیی سیاسی هەڵبگرێ دەبێ ببێتە

هۆکارێکی وەها حیسابی بۆ بکرێ، ببێتە هێزێک ڕێگە بۆ گۆڕان یان پاراستنی ئەو ژینگە سیاسییەی خۆش بکات کە تێیدا، کەم یان زۆر، پەرەی سەندووە.

گەر لە دیدەنێکی تەسکەوە بڕوانینە بەرهەمە سیاسییەکانی سیسێرۆ، وەها دێنە بەرچاو خوازنامەیەک بن لەو ناکۆکییەدا بەکارهێنرابن کە لە سەردەمەی سیسێرۆ خۆیدا، لە نێوان لایەنی سێناتی کۆنەوار و دەسەڵاتدارە تازەکانی وەک Caesar دا هەڵگیرسا. بەو پێیەش بێت ئەوا ئەو بەرهەمانە هەموو تاوێکی سیاسیی ڕاستەوخۆیان بەوە دۆڕاند کە حوکومڕانیی کۆمارەتی ڕما. بەڵام لە ڕوانگەیەکی دیکە و بەرینترەوە لێیان بنۆڕی ئەوا ئەم بەرهەمانە هەتا ماوەیەکی درێژخایەن نرخی خۆیان پاراست.

ڕاستە بەرنامەی سیاسیی کۆنکرێتی سیسێرۆ بریتی بوو لە زیندوو کردنەوەی بارودۆخی کۆنە شارەدەوڵەتی ڕۆما، بەڵام لە هەمان کاتیشدا سیسێرۆ پارێزەرێکی دڵگەرمی بیری مەزنەدەوڵەت بوو. دەتوانین بڵێین سیسێرۆ پێی وا بووە دەوڵەتی گەورە و ئاڵۆز دەشێ بە مێتۆدی شارەدەوڵەتی نموونەکیی خۆی، حوکومڕانی بکرێت. مەزنەدەوڵەتی ڕۆما هەر ما، دەزگە سیاسییەکانی شارەدەوڵەت وەک بەرگی بێگیان مانەوە. سیسێرۆ لە لایەک باشی بۆ چووبوو لە لایەک چەوت.

وەک ئایدیۆلۆگیستێکی مەزنەدەوڵەت، سیسێرۆ پێی وا بوو گەلی وەها هەیە، بۆ حوکومڕانی و فەرمانداریەتی، باشتر دەست دەدەن وەک لە گەلی دیکە. پێوەندیی نێوان نەتەوەی بەهێز و لاواز وەک پێوەندیی نێوان ئەریستۆکراتی ژیر و ئاپۆرەی کەمتر ژیر وایە. دەستووری سروشت باڵی بەسەر گەلانیشدا کێشاوە: «لە خۆشبەختیی لاوازان، سروشت سەروەریی داوە بە هەموو شتێکی هەرەباش» کەواتە سروشتە ڕۆمای کردۆتە سەروەری گەلانی دیکە. سیسێرۆ نکوولی لەوە دەکات ئەم بارە سەخت و ستەمکارانە بێت. کارێکی باش نییە ئەگەر گەلێک، لە ترسان، مل بۆ سەروەریی ڕۆما کەچ بکات، دەبێ لە جیاتی ترس تێبگەن کە ئەو ملکەچییە لە بەرژەوەندی خۆیانە – ڕۆمانییەکان بێ ئەملاوئەولا باشترن و ژیرترن و دەزانن بەرژەوەندی گەلانی دیکە چییە. هۆی ئەمەش لە نەریتی حوکومڕانیی ڕۆمادایە.

ئەم بۆچوونانەی سیسێرۆ ڕەسەن نین چونکە پێش هەمووان لە لایەن پۆلیبیۆس – دوە بنیات نراون. بەڵام داڕشتنەکانی سیسێرۆ بۆ دنیای پاش خۆی بوونە بەرهەمێکی پایەدار. لە هیچە نییە پاش نزیکەی پێنج سەد ساڵ، ئۆگوستینوسی گەورەپیاوی کڵێسە، بۆ دروستاندنی ڕەوایەتی ئیمپەراتۆرییەتی ڕۆمانی، گوتەکانی سیسێرۆ بەکار دێنێ و تەنانەت بە مەبەستی سەلماندنی ئەوەی ڕشتەی کۆیلەیەتی ڕەزامەندیی خودای لە سەرە،

نموونە تەنیا لە گوتەکانی سیسێرۆ دەهێنینەوە. بەلای سیسێرۆوە کۆیلەیەتی، لە ڕووی سیاسی و دادپرسییەوە هیچ خەوشدار نەبوو، بنجی دروستاندی ئەم ڕشتەیەش لەوەوە دەهات کە ئادەمیزادی وەها هەیە تەنیا لە ڕێگەی ملکەچ بوون بۆ ئارەزووی خەڵکی دیکە دەتوانن نۆرەیەکی گونجاوی کۆمەلایەتی ببینن.

گوتەکانی سیسێرۆ دەربارەی بەرزیی حوکومڕانیی تێکەڵ و وێکچوونی ناوەکیی ئادەمیزادان و مافهۆشیاریی هاوکۆ، تینی پێوەربەخشانەی خۆیان پاراست. ئاسان نییە ئایدیۆلۆگیستێکی سیاسیی دیکە بدۆزیتەوە توانیبێتی لە سیسێرۆ باشتر نوێنەرایەتی دوو دیاردەی باوی مێژووی بیری سیاسی کردبێ: یەکەم ئەوەیە ئایدیۆلۆگی بۆ ئەوەی کاریگەر بێ، مەرج نییە بیروڕای ڕەسەن و نوێی تێدابێ. دیاردەی دووەمیش ئەوەیە ئایدیۆلۆگی، تا ماوەیەکی درێژخایەنیش پاش نەمانی دەرفەتی خستنەکاری ئەو بیروڕایە، تاوی خۆی هەر بپارێزێ. بیروڕای سیاسی جیرپیەکی تێدایە دەبێتە هۆی ئەوەی بتوانێت لە ژینگەی جۆراوجۆری کۆمەلایەتی و سیاسیدا درێژە بە ژیانی خۆی بدات. یان دەتوانین بڵێین بەشێکی زۆری بیروڕا سیاسییە گرنگەکان هێندە گشتگرانەن دەتوانن خۆ لەگەڵ حوکومڕانیی تەواو جیاوازدا بگونجێنن. گریمانەی وەک ئەوەی دەڵێ خەڵک لە ڕووی سروشتەوە وێکچوون، دەکرێ نێزیکەی دوو هەزار ساڵ پاش سیسێرۆ لە خەباتی دژ بە بەردەوامبوونی کۆمەڵگەی ئیمتیازدار بەکار بهێنرێ. بەلام بەلای سیسێرۆوە، ئەم بیرە تەنیا لەگەڵ حوکومڕانییەکی نەریتەکی ڕۆمانیدا دەگونجێ، لە دەمی حوکومڕانی قەیسەریدا، بیری وێکچوونی ناوەکیی مرۆڤ وەهای کرد کە بەناچاری گوتەی قەیسەر ببێتە قانوون. خودی بیری وێکچوونی مرۆڤ نەگۆڕ بوو. بەلام دەکرا ئەم بیرە وەها ساز بکرێت بۆ پاراستنی لە شیرازەی دەسەلاتی هەمەجۆر دەست بدات. کەواتە ناوەڕۆکی ئەم بیرە تەنیا ئەو کاتە دەهاتە گۆڕان کە دەخرایە خزمەتی دەسەلاتی جۆراوجۆر، لەگەڵ ئەوەشدا وا چاکە هێزی دنەدەری ئەم بیرە بەکەم دانەنرێ.

**١- داهێزان و کەوتنی ڕۆما**

لە سەردەمی قەیسەرێتی ڕۆمانیدا، بۆ پتەو کردنی هەستی یەکیەتی لە ئیمپەراتورییەتە هەمەڕەگ و پڕ لە ناکۆکییەکەدا، دوو بۆچوون سەپێندران: قەیسەر خواوەندە و دەبێ بپەرسترێ. ڕۆما مانەوارە، هەتاهەتایە هەر دەمێنێ.

نەخێر ڕۆما هەمیشەکی نەبوو، بەلام بە درێژایی سەدان سالی دەسەلات و بەرزی وەهای دەنواند. وێڕای هەرا و ناکۆکیی ناوەکی و بەزمی بێبڕانەوەی سەر سنووران بەرانبەر دوژمنی دەرەکی، ئیمپەراتورییەتەکە هەر ما. قەیسەر و فەرمانڕەوایی قەیسەران جێگۆڕکێیان دەکرد، لەگەل ئەوەشدا حوکومڕانی قەیسەری هەر ما. دەسەلاتی ڕاستینەی ئەم یان ئەو قەیسەر بەرز و نزم دەبۆوە بەلام بە دیمانە و بۆچوونی گشتی قەیسەر هەر تاکە حاکم بوو.

ئولپیانۆس Ulpianos (سەدەی سێیەم)، بەناوبانگترین دەستوورناسی ڕۆمانی بوو و خۆشخۆش گوتەکانی دەکرانە ڕاگوێستە. ئولپیانوس دەیگوت ویستی قەیسەر دەستوورە.

لەو زەمانەدا، دیمانەی سیاسیی چالاک دەرفەتێکی یەکجار بەرتەسکی هەبوو. مەودای نێوان بۆچوون دەربارەی سروشتی ئادەمیزاد و هەلکەوتی سیاسی ئەوەندەی دیکە بەرفرەوانتر بوو. تەنانەت سیسێرۆ نیشانەی یەکسانی دەخستە نێوان دەولەتی ڕۆما، بەو جۆرەی دەبا ببێت، لە لایەک و کۆمەلگەی دروست و سروشتەکی، لە لایەکی دیکە. سێنەکا Seneca ی سیاسەتمەدار و نووسەری سەدەی پاش سیسێرۆ، دیتنی بەرانبەر دەولەت جیاواز بوو، ئەو پێی وا نەبوو دەولەت ئامرازێکە بۆ بلندبوونەوەی مرۆڤ بەلکوو ئامرازێکی زۆرسەپێنی پێویستە بۆ دابین کردنی، هەر نەبێ، نزمترین ئاستی گوزەرانی لەبار. لە دەولەتێکی وەهادا چالاکیی سیاسی نەدەبووە کارێکی بەرز و سەرنجڕاکێش. سێنەکا خەونی بە ژیانێکی ڕابوردووی سەرەتاییەوە دەبینی کە مرۆڤ تێیدا بە یەکیەتی و ئاشتی دەژیان، بەپێچەوانەی ئەم ژیانە نوێیە داڕزاوەی کە هیچ ڕێگەیەکی تێدا نییە لە دەولەتدا بە هاوئاهەنگی بگەیت. ڕاستە سێنەکا وەک ستۆیکیستێکی دروست پێی وابوو خۆتەرخان کردن بۆ کاری گشتی ئەرکی مرۆڤی ژیرە بەلام ئەو چالاکییەی ئەو مەبەستێتی چیدی ئەو بوارە ئاشکرایەی کارمەندی و سیاسەتە نییە. مرۆڤی ژیر دەبێ خەریکی ئەو پێوەندییانەی نێوان ئادەمیزاد بێت کە پتر سروشتێکی دینەکی و ئاکارەکییان هەیە نەک سیاسی.

سینەکا یەکێک بوو لەو بیریارە یەکەمانە، و لە هەمووان پتر کۆنەوارەی، کە لە ئاست سیاسەتدا نوێنەرایتی دیتنێکی ڕەشبینانەیان دەکرد، ئەو دیتنە لە سەدەکانی پاش ئەو دەمەدا برەوی پەیدا کرد.

لە سەدەکانی چوارەم و پێنجەمدا ئیمپەراتۆرییەتی ڕۆمانی ڕما. هۆکاری دەرەکی و ناوەکی دەستیان لەم ڕمانەدا هەبوو. دەوڵەتی ڕۆمانیی سەرەتا شتێکی وەهای لێ نەمایەوە: قەیسەرەکان بۆ سەپاندنی هێزی خۆیان جاشیان بە کرێ دەگرت، سەرلەبەری ئابووری دەوڵەت پێوەندی بەرماوەی ئەو بەرهەمە بوو کە لە هەرێمەکان زیاد دەبوو. گەلانی نەیار ورووژمیان دەهێنایە ئەم دیو سنووران و خێڵە سەرکوتکراوەکان ڕاپەڕین.

لە سەدەی چوارەمدا ڕۆمانستان کرا بە دوو پارچەوە: ڕۆمانی ڕۆژهەڵات و ڕۆمانی ڕۆژاوا. سەد ساڵی نەبرد، ڕۆمانی ڕۆژاوا، ڕووخا و بەر لەوەش ڕۆمای پایتەختی ئەو بەشە، ساڵی ٤١٠، لە لایەن Alarik ی شای گۆتی ڕۆژاواوە داگیر کرا. ئەم ڕووداوە، هەم لە مێژووی گشتیدا و هەم لە مێژووی بیری سیاسیشدا، ئەنجامی یەکلاکەرەوەی هەبوو.

## ٢- مەسیحایەتی و قەیسەر

مەسیحایەتی کاتێک هاتە ئیمپەراتۆرییەتی ڕۆمانییەوە یەکێک بوو لە چەند دینێک. پەیامگەلی سەر بە ژیری و ڕزگاریی ئادەمیزاد هەوڵی ڕاکێشانی لایەنگرانیان دەدا. مەسیحایەتی وردەوردە توانی پاشەکشە بەوانەی دیکە بکات. هۆیەکی ئەم سەرکەوتنەیشەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سازمانە دەرەکییە نایابەی هەیبوو.

تێڕوانینی مەسیحایەتی لە مێژوو، بە شێوەیەکی بنەڕەتی لەو تێڕوانینە باوانەی لە نێو نەریتی یۆنانی و ڕۆمانیدا هەبوون، جودا بوو. لە ناو یۆنانی و ڕۆمانیدا دیتنێکی تاڕادەیەک ستاتیکی هەبوو دەربارەی مێژوو. وەک باسمان کرد هەم ئەفلاتون و ئەریستۆ و هەم سیسێرۆش پێیان وابوو لە هەر دەمێکدا بێت دەوڵەتی نموونەیی دەشێت بێتە کایەوە.

مەسیحایەتی سەرچاوەی لە جوولەکایەتییەوە هەڵگرتووە. بە دیتنی جوولەکایەتی، مێژوو بەر لە هەر شتێک بریتییە لەو قۆناغە جۆراوجۆرانەی پێوەندیی نێوان خودا Jahveو گەلی هەڵبژاردەی خودا کە ئیسرائیلییەکانن. دەورانی مێژووکرد، شەڕ و ئاشتی، بەدبەختی و خۆشبەختی بەو پێوەندییە شی دەکرێنەوە. بەختی ئیسرائیلییەکان سوار بێت ئەوا لە ئاست خودادا سەلار بوون دەنا لاسار بوون. ڕووداوی هەرەمەزن -لە پێش هەمووشیانەوە پەیمانی نێوان خودا و گەلەکەی خۆی - یەکبارن، واتە بەندن بە دەمێکی تایبەتەوە و دووبارە نابنەوە.

لە نەریتی جوولەکایەتیدا بۆچوونێک دەربارەی مەسیح هەیە دەڵێ مەسیح ئیسرائیلییە دینگارەکان ڕزگار دەکات و دەوڵەتێکیان بۆ دادەمەزرێنێ بە ئاشتی و ئاسوودەکی تێیدا بژین. عیسا خۆی بە مەسیح دادەنێ. مەسیحییەکان دەڵێن عیسا مەسیح و ڕزگاریبەخشی نەک تەنیا ئیسرائیلییەکانە بەڵکوو هی هەموو دنیایە.

لە دیتنی جوولەکایەتی و لە ڕێی ئەویشەوە هی مەسیحایەتیش، مێژوو دەبێتە فراژووتنی یەکرەوت و یەکڕوو. پاش ئافراندن، گوناهکاریی مرۆڤ دێت، واتە ئەو گوناهەی مرۆڤ کردی بەرانبەر ئەو پەیمانانەی دابووی بە خودا. بەم گوناهکارییە مرۆڤ مافی مانەوەی لە بەهەشتدا لەدەست دا. کار و ڕەنج لە چارەی نووسرا. بەڵام خودا پەیمان لەگەڵ گەلی خۆی دەبەستێ و لەبەر ئەوەش مێژوویان – چ بۆ جوولەکە بێت و چ بۆ مەسیحییان – هەموو مێژوویەکی دیکە دەخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە و ئافراندنی تێدا ئاشکرا دەبێت. گوناهکاریی بەردەوامی ئیسرائیلییەکان بەرانبەر ئەو سزانەی داویانە بە خودا دەبێتە هۆی ئەوەی لە کۆتادا خودا لێیان پڕ دەبێ و ئەوان و هەر هەموو مرۆڤایەتیش لەگەڵ ئەواندا لەناو دەبات – تەنیا ئیمانداران ڕزگاریان دەبێت. کەواتە مێژوو، بە ناچاری، لە ئافراندنەوە بەرەو نەمان دەچێ – و پاشان ئافراندنێکی نوێ، بەهەشتێکی نوێ بۆ دینگاران هەڵدێ.

مەسیح لە دەمە هەرە درەنگەکاندا دەردەکەوێت، کاتێ خودا ئەوەی ئافراندوویەتی لە ناوی دەبات. لەبەر ئەوەش مەسیحییە بەراییەکان پێیان وابوو لەو دەمە هەرە درەنگانەدا دەژین. وا مەسیح هات و دنیای کۆن هەلاهەلا بوو. هەڵبەتە ئەم مەسیحییانە بە ئاستەم خەریکی مێژوویەکی داهاتوو دەبن – ئەویش ئەگەر هەبێ.

مەسیحایەتی نەیتوانی جوولەکایەتی بسڕێتەوە بەڵام لەناو گەلانی دیکەی ئیمپەراتۆرییەتی ڕۆمانیدا برەوی پتر بوو. مەسیحایەتی، لە دەمی بڵاوبوونەوەیدا خۆی دەگونجاند لەگەڵ بارودۆخی بەشە هەمە جۆرەکانی ئیمپەراتۆرییەتەکەدا، خەسڵەتی جوولەکایەتییەکەی تێکەڵ بە خەسڵەتی دیکە دەکرا.

بەڵام نە مەسیحی و نە جوولەکە ئەوەیان نەسەلماند قەیسەر وەک خوداوەندێک بپەرستن. بە دەیان ساڵ هەردوو لایان دووچاری ڕاونانی دژوار بوون. بۆچوونی باوی مەسیحییەکان ئەوە بوو قەیسەر و دەوڵەتی ڕۆمانی نوێنەری شەیتانن لەسەر زەوی و بە هەموو هێزیان دژایەتی پەیڕەوانی خودا دەکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا مەسیحییەکان هیچ خواستێکی وەهایان نەبوو ڕێڕەوێکی سیاسیی شۆڕشگێڕانە لە ئیمپەراتۆرییەتەکەدا بنیات بنێن. بەپێچەوانە. ئەوان پێیان وابوو خودا –

گەورەی هەموو دنیا – ئەم دەسەلاتدارییەشەی دروست کردوە. یەکێک لە دەقە کۆن و هەرە بە تینەکانی هەموو تەمەنی مەسیحایەتی ناوی *ڕۆماننامە* یە، لەوێدا پاولوسی موژدەگار apostle دەڵێ: «هیچ دەسەلاتێک نییە لە خوداوە نەبێت». کەواتە ئەو کەسەی لە فەرمانڕەوایەک هەڵگەڕێتەوە، لە خودا هەڵدەگەڕێتەوە. فەرمانڕەوایی بۆ ئەوەیە سزای ئەو کەسانە بدات لە قانوون دەردەچن. ئەوەی خراپەکاری بکات سزای ڕەوای خۆی وەردەگرێ، «چونکە بێمەبەست نییە فەرمانڕەوایی شمشێری گرتوتە دەست، بەڵکوو خزمەتکاری خودایە، تۆڵەستێنە». مرۆڤ دەبێ لە ئاست دەسەلاتدارییەتی دنیایەکیدا پاک بێت نەک تەنیا بۆ ئەوەی خۆی لە سزا لابدات بەڵکوو بۆ ئاسوودەیی ویژدانی خۆیشی.

لەبەر ئەوەشە هەر لە سەرەتای مەسیحایەتییەوە جێپێی دوو هەڵوێستی جیاواز لە ئاست دەسەلاتی دنیایەکی و سیاسیدا دەبینرێت. لە لایەک دەسەلات لە لایەن خوداوە هەڵنراوە و لەبەر ئەوە دەبێ لە هەموو سەروکارێکی دنیایەکیدا، خەلک گوێڕایەڵی بن. (ئەگەر بە ئاشکراش خراپەکار بوو، ئەوا یان سزایە یان تاقیکردنەوەی مەسیحیانە). لە لایەکی دیکەشەوە دەسەلات ئامرازێکی شەیتانە لە ململانێی دژ بە خودادا بەکاری دەهێنێت. لە (سفر الرؤیا *Revelation*) دا کە بەشێکی هەرە بەرچاوی ئینجیل (پەیمانی نوێ New Testament) ـە، هاتووە کە شاری بابل زلجندەیە ‹جندە: ژنی خراپ›. لەو دەمەدا زەحمەت نەبوو ڕۆما بە بابیل دابنرێ، ئەو زلجندەیە «بە خوێنی پیرۆزمەندان و خوێنی پەیڕەوانی یەسوع، مەستە» – ئەم وەسفەش لەگەڵ ڕەوتی ڕاونانی مەسیحییەکان لە لایەن ئیمپەراتۆرییەتی ڕۆمانییەوە، تەواو دەگونجا.

ئەم جووت هەڵوێستە لە ئاست دەسەلاتی دنیایەکیدا، سەدەوسەدە بە کوڵ مەسیحایەتییەوە بوو. بەلام لە سەدەی چوارەمدا گۆڕانێکی گرنگ ڕووی دا، مەسیحایەتی کرا بە دینی ڕەسمی دەوڵەتی ڕۆمانی. ڕۆما نەک هەر ڕێگەی دەدا بە بڕوای مەسیحایەتی بەڵکوو پشتگریشی دەکرد. دەشێ بڵێین ئەو مەسیحایەتییە خاوەن ڕێکخستنە – ئەگەرچی دەسەلاتێکی دەرەکی نەبوو – هێزێکی جێگیرتر بوو لە ئیمپەراتۆرییەتە ناڕێکخراوەکەدا. هەڵبەتە هەڵوێستی مەسیحییانیش لە ئاست دەوڵەتی ڕۆمانیدا دەبوو تەواو بگۆڕدرێت. ئێستا قەیسەر تەنیا نوێنەری ئەو دەسەلاتە نییە کە ڕەزامەندی خودای لەسەرە، بەڵکوو هاوسەنگەرێکی خەباتی کڵێسەشە. ئەو بۆچوونەی دەڵێ ڕۆما مانەوارە، لە نێو زۆر مەسیحییاندا پەسەند کرا. ڕۆمانستان جێگەیەکی گرنگی لە بواری ئافراندنی خودایەکیدا وەرگرت. لەبەر ئەوە کارێکی سروشتەکی بوو کە مەسیحییەکان، نێزیکبوونەوەی گرتنی ڕۆما لە لایەن پاشا Alarik ـەوە بە هەژەند دابنێن. یەکێک لە خوداناسە لەپێشەکان

دەیگوت: «چ ڕزگاربوونێک دەمێنێ گەر ڕۆما بگیرێت». وەهای لێ هات دەتگوت چارەنووسی مەسیحایەتی، لەو دەمەدا، تێکبەستەی چارەنووسی ڕۆمانستانە و هەر یەکەیان ئەوەی دیکە بەرەو لەناوچوون کێش دەکات.

لەو بارەدا بوو یەکێک لە هەرە مەزنەکانی پیری کلێسە، ئوگوستینوس Augustinus، شاکارێکی نووسی دەربارەی شاری خودا و شاری دنیایەکی.

### ٣- ئوگوستینوس و کەوتنی ڕۆما

Aurelius Augustinus (٤٣٠-٣٤٥) خەڵکی باکووری ئەفەریقا بوو. دایکی مەسیحی بوو، بەڵام خۆی هەتا لە تەمەنی سیساڵی تێپەڕی نەکرد بڕوای بە مەسیحایەتی نەهێنا. ئوگوستینوس هەموو مەرجەکانی خوێندنی درەنگەدێرینی پڕ کردەوە و لە تەمەنێکی زوودا بوو بە مامۆستایەکی سەرکەوتووی ڕەوانبێژی retoric. بە چوستی لە ڕێڕەوە فەلسەفی و دینەکییەکانی هاودەمی خۆی ورد بۆوە بە هیوای ئەوەی ڕاستی ڕەها بدۆزێتەوە. لە کتێبێ ***دانپیانانەکان*** *Confessiones* دا باس لە فراژووتنی خۆی دەکات هەتا ئەو دەمەی بوو بە مەسیحی، لە ڕوانگەی هاوچەرخەوە ئەو کتێبە یەکەم کتێبە لە بواری بیرەوەریدا.

لە سەردەمی دێرینی درەنگدا سنوورێکی ئاشکرا لە نێوان فەلسەفە و دیندا نەبوو. فەلسەفە و دین دەبوایە مرۆڤ ئاگادار بکەن لەو چاکە هەرە بەرزەی دەبا هەوڵی بۆ بدات. کەواتە دەبا فەلسەفە و دین ڕێگەی شادمانی و ئاسوودەکی گیان ڕوون بکەنەوە. نموونەیەکی ئەو بارەش ئەوەیە ئوگوستینوس، کاتێ بوو بە مەسیحی بە دیتنی خۆی دەگوت «فەلسەفەی من».

فەلسەفەی مەسیحایەتیی ئوگوستینوس ڕیشەی نەک تەنیا لە نەرێتی جوولەکایەتی و مەسیحایەتی کۆندا هەیە بەڵکوو لایەنی گرنگیشی لە فەلسەفەی دێرینەوە وەرگرتووە، لە پێش هەمووانیش لەو ڕێبازەی پێی دەگوترا ئەفلاتۆنایەتیی نوێ neoplatonism کە - لایەکی بیرەکانی سەرچاوە لە ئەفلاتونەوە دەگرن - بنەماکانی دەڵێن باشترین و شادمانترین شێوەی ژیان لە جیهاننۆڕییەکدایە بەرزیی خوداوەند لە سەرووی ئەم دنیا بەرچاوە دابنێت. ئوگوستینوس تێکەڵێکی بەهێزی لە جوولەکایەتی - مەسیحایەتی و دیتنی دێرین - یۆنانی پێکهێنا. پاشان ئەم تێکەڵە بە شێوەیەکی بەرفرەوان باڵی بەسەر ئەو بەشەی مەسیحایەتیدا کێشا، کە لە دواییدا ڕۆما بووە پێتەختی.

بەم جۆرە ئوگوستینوس نە تەنیا سەرگەرمی ئەو دۆزانە بوو کە ئێمە ئەمڕۆ بە خوداناسی theology ی دادەنێین و نە تەنیا تێبینییەکی یەکجار بەرفرەوانی دەربارەی Psalter (سفر المزامیر) ی تەورات نووسیوە، بەڵکوو خاوەنی دیمانەیەکی سەربەخۆیە دەربارەی زانیار. ئوگوستینوس بەوەوە ناوەستێتەوە کە بنەماکانی مەسیحایەتی شی بکاتەوە بەڵکوو دژنامەیەکیش دەنووسێ بەرانبەر فەلسەفەی گومانایەتی scepticism کە یەکێکە لە بەرهەمە هەرە بە تینەکانی دیمانەی سیاسیی ئوگوستینوس. باش بێت یان نەباش، دیتنی ئوگوستینوس دەربارەی پێوەندی نێوان کلێسە و دەوڵەت، نێوان دینەکی و دنیایەکی، بە درێژایی هەموو سەردەمی ناڤین و دواتریش، دەبێتە سەرچاوەیەکی ئەو بوارە.

مەسەلەی پێوەندیی نێوان دەسەڵاتی دەوڵەت و کلێسە دژوار و ناکۆک بوو، کاتێک مەسیحایەتی کرا بە دینی دەوڵەت، دژوارتریش بوو. لە کوێدا دەسەڵاتی دەوڵەت کۆتا دەبێت و لە کوێدا دەسەڵاتی کلێسە دەست پێ دەکات، مەسەلەیەک بوو تەواو نائاشکرا. ئایە دەکرێ قەیسەر ببێتە جۆرە فەرماندەیەکی کەشیشان؟ قەیسەر لە دینی پێشووی دەوڵەتدا وەها بوو، بەڵام ئەو دینە پێش هەموو شتێک پەرستن و پیرۆزییەک بوو بۆ خودی قەیسەر. قەیسەر هەر لە دەستپێکی قەیسەرایەتییەوە وەک مەزنایەتییەکی نەک هەر دنیایەکی بەڵکوو دینەکی و خوداوەندی هێنرایە پێش. هەڵبەتە ئەم دیتنەی خوداوەندبوونی قەیسەر لەگەڵ مەسیحایەتیدا نەدەگونجا.

یەکێک لەوانەی لە هەمووان سەرسەختانەتر پشتگری لە جوداکردنەوەی دەسەڵات دەکرد، لە نێوان قەیسەر و ڕێبەرانی کلێسەدا، Ambrosius ی مەترانی میلانۆ بوو. Ambrosius دەستی هەبوو لەوەی ئوگوستینوس بڕوا بە مەسیحایەتی بێنێت. بە دیتنی Ambrosius، کلێسە – یان ڕێبەرانی کلێسە و مەترانەکان – دەبێ دەسەڵاتێکی ڕەهایان بەسەر هەموو بوارێکی گیانەکیدا هەبێ. ئەم دەسەڵاتە بەسەر قەیسەریشدا دەکشێ، چونکە سەر بە کلێسەیە و «لە کلێسەدایە نەک بەسەر کلێسەوە». لەبەر ئەوە لە دۆزی سەر بە باوەڕ «مەترانەکان بڕیار بەسەر قەیسەری مەسیحیدا دەدەن نەک قەیسەر بەسەر مەترانەکاندا». ڕاستە مەتران و هەموو مەسیحییەک دەبێ گوێڕایەڵی دەستووری دنیایەکی بن، بەڵام کلێسەش دەبێ مافی ئەوەی هەبێ ڕەخنە لە کردەوەی نامەسیحایەتییانە و ئاکاری ناجۆری دامودەزگەی دنیایەکی بگرێت. قەیسەر دەسەڵاتی بەسەر سامانی دنیایەکیدا هەیە، تەنانەت بڕیار بەسەر سامانی کلێسەشدا دەدات. بەڵام خودی بینای کلێسەکان کە تەنیا لە خزمەتی باوەڕ دان، تەنیا لە ژێر فەرمانی کلێسەدا دەمێننەوە.

تەنانەت ئەم دەسەڵات دابەشینەش خاڵی ناكۆكی تێدا بوو. هەرگیز ناكرێت مەزنایەتیی دەوڵەت تاكە لایەنی مایەكی بگرێتەوە، هەموو دەستوورێكی دنیایەكی لایەنی ئاكارەكی هەیە، واتە ئەنجامی گیانەكی لێ دەبێتەوە. هەر بەو پێیەش ناكرێ كڵێسە دەسەڵاتێكی تەنیا گیانەكی هەبێت. كڵێسەش سامانی مایەكی خۆی هەیە.

ئوگوستینوس ڕێبازی دەسەڵات دابەشینی Ambrosius دەكاتە دەراو بەڵام ئەو بۆچوونانە دەخاتە كایەیەكی سروشتبەدەر metaphysical ی فرەوانترەوە. لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە كە ئەنجامی ڕووداوە مەزنەكان ڕەچاو دەگرێ، وەك كەوتنی ڕۆما یان وردتر بڵێین لاوازیی ئاشكرای ڕۆما. لای Ambrosius سەرچاوەی مەزنایەتیی دنیایەكی هەردەم یەكە و ناگۆڕدرێت، ئەویش قەیسەری ڕۆمانە، پێوەندیی نێوان كڵێسە و دەوڵەت پێوەندییەكە لە نێوان كڵێسە و ئەو دەوڵەتە داسەپێنەی ڕۆمادا.

بەڵام ئوگوستینوس دەبێ حیسابی ڕۆژێكی وەهاش بكات كە قەیسەری ڕۆمانی نا یەكێكی دیكە فەرمانڕەوایی دەكات. خاڵێكی گرنگی فەلسەفی سیاسیی ئوگوستینوس ئەمە بوو: دەسەڵاتی دنیایەكی دێت و دەڕوات بەڵام كڵێسە هەتاهەتایە هەر دەمێنێ.

*شاری خودا De civitate Dei* لە ژێر تاوی یەكەوڕاستی كەوتنی ڕۆمادا (كە ساڵی ٤١٠ بوو) نووسراوە. ئوگوستینوس سێزدە - چواردە ساڵ خەریكی ئەو بەرهەمە بوو، ساڵی ٤٢٦ لە نووسینەوەی بیست و شەش كتێبەكە بۆوە كە سەرلەبەریان لە هەزار لاپەڕە زیاترن (لە چاپی ئەم سەردەمەدا بە بیست و شەش بەشی گەورەی یەك كتێب دادەنرێن).

*شاری خودا* لە دیمانەی سیاسیدا، ڕانواندنێكی شیرازەدار نییە بەڵكوو لە یەكەم خوێندنەوەدا وەك زنجیرەیەك دێتە پێش چاو لە تێبینیی پەرت و بڵاوی سەر بە مێژوو، ڕاڤە كردنی تەوجیل ‹تەورات و ئینجیل : Bible› و ڕاگوێستەی گوتەی زانایان. كاتێك زیاتر لێی ورد دەبێتەوە شاڕێیەكی لێ ئاشكرا دەبێت. لە یەكەم دە كتێبدا، ئوگوستینوس لەوە دەكۆڵێتەوە ئایە هیچ پێوەندییەك لە نێوان كەوتنی ڕۆما و مەسەلەی بوونی مەسیحایەتی بە دینی دەوڵەت، هەیە. لەوانەی دیكەدا بیروڕای خۆی دەردەبڕێ بەرانبەر پێوەندیی نێوان مەزنایەتیی دنیایەكی و گیانەكی - بنەما فكرییەكەش پتر لەم بەشەدایە.

ئوگوستینوس، لەم بەشەدا، چەمكی *شاری دنیایەكی و شاری خودا*، كە دەربڕینێكە سەردەمێكی نوێی داهێنا، پتر ڕوون دەكاتەوە. دیتنی ئەو دەربارەی چۆنیەتی گوزەرانی سیاسی تەواو ئاشكرا و دیار نییە، بەڵام جیهاننۆڕیی دراماتیكی جوولەكایەتی - مەسیحایەتی بە شێوەیەكی زیندوو ڕادەنوێنێ. بێهۆ نییە گوتراوە *شاری خودا* پتر سەر بە فەلسەفەی مێژووە وەك لە فەلسەفەی سیاسی. بەڵام ئەم بەرهەمە تێنی لە فەلسەفەی سیاسیی پاش خۆی یەكجار بەهێزە.

ئەوەی ئوگوستینوس لە یەکەم دە کتیبدا دەیلێ، لەم بوارەدا، کەمتر هۆشگیرە. لەوێدا بەرپەرچی ئەو بۆچوونە دەداتەوە کە دەڵێ هۆی کەوتنی ڕۆما ئەوەیە شارەکە خوداوەندە کۆنەکانی خۆی وێڵ کرد. ئوگوستینوس پیشانی دەدات کە ڕۆما لە دەمی پەرستنی ئەو خوداوەندانەشدا دووچاری بەزین و پەژارەیەکی سەخت دەبوو. هۆی ئەم ئاستەنگە تازانە مەسیحایەتی نییە، بەڵکوو ئەو لەخۆبایی بوونەیە، یان وا باشترە بڵێین ئەو پشت بەستنەیە بە تاکە ڕێی هێز و شکۆمەندیی ئەم دنیایە.

نەک تەنیا ئەو بەشانە بەڵکوو سەرجەمی *شاری خودا* وا ڕادەنوێنێ کە جووت هەڵوێستیی لە ئاست ئیمپەراتۆرییەتی ڕۆمانیدا هەبێت. ئەم جووت هەڵوێستییە بۆتە هۆی ئەوەی ڕاوێژێک لە نێوان ڕاڤەکارانی ئەم سەردەمەدا دروست ببێت: ئایە ئوگوستینوس لایەنگریی ڕۆمایە یان دژیەتی؟.

لە لایەک ئوگوستینوس ڕەوایەتی دەبەخشێ بە سەروەریی ڕۆمانستان بەسەر گەلانی دیکەدا. ئەو سەروەرییە خەڵاتی خودایە بەرانبەر پاکژیی ڕۆما. ئوگوستینوس دەڵێ خەڵکی ڕۆما «بەرژەوەندی کەسەکییان کردە قوربانی بەرژەوەندی گشتی»، و نێزیکەی هەموو گەلان شکۆمەندیی ڕۆمایان سەلماندووە، فرە گەل هاتوونەتەوە ژێر سەروەری ئەمانەوە. «ئەو گەلانە بۆیان نییە گلەیی لە دادپەروەری هەرە بەرزی خودا بکەن: ***ئەوان مزەی خۆیان وەرگرتووە***».

لە لایەکی دیکەوە، ئوگوستینوس، ڕۆما بە دژوەستاوی ڕەهای کڵێسە و مەسیحایەتی دادەنێ و بیرەوەری ڕۆژگاری ڕاونانی مەسیحایەتی زیندوو دەکاتەوە. ڕۆما وەک دوژمنی هەرە گەورە و ئامرازی شەیتان دێتە بەر چاوان.

گەر بێتو کەسێک شی کردنەوەیەکی سایکۆلۆگیانەی ئەم جووت هەڵوێستییە بکات و بڵێ ئوگوستینوس لە سەرێکەوە هاوزێدێکی باشی ڕۆمانی بوو و لە سەرێکیشەوە کڵێسەپەروەرێکی، لەو دەمەدا، ڕاونراو بوو، ئەوا شی کردنەوەیەکی وەهای نەکردووە لێرەدا هۆشگیر بێت و ڕێگەش لەوە دەگرێ شارەزای دیتنی تازە و ڕەسەنی ئوگوستینوس بین دەربارەی مەزنایەتیی دنیایەکی. ڕۆما لەو زەمانەدا، بەلای مەسیحییەکانەوە، نموونەی هەم ئەو سەروەرییە بوو کە خەڵاتی خودایە و هەم ئامرازی شەیتان بوو. بەلای ئوگوستینوس ئەم ناکۆکییە بێچارە نییە. بەڵام بەرپەرچی ئەو بۆچوونەش دەداتەوە کە گوایە ڕۆما ئامرازێکی خودایە بۆ ڕزگار کردنی ئادەمیزاد، چونکە ئەم بۆچوونەش لەو دەمەوە کە مەسیحایەتی کرابوو بە دینی دەوڵەت بووبوو بە باو. ئوگوستینوس پێی وایە ڕۆماش – وەک هەر شارێکی دیکەی سەرزەوی – دەشێ چاک بێت یان خراپ، ئامرازی

خودا بێت یان شەیتان، هەمووی پێوەندە بەوەی چۆن حوکومڕانی دەکرێ. ڕۆما هیچ ناواز نییە، مەسیحایەتی بە کەوتنی ڕۆما ناکەوێ. خودی ڕۆما و هەموو دەوڵەتانی دیکەش لە بواری ئافراندندا، بێلایەنەن.

دەیسا چۆن بڕیار لەسەر چاکە و خراپەی دەوڵەت دەدرێ؟

لای ئۆگوستینوس، وەرام دانەوەی ئەم پرسیارە تەنیا لەو بارانەدا دەکرێ ئەو دەوڵەت و ڕشتە سیاسییانە لە تەوجیلدا باس کرابن. تەوجیل وەحیی خودایە. لەوێدا خودا خۆی بۆ خەڵک دەئاخفێ. وێڕای ئەوەش تەوجیل بۆمان باس دەکات چۆن خودا دەست دەخاتە مێژووەوە. کەواتە تەوجیل لە دوو سەرەوە سەرچاوەیە.

بەڵام ئێمەی مرۆڤ بۆ ئەو مێژوویەی دەرەوەی تەوجیل هیچ ڕێنوێنیکی وەهامان نییە لێی دڵنیابین. ئۆگوستینوس – بە پێچەوانەی زۆربەی خوداناسانی مەسیحیی پێش خۆی – پێی وایە مرۆڤ ناتوانێ بۆچوونی دڵنیای هەبێ دەربارەی پیرۆزی و ناپیرۆزی ئەو مێژووە. خودا تەنیا لە تەوجیلدا، یەکسەر بۆ مرۆڤ دەدوێ. لە تەوجیلەوە دەتوانین بەو سەرئەنجامە بگەین کە خودا لە دەسەڵاتی دادپەروەر و حوکومڕانی چاک مەبەستی چییە. دەنا ئێمە ناتوانین بە دڵنیاییەکی ڕەهاوە ئاماژە بۆ ئەم یان ئەو دەوڵەتە بکەین و بڵێین چاکە یان خراپە.

ئەم بۆچوونە پێوەندە بە بیری ***چارەنووس، قەزاوقەدەر*** *predestination* ی ئۆگوستینوسەوە. بەو ڕێبازە بێ چارەنووسی هەموو مرۆڤێک هەر لە دەستپێکەوە بڕیاری لێ دراوە، یان بەهەشتی هەمیشەکی یان دۆزانی هەمیشەکی. ئادەمیزاد هەرگیز نازانێ کێ هەڵبژاردەیە و کێ وێڵ کراوە. کەواتە ئادەمیزاد ناتوانێ بە دڵنیاییەوە بڕیار لەسەر ئەوە بدات چ سیاسەتێک ڕەزامەندیی خودای لەسەرە – مەگەر لە نێو تەوجیلدا گوتەی خودا هەبێت بگەڕێینەوە بۆی.

هەرچۆنێک بێت لە تەوجیلدا چەند شارێیەک هەیە پێشانمان دەدن دەوڵەتی چاک یان خراپ چۆنە (هەروەها مرۆڤی چاک یان خراپ چۆنە). ئێمە تەنیا لە یەک خاڵ دڵنیاین. ئێمە دەزانین کە هەر هەموو مێژوو بریتییە لە ململانێی نێوان شاری خودا و شاری دنیا (یان شەیتان). لە ئەنجامدا شاری خودا بۆ ئەو کەسانە دەمێنێ کە خودا هەڵیبژاردوون بۆ بەهەشت و ژیانی هەمیشەکی، لەولاشەوە شاری دنیا دەبێتە شاری دۆڕاوەکان. شاری خودا تەنیا ناوێکی دیکەیە بۆ ئۆرشەلیمی ئاسمانەکی. ئۆگوستینوس ئاماژە بۆ بڕگەیەکی (سفر المزامیر Psalter) دەکات، لەوێدا هاتووە: «شەرافەتمەندایەتیی بەرز باسیان لە تۆ کردووە، ئەی شاری خودا». بەڵام ئەو چەمکە تەنیا لە تەوجیلدا نییە بەڵکوو Marcus

Aurelius که قەیسەر و فەیلەسووفێکی ستۆیکیست و یەکێک بوو لە ڕاوەنەرانی مەسیحایەتیش، باس لە شاری خودا دەکات، ئەگەرچی بە مەبەستێکی دیکە.

کەواتە نە شاری خودا و نە شاری دنیا شتێک نین لە سەر زەوی ئاماژەیان بۆ بکرێ یان دیاری بکرێن. هەردوو شارەکە بریتین لە مرۆڤگەلێک کە لە ژیانی سەر زەویدا تێکەڵن. بەم جۆرە، وەک چۆن دەکرێ باس لە تاکەکیەتیی ستۆیکیزم بکەین دەشکرێ باس لە تاکەکیەتیی ئوگوستینوس بکەین، ئەوجا لێرەشدا تاکەکیەتی- یەکە بێ بانگ هەڵدان بۆ چالاکی سیاسی. ئوگوستینوس دەپرسێ «ڕۆما بێ خەڵکی ڕۆما چییە؟»، کۆمەڵگە بریتییە لە «کۆمەڵێک خەڵک کە یەکیان گرتووە».

کە گوترا هەموو وەڵاتێک هاوزێدی شاری خودا و هاوزێدی شاری زەوی تێدایە، مەبەست ئەوە نییە هەموو وەڵاتێک وەک یەک چاکن یان وەک یەک خراپن. لە تەوجیلەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەو دەوڵەتە – هەروەها ئەو مرۆڤە – لایەنگری خودایە کە شادمانیی هەمیشەکی لە ژوور شادمانیی سەر زەوی و دنیایەکی دادەنێ. هۆی کەوتنە سەر چۆکی وەڵاتانی وەک میسر و بابیل ئەوە بوو تەنیا لە خزمەتی دەسەڵات و خۆشگوزەرانیی دنیایەکیدا بوون. ئەوەی دەبێتە هۆکاری کەوتن مەرج نییە تاوانکاری بێت، ئەگەر ئەو کردەوانە لە خزمەت ئامانجێکی بەرز و ئاسمانیدا دانرابان ئەوا دەبوونە پاکژی. لەبەر ئەوەش ئوگوستینوس دەڵێ هەوڵدانی ڕۆمان بۆ چاکەی گشتی، کە ئەمە لە خۆیدا کارێکی نایابە، بێهودە دەمێنێتەوە ئەگەر خۆشگوزەرانی دەوڵەت نەک ڕزگاریی تاکەکەس ببێتە تاکە ئامانج.

نیشانەی شاری خودا ئەوەیە هەوڵی ژیانی هەمیشەکی بدات، شاری دنیایەکی تەنیا بیری بۆ دۆزی سەر بە زەوی دەچێت. هەرگیز مەبەستیش لەم گوتەیە ئەوە نییە خودی دۆزی دنیایەکی خراپ و بێنرخە. دەسەڵاتی دنیایەکی هەر دەبێ هەبێت بۆ پاراستنی ئاشتی و باوەڕ و سەپاندنی دادپەروەری لە سەروکاری ڕۆژانەدا. ئوگوستینوس وێنەی حوکومڕانیی باشمان بۆ دەکێشێ و دەڵێ حوکومڕانییەکە دەزانێ ژیانی سەر زەوی تەنیا سەفەرێکە و لە هەمان کاتیشدا بە هەموو هێزی هەوڵ دەدات ئاسوودەیی ئاپۆرەی خەڵک بپارێزێ و خۆشگوزەرانیان دابین بکات.

ئەفلاتون و ئەریستۆ و تاڕادەیەکیش سیسێرۆ بە گەرمی لە شێوەی حوکومڕانیی باش دەدوان و پاشانیش لە سەردەمی ناڤینی بەرزدا ئەم باسە سەری هەڵدایەوە، بەڵام ئوگوستینوس وەها نییە و لەم خاڵەدا تاڕادەیەک کەمنووسە، شێوەی درەنگی قەیسەرێتی ڕۆمان تاکە حوکومڕانییەکە ئەم کەمێک لێی دەدوێ.

خالّی ڕەخنەگرانە لە بیرکردنەوەی سیاسیی ئوگوستینوسدا پێوەندیی نێوان دەسەڵاتی دنیایەکی و کڵێسەیە. کڵێسەی بەربینی سەر زەوی، هەر هێندەی دەوڵەت، دەشێ بە شاری خودا بناسرێت. تەنانەت لە کڵێسەشدا مرۆڤ هەن چارەنووسیان هەر دۆزەخە و مرۆڤ هەن هەڵبژاردەن چارەنووسیان هەر بەهەشتە.

لەگەڵ ئەوەشدا، کڵێسە دەبێ لەم دنیایەدا دەسەڵاتی بێگەردی هەبێت لە بواری سەر بە گیاندا. بەڵام لە بواری دۆزی دنیایەکیدا دەبێ مل بۆ دەسەڵاتی دنیایەکی کەچ بکات. ڕاستە ناکرێ سنووری نێوانیان تەواو دیاری بکرێت، بەڵام وا پێ دەچێ دوا گوتەی ئوگوستینوس، لەم بوارەدا، ئەوە بێت کە دەڵێ ئەم دوو بنگەیە دەبێ ئەوەندەی مومکینە بە سەربەخۆیی کار بکەن. فەرمانڕەوای چاک دەبێ فەرمانڕەوایەکی مەسیحی بێت، بەڵام نابێ کڵێسە هیچ جۆرە تاوێکی لەسەر حوکومڕانی ئەو هەبێ. بەرانبەر ئەوەش دەبێ قەیسەر خۆی بە ڕۆڵەی سەلاری کڵێسە بزانێت و قەیسەرایەتی خۆی لە ئاست بەهەشتدا بە نەبوو دابنێت. «خەڵاتی فەرمانڕەوای چاک ژینی هەمیشەکییە و خودا تەنیا بەو کەسانەی دەبەخشێ کە بە ڕاستی لە خودا دەترسێن. هەموو شتێکی دیکە، پلەی بەرز یان ژیانی هەژاری – زەوی، ڕووناکی، هەوا، میوە، گیانی ئادەمیزاد، لەش، هەستەکان، ژیری، ژیان – بۆ پیاوچاک و پیاوخراپ هەر یەکن. قەیسەرنشینیش بەشێکە لەوانە...».

شاکارەکەی ئوگوستینوس *شاری خودا*، لە هەموو ماوەی سەردەمی ناڤیندا، وەک سەرچاوەیەک بەکار دەهێنرا و بەڵگەی لێ دەهێنرایەوە بۆ ئەم یان ئەو بۆچوونی سیاسی، ئەگەرچی کتێبەکە خۆی پێشنیازی سیاسیی یەکجار گشتی و کەمی تێدایە. تاکە شامەبەستی کتێبەکە ئەمەیە: بابەتی دنیایەکی، ئەگەر نەخرێنە خزمەتی ئامانجێکی بەرزەوە، خراپەن.

## ١- پێشەکی

مەودای نێوان *شاری خودا* ی ئوگوستینوس و *Summa Theologica* ی تۆماسی ئەکینۆ Thomas of Aquino فرەوانترە لە ماوەی نێوان تۆماس و ئێمە. سەیریش نییە کە ماوەی بەرفرەوانی نێوان سەدەی پێنجەم و سەدەی سێزدەیەم نەچێتە چوارچێوەی هاوکێشەیەکی ساکارەوە، بەڵام دەکرێ ئەم چەند خاڵە گرنگەی فراژووتنی ئەو دەمە دەستنیشان بکەین:

١) فەرهەنگی دێرین بەگشتی فەرهەنگی شار بووە، بەڵام لە سەردەمی ناڤیندا و هەتا سەدەی دوازدەیەم، فەرهەنگی گوند کە لە دێر و بەرهەمی زەویدا خەست دەبۆوە، باڵی بەسەر ئەورووپادا کێشا.

٢) لە سەردەمی ناڤیندا *ڕشتە فیوداڵ* گەشە دەکات. شێرازەی دانوستاندن و ڕێگەوبانی گەشەکردووی دەمی ڕۆمانستان هەڵدەوەشێتەوە، ئەو یەکە کۆمەڵایەتی و سیاسییە کارگێڕە بە ناچاری بەرتەسک دەبێتەوە. ئابووریی سەر بە سروشت دەبێتە شێوازی باوی ئابووری. ساماندار‌ی نزیک دەبێتەوە لەوەی تەنیا خۆی لە زەویداریدا بنوێنێ. بە ڕەسمی پاشا دەبێتە خاوەنی گشت زەوی. بەڵام ئەویش زەوی بەسەر خان و دەرەبەگدا دابەش دەکات بەرانبەر ئەوەش دەبێ ئەوان لەشکر (سوارە) ی بۆ تەرخان بکەن. هەر بەو شێوەیەش دەرەبەگ زەوی دەبەخشێ بە دەرەبەگی لە ژێرتر. بەو جۆرە ڕشتەی فیوداڵەتی شێوازێکی هەرەمیی خۆگری کۆمەڵایەتی و سیاسی بە خۆیەوە دەگرێ کە تێیدا سەرکردە و ژێرکردە، بەرانبەر یەکدی، ئەرک و فەرمانی دیاریکراویان هەیە. ڕەشەجووتیار دەبنە بنەمای هەرەمەکە. ڕاستە کۆیلەیەتی، کە بناخەی ئابووری دێرین بوو، تەواو بنەبڕ نەبووبوو بەڵام وردەوردە دەکەوتە بەر سێبەری ئەم ڕەشەجووتیارییەوە. ڕەشەجووتیار نە دەکڕێ و نە دەفرۆشرێ، بە درێژایی تەمەنی بەندە بەوەی کار لەو زەوییەدا بکات تێیدا زاوە. بەرانبەر کارەکەش، نێزیکترین ئاغای گوزەرانێکی یەکجار ساکاری بۆ دابین دەکات.

٣) لە ڕوانگەی دوارۆژەوە وەها ڕادەنوێنێ کە ناکۆکی نێوان مەزنایەتیی دنیایەکی و گیانەکی باڵی بەسەر نۆڕینی سیاسیی سەردەمی ناڤیندا کێشابێ. چینچین بوونی کۆمەڵایەتی تەواو ئاشکرا بووبوو بەڵام سنووری نێوان کڵێسە و حکوومەتی دنیایەکی بەوە

ناسرابوو که نادیاره. سنوورێکی پتەو و ئاشکرا لە نێوان بواری گیانەکی و دنیایەکی، لە نێوان بیر و پێوەندیی مایەکیدا نە هەبووە و نە بوونیشی هەرگیز مومکینە.

بەڵام ئەو ناکۆکییانە، لە هەموو سەردەمی ناڤینداـ یەک جۆر نەبوون. بەشدارانی ئەم بوارە مەزنە فرە گۆڕانکارییان بەسەردا هات. هەر لە سەدەی شەشەمەوە مەترانەکانی ڕۆما داوای مەزنایەتییان دەکرد بەسەر هەموو کڵێسە و هەموو بوارێکی گیانەکی لە مەسیحایەتیدا. Justinianus ی قەیسەری ڕۆمانستانی ڕۆژهەڵات، دیسان لە سەدەی شەشەمدا، داوای مەزنایەتی دەکرد بەسەر کڵێسەدا. بەم جۆرە هەر لەسەرەتاوە ئەم بۆچوونە یەکنەگرانە شێوازی خۆیان گرتبوو، بەڵام بۆ ئەوەی ئەم یان ئەو لایەنەیان بتوانێ ئامانجەکانی خۆی بهێنێتە دی پێویستی بە سازمانێکی گەشەکردوو بوو کە چ کڵێسە و چ فەرمانڕەوایان، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، لێی بێبەش بوون. ئەو بەشەی مەسیحایەتی کە ڕۆما پێتەختی بوو، لە سەدەی دەیەم و یازدەیەمدا ئەوجا فراژووت و بووە یەکەیەکی بەکار و چوست. ڕۆمانستانی ڕۆژهەڵات پاش Justinianus دەسەڵاتی بەسەر ناوچەکانی ڕۆمانی ڕۆژاوادا نەما و دەسەڵاتی ناوچەیی میرنشینەکانیش بەرتەسک بۆوە.

لە زەمانی کارل Karl ی مەزندا (دەروبەری ساڵی ٨٠٠) بۆ یەکەم جار دەوڵەتێکی گەورەی وەها دامەزرێنرا کە بشێت، لە ڕووی ڕێکخستنی ناوەکی و بەرفرەوانی دەرەکییەوە، بە ئیمپەراتۆرییەتی ڕۆمانی بەراورد بکرێت. لە سەدەکانی پاش ئەو دەمە *دەوڵەتی پیرۆزی ئەڵمانی - ڕۆمانی* گەشەی کرد و بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بووە یەکەم بەرهەڵستی پاپا. قەیسەری ئەڵمانی-ڕۆمانی هەوڵی ئەوەی دا ببێتە گەورەی دنیای مەسیحایەتی و وێڕای ئەوەش مافی دامەزراندنی مەترانەکانیشی گرتە دەست چونکە وا باو بوو مەتران درێژە پێدانی مەزنایەتیی دنیایەکییان بەدەستە. پاپاش ئەو مافەی بۆ خۆی دەویست. *شەڕی دامەزراندن* ڕیشەی تەنیا لەوەدا نەبوو کڵێسە مەزنایەتی و دەسەڵاتی گیانەکی گرتبووە دەست بەڵکوو لەوەشدا بوو کە کڵێسە و هەرەمی حوکومڕانی لەیەک جیانەدەکرانەوە.

ئەم شەڕی دەسەڵاتە لە سەردەمی ناڤینی بەرزدا، خەسڵەتی گۆڕا. لە جێی قەیسەر پاشای دەوڵەتی نەتەوەییی تازەبابەت بوونە یەکەم بەرهەڵستی پاپا. شەڕی نێوان پاپا Bonifacius VII و فیلیپ Filip ی جوانی پاشای فرانسە، لە سەرەتای سەدەی چواردەیەمدا، لە سەر ئەوە بوو پاشا دەیویست باج لە کڵێسە و کۆڕی کەشیشانی فرانسە بستێنێ. پاشا سەرکەوت.

٤) ناکۆکیی نێوان پاپا و میر - قەیسەر یان پاشای دنیایەکی - بە هیچ جۆرێ ناچێتە چوارچێوەی ناکۆکیی نێوان بیروڕای مەسیحایەتی و نامەسیحایەتییەوە.

بۆچوونی دینی بە شێوەیەک چووبۆوە کاروباری دنیایەکییەوە کە زەحمەتە ئەمڕۆ ئێمە بیهێنینەوە بەرچاوی خۆمان. مەسیحایەتی بووبووە شائایدیۆلۆگی و هەموو لایەک لەوێوە پشتیوانییان بۆ کردەوە و بڕیارەکانی خۆیان دەخواستەوە. ئافراندنێکی مرۆڤکرد نەدەبا تەنیا و نەدەبا بە پلەی یەکەم سوودبەخش بێت بەڵکوو دەبا وەک هێمایەکی سەر بە دینیش لەبار بێت. شارەکانی زەمانی کارل Karl ی مەزن دەبا هێمایەک بوونایە بوو ئۆرشەلیمی ئاسمانەکی، واتە ئەو شاری خودایەی ئۆگوستینوس باسی لێوە کردووە. لە پلان دانانی شار ڕێکخستن، لە سەردەمی ناڤینداء شێوەی خاچ شانۆرەی دەگێڕا. تەنانەت ئەمڕۆش گەر لە لەندەن و کۆبینهاگن ورد بیتەوە دەبینیت جادە سەرەکییە کۆنەکان لە شێوەی خاچدان.

کەواتە سەروکاری دنیایەکی بووبووە سەروکارێکی دینەکی. پاشا و قەیسەران لافی ئەوەیان لێ دەدا کە هێندەی پاپا مەسیحیی چاکن. لە سەردەمی ناڤینی درەنگدا ئەوجا بیری سیاسی مەیلەو عیلمانی سەری هەڵدا. بەڵام تەنانەت ئەو بیرەش بەرانبەر کڵێسە دوژمنکارانە نەبوو - بەڵکوو مەبەستی ئەوە بوو گوزەرانی سیاسی لە بواری دینەکی جودا بکاتەوە.

هەر لە سەرەتاکانی سەدەی ناڤینەوە چەندین پاشا لافی ئەوەیان لێدەدا کە خۆیان *بەرەکەتی خودان*. واتا مافی پاشایەتییان لە خوداوە وەرگرتووە نەک لە خەڵکی ژێر دەستی خۆیان. ئەم بۆچوونانەش تاڕادەیەک لەگەڵ دیتنی کۆنی جێرمانی کە پێی وابوو گەل (یان وردتر بڵێین گەورەپیاوانی گەل) سەرچاوەی دەسەڵاتی پاشایە، ناکۆک بوون. ئەم ناکۆکییە بەدەگمەن دەردەبڕا، بەڵام لەو بارانەدا دەکەوتنە بەرچاو کە ڕەوایەتی دەستووران دەکەوتنە بەر پرسیار. ئەگەر دەسەڵاتی پاشا لە خوداوە بێت ئەوا تەنیا لەبەردەم خودادا بەرپرسیارە، هیچ بوونەوەرێکی مرۆڤەکی بۆی نەبوو لە پاشا بپرسێتەوە لە دەستوورێکی دایناوە. ئەگەر سەرچاوەی دەسەڵاتیشی لە گەلەوە بایە ئەوا دەبا دەستوورەکان بە هاوکاریی گەل دانرابان.

٥) ئەو بۆچوونە یەکنەگرانە نەبوونە سەرچاوەیەک بۆ سەرهەڵدانی باوەڕی سیاسیی دژ بە یەک. ئەم خاڵە بە گشتی بووە خەسڵەتێکی ئەو ماوە درێژخایەنەی نێوان سەدەی شەشەم و یازدەیەم، هێندەی ئێمە ئاگاداربین، هیچ بەرهەمێکی وەهای تێدا دەرنەچوو بۆ دیمانەی سیاسی تەرخان کرابێت. ئەوەی بۆ ئێمە مابێتەوە ئەوەیە لە ڕێگەیەکی تیانەوە

ماوەتەوە: ئەویش ئەو دەقە دەستووری و دۆکیومێنتانەیە کە ماونەتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە دەزگەی بیری سیاسی لەو ماوەیەدا لاواز بوو.

گۆڕانێکی بەرچاو لە سەدەی یازدەیەم، دوازدەیەم و بەتایبەتی سێزدەیەمدا ڕووی دا. ئەوەش هاوشان بوو لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە بەرچاوانەی بواری کۆمەڵایەتی و سیاسی: فراژووتنی فەرهەنگی شارەکی لە باکووری ئیتالیا و پاشان لە ناوەند و ڕۆژاوای ئەورووپا، گەشەکردنی ڕشتەی دانوستاندن و پتەوبوونی دەوڵەتی نەتەوەیی. بەڵام هەتا ڕادەیەکی بەرزیش پەیوەستی ئەو نوێکارییە بوو کە لە بواری بیرکاری intellectual دا ڕووی دا. سازبوونی پێوەندی لەگەڵ بیرکردنەوەی سیاسی ئەریستۆدا، بایەخی تایبەتی هەبوو. ئەریستۆ هەتا ئەو دەمە نرخێکی ئەوتۆی لە مەسیحایەتیدا نەبوو، بەڵام لە ڕێی بەرزەفەرهەنگی عارەبییەوە، پێوەندی بە سەرچەمی فەلسەفەی ئەریستووە ساز درا.

ئەو دیراسەتە چوستەی نووسینەکانی ئەریستۆ گۆڕانکارییەکی هێنایە کایەوە دەشێ بڵێم هەموو بوارێکی بیرکاری گرتەوە. بواری دیمانەی سیاسیشی گرتوە. بەڵام لە ئاست چۆنیەتی کارکردنی ***سیاسەت***ی ئەریستۆ لە بیروڕاکانی سەدەی سێزدەیەم، بۆچوونی دژ بەیەک هەیە.

لە لایەکەوە، دەشێ بڵێین چەمکەکانی ئەریستۆ، کە لەگەڵ باروذۆخی شارەدەوڵەتی یۆنانیدا دەگونجان، یەکاویەک گوێزرانەوە بۆ وەسف کردنی ئەورووپای سەردەمی ناڤینی درەنگ. جیاوازیی نێوان حوکومڕانیی پاشایەتی و ئەریستۆکراتی و ستەمفەرمانی، لای ئەریستۆ کە شارەدەوڵەتی لەبەر چاو بوو، ڕوون و ئاشکرا بوون. بەڵام ئەم زاراوانە بە هیچ جۆرێ، لە ئیتالیا و فرانسەی سەدەی سێزدەیەمدا، ئەو واتا ئاشکرایەیان نەبوو. بەم پێیە دەشێ بگوترێ تاوی ئەریستۆ لەو دەمەدا ڕووالەتانە بووە.

لە لایەکی دیکەوە نموونە هەیە لە زاراوە و بۆچوونی ئەوتۆ کە لە ڕێی ئەریستووە ناسران و نۆرەیەکی بنیاتنەرانەی بەرزیان هەبوو. لە پێش هەمووشیانەوە زاراوەی ***پۆلیس*** *Polis* بوو کە بووە بنەمایەکی گرنگ بۆ زاراوەی هاوچەرخی ***دەوڵەت***. زووتر، لە سەردەمی ناڤیندا، جیاوازی دەخرایە نێوان دەسەڵاتی گیانەکی و دنیایەکییەوە. خاڵی بڕیاردەر لێڵ و لاواز بوون. بیروڕای ئەریستۆ دەربارەی *Polis*، وەک کەمێکی دیکە باسی لێوە دەکرێ، بووە ئامرازێکی فرەڕەنگ بە دەست دیمانەیارانی سیاسەت لە سەردەمی ناڤینی بەرزدا.

جگە لەوەش دەبێ لەبیرمان بێ کە تاوی ئەریستۆ بە زۆر شێوەی فرە جیاواز ڕەنگی دایەوە. تۆماسی ئەکینۆ کە، لە سەدەی سێزدەیەمدا، گەورەترین پێڕەوی ئەریستۆ بوو، هەوڵی دا فەلسەفەی ئەریستۆ و بڕوای مەسیحایەتی کۆبکاتەوە. لە بواری سیاسەتدا

هەوڵی دا، بە یارمەتی بنەماکانی ***سیاسەت*** هاوئاهەنگی لە نێوان خواستی کڵێسە و دەوڵەتدا، ساز بکات.

پێڕەوانی دیکەی ئەریستۆ هەبوون ئەریستۆیان بە پیری ڕێبازێک دادەنا کە بڕوا و زانین جیا دەکاتەوە لە دۆخی دینەکی و دنیایەکی. لەو دیمانە سیاسییەدا، لە سەدەی چواردەیەمدا، ڕێبازێک فراژووت پێی وابوو کە سەروکاری سیاسی دەبێ تەواو جودا بکرێتەوە لە کڵێسە و بڕوای سەر بە کڵێسە. گرنگترین نوێنەری ئەم ڕێبازە مارسیلیوس Marsilius ی خەڵکی Padua بوو (دەروبەری ١٣٤٢ مردووە)، و (ساڵی ١٣٢٤) کتێبی *Defensor pacis* دانا، ئەو کتێبە هەوڵدانێکی ئاگادارانەیە بۆ سەپاندنی بۆچوونەکانی نێو ***سیاسەت*** بەسەر بارودۆخی سەردەمی ناڤیندا.

بیروڕای سەر بەو دوو دنیا جیاوازەی دەوڵەت و کڵێسە، لە بواری دیکەشدا سەری هەڵدا. پیرایەتی ئەریستۆ مەسەلەیەک نەبوو ناکۆکی لەسەر نەبێ. فەلسەفەی تۆماسی ئەکینۆ لە لایەن نوێنەرانی ڕێبازی کۆنترەوە دژایەتی دەکرا، ئەمانە سەرچاوەیان لە ئوگوستینوسـەوە هەڵدەگرت. لە سەدەی چواردەیەمدا چەمکی via moderna لە بەرانبەر via antiqua فراژووت (ڕێبازی هاوچەرخ بەرانبەر ڕێبازی دێرین، کە ڕێبازی تۆماس بوو). گەورەترین نوێنەری ڕێبازی هاوچەرخ، ڕاهیبی ئینگلیزی فرانسیسکانی William ی Ockham (١٣٠٠-١٣٦٥) بوو. ولیەم لە چەندین بواری هەمە جۆردا چالاک بوو، تەنانەت لە بواری دیمانەی سیاسیشدا. ئەمیش وەک مارسیلیوس دەیویست دنیای دەوڵەت لە دنیای کڵێسە جودا بکاتەوە. بەڵام ئەم پشتی بە ئەریستۆ نەدەبەست. بەرهەمی تۆماسی ئەکینۆ نەک هەر لە ڕووی کاتەوە بەڵکوو لە ڕووی ناوەڕۆکیشەوە پلەیەکی نێوەندەکی هەبوو لە بیری سیاسیی سەردەمی ناڤیندا. لەبەر ئەوەشە کە، لە سەردەمی ناڤینی بەرز و درەنگدا، دەبێتە لەبارترین دەراوی ڕانواندنی فەلسەفەی سەر بە دەوڵەت و کۆمەڵگە.

**٢- تۆماسی ئەکینۆ و دەوڵەتی سروشتەکی**

تۆماسی خەڵکی ئەکینۆ (دەورووبەری ١٢٢٥-١٢٧٤) ئیتالیایی بوو و هەر بە لاوی چووە ڕیزی ڕاهیبایەتی دۆمینیکانەوە Dominican Order کە ئەو دەمە مەیلەو تازە دامەزراو بوو. خوێندنی لە شارەکانی ناپل و کوێلن و پاریس تەواو کرد و بووش بە یەکێک لە مامۆستا گەورە و زووەکانی زانستگەی پاریس بەڵام ماوەیەکی درێژخایەنیش لە وەڵاتی خۆی کاری کرد.

بەرهەمی هەرە گرنگی تۆماس *Summa theologica* یە (کە دەشێ بکرێتە ***ڕێنامەیەکی شیرازەداری خوداناسی***). لەو کتێبەدا باسیش لە بیروڕای سەرەکی خۆی دەکات. تۆماس بڕوای سیاسیی خۆی لە بەرهەمی دیکەشدا شی دەکاتەوە وەک ***حوکومڕانی میران*** *De regimine principum* و تێبینییەکانی دەربارەی ***سیاسەت*** ی ئەریستۆ.

تۆماس، لە هەوڵی کۆکردنەوەی مەسیحایەتی و فەلسەفەی ئەریستۆدا، گەورەترین ئەنجام و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. لە بیروڕای سەردەمی ئاڤیندا، کە ڕیشەی لە ئەفلاتۆنایەتیی نوێدا هەبوو، زانیاری بەرهەست و بەگشتی هەموو شتێکی لەشەکی و دنیایەکی، زۆربەی جار بە چاوێکی نزم سەیر دەکرا و تەنانەت بە تاوانیش دادەنرا. بەرانبەر ئەوەش تۆماس و پەیڕەوانی دیکەی ئەریستۆ هەڵکەوتی فیزیاوییان، ئەگەر بخرایەتە خزمەتی ئامانجی بەرز و گیانەکییەوە، بە چاکە دادەنا. بە خراپەشیان دادەنا ئەگەر زاڵ بووایە بەسەر لایەنی گیانەکیدا، وەک ئەوەی ئارەزووی لەشەکی و تەندروستی لە پێش شادمانیی بەهەشتییەوە دابنرێ.

گۆڕانکاریی هەرە مەزن لەوە نییە ئەو نرخاندنە دژبەیەکانە پەیدا بوون بەڵکوو لە گۆڕینی سەرلەبەری وێنەی مرۆڤدایە. بە پێی بیروڕای پێشووتر گیان کەسایەتی مرۆڤ دیاری دەکات - واتە جیاوازی گرنگی نێوان مرۆڤان، جیاوازییە لە نێوان گیان و چۆنیەتیی گیانەکی ئەواندا. بەرانبەر ئەوەش تۆماس پێی وابوو مایە، واتە لایەنی لەشەکی، بنەمای ئەوەیە مرۆڤی جیاواز وەک کەسایەتی جیاواز ڕادەنوێنن.

ئەم باوەڕە بووە هۆی بەرپابوونی ململانێیەکی مەزن دەربارەی ***گەوهەری مرۆڤ***. لە بواری خوداناسیدا، ئەم باوەڕە، خۆی وەها ڕادەنواند کە هەوڵێکە بۆ بەرجەستە کردنی ئەو باوەڕەی سەرەتای مەسیحایەتی دەربارەی ڕاست بوونەوەی فیزیایی: ئەگەر ئادەمیزاد - وەک کەس جارێکی دی، پاش مردن، ڕاست بێتەوە، هەڵبەتە دەبێ بە لەش و گیان ڕاست بێتەوە. بەلا ئەم باوەڕە مەرجی دەرەکی گشتیتری هەبوو. مەرجی تێڕوانینێکی نوێ و پتر ئایەتی هەبوو بەرانبەر ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی. ژیانی هەمیشەکی، کە پاش ڕاستبوونەوەی مرۆڤ پەیدا دەبێ، هەر لەم ژیانەی ئێستە دەچێ - تەنیا هەڕەشە و تاوانی تێدا نییە.

ئەم هەڵوێستە ئەنجامی گرنگی بۆ بیروڕای سەر بە گوزەرانی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەبوو. زووتر، دەوڵەت بە ئەنجامێکی پێویست بەڵام ناجۆری گوناهەکەی مرۆڤ دادەنرا. سروشتی مرۆڤ، واتە لە ناخیدا و لە دۆخێکی خاوێنی بەهەشتیدا - وەک یەک بوون. خەڵک لە دەوڵەتدا تەواو چینچین بوون، هەبوو سەرکردە و هەبوو ژێرکردە. مرۆڤ لە ڕووی

سروشتەوە ئازاد بوون بەڵام پاش گوناهەکە، گونهبارییان هێندە مەزن بوو کە دەبوو دەوڵەت دەسەڵاتی هەبێت بۆ ئەوەی ناچاریان بکات و سزایان بدات. کەواتە دەتوانین بڵێین دەوڵەت بنگەیەکی ناسروشتەکییە بەڵام پێویستە.

بەرانبەر ئەوە تۆماس، لەسەر ڕێچکەی ئەریستۆ، پێی وایە دەوڵەت بنگەیەکی سروشتەکییە.

تۆماس دەڵێ سروشت ژیرییەکە خودا لە شتاندا دایناوە «بۆ ئەوەی بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو ببزوێن». کەواتە ئەویش **سروشت** هەر بەو واتا سەر بە خوداناسییەی ئەریستۆ بەکار دێنێ. سروشتی بەردە وەها دەکات بکەوێتەوە سەر زەوی، چونکە کەرەستەی بەرهەست ئەو ئامانجەی بۆ دیاری کراوە کە هەتا دەکرێ نێزیک ببێتەوە لە ناوەندی زەوی (کە دەکاتەوە ناوەندی گەردوونیش). هەر بەو جۆرەش سروشتی تۆو وەهایە کە بەرەو ڕوەکێکی دیاریکراو گەشە بکات. سروشتی مرۆڤ وەهایە کە خۆیان لە دەوڵەتدا کۆبکەنەوە.

سروشت بەهیچ جۆرێک ناکۆک نییە لەگەڵ دنیای ئەودیو، دنیای خودایەکی. تۆماس دەڵێ میهرەبانیی خودایەکی سروشت ناسرێتەوە بەڵکوو دەیگەێنێتە پلە بێگەردی. لەبەر ئەوە دەوڵەتی سروشتەکی لەگەڵ ژیانی هەمیشەکیدا دژ نییە بەڵکوو مەرجێکی سروشتەکییە بۆی.

بەڵام هەموو جۆرە حوکومڕانییەک سروشتەکی نییە. بەلای تۆماسەوە دەوڵەتی ژیرانە دەبێ چەند مەرجێکی تێدابێ. بۆچوونەکەی ئوگوستینوس کە دەڵێ ئێمەی مرۆڤ تەنیا ناڕاستەوخۆ و نادڵنیا و بە یارمەتی چیرۆکەکانی نێو تەوجیل دەتوانین بڕیار لەسەر چاکی و خراپی سازمانێکی سیاسی بدەین، بەلای تۆماسەوە تەواو نامۆیە. ژیری مرۆڤ، بەلای تۆماسەوە، پاش گوناهەکە نەسڕاوەتەوە بەڵام بریندارە.

بیروڕای تۆماس دەربارەی سروشتێتی (یان ژیرێتی) دەوڵەت بەستراوە بە چەمکی ***دەستووری سروشتەکی*** یەوە. دەراوی تۆماس بۆچوونیەتی دەربارەی سروشتی مرۆڤ: سروشتی دەوڵەت دەبێ هاوجۆری سروشتی مرۆڤ بێت، چونکە دەوڵەت بریتییە لە یەک گرتنی مرۆڤگەل.

ئەریستۆ گوتبووی مرۆڤ بوونەوەرێکە لە ***شارەدەوڵەت*** *Polis* دا دەژی. پاشان هەر لە سەردەمی دێریندا، ئەم گوتەیە بەوە لێکدرایەوە کە مرۆڤ ***گیانەوەرێکی سیاسییە***. بەڵام تۆماس دەیگوت مرۆڤ ***گیانەوەرێکی سیاسی و کۆمەڵایەتییە***. لەوە دەچێ بیەوێت ڕاڤەیەکی پڕاوپڕ و تەواوی مەبەستەکەی ئەریستۆ بدات. (لێرەدا زاراوە دەبێتە کێشە. لەو

تەرجەمەیەی ***سیاسەت*** ی ئەریستۆ کە تۆماس بەکاری دەهێنێ هاتووە کە مرۆڤ *animal civile* یە بەڵام تۆماس دەڵێ مرۆڤ *animale politicum et sociale* یە. بۆ ئەوەی بە هەردوو جێناوی *politicum* و *sociale* وشەی *civile* پڕ بکاتەوە). لەگەڵ ئەوەشدا جودا کردنەوەی سروشتی سیاسی و کۆمەڵایەتی مرۆڤ بێمەبەست نییە. تۆماس ناڵێ لایەنی کۆمەڵایەتی و سیاسی مرۆڤ دوو خەسڵەتی جیاواز و سەربەخۆن بەڵام بە کردەوە لایەنی کۆمەڵایەتی (کە خەڵک بەگشتی بە یەکەوەیە) و سیاسی (کە ژیانی هاوکۆیان بە شێوەیەکی دیاریکراو رێک دەخرێ و دەبرێ بە رێوە) جیا دەکاتەوە. بەو جۆرە سروشتی کۆمەڵایەتی گشتیترە لە سروشتی سیاسی و دەبێتە بنەمایەک بۆ دووەمیان. یەکێک لە ئەرکە هەرە گرنگەکانی سازمانی سیاسی، ئەوەیە پێداویستی کۆمەڵایەتی مرۆڤ رەچاو بکات.

کە ئەریستۆ گوتوویەتی مرۆڤ گیانەوەرێکی سیاسییە مەبەستی ئەوە نەبووە خەڵکی هەموو وەک یەکن یا خاوەنی یەک سروشتن. بە پێچەوانە، هەبوونی مرۆڤ وەک گیانەوەرێکی سیاسی پێوەندە بەوەی مرۆڤ جودان. بەشێکیان ژیرن و وا چاکە ئەوانەی دیکە بەرن بەرێوە، بەشێکیان نازیرن بەڵام خاوەن لەشی بەهێزن لەبەر ئەوە دەبێ ببنە ئامرازێک بەدەست ژیرانەوە.

بەرانبەر ئەوە، لە نۆڕینی ستۆیکیزمدا، کە لە مەسیحایەتیشدا رەواجێکی گەورەی هەبوو، مرۆڤ لە رووی سروشتەوە وەک یەکن و ئەو جیاوازییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەی نێوانیان، ئەگەرچی دروست و پێویستە بەڵام هیچ بنەمایەکی لە ماکی مرۆڤدا نییە.

تۆماس لە تینی ئەو بۆچوونانە بە دوور نەبوو کە لە نەریتی مەسیحایەتیدا پەیوەستی چیرۆکی بەهەشت و گوناهی ئادەم و حەوا بوون. بەڵام ئەوەندەش نێزیکی ئەریستۆ بوو کە لایەنی لەیەک نەچوونی ماکی مرۆڤان هەڵداتەوە بەسەر لایەنی لەیەک چوونی ماکیاندا. چەندین مامۆستای گەورەی کڵێسە - کە ئۆگوستینوس یەکێکە لەوان - روونیان کردبۆوە کە خودا مرۆڤی کردۆتە سەروەر بەسەر گیانەوەراندا نەک بەسەر مرۆڤی دیکەدا. واتە ئەوە دیاردەیەکی ناسروشتی و ئەنجامێکی تاوانەکەیە کە کەسێکی دیکە دەکاتە ژێردەستەی خۆی، چ خزمەتکار بێت چ کۆیلە.

تۆماس لەگەڵ ئەوەی تەواو بڕوای بەو بۆچوونە هەیە، دەڵێ ***کۆیلەیەتی*** دۆخێکی ناسروشتەکییە، چونکە مرۆڤ - کە وێنەیەکە لە خودا - تەنیا بە هۆی گوناهبارییەوە دەبێتە ئامرازی مرۆڤێکی دیکە. لێرەدا تۆماس بە روونی لە بۆچوونی ئەریستۆ لادەدات. بەڵام دەبێ ئەوەشمان لە یاد بێ کە کۆیلەیەتیی تەواو دیاردەیەک بوو، لە دنیای بەرچاوی تۆماسدا، بوونێکی ئەوتۆی نەمابوو.

بەلام، بە نۆڕینی تۆماس، جۆری دیکەی ژێردەستی سروشتەکییە. لە هەموو شتێکی دروستکراودا ڕێکخستنێکی سروشتەکی هەیە، هەروەها لە مرۆڤیشدا «مرۆڤی زۆر زیرەک بە شێوەیەکی سروشتانە ڕێبەرایەتی دەگرنە دەست، ئەوانەی دیکەش کە کەمتر بەهرەدارن بەلام لەشیان پتەوە، سروشتانە بۆ ئەوە تەرخان کراون بەو شێوەیە خزمەت بکەن کە ئەریستۆ لە *سیاسەت* ـەکەیدا باسی دەکات».

تۆماس دەڵێ پەشۆکان، نائارامی و بێدەستووری لە کۆمەڵگەدا لەوەوە پەیدا دەبێت کە کەسانی بەهێز بەلام لە ڕووی هۆشەوە کەم بەهرە، بە زەبری هێزی لەش یان لە ڕێی هۆکاری سۆزەوە - نەک هۆشەوە - دەسەلات دەگرنە دەست. کۆمەڵگەی وەها ناسروشتەکییە با بەشێکیش بێت لە پلانێکی خودایەکی بۆ تاقیکردنەوەی خەڵک.

نۆڕینی تۆماس بەرانبەر دەوڵەت - هەر وەک ئەوەی ئەریستۆ - تاڕادەیەکی بەرز زیندەڵ و دژەتاکەکیەتی anti-Individualism یە. لە دەوڵەتی چاکەدا هاوکاریی کۆمەلانی سەر بە پیشەی جۆراوجۆر هەتا پلەیەکی بەرز هاوئاهەنگە. ئەوەش دەرمانە بۆ پێداویستییەکانی ژیان. کاسبکارانی هەمە جۆر، جووتیاران و خاوەن پیشەکان... هتد ئەرکی خۆیان جێبەجێ دەکەن و لە پلە و پایە و کەموکوورییەکانی خۆشیان ئاگادارن. یەکێک لە ئەرکەکانی ڕشتەی سیاسی ئەوەیە پێوەندییە کۆمەلایەتی و ئابوورییەکان بسازێنێ. خۆشگوزەرانیی مایەکی، ئەگەرچی لە هەمووان گرنگتریش نەبێ، نیشانەیەکە بۆ چاکیی دۆخی سیاسی. تۆماس دەڵێ پاشا، فەرمانڕەوای دادپەروەر، بە چاکەی دنیایەکیش بەرەکەتمەند دەبێ، بەلام ستەمکار، فەرمانڕەوای دادنەناس، پێوەندییە ئابوورییەکان تێک دەدات.

لەوانەیە ئەم بیرانەی سەر بە خۆشگوزەرانی مایەکی بە ئاسانی بە هەڵەماندا ببات. لە جیهاننۆڕیی سەردەمی ناڤیندا، بیری بەرەوپێش چوونی ئابووری بوونی نەبوو - بیری وەها زۆر درەنگتر پەیدا بوو. کاتێک تۆماس یان هەر بیریارێکی دیکەی سەردەمی ناڤین دەڵێ: بار و دۆخی مایەکی چاکەیە، مەبەستیان ئەوەیە هەر لایەکی کۆمەڵگە، هەر بەشێک، *بە پێی حاڵی خۆی بژێوی هەیە*. ئەمەش بیرێکە تاوی خوداناسی و فەلسەفەی لەسەرە. شیرازەیەکی سروشتەکی هەیە بەش و پلەی ڕەوا دەدات بە هەر چینێک. لە پێوەری بەرفرەوانی سروشتدا، مرۆڤ لە نێوان گیانداران و فریشتەدا، جێی بۆتەوە. بەلام لە نێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیشدا پلەداری هەیە، پلە و پایە بڕیار دەدات چ سوودێکی مایەکی بەر ئەم یان ئەو توێژەی کۆمەڵگە بکەوێت. کەواتە سروشت هەر لە سەرەتاوە و یەکجارەکی بڕیاری داوە میرێک، پیرێکی کلێسە، وەستای پیشەیەک یان ڕەشەجووتیارێک چەندی لە

خۆشی ژیان بەردەکەوێ. لە کۆمەڵگەیەکدا ئەگەر جووتیاران و وەستایانی پیشەی دەستەکی لە هەمان ئاستدا بن یان وەستایەک هێندەی مەترانێک خۆش بژی ئەوا ئەو کۆمەڵگەیە ناژیرانەیە. ئەوە کاری دەوڵەتە کە خێر بە دروستی دابەش بکات و ڕێگە نەدات نە کەس یەکجار کەمی بەرکەوێت و نە کەس یەکجار زۆری بەرکەوێت لەو بەشە باش کێشراو و حیسابکراو و لەبارەی خودا بە مرۆڤی داوە.

ئەم هاوئاهەنگییە ئابوورییە دیاریکراوەیە کە دەبێتە نیشانەی چاکیی ڕشتەیەکی سیاسی. جگە لەوە، دەوڵەت، ئامانجی دیکەی بەرزتریشی هەیە. لە تێبینییەکدا دەربارەی ئەریستۆ، تۆماس دەڵێ ژیانی سروشتەکی مرۆڤ لە کۆمەڵگەدا، تەنیا ئەو شتە مایەکیانە نادات بە مرۆڤ کە بۆ هەبوونی پێویستە بەڵکوو «تێری گیانەکی» ـشی دەداتێ.

لەم بیرەدا، تۆماس لەگەڵ یەکێکی وەک مارسیلیوسی پادوادا ناکۆک نییە، دیارە هەردووکیان ڕێچکەی ئەریستۆیان گرتۆتە بەر. بەڵام بۆچوونی تۆماس و مارسیلیوس دەربارەی ئەوەی کامەیە بەرزەئامانجی دەوڵەت، جودایە. بە نۆڕینی تۆماس ئەوەی کاتەکی و نێودنیایەکییە دەبێ هەردەم لە ژێر ئەوەوە بێت کە هەمیشەکی و ئاسمانەکییە. دەوڵەت تەنیا بەوە دەبێتە دەوڵەتی چاکە کە هەموو بنگەکانی وەها ساز درابن کە ڕاستەوخۆ ڕێگەی هەوڵدانی مرۆڤ، بۆ ژیانی هەمیشەکی، خۆش بکەن. بە بۆچوونی مارسیلیوس و بیریارانی دیکەی سەدەی چواردەیەم، دەبێ هەموو سەروکارێکی نێودنیایەکی تەواو سەربەخۆ بێت و نابێ بخرێتە ژێر فەرمانی دەستووری خوداکرد و باوەڕی کڵێسەوە.

جیاوازیی نێوان بۆچوونی تۆماس و مارسیلیوس لە باسی *دەستوور* دا تەواو ئاشکرا دەبێت، پاشان دێینە سەر ئەو باسەش.

وێڕای ئەوەش کێشەیەک هەیە، دیمانەی سیاسیی تۆماس و مارسیلیوس، کۆ دەکاتەوە. ئەوەش کێشەیەکی نوێ نییە، بەپێچەوانە، لە سەرلەبەری مێژووی بیری سیاسیدا بەردەوامە. بەڵام بەتایبەتی لە فەلسەفەی سیاسیی ئەریستۆکراتانەی سەردەمی ناڤینی بەرزدا، پتر دیارە.

فەلسەفەی سیاسی لافی گشتیەتی لێ دەدات. لافی ئەوە لێ دەدات کە ئەوەی پێشانت دەدا هێڵی سەرەکییە بەرەو باشترین ڕشتەی سیاسیی گشت دنیا. بەڵام، لە هەمان کاتدا، تەنیا لە یەک ڕشتەی سیاسیی دیاریکراودا کە گرێدراوە بە شیرازەیەکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە و بە ئاوهەوایەکی فیکریی تایبەتەوە، ئەو فەلسەفە سیاسییە دەرفەتێکی ڕاستەوخۆی خستنەکاری هەیە.

دەتوانین بڵێین شارەدەوڵەتی یۆنانی، بەو شێوەیەی ئەریستۆ لە *سیاسەت* دا نەخشاندوویەتی، بۆ دیمانەی سیاسیی تۆماس و مارسیلیوس، بووبوو بە نموونەی یەکەم. هەردووکیان لەوە ئاگادارن کە حوکومڕانیی ئەورووپای سەردەمی خۆیان، بە هۆی ئەو هێزەی کڵێسەی مەسیحایەتی پەیدای کرد، دەبێ جیاواز بێت لە دەوڵەتە یۆنانییەکانی سەردەمی دێرین، ناکۆکی نێوان کڵێسە و دەوڵەت باسێک نەبوو ئەریستۆ بیناسێ. ئەوەی لێ دەرەچێ، بە هەردووکیان، هەوڵیان داوە بیروڕا و چەمک و هەڵاواردنە سەرەکییەکانی دیکە لە ئەریستۆوە بخوازنەوە.

ئەو حوکومڕانییانەی ئەمان دەیانویست بڕیار لەسەر سروشتیان بدەن، هەمە جۆر بوون. لە ئیتالیای زێدی خۆیان، چەندین دەوڵەت هەڵنرا، ئەم دەوڵەتانە لە ڕووی خەسڵەتی گشتی، بەرتەسکیی ڕووبەر و چالاکیی بازرگانییان، دەکرا بە هاوشانێکی هاوچەرخی بەشێک لە شارە- دەوڵەتەکانی یۆنانی دابنرێ. بەتایبەتی تۆماس کە شارەزای دەوڵەتی نەتەوەییی فرانسی هەڵکشاو بوو. لە بواری جیهانئۆڕیی سیاسیدا، کە هەردووکیان تێیدا مامۆستا و چالاک بوون، قەیسەرنشینیی ئەڵمانی - ڕۆمانی هێشتا ئۆرەیەکی گرنگی دەبینی - بە خەسڵەتی فیودالانەی وشک و هەر لەو دەمەدا بەسەرچووەی، بە بەرفرەوانیی ئاسۆبەدەری، بە پێوەندیی شل و نادیاریکراوی نێوان قەیسەر و هەرێمدارەکان، نێوان سەرکردە و ژێرکردە. لەم حوکومڕانییە جیاوازانەدا دەسەڵاتی سیاسی خەسڵەتی تەواو جیاوازی هەبوو، هەر لە بەڕێوەبەرایەتی مەیلەو ڕاستەوخۆ هەتا شلەپێوەندیی وەها کە لەسەر بڕوا و پەیمانی شەرەف بنیات نراو، هەبوون. بەڵام ئەگەر تۆماس یان مارسیلیۆس - کە پەیڕەوانی ئەریستۆ بوون - ڕاستەوخۆ بیان گوتایە حوکومڕانی سنووردراو تاکە نموونەیە بەڕاستی چاک و جێی باوەڕ بێت، ئەوا دەبووە هەنگاوێکی دژوار لە لایەن ئەوانەوە. چونکە خواستی ئەوان ئەوە بوو دیمانەی سیاسیی خۆیان وەها دابنێن بۆ حوکومڕانیی جۆراوجۆر دەست بدات.

بەڵام ئەوەی دیارە و جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە تۆماس باس لە ئیمپەراتۆرایەتییەکە - واتە قەیسەرایەتییەکە - ناکات، ئەگەرچی هەموو گوتەیەکی جێگەی خۆی لەو ناکۆکییەدا دەکاتەوە کە لە نێوان دەسەڵاتی قەیسەر و دەسەڵاتی پاپادا هەبوو. دەربڕینەکانی دەربارەی بەرفرەوانی دەوڵەت، تا ڕادەیەک ناڕوونن، باس لە «شار یان هەرێم» دەکات، دەڵێ شار دەبێ هێندە گەورە بێ دانیشتوانی ئەو «تێریی ژیان» ـەیان هەبێ کە لە لایەن ڕشتەی سیاسییەوە دابین دەکرێ. بەڵام ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە هەرێمی بەرفرەوان ئاسوودەترە بەرانبەر دوژمنان.

مارسیلیوس درەنگتر دەژی و فریا دەکەوێ فراژووتنی بەردەوامی شارەدەوڵەتەکانی ئیتالیا ببینێ و شارەدەوڵەت دەکاتە دەراوی بیری سیاسیی خۆی. ئەوەی ئەو دەیڵێ دەربارەی خەڵک و دەستوور، تەنیا لەوێدا، ڕاستەخۆ جێی دەبێتەوە. بەڵام ئەو پێی وایە ئەو بنەمایانەی ئەو باسیان لێوە دەکات بۆ هەموو ڕشتەیەکی سیاسی دەست دەدەن و بەرهەمەکەی *Defensor pacis* لە ململانێی نێوان قەیسەر و پاپادا بە بەرهەمێکی هێندە گرنگ دانرا کە مارسیلیوس، لە لایەن پاپاوە، نەفرەتی لێ کرا و کوڕی مەسیحایەتی لێ حەرام کرا و بە کوڕی شەیتان لەقەڵەم درا. بەڵام قەیسەر بەخێری هێنا کە ببێتە دوکتۆری قەیسەر و ژیانێکی خۆش و نایاب بباتە سەر.

**٣- دەستووری خوداکرد و مرۆڤکرد و سروشتەکی**

چەمکی ***دەستوور*** لە بیری سیاسیی هەموو سەردەمی ناڤیندا شاپلەی هەیە. لە سەدەی دوازدەیەم و سێزدەیەمدا، سەرلەنوێ دیراسەتێکی چڕی ***مافی ڕۆمانی*** و بەتایبەتی بەرهەمی *Corpus juris civile* کە لە سەدەی شەشەمدا، قەیسەر Justinianus داینابوو، سەری هەڵدا و بووە هۆی ئەوەی گوتوبێژ لە ناوەڕۆک و ڕەوایەتیی دەستووران دەوڵەمەندتر بێ و پتر وردەکاری تێدا بکرێ. تەنانەت ئەو نەریتی سەر بە ماف و دادپرسییەی بە سەدان ساڵ لە کڵێسەدا گەشەی دەکرد و بەدەرس دەگوترایەوە، کۆکرایەوە و لە شێوەی مافی قانوونیدا نووسرایەوە.

لە مافی ڕۆمانیدا، بنگەیەکی دەوڵەمەند و ئامادە لە زاراوە و چەمکی وەها هەبوو بیریارانی سەردەمی ناڤینی بەرز بتوانن سوودی لێ ببینن و گەشەی پێ بدەن. سوود وەرگیرا لەو جیاوازییەی نێوان مافی سروشتەکی *ius naturale* و مافی گەل *ius gentium* و مافی سیڤیل *ius civile* و زاراوەی تازەبابەتی بەسوود پەیدا بوون، وەک ***مافی دانانەکی*** (و ***دەستووری دانانەکی***). مەبەست لە دەستووری دانانەکی ئەو بارودۆخەی دادپرسییە کە لە کۆمەڵگەدا جێگیرە، لە دەوڵەتدا یان هەر بنگەیەکی دەوڵەتاسادا، دەستووردانەران دەستووری دانانەکی دادەنێن.

پرسیاری گەورەی سەرەکی، گەر بەم زاراوانە بکرێت، ئەمەیە: دەستووری دانانەکی چ پێداویستییەکی هەیە بۆ ئەوەی ڕەوایەتییەکی گشتیی هەبێ؟ یان ئایە دەستووری دانانەکی چ ڕەسمییەتێکی هەیە؟ ئایە مەرجە دەستووری دانانەکی لەگەڵ دەستووری سروشتەکیدا بگونجێت؟ یان دەشێ نۆرینی سەر بە دەستوورێکی سروشتەکی، کە گشتگیرانەیە، وەلا

بنێن و بڵێین دەستووری دانانەکی فلانە دەوڵەت، لەبەر ئەوەی گەل بە هەر شێوەیەک بێت لە سەری ڕێککەوتووە، ڕەوایە.

مارسیلیوس، لە سەردەمی ناڤیندا، نوێنەرێکی هەرە بەرچاوی ئەم دوا بۆچوونەیە. تۆماسیش ئەو کەسە بوو کە بەوپەڕی هێز و ئاشکراییەوە، نوێنەرایەتی بۆچوونی پێشووتری دەکرد و دەیگوت مافی دانانەکی، بۆ ئەوەی پێش هەر شتێک ناوی مافی لێ بسلەمێنرێت، دەبێ بنچی لە بنەما گشتگرەکانی سەر بەو مافەدا هەبێ.

تۆماس چوار جۆر دەستوور لەیەک جودا دەکاتەوە (و بەو جۆرە مافیش دەگرێتەوە: ماف و دەستوور گرێدراوی یەکن، ماف واتە ئەوەی ڕێگەی پێ دراوە، دەستوور واتە ئەوەی کراوە بە فەرمان). تۆماس باس لەم جۆرە دەستوورانە دەکات: دەستووری هەمیشەکی، دەستووری خوداکرد، دەستووری سروشتەکی و دەستووری مرۆڤکرد. دەستووری خوداکرد پلەی تایبەتی خۆی هەیە و ڕێک تەورات و ئینجیل دەگرێتەوە. دەستووری سروشتەکی (یان دەستووری سروشت) سەرچاوەی لە دەستووری هەمیشەکییەوە هەڵگرتووە. دەستووری مرۆڤکردیش، بۆ ئەوەی دەستوورێکی ڕەوا بێت، دەبێ لەگەڵ دەستووری سروشتەکیدا بگونجێت.

دەستوور بەلای تۆماسەوە فەرمانی ژیرایەتییە. خودا دنیای بە پلانێکی تایبەتی دروست کردووە، کە گوتیشت فلانە شت بە پێی دەستوور دەچێ بەڕێوە دەکاتەوە ئەوەی لە ئەنجامدا بەشێوەیەک دەبێت لەگەڵ مەبەست و پلانی خودادا ڕێک بکەوێت.

دەستووری هەمیشەکی پلانی ئافراندنی خوداکرد دەردەبڕێ. لەبەر ئەوەش هەموو شتێک دەگرێتەوە، ژیندار و ژیننەدار، ژیر و ناژیر. بەرد کە بەرەو زەوی بەر دەبێتەوە بە پێی دەستووری هەمیشەکی دەبزوێ، تۆو پێڕەوی دەستووری هەمیشەکی دەکات و بەرەو گوڵ کردن هەڵدەکشێ. دەستووری هەمیشەکی، لە شێوەی مەیل یان هێزی هاندەردا، خراوەتە نێو هەموو شتێکەوە. شتی ناژیر - تەنی بێگیان، ڕووەک و گیانەوەر - هیچ دەرفەتێکی سەرپێچییان نییە لەم دەستوورە هەمیشەکییە، بەڵام مرۆڤ، کە خاوەنی ویستی ئازادە، دەتوانێ ئەو کارە بکات. دەستووری هەمیشەکی لە هیچ ڕوویەکەوە لە تێکستی قانوونی ناچێت کە ڕێبازی مەرجداری دیاریکراوی هەیە. دەستووری هەمیشەکی، شتی هەمە جۆر دەبات بە ڕێوە، بابەتی هەمەجۆر بە پێی سروشتی تایبەتی خۆیان گەشە دەکەن و دەچن بە ڕێوە. ئەگەر دەستووری هەمیشەکی بە وشە بنووسرایەتەوە، دەبا سروشتی ئەسپ و کۆسارانمان بۆ ڕوون بکاتەوە.

پێوەندی مرۆڤ بە دەستووری هەمیشەکییەوە، بەوەی مرۆڤ خاوەن هۆش و ویستێکی ئازادە، جودایە لە پێوەندی بوونەوەری دیکە. لەبەر ئەوەیە تۆماس باس لە دەستووری سروشت (یان دەستووری سروشتەکی) ی تایبەت بە مرۆڤ دەکات. دەستووری سروشتەکی، دەستووری هەمیشەکییە و بۆ مرۆڤ گونجێنراوە. مرۆڤ لە ڕێی هۆشیاریی خۆیەوە دەتوانێ زانیار دەربارەی سروشتی ڕاستینەی خۆی پەیدا بکات و بەو جۆرە بە ناسینی دەستووری سروشتەکی بگات.

بوونەوەری دیکە هەر ***ئەوەن*** کە ***دەبا وەهابن*** واتە ناتوانن سەرپێچی لە سروشتی خۆیان بکەن. بەلام مرۆڤ، هەموو کاتێک، ئەوە نییە کە دەبا ببێ، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ دەتوانێ بەو زانینە بگات کە پێی دەڵێ دەبا وەها بێت. واتە دەتوانێ دەستووری سروشتەکی بناسێت.

پێشتر باسمان لە نۆڕینی تۆماس کرد دەربارەی سروشتی مرۆڤایەتی - مرۆڤ بوونەوەرێکی سیاسی و کۆمەڵایەتییە. لە *Summa thiologica* دا دەڵێ بنچی هەموو فەرمانەکانی دەستووری سروشتەکی ئەوەیە کە «چاکە خواستی هەمووانە». بەلام ئەگەر نەزانین چاکە چییە ئەو گوتانە سوودێکیان نییە. تۆماس - وەک ئەریستۆ - پێی وایە هەرەمێک لە چاکە و ئامانجی وەها هەیە شایانی ئەوە بن هەوڵیان بۆ بدرێ. چاکەی هەرە بەرز خودایە، لەبەر ئەوەش ئامانجی هەرە لەپێش، کە مرۆڤ دەبێ هەوڵی بۆ بدات، خودا و شادمانیی بەهەشتییە. هەموو هەوڵ دانێکی دیکە لە پاش ئەوەوە دێت.

کەواتە دەستووری سروشتەکی وەها دەخوازێ سەروکاری دنیایەکی بخاتە پاش چاکەی هەرە بەرز. باسی ئەوەمان کرد کە تۆماس پێی وایە خودی گوزەرانی سیاسی و کۆمەلایەتی چاکە و سروشتەکین. بەلام لە ڕووداوێکدا، کە دەسەلاتی دنیایەکی و شکۆداری و سامانی مایەکی، تێیدا ببێتە ئامانجی سەرەکی مرۆڤ، ئەوا ئەوانەش دەبنە بابەتی خراپە. شیرازەی سروشتەکی دەشێوێنرێت.

ئاشکرایە ئەم بۆچوونانەی تۆماس دەربارەی دەستووری سروشتەکی، کار دەکەنە سەر ململانێی نێوان کڵێسە و دەسەلاتی دنیایەکی، پاشان دێینەوە سەر ئەو باسە. بەلام بۆچوونەکانی تۆماس زۆر کەم لەوە دەدوێن دەستووری مرۆڤکرد دەبێ چۆن بێت بۆ ئەوەی لەگەڵ دەستووری سروشتەکیدا بگونجێت. تۆماس دەستووری سروشتەکی دەکات بە دوو بەشەوە: ئەوەی لە ***مافی گەل*** دا نووسراوەتەوە و ئەوەی لە ***مافی سیڤیل*** یان ***مافی کەسەکی*** دا نووسراوەتەوە (لە نەریتی دەستوورناسیی ڕۆمانیدا زاراوەی *ius gentium* و *ius naturale* دیاری کراون، بەلام لای تۆماس وەها نییە). «ئەو بڕیارانەی لە دەستووری

سروشتەکییەوە سەریان هەڵداوە و ئەو ئەنجامانەی لە شی کردنەوەی لۆگیکانەوە پەیدا دەبن، وەک دادپەروەری لە کڕین و فرۆشتندا و بڕیاری لەو بابەتەی ئەوتۆ کە مرۆڤ بێ ئەوانە ناتوانێ بژی» بەشێکن لە مافی گەل. مافی کەسەکی ڕوون کردنەوی دیکەشی تێدایە، هەڵبەتە ئەویش نابێ لەگەڵ مافی سروشتەکیدا ناکۆک بێت. لەگەڵ ئەوەشدا جۆرە ئازادییەک دەدات بە تاکەتاکەی دەوڵەتان کە خۆیان «بڕیار لەسەر ئەوە بدەن چ شتێک لەگەڵ ئامانجەکانیاندا دەگونجێت».

کەواتە مەبەست لە دەستووری سروشتەکی ئەوە نییە چۆنیەتی دەستوورگەلی یەکەیەکەی دەوڵەتان بە ڕوونی پێیان بدات. ڕاستە تۆماس دەڵێ پێوەندیی ئابووری و کۆمەڵایەتیی نێوان چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگە ئەگەر سروشتەکی بێت ئەوا ئەو کۆمەڵگەیە شیرازەیەکی سروشتەکی تێدایە، بەڵام ئەوەش دەڵێ کە دەستوورە دانراوەکانی ئەو کۆمەڵگەیانە مەرج نییە هەردەم وەک یەک بن. «ئەگەرچی دەستوور گۆڕین مەیلێکی پێوەیە بۆ تێکدانی خۆشگوزەرانی کۆمەڵگە، چونکە خووگرتن، لە پێڕەو کردنی دەستووردا، دەستی هەیە». لەگەڵ ئەوەشدا، دەشێ دۆخی ئاکارەکی، لە دەوڵەتدا، کەم یان زۆر بەرەو چاکە بێت، بۆ بەڵگەش ئاماژە بە گوتەکەی ئەریستۆ دەکات کە دەڵێ ئەگەر گەل ئەرکی خۆیان بەجێ بێنن ئەوا کارێکی ڕەوایە ڕێبەرانی خۆیان هەڵبژێرن. بەرانبەر ئەوەش ئەگەر ڕادەی ئاکاری گەل دابەزێت ئەوا دەبێ مافی هەڵبژاردن بدۆڕێنن.

کەواتە تۆماس پێی وایە کە، بە پێی پێداویستیی دەرەکی، دەکرێ لە خاڵی گرنگدا دەستکاریی دەستووری دانانەکی بکرێت. شایانی باسە کە دەستووری سروشتەکی ڕێگە بە هەبوونی ڕشتەی سیاسیی جۆراوجۆر دەدا. دەستووری سروشتەکی بڕیاری ئەوە نادات دەسەلاتی دەوڵەت چ جۆرە ڕێکخستنێکی ڕەسمی هەبێت، بەڵکوو، باس لەوە دەکات چۆن بە چاکە دەگەیت، بۆ ئەو ئامانجەش لەوانەیە لەم دەوڵەتەدا فلانە شێوەی حوکومڕانی باش بێت، لە دەوڵەتێکی دیکەدا شێوەیەکی دیکە.

بەهەر حاڵ، ئەوەی هەرە گرنگە لە بۆچوونەکانی تۆماسدا ئەوەیە هەموو دەستوورێکی دانانەکی و دۆخێکی سیاسیی هەڵکەوتوو دەبێ بە هەمان پێوەری ئاکارەکی بپێورێن. هەر لەم خاڵەشدایە کە بەتایبەتی لە سەدەی پاش خۆی بەربەرچ دەدرێتەوە.

مارسیلیوس - یش وەک تۆماس چوار جۆر دەستوور لە یەک جودا دەکاتەوە، بەڵام دوانیان داوای سەرنج دانێکی تایبەتی دەکەن: دەستووری خوداکرد و دەستووری مرۆڤکرد. بە ڕای مارسیلیوس هاوئاهەنگی لە نێوان دەستوورە جۆراوجۆرەکان پەیدایە. ئەو دەستووری خوداکردەش کە خراوەتە نێو تەوجیلەوە، هەر ئاوڕۆی دەستووری

هەمیشەکییە بەڵام زانیاری دیکە دەدەن بە مرۆڤ ئەوەش لە ڕێی ڕاستیی خویاوە (واتا ئەو ڕاستییەی کە مرۆڤ ناتوانێ تەنیا لە ڕێی بەکارهێنانی هۆشەوە درکی بکات).

بە ڕای مارسیلیوس دەستووری خوداکرد و دەستووری مرۆڤکرد دوو جۆرە دەستووری جیاوازن و ناوەڕۆکی هەریەکەیان سەربەخۆیە. مارسیلیوس لایەنگری ئەو بۆچوونەیە کە دەڵێ دوو جۆر ڕاستی هەیە، ڕاستییەکی دنیایەکی، کە هۆشی مرۆڤ بێ یارمەتی درکی دەکات، و ڕاستییەکی خویا، کە ڕاستییەکی دینەکییە. ئەم بۆچوونە، لە بواری سیاسەتدا، ئەنجامەکەی ئەوەیە باوەڕی کڵێسە پێوەندی نەبێت بە دەستوورگەلی دەوڵەتەوە – کڵێسە سەرگەرمی ڕاستیی خویا دەبێ و مەزنایەتیی دنیایەکیش تەنیا هۆشی مرۆڤەکی دەکات بە دەراو.

تۆماس پێی وابوو هەمان پێوەری ئاکارەکی (هەمان دەستووری سروشتەکی) بۆ هەموو کۆمەڵگەیەک دەبێ دەست بدات. مارسیلیوس نیسبییەت relativism یکی ڕوون دەردەبڕێ: هەر دەوڵەتە نەریتی خۆی هەیە، مەرجی تایبەت بە خۆی هەیە وەک ئاووهەوا و جێگە... هتد. مارسیلیوس لەمەشدا بەڵگەیەکی دیکە دەبینێت بۆ جیاوازی نێوان کڵێسە و دەوڵەت. کڵێسە دەبێ هەمیشە یەک باوەڕ بێ. دەوڵەتان دەشێ و دەبێ دەستووری جۆراوجۆریان هەبێ. مارسیلیوس لە نێو هاوچەرخانیدا، لەم بیرەی نیسبییەتی سیاسییدا تەنیا نەبوو. ئەم بیرە لە سەدەکانی پاش خۆی، لە بیرکردنەوەی سیاسیدا، جێگەیەکی تاڕادەیەک لەپێشی گرت.

کەواتە بە نۆڕینی مارسیلیوس بڕیار دان لەسەر دەوڵەتی جۆراوجۆر دەبێ بە ڕەچاوگرتنی بارودۆخی دەوڵەتەکان بێت نەک بە پێوەری ئاکارنامەی گشتی. هۆی ڕاستەوخۆی ئەمەش لەوەدایە کە دانانی دەستوورگەلی ئەم یان ئەو دەوڵەتە تەنیا ئەرکی گەلە، ئەرکی هاوزێدانی ئەو دەوڵەتەیە. تۆماس پێی وابوو تاوی گەل لەسەر بنگەی دەوڵەتی بەندە بە ئاستی ئاکارەکی گەلەوە بەڵام مارسیلیوس پێی وابوو ئەوە مەرجێکی بنەڕەتییە کە گەل لە ڕێی دەستوور دانانەوە تاوی لەسەر دەوڵەت هەبێ.

لێرەدا ئاشکرایە کە مارسیلیوس دۆخی شارەدەوڵەتی نوێی ئیتالیای ڕەچاو گرتووە. بەو ڕێگەویان و دانوستاندنەی سەدەی چواردەیەم، کاریگەریەتی گەل بەسەر دەوڵەتدا، بەو شێوەیەی ئەو باسی لێ دەکات، لە دەوڵەتی بەرفرەواندا نەدەکرا. کاتێک مارسیلیوس باس لە کاریگەریەتی گەل دەکات، مەبەستی ئەوە نییە هەموو ئەو کەسانەی لە چوارچێوەی دەوڵەتدا دەژین هەمان کاریگەریەتییان لەسەر دەستوور هەبێت.

هەر وەک بیریارانی شارەدەوڵەتی یۆنان، ئەمیش پێی وایە کۆیلە، کەسانی نیشتەجێ و ژنان ناشێ ڕێگەیان بدرێ بێنە دنیای دەسەڵاتی سیاسییەوە. لەوەش بترازێ، دەڵێ جۆری کاریگەریەتی بەشە نرخدارەکەی گەل، لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی دیکە دەگۆڕدرێ. دەشێ گەل دەسەڵاتی خۆی بخاتە ئەستۆی ئەنجومەنێکی ڕێبەرەوە. گرنگ ئەوەیە بتوانیت بڵێیت ئەو گەلە، ڕاستەوخۆ یان تیان، ئەو دەستوورانەی داناوە کە خۆی گوزەرانی لە سایەیاندا دەکات.

تۆماس پێی وایە گەلی ئاکار نزم ئازادیی سیاسیی خۆی بە شێوەیەکی خراپ بەکار دەهێنێ و بڕیاری گەوجانە دەر دەکات. مارسیلیوس ئەو بیرە پەسەند ناکات: بڕیارێک لە لایەن گشت گەلەوە دەرچووبێ دەبێ بڕیاری سەر بە چاکە بێت، ئەمەش بەلایەوە ڕاستییەکی بەڵگەنەویستە.

گەر لە ڕوانگەیەکی فرەوانترەوە لێی بنۆڕین دەبینین گرنگترین جیاوازیی نێوان ئەو بیرکردنەوەیەی، تۆماس نوێنەرێتی و ئەوەی مارسیلیوس نوێنەرێتی، ئەوەیە تۆماس پێی وایە بنگەی سەر بە سیاسەت وەک بنگەی دەستووردانەر و دەسەڵاتی بەجێهێنەر... هتد دەبێ بخرێنە ژێر سایەی ئامانجێکی تایبەتییەوە، بەڵام مارسیلیوس پێی وایە کاتێ بنگە سیاسییەکان جێگیر بوون ئەوا ئامانجەکانیش دەپێکرێن. ئەمە جیاوازیی بۆچوونە لە ئاست ئامانجی سیاسەت و ئامرازی سیاسەت، و هەتا ئەمڕۆش ئەم جیاوازییە هەر بەردەوامە.

بەڵام بێگومان ئەو بیروڕایەی تۆماس و مارسیلیوس، پتر ڕاستەوخۆ تێیدا کاریگەر بوون، بواری پێوەندیی نێوان کڵێسە و دەوڵەت بوو. تۆماس لەو مەسەلەیەدا هەڵوێستێکی تاڕادەیەک سازێن وەردەگرێ. کاتێک پاپاپەروەران، ئەوانەی زۆر بە دڵگەرمی پشتیوانییان لە دەسەڵاتی پاپا دەکرد، پێیان وابوو کە دەبێ دەسەڵاتی پاپا، و لەو ڕێگەیەشەوە کڵێسە، مەزنایەتییان بەسەر بنگەی دنیایەکیشدا هەبێ، تۆماس دەیگوت دەسەڵاتی دەوڵەت بە تەنیا بەرپرسی سەروکاری دنیایەکییە. بەڵام تۆماس هەردوو بنگەی دەوڵەت و کڵێسەی بە هاوشانی یەکدی دادەنا. ئەگەر دەوڵەت لە سنووری دەسەڵاتی خۆی دەربچێت، واتە لە دەستووری سروشتەکی و دەستووری خوداکرد لابدات، ئەو دەمە ئەرکی سەرشانی کڵێسەیە لێی ڕاست بێتەوە.

مارسیلیوس نەک هەر نوێنەرایەتی جیاکردنەوەیەکی بنەڕەتانەی کڵێسە و دەوڵەتی دەکرد بەڵکوو پێشی وابوو ئەگەر کڵێسە لە بوارێکدا ناچار بوو لە سەروکاری دنیایەکییەوە نێزیک بێتەوە ئەوا دەبێ کڵێسە سەر فروو بێنێ بۆ مەزنایەتیی دنیایەکی.

کارێکی ڕەوا و گونجاوە کە لە هەموو دەوڵەتێکدا کۆمەڵێک خەڵک دین بکەن بە پیشە - کەشیشایەتی بکەن. بەڵام کەشیشایەتی تەنیا چینێکە لە نێو چەندین چیندا. دەسەلاتیشیان دەبێ هەر ئەوەندە بێ کە ئاگاداری و ئامۆژگاری سەر بە شادمانیی گیانەکی بدەن بە خەڵک. کڵێسە هیچ ئەرکێکی بڕیاردەرانەی نییە لە کۆمەڵگەدا و ناشبێ هیچ سامانێکیشی هەبێ.

جگە لەوە مارسیلیوس بیروڕا دەربارەی شیرازەی ناوەکیی کڵێسە دەردەبڕێ. وەک چەندین کەسی دیکەی ماوەی نێوان سەدەی سێزدەیەم و چواردەیەم - بۆ نموونە ویلیەمی ئۆکهام William of Okham- دژ بەوە دەوەستێت کە پاپا بە تەنێ بڕیاری باوەڕ و کردەوەی کڵێسە بدات. مارسیلیوس دەڵێ بنگەی بڕیاردەری کڵێسە دەبێ ئەنجومەن Koncilium ێکی نوێنەرەکی بێت. ئەنجومەنەکە بە تەنیا بڕیاری ڕووگەی کڵێسە دەدات. هەر وەک ناشێ گەل، لە دانانی دەستووردا، بە هەڵەدا بچێت، هەروەهاش ئەنجومەنی کڵێسەش لە باوەڕی دروستی سەر بە کڵێسە، بەهەڵەدا ناچێت.

## ١- کۆمەڵگەیەکی نوێ، دەوڵەتێکی نوێ

هەڵوەشاندنەوەی پێوەندارییەتیی فیوداڵەتی لە سەدەی چواردەیەمدا دەستی پێ کرد و لە سەدەی پازدەیەم و شازدەیەمدا بەردەوام بوو و پەلەی لێ کرا. فیوداڵەتی داوای یەکەی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسیی وەهای دەکرد کە سنووردراو بێت و دەستووری وردی بۆ دانرابێت. پیشەی تایبەتی ئیمتیازێکی کەسەکی بوو، پێوەندیی نێوان سەرکردە و ژێرکردە پێوەندییەکی کەسەکی بوو. کاتێک دانوستاندن و ڕێگەوبان خۆشتر بوو، کاتێک ڕێگەی بازرگانی نوێتر و چوستتر کرایەوە، کاتێک شێوازی بەرهەمهێنانی نوێ هاتە کایەوە و جێگەی لە ڕشتەی دەستەی پیشەدارانی سەردەمی ناڤیندا نەدەبووە، فیوداڵەتی بووە کۆسپێک و دەبا لاببرێت. ئەوجا پێوەندییە کۆمەڵایەتییە چەسپاوەکان کەوتنە لەرزین. چینێکی بۆرژوای پەرەسێن و لە ڕووی ئابوورییەوە کاریگەر، کە گرێدراوی دیاردەی زۆرکاری و خاترانەی نێو دەستەی پیشەداران نەبوو، فراژووت. دوور لە بەندایەتی گیانی فیوداڵەتی، ژێرچینێکی نوێی هەمەڕەگەز heterogeneous پەیدا بوو. ئەم ژێرچینە بریتی بوو لە گەدا و گەمار و کرێکاری ڕۆژانە، سەر بە ئاغایەک یان کارێکی تایبەتی نەبوون بەڵکوو بێکارانە دەخولانەوە و دەبوونە مایەی نائارامی لە کۆمەڵگەدا، مەگەر لە لایەن پیشەسازی دەستەکییەوە وەرگیرانایە و ببوونایە بە کرێکاری ئازاد.

هەڵبەتە گۆڕانکاریی ئابووری و کۆمەڵایەتیی وەها هەژانی سیاسیشی بە دەمەوەیە. ئابووریی سەردەمی ناڤین و پێوەندیی کۆمەڵایەتیی سەردەمی ناڤین دەمێک بوو لە ئاستێکی ناوچەیەکیدا دەبران بەڕێوە. یەکە سیاسییە بەکارەکان، سنووردراو بوون. بازرگانی و پیشەسازی دەستەکیی پەرەسێن داوای یەکەی فرەوانتریان دەکرد، نەدەکرا گرێ بدرێن بە ناوچە و جێگەوە، دەنا زیانیان لێ دەکەوت.

لەوانەیە ئەم گوتەیە ناکۆک ڕانوێنێ گەر بڵێین: ئەو پەرەسەندنە ئابوورییەی لە سەردەمی ناڤینی درەنگدا دەستی پێ کرد بووە هۆکارێکی گرنگی دروست کردن یان پتەو کردنی نەک تەنیا یەکەی سیاسیی بەرفرەوان بەڵکوو پاشایەتی و میرایەتیی تاکفەرمانیش، کاتێک هەمان پەرەسەندن پاش چەند سەدەیەک، بە گشتی دەسەڵاتی ڕەهای پاشایەتی هاڕی. لەوەش پتر ناکۆک ڕادەنوێنێ کە دەگوترێ بۆرژوای ئازاد لە سەرەتادا هاندەرێک بوو بۆ دەسەڵاتی پاشایەتی، بەڵام پاشان - لە سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەمدا - بوو بە

سەختترین بەرهەڵستی هەمان دەسەڵاتی پاشایەتی. بەڵام گوتەکە ناکۆک نییە. ئەو فراژووتنەی لە سەرەتادا پەناگەی لە سایەی پاشا و میراندا دۆزییەوە، دەبا لە ئاستێکی بەرزتردا، شێوازی نوێتر بۆ خۆی پەیدا بکات. لە سەرەتادا، پاشا، بەرانبەر بەگزادە و ئاغایانی فیوداڵ، بووە هاوپەیمانی بۆرژوا. پاشا توانی بازرگانی و پیشەسازیی دەستەکی لە پێوەندیی ناوچەکی ڕزگار بکات - بەڵام لە بری ئەوە لکاندنی بە نەتەوەوە. کاتێک بازرگانی و پیشەسازیی دەستەکی ویستی لە سنووری یەکەی نەتەوەیی دەربچێ و خۆی لە بەرژەوەندی تەسکی نەتەوەیی ڕزگار بکات، ئەوجا دەسەڵاتی پاشایەتی بوو بە کۆسپێک و دەبا لاببرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، هۆی گەشە کردنی دەسەڵاتی پاشایەتی لە سەدەکانی پازدەیەم و شازدەیەمدا، تەنیا مەرجی ئابووری نەبوو. کە شیرازەی پتەوی سەردەمی ناڤین هەڵوەشا، ئەوجا پێداویستی هێزێکی دیکە هاتە کایەوە کە بەرفرەوانتر بێت و بۆ دابین کردنی دەستوور چوستتر بێت و بتوانێت دژ بە پەشۆکانی کۆمەڵایەتی چالاک بێت. دەسەڵاتی پاشایەتی ئەرکێکی دیکەشی گرتە ئەستۆ، ئەوەش لە ئەنجامی بێهێزی و فرەبەرەکی نێو کڵێسە بوو. دین چیدی نەیدەتوانی ببێتە هۆکارێکی یەک گرتن، بەڵکوو بووە مەسەلەیەکی کەسەکی وەها کە دوور بێ لە پێوەندیی کۆمەڵایەتی و سیاسیی تاکەکەس، مەگەر گرێ بدرایە بە نەتەوەوە و بخرایەتە ژێر سایەی پاشاوە. لە ڕاستیدا، دین، لە ماوەی بیرازکاریی پرۆتێستانتیدا، بە مەسەلەیەکی کەسەکی و دەوڵەتیش پێشان دەدرا. هەڵبەتە ئەرکە نەرێتییەکەی دین، وەک پارێزەرێکی کۆمەڵگە تەنیا بەوە دەما کە دین بە دەوڵەت و دەسەڵاتی پاشایەتییەوە گرێ بدرێت. ئەمەش لە بەرژەوەندی پاشایەتی و دینەکەشدا بوو.

لە بەرایی سەدەی شازدەیەمدا، کاتێ فراژووتنی باسکراو دەگاتە لووتکە، هیچ دیمانەیەکی سیاسیی کاریگەر، نە بە پێوانەی کۆن و نە بە پێوانەی نوێ، هەڵنەنرا. ئەو بیروڕا سیاسییانەی سەنگ و نرخیان پەیدا کرد، نەخرانە نێو چوارچێوەیەکی شیرازدەدارەوە، بەڵکوو وەک تێکستێک سەریان هەڵداوە کە داخوازیی جۆراوجۆر و سنوورداریان تێدایە. لەبەر ئەوە زۆربەیان یەکڕەو نین و کەمتر بنەڕەتین، بەڵام زۆر بە ڕوونی ئەو گۆڕانکارییانە پێشان دەدەن کە باشوور و ناوەندی ئەورووپای گرتەوە. نموونەیەکی پڕبەپێستی ئەو خاڵە، بەرهەمە بەناوبانگەکەی نیکۆلۆ مەکیاڤێللی Niccolò Machiavelli یە. هەڵبەتە ئەو خاڵە بە پلەیەکی کەمتر بەرهەمەکانی بیرازکار reformer ە گەورەکانیش دەگرێتەوە.

## ٢- مەكیاڤێللی و دووناكارەكی

مەكیاڤێللی یەكێكە لەو كەسایەتییانەی مێژووی بیری سیاسی كە مشتومڕیان زۆر دەربارەوە كراوە. لە *Il Principe* (میر، ١٥١٣) دا، مەكیاڤێللی پاڵێكی بە دیمانەی سیاسییەوە داوە، ئەوەی ئەو لەوێدا باسی دەكات بە یەكەم دەربڕین دادەنرێ لە ئایدیۆلۆگیی ڕەهایەتی absolutism دا كە پاشان لە سەدەی حەڤدەیەمدا، هۆبز Thomas Hobbes گەیاندییە دوند. لەگەڵ ئەوەشدا، زیاتر بەوە ناسراوە كە باشترین نموونەیە بۆ بێشەرمیی و بێویژدانیی سیاسی، بە كورتی بۆ ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەگوترێ مەكیاڤێللیەتی.

بەشێك لە ڕاڤەكاران پێیان وایە میر لاسایی كردنەوەیەكی گاڵتەجاڕانەی ئەو هەموو بەرهەمەیە، كە وەك میر، سەر بە بواری دیپلۆماتین و لە ڕۆژگاری مەكیاڤێللیدا پەیدا بوون. ڕاڤە كردنی هەمەجۆر زۆرن و هەر یەك لە ئاوازێك دەخوێنن.

تۆ بڵێی بەرهەمەكەی مەكیاڤێللی، بە پلەی یەكەم، یەكێك نەبێ لەو هەموو نموونانەی نێو مێژووی بیری سیاسی كە، لە دۆخێكی سیاسیی دیاریكراودا هاتووەتە كایەوە بەڵام توانیویەتی لە دۆخەكە خۆی تەمەندرێژتر بێت و پاشان – بە شێوەیەكی فرەلا و بێ ئەوەی نووسەرەكەی مەبەستی بووبێت – كاری كردبێتە سەر ڕێبازی فیكر لە ژینگە و ڕشتەی سیاسیی تەواو جۆراوجۆردا.

مەكیاڤێللی (١٤٦٩–١٥٢٧) لە فلۆرێنس Florens كارمەند بوو و ساڵانی ساڵ وەك دیپلۆماتێك كاری بۆ دەوڵەتەكەی خۆی دەكرد. ساڵی ١٥١٢ باوی نەما و پاشەكشەی كرد، لە ماوەی ئەو دوورەپەرێزییەی بەسەریدا سەپێنرا میر و چەندین بەرهەمی دیكەی كاریگەری نووسی، وەك: ***لێكۆڵینەوەیەك لە یەكەم دە كتێبی*** *Titus Livius* (ئەمیش وەك میر ساڵی ١٥١٣ بڵاوكرایەوە).

لایەنی بیری نەتەوەیی وەڵاتپارێزیی ئیتالیایی لە میر دا بەرچاوە. ئیتالیا دابەش بووبوو بەسەر چەندین حوكومڕانیی هەمەجۆردا. ئەم فرەبەرەكییە، ڕۆژبەڕۆژ دەبووە لاوازییەكی ئاشكرا. لە باكوور و ڕۆژاوا دەوڵەتی نەتەوەیی بەهێز و هاوئاهەنگی فرانسە و سپانیا فراژووت.

كڵێسەدەوڵەتی پاپا پلەوپایەی تایبەتی وەرگرت. ئەم دەوڵەتەی پاپا، بەو خەسڵەتە ناوازانەی هەیبوو، كۆسپێكی لەبڕین نەهاتوو بوو لە ڕێی هەموو هەوڵدانێك بەرەو یەك گرتنی ئیتالیا. مەكیاڤێللی بەرهەڵستێكی مەزنی ئەوە بوو پاپا دەسەڵاتی دنیایەكی هەبێت و دەڵێ لە سایەی كڵێسەوەیە ئێمەی ئیتالیایی لادینین، هەر لە سایەی كڵێسەشەوەیە ئیتالیا وەها فرەبەرە و لاوازە.

مەکیاڤێللی، بەو ڕەخنانەی لە کڵێسەی دەگرێت، مارسیلیوسی پادوا- مان بەبیر دەهێنێتەوە. بەڵام دەراوی مارسیلیوس دۆخی شارەدەوڵەتی باکووری ئیتالیا بوو. لە دەمی مەکیاڤێللیدا ئەو شارەدەوڵەتە سنووردراوانە زەمانیان بەسەر چووبوو. مارسیلیوس ئەوەی سەلماندبوو کە گەل دەبێ ئەوپەڕی دەسەڵاتی هەبێ بەسەر دۆخی سیاسیدا. ***گەل*** لای مارسیلیوس هەر ئەو واتایەی سەردەمی ناڤین و فیوداڵەتییەی هەبوو: سەرکردە نوێنەری ژێرکردەیە، بریکار و دەنگییەتی. کەواتە مارسیلیوس، ئەریستۆکراتی و دیمۆکراتی، بەو شێوەیەی سەردەمی دێرین، بە نیشانەیەکی حوکومڕانیی گەل دادەنا. لە ڕۆژگاری مەکیاڤێللیدا، ئەو یەکە گەلێرە ڕووخابوو. مەکیاڤێللی حوکومڕانیی بەگزادان دەدزێنێ - ئەوە تاکە حوکومڕانییە ئەم یەکڕەو و بەردەوام دژیەتی. مەکیاڤێللی پێی وایە لەو زەمانەی خۆیدا، تەنیا تاکفەرمانیی میرایەتی دەبێتە دەستەبەری هێمنی و ئاسوودەکی و پەرە بە بەرفرەوانی و دەسەڵاتی دەوڵەت دەدات.

چەندین ڕاڤەکاری نووسراوەکانی مەکیاڤێللی پێیان وایە دژوەستانێک هەیە لە نێوان میر و ***لێکۆڵینەوەیەک*** لە یەکەم دە کتێبی Livius دا کە دەربارەی مێژووی ڕۆمانە. لە میر دا پشتیوانی لە تاکفەرمانی دەکات و لە ***لێکۆڵینەوەیەک*** دا، بە سۆزەوە باسی کۆماری ڕۆمانی پێشوو دەکات.

لێکۆڵەوەری دیکە ئەو مەسەلەیە بە دژوەستان نابینن بەڵکوو پێیان وایە ناوبینییەکی سەرنجڕاکێشە لە ئاست نیسبییەتی مێژوو و ڕشتەی سیاسی. پەیڕەوانی بیری مرۆڤایەتی humanism، سەردەمی دێرینی کلاسیکیان بەرز دەنرخاند و مەکیاڤێللیش لەسەر هەمان ڕایە. بەڵام ئەم پێی وایە پێوەندارییەتی سیاسیی دێرین چیدی زیندوو ناکرێتەوە چونکە مەرجە دەرەکییەکان یەکجار گۆڕاون.

ئەم بیروڕایانە بە باوەڕێکی سیاسی و مێژووکرد، بۆ مەکیاڤێللی، ناژمێردرێن، بەڵام دەکرێ نیسبییەت بە ئەنجامێکی ئەو هەڵوێستە گشتییەی ئەو دابنرێ کە لە ئاست هەڵکەوتی سیاسیدا هەیبوو. سیاسەت بەلای مەکیاڤێللییەوە زۆر بە جیددی بریتییە لە هونەری مومکین. هیچ بنەمایەکی هەمیشەکی نییە سیاسەتی پێ بنرخێنی و پێی ڕاست بکەیتەوە. هیچ دەستووری سروشتێک نییە نەگۆڕ بێت و بڕیار و چارەسەری سیاسییانە بسەپێنێ. سیاسەتمەدار دەبێ بەردەوام لە تەگەرە و سنووردارێی کاتەکی بپەڕێتەوە. ئەرکی سیاسەتمەدار ئەوەیە - هیچ ئامانجێکی دیکەی نییە.

بارودۆخی مێژوو دەگۆڕدرێت. بەڵام مەکیاڤێللی نایگەیەنێتە ئەوەی بڵێت مرۆڤ، بە گۆڕینی مەرجە دەرەکییەکان، دەگۆڕدرێت. ئەو هەر لایەنگری ئەو بۆچوونە نەرێتییەیە کە

دەڵێ مرۆڤ سروشتێکی نەگۆڕی هەیە. ئەو سروشتەیە کە دەبێتە پێکهێنەری تاکە بابەتێکی چەسپاو لەم دۆخە دەرەکییە بارگۆڕەدا.

بۆچوونی مەکیاڤێللی دەربارەی مرۆڤ تاڕادەیەک نموونەیەکی نوێیە لە بۆچوونە کۆنەکە. نموونەیەکە، ماوەیەکی درێژ دوای خۆی Hobbes بە بەڵگەی زۆر زیرەکانە و یەکڕەوانەی سەیر گەیاندییە لووتکە. مەکیاڤێللی تاڕادەیەک پشت دەکاتە ئەو جۆرە زمان بەکارهێنانە نەرێتییەی دەڵێ مرۆڤ هەر چۆنێک بێت ***ئەوەیە کە دەبا وەها*** بێت (یان ئەوەیە کە خودا دروستی کردووە یان خودا بەتەمابووە وەهای دەرچێنێت). ئەم شێوازی پێوەرایەتییە بەلای مەکیاڤێللییەوە نامۆیە، ئەگەرچی لەم بوارەشدا هیچ باوەڕێکی یەکڕەو ناهێنێتە کایەوە.

مەکیاڤێللی دەڵێ مرۆڤ سروشتانە خۆویستە، دڕە و چاوچنۆکە: بەخشینی بکوژی باوکی خۆی لا ئاسانترە لە بەخشینی کەسێک میراتی باوکی ئەمی خواردبێ. مرۆڤ دەسەڵاتویستە، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستی بە ئاسوودەکی و پاراستنە.

ئەمانە ڕاستیی نەگۆڕن و سیاسەتمەدار تەنانەت میری تاکفەرمانیش دەبێ ڕەچاویان بگرێ. مەکیاڤێللی ئەم ناوبینییە تەماوییە بە ڕستەی پەندامێزانە دادەڕێژێ. مەکیاڤێللی دەڵێ میر دەشێ ژێردەستەی خۆی بکوژێت، بەڵام نابێ نابووتیان بکات. میر دەبێ، بەر لە هەر شتێک، پێداویستی دڵنیابوونی ژێردەستانی خۆی دابین بکات و دەسەڵاتویستییان بکاتە دەسەڵاتویستیی نەتەوەیی.

بەو جۆرەش ئاشکرا دەبێ کە ڕەنگدانەوەی سروشتی مرۆڤ، بە گۆڕانی ژینگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی، دەگۆڕدرێت. لە ڕشتەیەکی سیاسی باشدا، مەیلە سروشتەکییەکانی مرۆڤ دەخرێنە خزمەتی ئامانجی چاکەی دەوڵەتەوە. لە ڕشتەی دزێو و بەددا، دڕی و چاوچنۆکی و دەسەڵاتخوازیی خەڵک، لێکترازان و نارێکی و داڕزانیان لێ دەزێ. مەکیاڤێللی نموونەی بەهێزی ئەم ناجۆرییە لە وردەدەوڵەتی ئیتالیای هاودەمی خۆی دەهێنێتەوە. بارودۆخ لە سپانیا و فرانسە باشترە. بەڵام ئەوە وەها ناگەیەنێت خەڵکی سپانیا و فرانسە لە خەڵکی ئیتالیا باشتر بن – سروشتی مرۆڤ لە هەموو دنیادا هەر یەکە – بەڵکوو ئەوان لە دەوڵەتی ڕێکخراو و هەمووتوان و بەهێزدا دەژین.

لە دوورەڕوانگەیەکی مێژووکردەوە وەها ڕادەنوێنێ کە مەکیاڤێللی بە ڕوونی لەوە گەیشتبوو کە چ هەڵوەشان و پەشۆکانێک لە ڕووخانی کۆمەڵگەی سەردەمی ناڤینەوە پەیدا دەبێ و چ دەسەڵاتێکی ڕەهاش پێویستە بۆ ئەوەی گوزەرانێکی نوێ بنیات بنرێ. بەڵام مەکیاڤێللی هەر ئەوەندە دیتەدەر بوو کە نیشانەکانی سەردەمی خۆی ببینێت. ئەوەی

بووبوو بە ڕێبەری مەکیاڤێللی، تێڕوانینێکی گشتیی فەلسەفی و مێژوودار نەبوو، ئەو لە گۆشەنیگای ئەزموونەکانی خۆیەوە کە لە بواری کارمەندی و دیپلۆماتیی فلۆرێنسدا پەیدای کردبوون، دەیڕوانییە دنیا، پێشی وەها بوو ئاکامگرییەکانی خوی هەمیشەکین.

لە دنیای پاش خۆی، ئەوانەی مەکیاڤێللییان بە مەیلەو هەلکەوتوو دانەدەنا، دووئاکارەکیی سیاسییان دەخستە ئەستۆ. ڕاستە ئەو پێوەری جودای بەکاردەهێنا بۆ هەلسانگاندنی کردەوەی میر و کردەوەی ژێرکردە بەلام ئەو مەسەلەیە گرێدراوی سەرجەمی گۆشەنیگای خۆی بوو لە بواری ئاکاری سیاسیدا. وەک باسمان کرد، بە بڕوای مەکیاڤێللی، لە سیاسەتدا، هیچ پێوانەیەکی ڕەها نییە. ئاکار - پێوەر، ڕەسم، دەستوور - لە نێو ڕشتە سیاسییەکەدا دروست دەبێ، نەک پێشتر. میر دەستووربەخشە و بەوەش، لە دەرەوەی سنووری ئاکار، دروستکەری ئاکارە. تاکە یەک شت کە لەڕاستیدا سنوور بۆ کردەوەکانی میر دادەنێت، ڕەچاوگرتنی بەرژەوەندی دەولەتەکەیە.

کەواتە میر بۆی هەیە، بەرانبەر ژێرکردەکان، ویژدانبەدەر بێت، بە مەرجێک مەیلی سروشتەکییان ئازار نەدات. پێش هەموو شتێکیش میر دەشێ و دەبێ بەرانبەر میر و دەولەتانی دیکە ویژدانبەدەر بێت، چونکە ئەوان هاوچاوی ئەون و گەورەترین کۆسپن لە ڕێی پەلهاوێشتنی دەولەتەکەی ئەودا. ژێرکردەکانیش دەبێ تەواو ملکەچی دەستوور بن و ئەوەی سەرپێچی لە دەستوور بکات بە ئەوپەڕی بێبەزەییەوە سزا بدرێت.

مەکیاڤێللی، نووسینی ئەوتۆی کەمە لە پێوەندیی ئابووری و کۆمەلایەتیی نێو دەولەت بدوێ. ئەو گۆڕانکارییە بنەڕەتییانەی، کە گۆڕانی گوزەرانی سیاسی نیشانەیەتی، دەکەونە دەرەوەی سنووری ئاسۆی ئەوەوە.

بیری سیاسیی پارەپارەی مەکیاڤێللی ئەم سەرباسانە دەگرێتەوە:

١) بیری نەگۆڕیی سروشتی مرۆڤ.

٢) بۆچوونێکی ساکاری نیسبییەتی مێژوو.

٣) باوەڕێکی چەسپاو بەوەی ئاکاری دنیایەکی دەبێ سەر بۆ دەولەت و نەتەوە فروو بێنن و بەو جۆرەش ئاکاری ژێرکردەکان دەبێ لە لایەن مەزنایەتی سیاسییەوە دیاری بکرێت و سەرۆکایەتیش تەنیا بەرژەوەندی نەتەوەکەی خۆی ڕەچاو بگرێ.

### ٣- بیرازکاران

بیرازکاری reformation ی سەدەی شازدەیەم تەنیا دۆزێکی ناو کڵێسە نەبوو، بەڵکوو مەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئاشکرای هەبوو و بۆخۆیشی کارێکی کەمی نەکردە سەر فراژووتنی سیاسی. بەڵام بیرازکاری خاوەنی ئایدیۆلۆگیی سیاسیی خۆی نەبوو. دۆزی سەر بە سیاسەت، یان نرخێکی لاوەکییان دەدرایە یان دەخرانە دەرەوەی بواری کارامەیی بیرازکاران. لوتەر Luther دەڵێ من بەرگدروو فێری دروومان ناکەم، من میر فێری حوکومڕانی ناکەم.

بەڵام ئەم گوتانە ڕێگە لەوە ناگرن کە گەورەترین دوو بیرازکار، مارتین لوتەر Martin Luther (١٤٨٣-١٥٤٦) و ژان کالڤین Jean Calvin (١٥٠٩-١٥٦٤)، هەڵوێست وەرگرن لە ئاست چەندین شادۆزی سیاسیدا و ئەو هەڵوێستە دینەکەییە بنەڕەتییەی ئەوان، بە کردەوە ئەنجامی سیاسیی یەکالاکەرەوەی لێ پەیدا ببێ. لەوانەش زیاتر مشتومڕ لێ کراو، ئەو ناوەڕۆکە سەر بە سیاسەتەیە کە لە بەرهەمەکەی تۆماس مونتزەر Thomas Müntzer (دەوری ١٤٩٠-١٥٢٥) دا هەیە. مونتزەر، کەسایەتییەکی گرنگی شەڕی جووتیاران بوو کە لە ئەڵمانیا، لە سالانی ١٥٢٠دا هەڵگیرسا، و شۆڕشگێڕێکی سیاسیی هۆشیار بوو. لە بەشی داهاتوودا باسی مونتزەر و بیروڕا ورووژێنەرەکانی ئەو دەکەین.

مارتین لوتەر خەباتی دژ بەوە دەکرد کە خۆی بە ئاکاری تاوانبارانە و فاریسایەتی pharisaism و ڕەوشتنزمی گشتیی نێو کڵێسەی دادەنان. بەڵام ئێمە لێرەدا لەو باسە ورد نابینەوە. مەبەستی لوتەر ئەوە نەبوو کڵێسە دووکەرت بکات بەڵکوو دەیویست لە ناوەوە بیرازی بکات، بەڵام ئەو فراژووتنە، بە ناچاری، سەری بە دووبەرەکییەوە نا. کڵێسەی لوتەری، کە بەهێزترین بنگەی لە چەند بەشێکی ئەڵمانیا و باکووری ئەورووپادا هەبوو، هەر زوو دووچاری بەرهەڵستییەکی نوێ بوو، ئەویش کڵێسەی کالڤینی بوو. باوەڕی کالڤین، لە سویسرا، فرانسە (هوگێنۆت Hugyenot ـکان لە بنەتاکانی سەدەی شازدەدا، لە لایەن دەوڵەتی کاتۆلیکەوە سەرکوت کران)، هۆلاند، ئینگلاند و سکۆتلاند، بەوپەڕی کاریگەریی خۆی گەیشت. زۆر جار گوتراوە کە کالڤینایەتی لەو وەلاتانەدا ڕەگی داکوتا کە لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە لە هەمووان لەپێشتر بووە و سەرمایەداریەتی هەر لەو وەلاتانەدا خێراتر بەرەو ڕسکانی تەواو فراژووت (هۆلاند و ئینگلاند). پێوەندیی نێوان کالڤینایەتی و سەرمایەداریەتی بە تێر و تەسەلی گوتوبێژی لەسەر کراوە.

نوێکاریی ئاگادارانە لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا، چ لە باوەڕی کالڤین و چ لە

باوەڕی لوتەردا، کەمە. جیاوازیی نێوان بیری داڕێژراو و کاریگەریەتی ڕاست، لای هەردووکیان، یەکجار فرەوانە.

لوتەر و کالڤین لەگەڵ مارسیلیوس و مەکیاڤێللی لەوەدا هاوباوەڕ بوون کە بابەتی نێودنیایەکی و بابەتی دنیایەکیبەدەر دەبێ لەیەک جودا بکرێنەوە. بەڵام لوتەر و کالڤین بە پلەی یەکەم سەرگەرمی بواری سەر بە دین و لەبەر ئەوەش بواری سەر بە سیاسەت بە شێوەیەکی نایەتی دەنرخێنن بەوەی هەر بابەتێک سەر بە دنیای کڵێسە نەبێ پشتی تێ دەکەن.

پێوەندی دینەکی، لای ئەوان، پێوەندییەکە لە نێوان گیانی مرۆڤ و خودادا. میهرەبانی خودا، کومەڵ و کۆڕی دیکەی مرۆڤایەتی ناگرێتەوە بەڵکوو تەنیا تاکەکەس دەگرێتەوە. تاکەکەسیش لە لای خۆیەوە تەنیا لە ڕێی باوەڕی خۆیەوە بە عیسای مەسیح لە گوناھ و مردن دەبخشرێ.

کەواتە تاکەکیەتی-یەکی دینەکیی ئاشکرا لە باوەڕی بیرازکاراندا هەیە. بەڵام ئەم تاکەکیەتییە تەواو جیاوازە لە بۆچوونیان دەربارەی بارودۆخی دنیایەکی خەڵک. لەم دنیایەدا مرۆڤ خۆی لە کۆمەڵ، خێزان و دەوڵەتدا دەدۆزێتەوە. باوک لە خێزاندا و فەرمانڕەوایەتی لە دەوڵەتدا، بڕیار دەدەن بە سەر ژیانی ئەندامانداو داب و ڕەسمیان بۆ دادەنێن. هیچ ئاماژەیەک بۆ تاکەکیەتیی سیاسی لە باوەڕی لوتەر و کالڤیندا نییە.

بەڵام دەسەڵاتی دنیایەکی بڕیار تەنیا بەسەر لەشدا دەدات نەک گیان. ئەم بۆچوونە، لە بواری دیتنی سیاسی لوتەر و کالڤیندا، فرە گرنگە.

لوتەر و کالڤین دەزانن کە ناشێ کڵێسە تەنیا مەزنایەتی گیانەکی هەبێت: کڵێسەش بابەتی تەواو دنیایەکی خۆی هەیە ئەندامەکانیش تەواو لەشەکین. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوانیش وەک ئوگوستینوس، کڵێسەی بەربین و نەبەربین جودا دەکەنەوە. مرۆڤ، هەر بەوەی سەر بە کڵێسەی بەربینە، ناتوانێ لە بەخشین دڵنیابێ. کڵێسەی بەربین ناتوانێ لە پێوەندیی نێوان تاکەکەس و خودا، بڕیار بدات. پێوەندیی نێوان تاکەکەس و خودا پێوەرێکە بۆ پێوەندیی مرۆڤ بە کڵێسەی دروستەوە، کڵێسەی نەبەربین.

ئاشکرایە کە لە نێوان کڵێسەی بەربین و دەسەڵاتی سیاسیدا دەبێ پێوەندییەک هەبێ – کڵێسەی بەربین لە نێو ئەم دنیایەدا دەژی. کاتێک لوتەر و کالڤین باس لە پێوەندیی نێوان کڵێسە و دەوڵەت دەکەن، بەو مەرجە ئاواڵە یان بێدەنگە دەیکەن کە هەر کڵێسەیەک، بە هەر جۆرێک بێت، بتوانێت پێوەندی بە دەوڵەتەوە هەبێت، ئەوا کڵێسەیەکی بەربین و نادروستە، «کۆڕی پیرۆزان» نییە.

ئەم دوانەتی dualism یە توندەی نێوان نێودنیایەکی و دنیایەکییەدەر، نابێ بۆ ئەوەمان بباتەوە کە لوتەر و کالڤین داوای ڕشتەیەکی سیاسی عیلمانی وەهایان کردبێ کە لە لایەن دینەوە بێلایەن بێت. بە پێچەوانە. دنیاش هەر لە لایەن خوداوە دروست کراوە و هەموو ئەوانەی نێودنیایەکین بەشێکن لە پلانی ئافراندنی خودایەکی. لە گۆشەنیگای دینەوە، چۆنیەتی دروست بوونی دنیا، بێبایەخ نییە.

لوتەر دەڵێ هەموو مرۆڤێک دوو هاوزێدەتی هەیە، یەک لە گیانستاندا و یەک لە دنیاستاندا. لە گیانستاندا هەموو یەکسانن، چ کەشیش بێ چ بۆرەپیاو، چ بەرز بێ چ نزم – هەر هەموویان گوناهبارن و سزایەکی هەمیشەکییان لێ ڕەوایە. لە دنیاستاندا، هەر کەسە ئەرکێکی تایبەتی هەیە، چ میر بێ چ کارەکەر، چ کارمەند بێ چ وەستا. جیاوازیی پلەوپایەی ئەمانە فرەوانە و هەر دەشبێ وەها بێ. ئەمە ویست و فەرمانی خودایە. دەبێ هەموو کەسێک بە بەختی خۆی ڕازی بێت.

لای کالڤین – یش ڕووبەڕووی بیری وەها کۆنەوارەتی دەبینەوە. بەلام لوتەر و کالڤین داوای ئەوەش دەکەن کە دۆخی دنیایەکی دەبێ بە پێوەری دینەکی – بگرە بە تەوجیل – بپێورێن. تەوجیل فەرموودەی خودایە و فەرموودەی خودا ئەم دنیایەش دەگرێتەوە. لەم خاڵەدا جیاوازییەکی ئاشکرا لە نێوان بۆچوونی لوتەر و کالڤیندا هەیە. بە ڕای لوتەر، تەوجیل، لەم بوارەدا ئەرکێکی نایەتی هەیە: تەوجیل ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە حوکومڕانیی لادینەکی نابێ چاوپۆشی لێ بکرێت. کالڤین ئەرکێکی ئایەتیشی دەخاتە سەر و دەڵێ ئەو دەستوور و فەرمانگەلەی نێو تەورات، ئێستەش هەر ڕێنمایە بۆ گوزەرانی سیاسی و کۆمەلایەتی.

کەواتە گەر تەوجیل بە بنەما بگرین دەتوانین فەرمانڕەوایی و دەسەلاتداریی چاک و خراپ لە یەک جودا بکەینەوە. بەلام لوتەر و کالڤین لەگەڵ ئەوەدا نین ژێرکردەی وەلات ئەم نرخاندنە بکەن و بە کردەوەش دوای نرخاندنەکە بکەون. تەنیا خودا سزای حوکومڕانی ستەمکار دەدات. ژێرکردە، بە گشتی، دەبێ گوێڕایەڵی سەرکردە بن. فەرمانڕەوایەتی لە لایەن خوداوە دانراوە، گەر خراپ بێت، ئەوا خودا دەیەوێت ژێردەستان، یان تاقی بکاتەوە، یان سزایان بدات.

بێگومان ڕێگەی پەیڕەوی کردنی یەکڕەوی ئەم بنەما گشتییەی ملکەچی، بێتەگەرە نییە. بۆ نموونە، لە ئاست دەوڵەتێکدا کە ئاشکرا بێت زیان بە کڵێسە و باوەڕ بگەیەنێت، چ دەکەی؟

لوتەر لە نووسراوێکی زوویدا، بە ناوی *کردەوەی چاکە* (١٥٢٠)، دەڵێ مرۆڤ دەبێ هەردەم لەگەڵ ستەمکاریی دەسەڵاتی دنیایەکیدا هەڵبکات بە مەرجێک دەسەڵاتەکە نەگاتە ئەوەی «ئاشکرا بێت کە ناچارمان دەکات خراپە بەرانبەر خودا بکەین، وەک زەمانی زوو کە هێشتا مەسیحی نەبوو، یان وەک ئەوەی ئێستە تورک دەیکات. پەژارەداری ناڕەوا زیان بە گیان ناگەیەنێت بەڵکوو زاخاوی دەدات، تەنانەت گەر سوودێک یان سامانێکی دنیایەکیشمان لێ زەوت بکرێ. بەڵام گەر کارێکی ناڕەوا بکەین، با هەموو بەرهەمی دنیاشمان خەڵات بکرێ، گیانمان دادەڕزێ».

کەواتە ڕژێمێکی مەسیحی، بە هەر جۆرێک بێت، بۆ گیان زیانبەخش نییە. بەڵام کڵێسەی بەرین دەشێ تینێکی رووخێنەری هەبێت، لەبەر ئەوە لەوانەیە بەرەنگاربوونەوەی کڵێسە (وەک ئەوەی لوتەر خۆی کردی) کارێکی باش بێت.

مەرجی هەموو ئەو ڕاوێژە ئەوەیە کە مەزنایەتیی گیانەکی دەبێ تەواو خۆی بۆ بواری گیانەکی تەرخان بکات و مەزنایەتیی دنیایەکیش بۆ بواری دنیایەکی. لوتەر دژ بەوە دەوەستێ کە کڵێسە خۆی تێکەڵ بە سەروکاری دنیایەکی بکات. بۆ نموونە، کڵێسە ئەرکی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی پێ درابوو، خێر ببەخشێتەوە، چاودێریی هەژار و نەخۆش بکات... هتد. بە ڕای لوتەر ئەمە کاری دەسەڵاتی دنیایەکییە. کاری کڵێسە تەنیا ئەوەیە فەرموودەی خودا بڵاوبکاتەوە.

چەسپاندنی دوانەتیی وەها، ئاسان نەبوو. بەر لە هەر شتێک، باوەڕی کڵێسە بەلای دەسەڵاتی دنیایەکییشەوە هۆشگیر بوو، بەتایبەتی پاش ئەوەی فرەبەرەکیی نێوان باوەڕی جودا، فرەوان بوو. دەوڵەت تەنیا مەسیحی نەبوو، بەڵکوو لوتەری یان کالڤینیش بوو. کێشەی نێوان ڕێبازی مەسیحایەتیی جودا، کێشەیەکی گەورەی سیاسیش بوو.

ئەو چارەسەرکردنەی لوتەر پاشان سەلماندی ئەوە بوو کە میر (واتە دەسەڵاتی دنیایەکی) بڕیار بدات چ باوەڕێک لە وەڵاتەکەدا برەوی هەبێ. ئەوەش چارەسەرکردنێکی کارەکی بوو ئەگەرچی بەزەحمەت نەبا لەگەڵ تاکەکیەتیی دینەکیدا نەدەگونجا. وەها دێتە بەرچاو دیتنی کالڤین لە مەسەلەی دین – دەوڵەتدا تەواو بەپێچەوانەی دیتنی لوتەر بێت. لوتەر ئەوەی سەلماند کە کڵێسە سەر بۆ دەوڵەت فروو بێنێ، کالڤین دەیگوت کڵێسە دەبێ لە ژوور دەوڵەتەوە بێت.

بەڵام جیاوازی ڕاست لە نێوان نۆڕینی لوتەرایەتی و کالڤینایەتیدا زۆر لەوە کەمتر بوو. کالڤین جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە دەوڵەت دەبێ خۆی لەگەڵ فەرمان و مەرجەکانی نێو تەوجیلدا بگونجێنێ، باوەڕی پاک بپارێزێ، شێوازی دەرەکی دین بەهێز و پێز بکات. بە

ڕای لوتەر، دەسەڵاتی دنیایەکی دەبێ تەنیا سەرگەرمی بابەتی دنیایەکی بێت، بەو جۆرەش کڵێسە مەترسییەکی نایەتە ڕێ. کەواتە دوانەتی لای لوتەر توندترە وەک لای کالڤین.

هۆیەکی دیکەی بەزەحمەت چەسپاندنی ئەم دوانەتییە ئەوەیە بزووتنەوەی بیرازکارانە پێوەندییەکی نێزیکی بە هەوێن کردنی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئەو دەمەوە هەبوو. ئەو دیندۆستییەی لوتەر داوای دەکرد، لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە بێلایەن نەبوو. ڕێبازی دیکەی لاتەریب هەبوو، بە تایبەتی ئاناباپتیست Anabaptist ـەکان، کە بیروڕایان لایەنی شۆڕشگێڕانەی تێدا ئاشکرا بوو. ڕاپەڕینی دژ بە پاپا دەبووە ڕاپەڕینێک دژ بە دەسەڵاتداریی نەریتی دیکەش.

بەڵام ئەو پەیامە سیاسییە سەرکەوتووەی بیرازکاری، هەر زوو، بوو بە گوێڕایەڵییەکی بێمەرج لە ئاست فەرمانڕەوایەتیدا. مەرج نییە پەیامی سیاسی و هەڵکەوتی سیاسی شان بە شانی یەک ڕێ بکەن. لە کڵێسەی کالڤینیدا بەتایبەتی - کە ملکەچیی ڕەها بە دەگمەن نەبێ گومانی لێ نەدەکرا - لە فرانسە و سکۆتلاند و باکووری ئەمەریکا، لە سەدەکانی دوابەدوادا، بزووتنەوەی سیاسیی بەرهەڵستکار سەری هەڵدا. پەرژینی نێوان گیانەکی و دنیایەکی، نە لەو دەمەدا و نە لە سەردەمی ناڤیندا، هەرگیز هەڵنەنرا.

### ١- پێشەکی

لە مێژووی بیری سیاسیدا تا دەگەیتە سەردەمی نوێ بەدەگمەن نەبێ تووشی بێژەرێکی ژێرچینی گەل نایەیت. مەبەستیش لە ژێرچینی گەل، کۆیلە و نەدارانی سەردەمی دێرینە، ڕەشەجووتیاری سەردەمی ناڤین و پرۆلیتاری سەردەمی نوێیە. لەگەڵ ئەوەشدا نێزیکەی هەر هەموو بیریارانی سیاسەت لە *گەل* دەدوێن، بەڵام مەبەستیان لەو گوتەیە هەموو جۆرە کەسێک نییە. گەل لە ئەتێن تەنیا گەلی پیاوی ئازاد بوو، گەل لە فیکری سیاسیی سەردەمی ناڤیندا ئەوانەن کە بە زگماک سەر بە دەستەی دەسەڵاتدارانن. گەل لە فیکری سیاسیی سەردەمی درەنگتر، هەتا ماوەیەکی درێژخایەنیش، ئەوانەن کە خاوەن و داهێنەری سامانی دنیایەکێن.

لەبەر ئەوە لە مێژووی ئەورووپادا، گەلێک ڕاپەڕین ڕوویداوە بێ ئەوەی بێژەریان هەبووبێ مەبەست و ئامانجی ڕاپەڕینەکان بنووسنەوە و گیانی ئەو ڕاپەڕینانە بۆ دنیای پاش خۆیان بپارێزن. ڕاپەڕینی کۆیلەگەل، ڕاپەڕینی سپارتاکۆس، لە ساڵانی حەفتای پێش زاییندا، ڕۆمای هەژاند. ئێمە ئەم ڕاپەڕینە لە ڕێی بەرهەڵستەکەیەوە دەناسین. دەزانین کە لە لایەن کۆیلەیەک بە ناوی سپاراتکۆس Spartacus ەوە ڕێبەری دەکرا، سپارتاکۆس لە فێرگەی گلادیاتۆر Gladiator هەڵاتبوو و ئەو ئازادییە خۆسەندەی خۆی بە ڕێگری دەبردەسەر و لە ناکاو – لە دەمێکی شێواو ئاژاوڵەدا – بوو بە ڕێبەری لەشکرە کۆیلەیەکی بێهەژمار. بۆ ماوەیەک، ئەم لەشکری کۆیلەیە ڕووەو سەرکەوتن بوو، بەڵام ژێرکەوتنیش ئاشکرا بوو چونکە، لە ڕکی ئەندامە ستەمدیدەکانی زیاتر، هیچ بنەمایەکی دیکەی نەبوو بنیاتی لەسەر هەڵنێ. دەوڵەتێک – کۆنەکۆیلە – بیبات بەڕێوە، لە ئەنارکییەکی ڕووت زیاتر چی بەدەمەوە دەبێت. بەڵام دەربارەی بیر و ئامانجی ئەم ڕاپەڕینە، ئێمە هیچ نازانین. بێ ئەوەی تاکە یەک وشەی لێ بەجێ بمێنێ، لەشکری کۆیلە لە مێژوودا ون بوو.

لە ڕۆما، جگە لە کۆیلە جۆرە خەڵکێکی دیکەش هەبوون، ئەوانە پیاوی ئازاد بوون بەڵام نە دەسەڵاتی بەگزادانیان هەبوو نە سامانی چینی سوارە. ئەوانە دەیانتوانی لە ڕێگەی ترییبیون Tribune ‹نوێنەر یان پارێزەری گەل› ـەوە لە ئەنجومەنی گەلدا خواستی خۆیان ئاشکرا بکەن. بەڵام خودی ترییبیونەکان کە بووببوونە بێژەری گەل ئەریستۆکرات بوون و کاریان ئەوە بوو ئامانج و خواستی ناخی گەل ڕانوێنن. ئەمانە تا چ ڕادەیەک بەڕاستی

دەنگی گەل بوون، پرسیارێکە وەرامدانەوەی زەحمەتە. ئەو گەلەی ئەوان نوێنەری بوون هەرنەبێ خۆشجڵەو بووە. هیچ بنەمایەک نەبووە بۆ ئەوە دەست بدات ئایدیۆلۆگییەکی وەهای لەسەر هەڵنرێ بەرەنگاری ئایدیۆلۆگیی حوکومڕانیی ڕۆمانی ببێتەوە کە بیریاری وەک پۆلیبیۆس و سیسێرۆ گەشەیان پێ دەدا.

لە سەردەمی ناڤیندا ئەو باوەڕەی دەڵێ *گەل* سەرچاوەی دەسەڵاتی خوونکارە، فراژووت. بەڵام ئەو بۆچوونەش دەبێ بەو پاشخانەوە ڕاگیرێ کە بریتی بوو لە بۆچوونێکی کۆمەڵایەتی هەرەمیی توند. پاشا لە هاوشانەکانی خۆیەوە هەڵدەبژێردرا، واتە گەورەپیاوان یەکێکی ناو خۆیان بە پاشا هەڵدەبژارد. ئەم گەورەپیاوانە نوێنەری ژێرکردەکانی خۆیان بوون، نەک بەو مەبەستەی لە خواستی ژێرکردەکانیان بگەڕێن بەڵکوو ئەمانە بووبوونە بەرجەستەبوونی خواستی ژێرکردەکانیان.

کاتێ دەگەینە سەردەمی ناڤینی بەرز، واتە سەدەی چواردەیەم، ئەوجا گەل بە واتایەکی فرەوانتر، وەک ئەکتەرێکی سەر شانۆی سیاسەت دێتە پێش، نەک وەک کۆرس و ئامراز و قوربانی. هەر ئەو دەمەشە کە دەبێتە دەستپێکێکی شەرمنی ئەو سەردەمە شۆڕشگێڕە درێژخایەنەی هێشتا بە کۆتا نەگەیشتووە.

بەڵام، هەتا ئەو دەمەش، هیچ ئایدیۆلۆگییەکی گەشەکردوو لە ئارادا نییە. ئەگەر گەلی ڕاپەڕیوو، جگە لە کردەوە، دەنگێکیشی هەبووبێ ئەوا داوای ئەوەی کردووە بگەڕێتەوە بۆ ڕشتەی کۆن نەک بە یەکێکی دیکەی نوێ بگات. ئەمە بوو دۆخی ڕاپەڕینەکانی جووتیاران، کە لە سەردەمی ناڤینی درەنگ و بەملاوە، چەندین دەوڵەتیان هەژاند: ڕاپەڕینی Wat Tylor لە ئینگلاند، ڕاپەڕینی Jacquerie یان ڕاپەڕینی جووتیاران لە فرانسە، سەرهەڵدانی بۆهێم (بەشێکە لە چیکوسلۆڤاکیای ئەمڕۆ)، ڕاپەڕینەکانی ئیتالیا و سویسرە... هتد. هاوشانێکی شەرمنیش لە سوێد هەیە بە Engelbrekt ناسراوە، لەوانەیە بشێت لەم بوارەدا ناوی بێت. ئەمانە ڕاپەڕینێک بوون بێ ئایدیۆلۆگیی ڕاپەڕین. مەسیحایەتی شائایدیۆلۆگییان بوو. گەر بتەوێ جێپێی ئەو کۆمەڵگە و بیرانەی سەر بە کۆمەڵایەتی هەڵگریتەوە کە بووبوونە پاشخانی ئەو سەردەمە، دەبێ بەو لێکدانەوە جۆراوجۆرانەی مەسیحایەتیدا بچیتەوە.

لەم ڕووەوە، دۆخی شەڕە سەرنجڕاکێشەکەی جووتیاران، کە لە سالآنی ١٥٢٠ دا ئەڵمانیای هەژاند، لەگەڵ دۆخی ئینگلاندی ڕاپەڕیوی سەدەی حەڤدەیەمدا، وێکچووە. خوێندنی بۆچوونی کۆمەڵایەتی دژبەیەک هەر لەوەدا بوو کە ڕای جودایان هەبوو لە ئاست ئەوەی کامەیە دینی دروست. ئەوەی بەتەمابوو لێی ببیسترێ دەبا بەڵگە لە باوەڕی مەسیحایەتیدا بدۆزێتەوە. مەسیحایەتی ئەو فیلتەرەیە کە ئێمە دەتوانین لێوەی بنۆڕینە

بیری سیاسیی و ناکۆکییەکانی ئەو دەمە. لە سەدەی شازدەیەم و بەشێکی سەدەی حەڤدەیەمدا، ئامۆژگاریی دینەکی و بڵاوکردنەوەی فەرموودەکانی خودا تاکە ڕێگەی سروشتەکی بوون بۆ بڵاوکردنەوەی بیری شۆڕشگێڕانە. بەڵام نە سەدەی شازدەیەم و نە سەدەی حەڤدەیەم، نەبوونە خاوەن بێژەری ڕاپەڕینی فرەمەودای گەلێر، مەگەر چەند کەسێک. لە ڕاستیشدا تەنیا ناوی دوانیان شایانی باسە: تۆماس مونتزەر Thomas Müntzer (دەوری ١٤٩٠-١٥٢٥) و جیرارد وینستانلەی Gerrard Winstanley (١٦٠٩ زاوە و پاش ١٦٦٠ مردووە). ئەم دوانە پتر لە سەدەیەکیان نێوان بووە. وینستانلەی لە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووریی زۆر پێشکەوتووتردا کاری کردووە و خۆیشی پتر بایەخی بە دۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری داوە. بەڵام هەردووکیان هەڵگری پەیامی توێژی بەرین بوون، مونتزەر بە ئامۆژگاریی دینەکی و دژنامەی وروژێنەر و وینستانلەی، بەر لە هەر شتێک، بە کتێبە سەیرەکەی ***دەستووری ئازادی*** *Law of Freedom* (١٦٥٢). ئەمانە بەڵگەی پتەویان لە مەسیحایەتییەوە دەهێنایەوە و وینستانلەی لە ژێر تاوی ئەو نەریتە دینەکییەدا بوو کە مونتزەر یەکێک بوو لە نوێنەرە هەرە بەرچاوەکانی.

لەو دوانەدا، مونتزەر پتر مشتومڕ وروژێنە و لەوانەیە پتر خەیاڵبازیش بێ. مونتزەر، لە نێو هەموو شۆڕشگێڕانی ئەورووپادا، هەتا شۆڕشی فرانسەیی (١٧٨٩) لە هەمووان پتر جێی هەم دزاندن و هەم خۆشویستن بووە، لە هەمووان زیاتر پەنهان بووە.

لەم باسەی خوارەوەدا، بانگەوازە ناوازەکانی مونتزەر دەکەینە دەراو و ئەگەر وینستانلەیش گوتەیەکی دیکەی هەبێ شتێک بخاتە سەر گوتەکانی مونتزەر یان لەوان تێپەڕی کردبێ ئەوا جێگەی ئەویش دەکەینەوە.

## ٢- پاشخانی مەسیحایەتیی مونتزەر

گەر مونتزەر بەو پاشخانە هەمەجۆرەی سەردەمی ناڤیندا ڕابگیرێ وەها ڕادەنوێنێ باوەڕی ئەویش یەکێک بێ لە لێشاوی ئەو ڕێبازە دینەکییانەی بەرانبەر کڵێسەی ڕەسمی و دەسەڵاتدارانی دیکەش ناکۆک بوون. ئەو خوداناسییەی ئەو مێژوویەکی کۆنی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دوازدەیەم و زووتریش. ڕاپەڕینی گەلێر کە دروستاندنی دینەکی هەڵگرتبێ، وەک شەڕی جووتیاران کە مونتزەر ڕێبەرایەتی دەکرد، وەک باسمان کرد، تێکرای ئەورووپای سەدەی چواردەیەم و پازدەیەمی گرتبووە. ئەوەی لە حاڵەتی مونتزەردا نوێیە، بە پلەی یەکەم ئەو سەرئەنجامەیە لە پێکەوەگرێدانی بنەمای نەریتییەوە پێکی هێنا.

دەبێ ئەوەمان لەبیر بێ کە مونتزەر تەنیا وەک خوداناس و کەشیشێک دێتە گۆ. ئامانجیشی هەر ئەوە بوو ئەو مەسیحایەتییە بچەسپێنێ کە خۆی پێی وابوو تاکە مەسیحایەتییەکی دروستە. ئەو ڕێبازەی ئەو لایەنگری بوو پێی دەگوترێ ئاناباپتیزم anabaptism. خودی زاراوەی ئاناباپتیزم هەر ئەوەندە دەڵێ تەعمید کردنی زارۆ نابێتە بلیتی دەروازەی گوزەرانی مەسیحایەتی، گەورەتەمەن دەبێ سەرلەنوێ تەعمید بکرێنەوە، تەعمید کردنی مرۆڤی ڕەسیو دەبێتە نیشانەیەک بۆ ئەو دیدارە ڕاستییەی ئەو کەسە و خودا. بەلام ئەو ئاناباپتیزمەی مونتزەر پەیڕەوی بوو لەوە زیاتر بوو. ئەو باوەڕە تەنیا ئەوە نەبوو پشت لە دەزگە و نەریتی سەر بە کڵێسە بکات بەڵکوو نووکەڕمی گرتە هەموو جۆرە مەزنایەتییەک، تەنانەت مەزنایەتیی دنیایەکیش. ئەو باوەڕە کەموزۆر شۆڕشگێڕ بوو.

گەر بە درەنگە کاتەوە لێی بنۆڕی لەوانەیە ناکۆک بێتە بەرچاوت بڕوایەکی دینەکی، کە دیداری تاکەکەس و خودای مەبەست بێت، لە بری هێمنی و دنیانەویستی، لاساری و ڕاپەڕین بکاتە ئامۆژگاری. باوەڕی مونتزەر لەگەڵ دەروێشایەتی Mystic دا زۆر لایەنی هاوبەشیان هەبووە. دەروێشیش بەلای ئێمەوە ئەو کەسەیە کە بەخۆوەگلاوە و سەرگەرمی دینداری خۆیەتی.

بەلام دەروێشایەتی هەر ڕووەو ناخ نییە، هەر لە سەردەمی ناڤینەوە هەتا ئەم ڕۆژگارەش، نەریتێکی دیکەشی هەیە پێی وایە ڕێگەیەکی ناوەکی و ڕاستەوخۆی ڕووەو خودا هەیە و بەندە بە فیکری سەرەوژێرکردنەوەی باری سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتییەوە. مونتزەر سەر بەم نەریتە بوو.

لە ئاستێکی تایبەتدا، پێوەندیی نێوان دەروێشایەتی و بیری ڕاپەڕین ئاشکرایە. لە ڕوانگەی دەروێشەوە ژینی بەرزەشێوازی دینەکی، واتە دانوستاندنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ خودادا، چ پێویستی بە دەزگەی دینەکی، وەک کڵێسە و ئەو هەموو نەرێت و نوێنەرە دەرەکییەی سەر بە کڵێسە، نییە. ئادگارێکی دەزگەنەویستی لە تێکڕای ڕێبازەکەی مونتزەردا هەیە. ئەم ئادگارەش بە ئاسانی پەلی نەیاری بۆ هەموو جۆرە دەزگەیەک دەکێشێ، بۆ هەموو جۆرە ڕشتەیەکی چەسپاو، هەموو جۆرە مەزنایەتییەک – ئەمەش بەتایبەتی لە زەمانێکدا وەک زەمانی مونتزەر، کە لایەنی دنیایەکی بێوچان دروستاندنی دینەکی بۆ دەهێنرایەوە و سنووری نێوان دنیایەکی و دینەکی زۆر جار دەسڕایەوە. ئەوجا تێکەڵ کردنی دەروێشایەتی و ڕادیکالیزم radicalism مەرجی دیکەشی هەیە. ئەگەر دیداری تاکەکەس و خودا تایبەت نەبێت بە هەڵبژاردە و خواپێداو و هەرە بەهرەداران، ئەوا ڕێگەی ئەو دیدارە بۆ هەموو کەس ئاواڵەیە ئەگەر کۆسپی دەرەکی لابدرێت. کۆسپی

دەرەکیش، بە ئاسانی، بە هەموو جۆرە پێوەندییەکی دەرەکی لێک دەدرێتەوە. بە گشتی، دیتنی دەروێشی شۆڕشگێڕ لە ئاست مەسەلەی مرۆڤدا دیتنێکی دێمۆکراتییانەیە، بەو واتایەی کە ئەو پێی وایە هەرەمی دنیایەکی و دینەکی کۆسپن لە ڕێگەی ژینی دیندارانەدا. شۆڕشگێڕی لەو بابەتە، وەک مونتزەر و پاش ئەویش وینستانلەی، پێی وایە مرۆڤی هەژار و بێسەواد نێزیکترە لە خوداوە. بەو جۆرە، دەروێشی شۆڕشگێڕ بەرانبەر باوەڕی مەسیحایەتی دەبێتە ڕەخنەگرێکی دڵگەرم چونکە بەو باوەڕەبێت، پلەوپایەی دنیایەکی مرۆڤ چ پێوەندیی نییە لەگەڵ نرخ و بەهای دینەکی ئەو کەسە. مونتزەر پەیرەوێکی دڵگەرمی لوتەرە، ئەو لوتەرەی کە دەڵێ مرۆڤ دەبێ لە مەزنایەتی دنیایەکی ئازاد بێت و باوەڕی تاکەکەس بە بەرزترین پێوەری دینداری دادەنێت. بەڵام کاتێک هەمان لوتەر ئەو باوەڕە تێکەڵ بەو ڕایە دەکات کە دەڵێ دیندار دەبێ بە هێمنی و سەلاری بەرگەی ئازاری دنیایەکی و ناڕەوایی ئەم سەرزەوینە بگرێت، ئەو دەمە مونتزەر دەبێتە گەورەترین دوژمنی لوتەر. لە ئەنجامدا مونتزەر دەگات بەوەی کە چیدی تەوجیل بە پێوەربەخش و ڕێنیشاندەری دیندارانە نەناسێت.

بەلای مونتزەرەوە نێودنیایەکی و دنیایەکیبەدەر لەیەکدا دەتوێنەوە و دەبنە یەک. ئەو دینەی ڕاستەوخۆ خەریکی ئەم دنیایە نەبێت، مونتزەر نەفرەتی لێ دەکات. کەشیش و خوداناسان کە باس لە بەهەشتی ئەودیو دەکەن درۆزن و ساختەکارن. مونتزەر ڕاستەوخۆ ڕوو لە «مرۆڤی ئاسایی» دەکات و دەڵێ: «گوێم بۆ ڕادێرە، مرۆڤی ئاسایی»، «ئەگەر ناتەوێ چی دی فریو بدرێیت، دەبێ خۆت خۆت فێرکەی».

هەر ئەو گومانەی مونتزەر لە باوەڕی مەسیحایەتی دەکات، کە سەرنجی خەڵکی لە سەروکاری خۆیان دوور دەخاتەوە، جارێکی دیکە لای وینستانلەی دێتەوە ڕێمان. لە کتێبی *دەستووری ئازادی* دا دەڵێ «کاتێک ئادەمیزاد چاو لە ئاسمان دەبڕێ و خەیاڵ بە شادمانیی هەمیشەکییەوە دەکات، یان لە ترسی مەرگ و دۆزەخ لەرز دایدەگرێ، چاوی کوێر دەبێ و مافی میراتبەری نۆبەرە - کە مافی خۆیەتی - نابینێ». ‹مافی میراتبەری نۆبەرە: زاراوەیەکی تەوجیلە باس لەو میراتە دەکات بەر نۆبەرە دەکەوێت›.

مونتزەر دەڵێ، کەشیشان «هەرچی باوەڕ هەبێ نییانە، نە لە ئاست خودادا و نە لە ئاست مرۆڤدا. هەموو کەس چاوی لێیانە چۆن بۆ زێڕ و مەزنایەتی دەگەڕێن». ئەم گوتانەی مونتزەر وەک خۆیان لای وینستانلەی دووبارە دەبنەوە.

### ٣- پەیامی سیاسی

کەواتە مەسیحایەتی، لە لای مونتزەر و پاشانیش لە لای وینستانلەی، بابەتێکی تەواو نێودنیایەکییە. ئێمە لەم ژیانەدا، هەر لە ناخی تەنیاماندا نییە کە دەچینە دیداری خودا، ئەوەی خودا پێی دەڵێ باوەڕی دروست، بەتایبەتی گوزەرانی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئەم دنیایە دەگرێتەوە.

لەم خاڵەشدا نەرێتێکی زووتر لە مونتزەر هەیە. شەڕی جووتیاران، کە مونتزەر نۆرەیەکی ڕێبەرانەی تێدا دی و تێشیدا مرد، کۆتابوونێکی مەزنی ئەو ڕیزە ڕاپەڕینانە بوو کە نۆڕینی دینەکییان ڕاپێچی نێو کایەی خەبات کردبوو. ڕاستە لە دەستپێکدا هۆکاری سەرهەڵدانەکە قانوونی بوو پتر لەوەی دینەکی بێت. جووتیاران شەڕیان بۆ ئەوە دەکرد کە پێی دەگوترا «مافی کۆن» دژ بەو مافە نوێیەی کە میران سەپاندیان بەسەر جووتیاراندا. مافی نوێ ئەو مافە ڕۆمانییە بوو کە لە سەدەی دوازدەیەم و سێزدەیەمدا لەگەڵ بارودۆخی سەردەمی ناڤیندا گونجێنرا و ڕێکخرا. مافی کۆن تەواو ناوچەیەکی و هەمەجۆر بوو: خەریکە بڵێم هەر گوندە و لە ڕووی مافەوە بارێکی خۆی هەبوو. ئەمەش بووبوو بە هۆی جۆرە سەرخۆبوونێک، هەر نەبێ بۆ ئەوانەی بەختیان سوار بوو. ئەم مافە گەر بە وردی لێی بنۆڕی، مافێکی فیودالانە بوو، چونکە دەبا مرۆڤ مل بۆ جۆرە مەزنایەتییەک کەچ بکات، واتە هەرەمێک کە بریتی بوو لە ئاغایانی فیوداڵی سەر بە دین و دنیا، ئەم ملکەچییەش لەبەر ئەوە نەبوو کە ئەو مرۆڤە لەو ناوچەیەدا نیشتەجێیە، بەڵکوو لەبەر جۆرە پێوەندییەکی سەر بە باوەڕ و خێرخوازی بوو کە بە ئاغاکانییەوە دەبەستەوە. بەرانبەر ئەمەش، مافی ڕۆمانی سەپێنەری یەکڕەنگی بوو. مافی ڕۆمانی، کۆڕێکی کارامەی دادپرسانی بەسەر گەلدا دەسەپاند و وێڕای ئەوەش بەڵگەی بۆ ئەوە دەهێنایەوە کە هەنگاو بنێت بەرەو ڕشتەیەکی هەرێمگریی پەتی، کە ناو وەڵاتەکە و دەوڵەتانی دواکەوتەش بگرێتەوە: کێ ژێر دەستەی کێیە مەسەلەیەک بوو بەند بوو بە هەرێمەوە نەک بە پێوەندارییەتی باوەڕ و گوێڕایەڵی خەڵک.

زایەڵەی خەبات لە پێناوی «مافی کۆن» دا، هەتا سەردەمی شەڕی جووتیارانیش هەر بەربیست بوو. لەو دەمەدا، باس لە گوزەرانی هەرەکۆنی ئازاد و ژیرانە زۆر باو بوو. ئەو باسانە لە زۆربەی ڕاپەڕین و هەوڵدانی بیرازکاریدا زۆر و بەردەوام بوون هەتا بیری پێشکەوتن و گەشبینایەتیی فراژووتن لە ئەورووپادا جێگەی خۆی کردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا دە ساڵێکی مابوو بۆ هەڵگیرسانی شەڕی جووتیاران کە بۆچوونێکی دیکە کەوتە نێوانەوە. خەبات لە پێناوی «مافی کۆن» دا لە ئاست خەبات لە پێناوی «مافی خوداکرد» دا

کاڵ بۆوە. ئامانجی بیری مافی خوداکرد، بەگشتی ئەوە بوو ئەو گوتانەی نێو تەوجیل، کە باس لە مافی هەژار و چەوساوە و وەکیەکیی هەموو ئادەمیزادان دەکات، لەم دنیایەدا بچەسپێنێ. پێشتر ئەم گوتانە تەنیا لە کایەی دنیایەکیبەدەردا ڕێگەیان پێ دەدرا، پتر نرخ دەدرا بە گوتەی وەک «مەزنایەتی، بێهودە شمشێری نەگرتۆتە دەست». ئەو دەمە، هەژاریی نێو تەوجیل بە هەژاریی گیانەکی لێکدەدرایەوە و یەکسانیی تەوجیلیش بووبوو بە یەکسانیی ئەودیو گۆڕ.

ئەمجارەیان بۆ لە دنیا نۆڕین، گوتەی دیکەی تەوجیل بایەخیان پێ درا، ئەو مافەی ڕێی دەدا بە بەگزادە و میرانی کڵێسە سەرانە لە ژێرکردەکانیان بستێنن و بێگاریان پێ بکەن، کەوتە ژێر گومانەوە. داخوازیی، کەموزۆر، شۆڕشگێڕانە سەری هەڵدا.

لەوەیە پیاو سەیری لەوە بێت چۆن پەیامی تەوجیلانەی وەها، بە خەڵکی ئاسایی و گەلی نەخوێندوو، ناسێندرا. بێگومان ئەو خواستەی لە سەردەمی ناڤینی درەنگ و سەردەمی بیرازکاریدا سەری هەڵدا و دەیگوت تەوجیل دەبێ لە ناو هەموو خەڵکدا بڵاوبێتەوە، نۆرەیەکی گرنگی هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا توێژێک لە پەیامبەرانی وەک مونتزەریش هەبوون، کە بریتی بوون لە کەشیشی پلە نزم و کۆڕی داواگران (کۆڕی داواگر: بریتی بوو لە "نووسکار" ی ساکار کە باوەڕی شۆڕشگێڕانەیان بڵاودەکردەوە) ئەمانە بە هۆی ڕیشە و باری گوزەران بێت یان بە هۆی باوەڕی پەتییەوە بێ، خۆیان بە خزمی گەلە ژێردەستەکە دەزانی. ئەمانە هەرچۆنێک بێت سەریان لەو باوەڕە دەردەچوو کە جاران بە زۆری بۆ دروستاندنی زۆرداری و ملکەچی بەکار دەهێنرا. ئەمانە جەختیان لەسەر پێوەندارییەتی دینەکی یان دنیایەکی خۆیان دەکرد. تۆماس مونتزەر سەرلەشکری جووتیاران بێ، بەڵام کە خۆی پێشکەش دەکرد دەیگوت: «من تۆماس مونتزەری کۆنە کەشیشی Allstedt م» و پاش ئەوە وەک ڕێبەرێکی شۆڕشگێڕ نەک، وەک چاوەڕوان دەکرا، کەشیشێک، دەهاتە گۆ.

نۆڕینی سەر بە مافی خوداکرد، لە هەموو بانگەوازی دەمەو درەنگی مونتزەردا ڕەنگی دابۆوە. دەستووری خوداکرد لەگەڵ پێوەندارییەتی حوکومڕانی چەسپاودا، تەواو ناکۆک بوو. مونتزەر لە دژنامەیەکی توندا، دژ بە لوتەر، گوتەیەکی بەناوبانگی هەیە، دەڵێ: «هەرچی ئافرێنراوە بووە بە سامان – ماسیی نێو ئاو، مەلی ئاسمان، ڕوەکی سەرزەوی – بەڵام ئەمانەش دەبێ ئازاد بن». لەوانەیە وشەکان شیعراسا خۆش بنوێنن، بەڵام دەربڕینێکن لە هەڵکەوتێکی دژوار. ئەو گوتەیە باسی مافی جووتیاران دەکات لە ماسیگری و ڕاو و کۆکردنەوەی بەری ڕوەک. ئەم مافی خوداکردە، لە هەموو سەروکارێکی دنیایەکیدا سەر هەڵدەدات.

بەلام ناشێ ئەم بیروڕای سەر بە مافی خوداکردە بە ئایدیۆلۆگییەکی سیاسی فراژوو دابنرێت. ڕاستە خاڵی شۆڕشگێڕانەی تێدایە، بەلام بۆچوونێکی ڕوونی وەهای تێدا نییە دەربارەی چۆنیەتی ئەو کۆمەڵگەیەی دەبێتە بەرهەمی شۆڕشەکە. هەڵبەت هەر دەشبا وەها بێ. ئەو بیرە ڕووی لە چەوساوان بوو، چەوساوانیش پشتگرییان لێ دەکرد. زۆربەیان جووتیار بوون بەلام لە زۆر لایەنیشەوە وردەبۆرژوای شاران و ئەو ژمارە کەمەی کە دەشێ بە پێشکۆیەکی پرۆلیتاریای سەردەمی نوێ دابنرێن، پشتیوانییان لە بیروڕای ڕاپەڕینەکە دەکرد. ئەو داهێزانە بەرهەستەی باری ئابووری و کۆمەلایەتییەی دووچاری گوندنشینەکان بووبوو، لە شارەکانیشدا ڕەنگی دابۆوە. پشتیوانیی شارنشینەکان مەرجێکی ئەو سەرکەوتنە کەمخایەنە بوو.

ڕاپەڕینەکە بنجداکوتانێکی چینایەتی هەمەجۆری هەبوو، ئامانجی گرووپە جیاوازەکان یان یەکنەگر بوون یان پێوەندییەکی لاوازیان لە نێواندا بوو، وێنەی ئەو کۆمەڵگەیەی پاش کەوتنی دەسەلاتدارانی کۆن هەڵدەنرێ تێکچەسپاو نەبوو، لێڵ بوو.

باڵی ڕادیکاڵی Diggers، کە وینستانلەی بێژەرێکی هەرە بەرچاویان بوو، سەرکەوتنێکی کاتەکی و کەمخایەنتریان وەدەست هێنا. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ژینگەیەی وینستانلەی کاری تێدا دەکرد، لە ڕووی کۆمەلایەتی و ئابوورییەوە، پێشکەوتوتر بوو، بەرنامەی کۆمەلایەتی ئەمیش لەوەی مونتزەر هەڵکشاوتر بوو. ئەو باڵەی ئەو نوێنەری بوو ناوی (هەڵکەندەکان Diggers) ی بەوەوە لێ نرا کە ئەندامەکانی، سەربەخۆ، زەوی گشتیی نەچێنراویان دەچاند و بەرهەمەکەیان بەسەر هەژاراندا دەبەشییەوە. ئەم کارەیان هەر زوو و بە توندی ڕێی لێ گیرا. دوژمنی هەرە گەورەشیان زەویدارە مەزنەکان بوون کە بێوچان خەریکی فرەواندنی ناوچەکانی خۆیان بوون و داهاتی مەڕدارییان زیاتر بوو لە داهاتی کشتوکاڵیان. کاتێک Diggers باس لەوە دەکەن کە هەموو سامان دەبێ هاوبەش بێ، مەبەستی سەرەکییان زەوییە. داهاتی زەوی دەبێ بچێتە خەزنەیەکی هاوبەشەوە و هەرکەسە بە پێی پێداویستی خۆی بەشی خۆی لێ دەربێنێت. هەموو دەوڵەمەندییەک، دەوڵەمەندیی زەوییە، هەموو دەوڵەمەندییەک ناڕەوایە چونکە لەسەر ئەرک و ڕەنجی خەڵکی دیکە هەڵنراوە.

ڕێبازی وینستانلەی، کە ڕووی لە چەوساوە و بەشخوراوانی کۆمەڵگەبوو، هەر زوو فەرامۆشیی پێچایەوە. ئەو نەریتەی ئەو دەستاودەستی پێکرد و دەوڵەمەندتری کرد، جارێکی دیکە، لە لایەن بێژەرە هەرە ڕادیکاڵەکانی شۆڕشی فرانسییەوە، ئەوانەی پێیان دەگوترا بێژەرانی بەرەی چوارەم، سەری هەڵدایەوە و دیسان بەردەوام بۆوە.

## ٤- ئێسکاتۆلۆگی (بنەتاناسی) Eschatology

جیاوازییەکی هەرە گرنگی نێوان بیروڕای شۆڕشگێڕانەی مونتزەر و وینستانلەی لە لایەک و بیروڕای سۆسیالیستانە و کۆمیونیستانەی ئەم سەدانەی دوایی ئەوەیە کە مونتزەر و وینستانلەی زەمانی خۆیان لەبەر تیشکی بنەتاناسیدا دەبینی: وا ئاخیر زەمانە. لە زەمانی مونتزەردا بۆچوونی ئاپۆکالیپتی apocalyptic باو بوو کە پێی وایە دنیا بەم زووانە کۆتا دەبێ، ئەو باوەڕانە لە زەمانی وینستانلەی-یشدا نرخی خۆی هەبوو. هەڵبەت دواڕۆژ، لە گوتەکانی ئەم دوانەدا، مۆرکی ئەم بۆچوونەی پێوە بوو، خۆیشیان و هاوبیرەکانیشیان پێیان وابوو دنیا خێرا دەکات. بەم زووانە ئاسمانێکی نوێ و زەوییەکی نوێ پەیدا دەبن، لەبەر ئەوە هەتا زووە، هەرچەندێکیان پێ دەکرێ، دەبێ ئادەمیزاد بخەنە سەر باوەڕی دروست و ڕزگاری بکەن.

بەڵام ئەوەی، لە نەریتی مەودافرەوانی بنەتاناسیدا کە نێزیکەی تێکڕای مێژووی مەسیحایەتی گرتوتەوە، بە بەرهەمی ڕەسەنی مونتزەر و وینستانلەی دادەنرێ ئەوەیە ئەمان ناڵێن بەهەشت، لەسەر ئەم زەوییە، وەک چارەنووسێک بە ملی ئادەمیزادەوەیە. نەخێر، ئەمان دەڵێن ئەو مەسەلەیە پێویستی بە خەبات و جەنگی ئادەمیزادە – بەتایبەتی هی چەوساوەکان. ڕێگە لە بواری دنیایەکیبەدەر بەرەو نێودنیایەکی، بە لای ئەوانەوە، کورتە. هێما دینەکییەکان ڕەنگدانەوەی ڕاستەوخۆیان لەم دنیایەدا هەیە. جیاکردنەوەی لایەنی دینەکی و لایەنی کۆمەڵایەتی، لە بانگەوازی ئەواندا، کارێکی سەختە و لە کردن نایەت. وشەی وەها هەیە جارێک بە واتایەکی قووڵی دینەکی و جارێک بە واتایەکی تەواو سادەی ڕۆژانە بەکار دەهێنرێن. تۆماس مونتزەر هاوار دەکات: «ڕۆژی جێژنە، وا هاوین دێتەوە»، ڕاستیشی دەکرد، ئەو دەمە بەهار بوو. بەڵام هاوین واتایەکی هێمایەکیشی هەبوو. ڕایخی سێیەم کە یواکیمی فیۆر Joachim of Fior لە سەدەی دوازدەیەمدا باسی لێوە دەکات و بەو شێوە دزێوەی سەردەمی هیتلەر کۆتا بوو، یەکێک لە ناوەکانی ئەو ڕایخە هەزارساڵانەی سێیەم، هاوین بوو. حوکومڕانی یەکەم، ڕایخی یەکەم – کە بە لەدایکبوونی مەسیح کۆتای هات – ڕایخی زستان بوو، دووەمیان، کە یواکیم و مونتزەریش پێیان وابوو خەریکە برمێ، ڕایخی بەهار بوو. پاش ئەوە دەبا هاوین لەو ساڵە جیهانییەدا بێت، ڕایخی سێیەم جگە لە هاوین، کییانستانە، ئەڤینستانە، ڕۆشنستانە.

باوەڕی سەر بە ڕاپەڕینی گەلێر گەشانەوەیەکی کەمخایەنی بەخۆیەوە دی. بە هێزێکی بێبەزییانە سەرکوت کرا و پاشان لە بەرهەمی بیبڕانەوەی ڕاڤەی دینەکی و بەیانی سیاسیدا، وەک دوژمنێکی ناونەهێنراو بەڵام هەمیشە ئاماژەبۆکراو، ژیانێکی پەنامەکی دەبردە سەر.

### ١- ناکۆکییەکانی سەدەی حەڤدەیەم

لە مێژووی بیری سیاسیدا سەدەی حەڤدەیەم سەدەی ناکۆکییەکی ئاشکرای ئایدیۆلۆگییە. باوەڕی پەرگر پەیدا بوون، بیروڕای تازە جێی کۆنیان گرت، زاراوەی نەرێتی ناوەڕۆکی تازەیان پەیدا کرد و هەڵوێستی نوێ لە ئاست زانست و جیهانبینییەکی نوێی دواکەوتەی زانست ڕەنگیان لە شابەشەکانی جیهانبینیی سیاسیدا، دایەوە.

لە ئەورووپای سەدەی حەڤدەیەمدا فراژووتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی یەکجار هەمەشێواز بوون. لە سەدەکانی پێشووتریشدا جیاوازیی بارودۆخی بەرهەمهێنان و بازرگانی، لە هەرێم و وەڵاتی جۆراوجۆردا، گەورە و گرنگ بوون. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو جیاوازییانە هێندە گەورە نەبوون ڕێگە لەوە بگرن کە هەموو مەسیحایەتیی ڕۆژاوا بتوانێت لە چەند ڕێبازێکی سیاسی و ئابووریدا، هاوبەش بێت. ئەو بۆچوونەی سەردەمی ناڤین کە دەیگوت هەر چینێکی کۆمەڵایەتی بەرهەمێکی سروشتەکی خۆی هەیە و هەر شتێک نرخێکی سروشتەکی خۆی هەیە، باوەڕێک بوو لەگەڵ هەڵکەوتدا هاوشان نەبوو - باوەڕ و تەژەند prosperity لە ئەورووپادا تەواو لەیەک جودا بوون - بەڵام باوەڕێک بوو بە ئامانجێکی سروشتەکی دادەنرا. بیروڕای لەو بابەتە، لە سەدەی حەڤدەیەمدا، جێگەی نەما. لە هۆلاند و ئینگلاند، لە ئەنجامی گەشەکردنی بازرگانی، سامانێکی زۆر پەیدا بوو، بەڵام وەڵاتانی سەر زەریای ناوەڕاست لەو گەشەکردنە بەجێمان. ئەورووپا دابەش بوو بەسەر بەشێکی دارا و بەشێکی نەداردا، جیاوازییەکەش پتر بە ئەنجامی بەرزی و نزمیی ژیریی سیاسی دادەنرا نەک بە نارەوایی.

گەشە کردن لە ئەورووپایەکی ژێرفەرمانی جووتەوەری پاپا و قەیسەری ئەڵمانی-ڕۆمانی، بەرەو ئەورووپایەکی نەتەوەدەوڵەت، لە سەدەی دوازدەیەمەوە دەستی پێ کرد و لە سەدەی حەڤدەیەمدا بە کامڵبوون گەیشت. دەوڵەتەکان بوونە هاوچاوی ئابووری یەکدی. ئەو فراژووتنە هەمەشێوازەی ئابووری کە دەکاتەوە دژوەستانی نێوان دەوڵەمەندبوونی هەڵکشاوی نەتەوەیی لە لایەک و تاڕادەیەک هەژاریی نەتەوەیی لە لایەکی دیکە، یەکێک بوو لە مەرجەکانی بڵاوبوونەوەی ئەو باوەڕە ئابوورییەی پێی دەگوترێ ***مەرکانتیلایەتی*** *mercantilism*. پەیڕەوانی مەرکانتیلایەتی، هەر وەک ئەوانەی دیکەی سەردەمی ناڤین، پێیان وابوو کە سەرلەبەری سامانی زەوی نەگۆڕە. بەڵام جیاوازییان

لەوەدا بوو کە پەیڕەوانی مەرکانتیلایەتی ئەو ئاکامگرییەیان نەدەسەلماند کە دەیگوت دەبێ هاوسەنگییەکی سروشتەکیی ئابووری لە نێوان هەرێم و دەوڵەتانی جۆراوجۆردا دابین بکات. پەیڕەوانی مەرکانتیلایەتی دەوڵەتیان بە یەکەیەکی سەلمێنراوی ئابووری دادەنا – و پێیان وابوو دەوڵەتی جۆراوجۆر دەشێ و دەبێ ڕادەی بەرهەمدارییان جیاواز بێت. ئەو دەوڵەتەی ***هەناردن*** *export* ی لە ***هاوردن*** *import* ی زیاتر بێت، سامانی پتر دەبێت، لەبەر ئەوە دەبێ هەر دەوڵەتێک هەوڵ بدات پێداویستییەکانی خۆی لە ناو خۆدا بەبەرهەم بێنێت، بۆ ئەوەی زیادەهەناردەی خۆی بپارێزێ.

هەر لەبەر ئەوەشە پەیڕەوانی مەرکانتیلایەتی داوای ئەوە دەکەن بە گومرگ بەرهەمی خۆماڵی بپارێزرێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بارەڕانەی مەرکانتیلایەتی لە دەوڵەتە پێشەنگەکاندا لاوازتر بوو. لە هۆڵاند، کە لە ماوەیەکی سەدەی حەڤدەیەمدا لە هەموو دەوڵەتەکانی دیکەی ئەورووپا پەرەسێنتر بوو، باوەڕی مەرکانتیلایەتی نۆرەیەکی کزی هەبوو. پاشان کە ئینگلاند جێی هۆلاندی پێشەنگی گرت، مەرکانتیلایەتیی ئینگلیزیش کز و تەنک بووە. بەلام یەکێک لە بنەما فیکرییەکانی مەرکانتیلایەتی، کە دەڵێ سەرجەمی سامانی زەوی نەگۆڕە، تاوی خۆی هەتا ماوەیەکی درێژخایەن پاراست. پاشان نۆڕینێکی دیکە سەری هەڵدا دەیگوت تەژەند، بە زیاد کردنی بەرهەمی کار، زیاد دەبێت، بەلام لە سەرەتادا تەنیا لە بواری تاکەکەسی و نەتەوەییدا، بەکار هێنرا. لەسەر ئاستی بواری ئابووریی نەتەوەییدا، هەر ئەو باوەڕە برەوی هەبوو کە دەیگوت ئەوەی دەستکەوتی ئەم دەوڵەتەیە، زیانی ئەوەی دیکەیە.

بەلام ئەو فراژووتنە ئابوورییە ناهاوسەنگە کاری تەنیا لە پێوەندیی نێوان دەوڵەتان نەدەکرد بەڵکوو لە پێوەندیی ناوخۆی تاکە دەوڵەتیش دەکرد. بە نموونە، ئینگلاند تەواو دوور بوو لەوەی کە هەموو ئینگلاند لە بەری ئەو فراژووتنە ئابوورییە بخوات. بە پلەی یەکەم چینێکی، لە سەرەتاوە هاوبنچی، بازرگان بەو داهاتە خۆیان دەوڵەمەند دەکرد. بەشێکی بەرچاوی بەگزادانی زەویدار پلەوپایەی خۆیان بە هەرەشەلێکراو دەزانی. لە ململانێی نێوان ئەریستۆکراتی کۆن و نوێدا – گەر پێت خۆشە دەڵێین نێوان ئەریستۆکراتی کۆن و گەورەبۆرژوای پەرەسێن – خەلکی دیکەی چین نەویتر، تێوە دەگلان. سنووری سیاسی و ئایدیۆلۆگی ڕوون و ئاشکرا نەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا لەیەک جودا دەکرانەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، شەڕە گەورەکانی سەدەی حەڤدەیەم شەڕێک نەبوون، بە ئاشکرایی و ئاگادارانە، لەسەر دەسەلاتی ئابووری بن، مەگەر ناڕاستەوخۆ ململانێی چینایەتی بن. لە

نیوەی یەکەمی سەدەکەدا شەڕەدین لە ئارادا بوو، لە نێو دەوڵەتیشدا ناکۆکیی نێوان ڕێبازە دینەکییەکان نۆرەیەکی گرنگیان هەبوو. دۆزی سەر بە دین لە دنیای بیری سیاسیشدا نۆرەیەکی بەرچاویان هەبوو. گەر لە ڕوانگەی فراژووتنی ئابوورییەوە لێی بنۆڕیت دەکرێ حوکومڕانیی تاکفەرمانی پاشایەتی فرانسە بە دژایەتییەک دابنێیت لە نێوان پاشا و ئەو گوزەرانە ئابوورییەی کە دەوڵەت دەمراستی بوو لە لایەک و لە لایەکی دیکەش هەردوو بەرەی، فیوداڵەتی feudalism و ئەریستۆکراتی فیوداڵ لەم سەر و هوگونۆنت Huguenot ی پرۆتێستانتی لیبرال و لە ڕووی ئابوورییەوە پێشکەوتنخواز، لەوسەر. بەڵام لە ڕوانگەی لایەنە تێوەگلاوەکانەوە، ئەو حوکومڕانییە بە فەرمانێکی خودا و پێویستییەک دادەنرا دژ بە لادانی پرۆتێستانت. لە ئینگلاند، کە گرنگیی ململانێی ئابووری و کۆمەڵایەتی تەواو ئاشکرابوو، ناکۆکیی نێوان کاتۆلیک، ئینگلیکان و سەربەخۆ یەکان Independent و کۆمەڵەی دینەکی دیکە بووبوو بە پێشەنگی ئەو ماوە ئاژاوەڵەی نێوان سالانی ١٦٤٠ و «شۆڕشی شکۆمەند» ی ١٦٨٨.

فرەبەرەکیی دینەکی هەر ئەوە نەبوو وەک بیانوویەکی شەڕ بەکار بهێنرێ، بەڵکوو تاوێکی گشتیتر و درێژخایەنتریشی لەسەر دیمانەی سیاسی هەبوو. بە شێوەیەکی تیان ڕێگەی بۆ *مافی سروشتەکیی عیلمانی* خۆش کرد. مافی سروشتەکی لە سەردەمی ناڤینی بەرزەوە، شامەبەستێکی ڕەچاوی گرتبوو ئەوە بوو ڕەوایەتییەکی ئاکارەکی بدات بە مافی دانانەکیی چەسپاو، بەڵام ئەوەشی کردبوو بە مەرج کە مافی سروشتەکی بەندە بە دەستووری خوداکردەوە. باوەڕی لوتەرایەتی کە لە سروشتی داڕزاوی مرۆڤ دەدوا وەهای کرد چەمکی مافی سروشتەکی بۆخۆی بەرگومان بێت. بەڵام بیروڕای سەر بە مافی سروشتەکی، گەرچی چوونە بەرگێکی تاڕادەیەک نوێوە، بەردەوام مانەوە.

دنیای ڕۆمانی - کاتۆلیک ڕەگی ڕووەو پشتەوەی بە سەردەمی ناڤینەوە بە هەڵنەبڕاوی هێشتەوە، بەڵام لە چەندین وەڵاتی سەر بە پرۆتێستانتدا، مافی سروشتەکی، کەموزۆر، بە مافێکی دنیایەکیکراو سەری هەڵدا. ئەو بۆچوونەی باس لە مافێک دەکات هەموو گەل و نەتەوەیەک بگرێتەوە، کەموزۆر ڕادیکالانە، لە نۆڕینی دینەکی ڕزگار کران: جیاوازییەکی تەواو کەوتە نێوان ئەو دەستوورانەی لەم دنیایەدا بڕیاردەرن و ئەو دەستوورانەی لەو دنیایەی دیکەدا بڕیاردەرن.

بێگومان مەرجێکی ئەم مافە سروشتەکییە ئەو فرەبەرەکییەی نێو مەسیحایەتی بوو. ئەگەرچی هەر لایەنێک پێی وابوو خۆی خاوەنی باوەڕی دروستی مەسیحایەتییە، بەڵام ناکۆکیی بۆچوونەکان - بەتایبەتی لە ئاست پێوەندیی نێوان کڵێسە و دەسەڵاتی دنیایەکی

– هێندە فرەوان و ئاشکرا بوون کە چیدی نەدەکرا، ئەو لایەنانە، چنگ لەو ڕایە گیربکەن کە دەڵێ تەنیا یەک مافی مەسیحایەتی هەیە.

بەڵام مافی سروشتەکی عیلمانی – کە بنەمای: «ئەگەر خوداش نەبوایە» خەڵک چەند جۆرە مافێکیان هەر دەبوو، کردبووە گرفتڕەوێن – مەرجی دیکەی یەکجار گرنگی هەبوو. یەکێک لەوانە، وەک باسمان کرد، ئەو فراژووتنە ئابووری و کۆمەڵایەتییە خێرایە بوو کە، بە پلەی یەکەم لە هۆلاند و ئینگلاندا هاتە کایەوە. لەگەڵ ئەو فراژووتنەدا، کۆمەڵگەیەکی بۆرژوای بەهێز و تاڕادەیەک نوێی وەها پەیدا بوو هەرگیز شێوازی مەسیحایەتی وەها تێیدا ڕۆنەچووبوو، وێڕای ئەوەش تەواو دنیایەکی دەچوو بەڕێوە. مەرجێکی دیکەش ئەو ***شۆڕشی زانستی*** یە بوو کە بووبوو بە هاوشانێکی بیرکاریی ئەو فراژووتنە.

ئەم شۆڕشە زانستییە لە سەدەی حەڤدەیەمدا بە دوند گەیشت بەڵام بنجی لە سەدەی چواردەیەمدا هەیە. کەواتە دیاردەیەکی تێژڕەو و گشتگیری ڕاستەوخۆ نەبوو، بەڵام ئەنجامەکەی وێنەیەکی تەواو نوێی سروشت و زانست بوو.

«سروشت» هەر لە سەردەمی دێرینەوە، تەنیا بە واتای «ئافرێنراو» (هەڵکەوتی بەرجەستە) نەهاتووە، بەڵکوو «ئافرێن» یشی گرتۆتە خۆ، مەبەستیش لە ئافرێن ئەو بنەما چالاک و ڕێکخەرەی نێو شتانە، «پێوەر norm» ە، واتە بڕیادەری ئەوەیە کە بابەتی جۆراوجۆر دەبێ «چۆن» بن. ئەم بۆچوونەش بەند بوو بەوەی لە ڕوانگەیەکی ئامانجناسییەوە سەیری هەموو هەڵکەوت دەکرا: نەک تەنیا ئادەمیزاد بەڵکوو هەموو شتێک بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو ڕێی دەکرد. مرۆڤ تەنیا لەوەدا خۆی لە بوونەوەری دیکەی لەژێرتر جودا دەکردەوە کە ئەم دەیتوانی لە پێوەر و سروشتی خۆی لابدات.

فراژووتنی زانستی، کە لە سەدەی چواردەیەمدا دەستی پێ کرد و دەکرێ بڵێین بە دیمانەکەی نیووتن Isaac Newton دەربارەی هێزی ڕاکێشان (١٦٨٧)، گەیشتە لووتکە، یەکێک لە ئەنجامەکانی ئەوە بوو کە لێکدانەوەی ئامانجناسی دەخرانە لاوە و مرۆڤ بۆ لێکدانەوەی میکانیکی دەگەڕا کە بۆ شتی بێگیان و زۆر جاریش بۆ کردەوەی گیانلەبەرانیشی بەکار بێنێ. پێشتر، ***دەستووری سروشتەکی*** مەبەستی ***پێوەر*** ی ئەم یا ئەو دیاردەیەی دەدا بەدەستەوە. بەڵام ئەم دەستووری سروشتەکییەی کە، بۆ نموونە، نیووتن دەربارەی بزووتنی کۆساران و داکەوتنی شتان دایڕشتووە، وای دەردەخات کە تەنیا ئەو هۆکارانەی ڕاستەوخۆ کار لە ڕەوتی بزووتنەکە دەکەن، پێشان دەدرێن. دەستووری ڕاکێشان – ی نیووتن دەڵێ یەکتر کێشکردنی ناوەڕۆکی دوو لەش پێوەندە بە مەودای نێوان ناوەڕۆکیان و بە بارستی هەر یەکەیان. گەر ئەو هۆکارانە بزانیت دەتوانی

هێزی یەکتر کێشانیان ڕێک حیساب بکەیت. بەڵام ئەم دەستوورە بە هیچ جۆرێک باس لە ئامانجی لەش ناکات، ئەمە دەستوورێکە سەر بە میکانیکە نەک ئامانجناسی.

هەڵبەتە ئەم تێڕوانینەی سەر بە میکانەتی mechanism یە ڕوانینێکی نوێیە لە سروشت، بەڵام کاری کردۆتە سەر دیمانەی سیاسیش، چونکە چەمکی وەک سروشتی مرۆڤ و مافی سروشتەکی دەبا وردەوردە ناوەڕۆکێکی نوێ پەیدا بکەن. یەک لە دەرفەتان ئەوە بوو دیمانەی سیاسی تێهەڵکێشی دیمانەیەکی میکانەتیی وەها بکرێ کە گەردوون بگرێتەوە، وەک ئەوەی تۆماس هۆبز Thomas Hobbes (١٥٨٨-١٦٧٩) بە هەنگاوی یەکڕەوانە هەوڵی بۆ دا. دەرفەتێکی دیکە ئەوە بوو ڕێ بدرێ دیمانەی سیاسی ئەو جۆرە سەرخۆبوونەی هەیبوو بپارێزێ و لەم بوارەدا - کە هەڵسوکەوت لەگەڵ کردەوەی مرۆڤ دەکرێ - چەمکی سروشت هەر ئەو ناوەڕۆکە کۆنەی سەر بە ئامانجناسی هەبێ.

لە ئەنجامی ئەم زمانگۆڕییەدا، فرەمەبەستییەکی هەراسانکەرانە پەیدا بوو. لە بەرهەمی زووتردا، دوان لە سروشتی مرۆڤ و ... هتد شل و نادیاریکراو بوو، بەڵام بنجەواتای وشەی «سروشت» یەکڕەنگ بوو. لە سەدەی حەڤدەیەمدا، لە بواری سیاسیدا دەشیا سروشت بە ناوەڕۆکە کۆنەکەیەوە - پێوەر - بەکار بێت، بەڵام دەشکرا بە واتای «بە پێی دەستوورانی میکانیکی کە گەردوون دەگێڕن» یان هەر نەبێ «بە پێی سروشتی بایۆلۆگی و سایکۆلۆگی مروڤ» بەکار بێت. جگە لەوەش بە واتای «بنچینەکی»، «مرۆڤ، پێش دەستپێکی مێژوو و دەوڵەتی ڕێکخراو، وەها بووە» بەکار هاتووە. زۆر جار وا دێتە بەر چاو کە نووسەرانی سەر بە سیاسەت ئاگاداری ئەوە نەبووبن کام ناوەڕۆک بەکار دێنن.

بەرانبەر ئەوە، ئاشکرا بوو کە تێڕوانینی زانستانەی نوێ، کە هێدی هێدی ترنجایە نێو جیهاننۆڕیی سیاسییەوە، بووە هۆکارێک بۆ سەرخستنی مافی سروشتەکیی عیلمانی و بەگشتیش دیمانەی سیاسیی عیلمانی.

بەڵام کاریگەریی نۆڕینی زانستانە بەوە تەواو نابێ. مێتۆدی زانستانەی نوێ بە قووڵی کاری لە هەموو شێوازێکی بەرهەمهێنانی ئەدەبی سیاسەت کرد. (نووسینەوەی ئەرک و بڕیارەکانی دەوڵەت کارێک نەبوو بدرێتە دەست پسپۆڕانی ئەو پیشەیە، زۆربەی زانستکار و فەیلەسووفانی سەدەی حەڤدەیەم بووبوونە نووسەری سیاسیی بالادەست).

## ٢- ئینگلاند: هۆبز و لۆک

سەدەی حەڤدەیەم سەدەی گۆڕانکاریی گەورەی کۆمەلایەتی و بیرەکییە. لە چەندین وەلاتیشدا سەدەی شۆڕشی سیاسیی درندانە بوو. بەر لە هەمووشیان ئینگلاند. ویڕای ئەوەش لە ئینگلاند زەنگینترین و ڕەنگینترین بەرهەمی ئەدەبی پەیدا بوو. نەریتی کۆن دەشکیندرا، ڕشتەی سیاسی یەک بە دوای یەک دەگۆڕان. مرۆڤ، نە دەیتوانی پشت بە نەریتیکی چەسپاو ببەستێ نە دەشیتوانی بنەمای سیاسی بە کردەوە بچەسپێنێ. لە ژینگەی وەها سەخت و نائارامدا، چەندین جۆرە باوەڕ پەیدا دەبێ، وشەی ڕادیکال پڕبەپیستی بەشێکی زۆری ئەو باوەڕانەیە: بیریارەکان هەولیان دەدا شابنەمای وەها دابنێن کە بۆ حوکومڕانیی هەموو دەولەتێک، بێ ڕەچاو گرتنی لایەنی سەر بە بیروڕا و نەریتی دیکە، دەست بدات.

لە سەرەتادا، ململانێ لەسەر دەسەلاتی پاشا و پەرلەمان بوو، بەتایبەتیش لەسەر ئەوە بوو کە مافی پاشا لە باج ستاندندا چەند و چۆن بێ. پاشا و بالی سەر بە پاشا لە نێو پەرلەماندا، واتە سوارچاکان Cavalier، پشتیان بەو باوەڕە دەبەست کە دەیگوت دەسەلاتی پاشا خێری خودایە، هاوچاوانیشیان، سەرخڕەکان، دەیانگوت دەسەلات دەبێ لە نێوان پاشا و پەرلەماندا دابەش بکرێ، چونکە پەرلەمان نوێنەری گەلە (واچاکە بلێین نوێنەری بەشێکی هەلبژاردەی گەلە).

لەگەل ئەوەشدا، ئەو ناکۆکییانە هەتا پلەیەکی بەرز دینەکی بوون. کلێسەی ئەنگلیکانی کلێسەیەکی سازێن compromise بوو، ئادگاری کالڤینی و ڕۆمانی - کاتۆلیکی هەبوو. ئەو کلێسەیە ژێردەستەی دەسەلاتی دەولەت بوو و بەوەش بووبووە ئامرازێک بە دەست پاشاوە. لە پەرلەماندا، سەرخڕەکان، پەیڕەوێکی سەرگەرمی کالڤینایەتیی هەمەجۆر بوون، زۆر جار بە تێکڕایان دەگوترا پیوریتان puritan <پەیڕەوانی پیوریتانیزم puritanism> (ئەگەرچی پیوریتان بۆ دەستەیەکی بچووکتریش بەکار دەهێنرا). بۆچوونە کۆنەکان، بەگشتی، دەربارەی پێوەندیی کلێسە و دەولەت و دەربارەی سازمانی ناوەکیی کلێسە بوو. سەربەخۆ Independent یەکان کە بالێکی ڕادیکالی پیوریتانەکان بوون، داخوازییان ئەوە بوو کە هەر کلێسەیەک تەواو سەربەخۆ بێت، نە فەرمانبەری دەولەت بێت و نە ژێردەستەی مەترانان بێت. لەبەر ئەوە داوای جۆرە سنگفرەوانییەکی دینەکییان دەکرد - ئەگەرچی زیاتر بۆ خۆیان بوو وەک لەوەی بۆ لایەنی دیکەش بێت.

ئەو ناکۆکییانە لە بەرەو بنەتای سالانی ١٦٤٠ تەواو پێگەیین و بەرەنجامەکەشی ئەوە

بوو پاشا ئیعدام کرا و ئینگلاند کرا بە کۆمار و Oliver Cromwell کرا بە سەرکۆمار. کۆمارەکە مەزن نەبوو، تەمەنی لە دە سالێک تێپەڕی کرد. بە هەڵگەڕانەوە Restoration ی سالی ١٦٦٠ خوونکارەتی ستیوارت Stuart دەسەلاتی گرتەوە دەست. بەلام شەڕ هەر بەردەوام بوو، سالی ١٦٨٨ پاشای فەرمانڕەوا لابرا و پاشایەکی نوێ، بە دەسەلاتێکی سنووردراوەوە جێگەی ئەوی گرت (*شۆڕشی شکۆمەند*). ڕووداوەکانی سالی ١٦٨٨ لە زۆر ڕووەوە گەڕانەوەیەک بوو بۆ دۆخی کۆن: دابەشینی دەسەلات لە نێوان پاشا و پەرلەماندا وەک خۆی لێ هاتەوە. بیژەرانی شۆڕشەکە – کە جۆن لۆک John Locke (١٦٣٢–١٧٠٤) لە هەرە بەرچاوەکانیان بوو – شۆڕشەکەیان بە سەرکەوتنی نەریتی ژیرانە دادەنا. بەلام شۆڕشەکە گەلێ لایەنی دیکەی بە دەمەوە بوو: بووە هۆی لابردنی گەورەترین کۆسپی سیاسی لە ڕێی فراژووتنی سەرمایەدارەتیی هاوچەرخدا. بنگەی دەولەت باوەشی بۆ ئەو خەسلەتە تایبەتییە گرتەوە کە بریتی بوو لە تێکەلێکی نەریتەکیەتیی ئەریستۆکراتانە aristocratic traditionalism و نوێکاریی بۆرژوایانە. لەو دەمەوە، ئەو خەسلەتە، بووە مۆرکێک و بۆ ئینگلاند مایەوە.

ئەو ئەدەبە سیاسییەی لە ماوەی شۆڕشە گەورەکاندا بەبەرهەم هات، یەکجار دەولەمەند بوون. ئاشکرایە کە ناکۆکیی دینەکی نۆرەیەکی بەرچاویان لەو ئەدەبەدا هەبوو. بەلام ئەو تێبینییانەی ڕاستەوخۆ سەر بە بواری ئایدیۆلۆگی و تەنانەت چینایەتیش بوون، شاپلەیان هەبوو. *Diggers* (هەلکەندەکان: ئەم ناوەیان لەوەوە هاتووە کە دەیانویست زەویی گشتیی بەسەر هەژاراندا دابەش بکەن) ئەوپەڕی چەپیان گرتبوو. ئەمانە، لە ئەدەبی سیاسییدا، کەمتر بەرچاون، لەگەل ئەوەشدا شیاوی ئەوەن کە وەک بیژەرێکی خەلکی ستەمدیدە باس بکرێن – بیژەری لەم بابەتە، وەک باسمان کرد، لە مێژووی بیری سیاسیدا، دەگمەنن. Diggers زۆر بە توندی جەخت لەسەر ئەو پێوەندییەی نێوان ئابووری و سیاسەت دەکەن، ئامانجیان سۆسیالیستانەیەکی لێلە.

لە تەک Diggers دا *Levellers* هەبوون، ئەمانە نوێنەرایەتیی ئەفسەری نزم و بۆرەپیاوانی نێو لەشکری Cromwell بوون، بەلام بەگشتی بیژەرێک بوون بۆ نێوچینی ژێرکەوتە، کاسبکاران، وردەبازرگان و تاڕادەیەکیش جووتیاران. Levellers بە واتای «یەکسانیپەروەران» دێت، بەلام ئەو یەکسانییەی ئەمان بە ئامانجیان گرتبوو بەر لە هەر شتێک سیاسی بوو (Diggers، بۆ ئەوەی ئەو جیاوازییە ئاشکرا بکەن، خۆیان ناونابوو true levellers واتە یەکسانیپەروەرانی دروست). داخوازی Levellers بیراز کردنی پەرلەمان بوو بۆ ئەوەی ببێتە نوێنەری بەشێکی گەورەتر و فرەوانتری گەل و هەروەها ببێتە

ناوەندێکی خۆڕسکی دەسەڵاتی نەتەویی. ئەمانە داوای مافی سیاسیی تاکەکی individual یان دەکرد و بەو جۆرە پێشکاتییان لە بیروڕای سیاسیی لیبەڕالانەی دواکات کرد.

لە سەرپەڕی کایەی سیاسی بەرانبەریشدا ئەو لایەنانە هەبوون کە داوای پاشایەتییەکی تاکفەرمانیان دەکرد. بەڵگەی ئەمانە، بەر لە هەر شتێک، سەر بە ڕەوایەتی legitimism بوو: پێیان وابوو کە پاشایەتیی تاکفەرمان ئەو مافەی لە خوداوە پێ بەخشراوە کە هەموو دەسەلاتێکی ناو وەڵاتەکە بگرێتە دەست. بەڵگەوازی argumentation ی ئەمانە زۆربەی جار تەواو ساکارانە بوو بەڵام تینێکی زۆری هەبوو، بەتایبەتی پاش *هەڵگەڕانەوەکەی* ۱٦٦۰.

بۆ ئەوەی مەودای گوتوبێژی ئایدیۆلۆگی، لە ئینگلاندی سەدەی حەڤدەیەمدا، ڕوون بێتەوە، لەوانەیە کارێکی خراپ نەبێ ئەگەر لە نێزیکەوە ئەو تێکستانە شی بکەینەوە کە دەشێن ببنە نموونەیەکی ئەو سێ ڕێبازەی باسمان لێوە کردن. بیروڕای ورووژێن، کە بە پلەی یەکەم، Diggers نوێنەرایەتی دەکرد و Gerrard Winstanley بێژەری بوو، لە بەشی پێشوودا بە کورتی باس کران. هەرچی Levellers و ڕەواپەروەران legitimist بوون، بەرهەمێکی وەهایان نییە تایبەتمەندییەکانی بیری سیاسیی سەدەی حەڤدەیەم پێشان بدەن. ئەوجا ئەگەر بەدوای نووسەری وەهادا بگەڕێین کە لە نووسینەکانیاندا بنەمای نەخشی ئەو بیرانەیان کێشاوە، ئەوا دەبێ تۆماس هۆبز Thomas Hobbes و جۆن لۆک John Locke هەڵبژێرین. هۆبز لایەنگری تاکفەرمانیی ڕەها بوو، بەڵام لەگەڵ ڕەواپەروەراندا لایەنی هاوبەشی کەم بوو و وەها پێ دەچێ تینی ڕاستەوخۆی باوەڕەکەشی یەکجار کەم بووبێ. بەڵام هۆبز بە شێوازێکی یەکرەو و ڕوونی وەها کە لە مێژووی بیری سیاسیدا کەممانەندە، لە چەندین دیمانەی سیاسی دەدوێ، ئەو دیمانەگەلە بە شێوەیەکی پەرت و بڵاو، لای ئەموئەو لە سەدەی حەڤدەیەم و دواتریش، زۆر جار دێنە ڕێمان. جۆن لۆک وەها یەکرەو و ئاشکرا نییە، بەڵام ئەویش لە ڕۆژگاری خۆیدا، بیری ساماندارەتیی بورژوایانە و بیری مافی سیاسیی تاکەکی (واتە تایبەت بە تاکەکەس) لە هەمووان ڕوونتر دەردەبڕێ. لەم بوارە و چەندین بواری دیکەشدا، لۆک وەک کەسایەتییەکی بەرزی سەردەمی ڕۆشناکی enlightenment دێتە پێش.

هۆبز و لۆک تەنیا بیریاری سیاسی نەبوون. هۆبز، لە سەدەی حەڤدەیەمدا، یەکێک بوو لەو گەورانەی پێیان دەگوترا وەستایانی ڕشتەی فەلسەفی. ڕشتەکەی ئەو بە شێوەیەکی لۆگیکانەی توند و لەسەر شێوازی ئەندازەناسی geometry ی یوکلیدەس Euklides، هەڵچنراوە. لە دەراوی چەند سەلمێنە axiom یەکی ساکارەوە ڕێ بەرەو خەسڵەتی وەها

دەکات کە هەموو دنیا بگرێتەوە. هۆبز مەتێریالیست و میکانیستە: تەنیا لەش بوونی هەیە و دەکرێ هەموو دیاردەیەک بە بزووتنی میکانیکانەی لەش لێکبدرێتەوە. نووسینی سیاسیی هۆبز تەنیا بەشێکی خۆشاخنراوی سەرجەمی نووسینەکانییەتی. هۆبز بە وردترین شێوە لە *Leviathan* (١٦٥١) دا - باس لە دیمانەی دەوڵەت دەکات. لەو کتێبەدا هۆبز ئەوە دەکا بە دەراو کە تەنانەت دیاردەی کۆمەڵایەتیش دەکرێ بە بزووتنی لەش (واتە لەشی مرۆڤەکی) سەیر بکرێن و لێکبدرێنەوە.

دیتنی فەلسەفی لۆک جۆرێکی تەواو جیاوازە. لۆک لایەنگری بیری شارەزاکیەتی-یە: ئەو زانیارەی ئێمە هەمانە دەربارەی دنیای بەربین، سەرچاوەکەی شارەزایی و ئەزموونە. ڕاستە لۆک لەو خاڵەدا تەواو یەکڕەو نییە و ئاسانیشە کە بۆ نموونە لە نێوان دیمانەی زانیاری خۆی و ئەو بیروڕایانەی کە لە گرنگترین بەرهەمی سیاسیی خۆیدا *Two Treatises of Government* ( *دوو لێکۆڵینەوە دەربارەی حکوومەت*، ١٦٩١) باسی کردوون، دژوەستان بدۆزینەوە. بەڵام ئەوەی لۆکی تەواو هەڵاوێردووە ئەو ڕێبازە گومانگرە و ئەو باوەڕە بەهێزەیەتی بە «هۆشی ڕوون common sense».

لەوانەیە کارێکی دڵکێش بێ هۆبز و لۆک بە دوو کەسی تەواو پێچەوانەی یەک دابنێین. لە زۆر شادۆزدا تەواو دژوەستانی یەکن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەردوو بەرهەمی *Leviathan* و *Two Treatises* نیشانەی تەواویان تێدایە[٤] بۆ ئەو گۆڕانکارییە بنەڕەتییانەی نێو جیهاننۆڕیی سیاسی، کە بوونەتە خەسڵەتێکی سەدەی حەڤدەیەم. لەبەر ئەوە چەند گرنگە جیاوازیی نێوانیان پێشان بدرێن، ئەوەندەش گرنگە لایەنی هاوبەشیان بخرێنە ڕوو.

### ٣- تاکەکیەتیی سیاسی

زووتر لە ستۆیکیزم و مەسیحایەتیی زوودا جۆرێک لە تاکەکیەتی-مان هاتە ڕێ. ئەو تاکەکیەتییە مرۆڤی دادەبڕی لە پێوەندییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی خۆی. ئەوە تاکەکیەتیی ناسیاسی بوو: مرۆڤ لە دەرەوەی ڕشتەی سیاسی و وێڕای ڕشتەکە، دەرکەوێت و نرخی سەربەخۆی هەبێ وەک تاکەکەس.

لە بیرازکاریدا و بەتایبەتی لای لوتەر، تاکەکیەتییەکی دینی هەبوو: پێوەندیی دینەکیی یەکلاکەرەوە، ئەو پێوەندییەیە کە لە نێوان خودا و تاکەکەسدایە. بەڵام ئەم تاکەکیەتییە تاکەیەتییەکی سیاسی لەگەڵ خۆی نەهێنا.

بۆ یەکەم جار لە سەدەی حەڤدەیەمدا تاکەکیەتیی سیاسی لە بەرەیەکی فرەواندا پەیدا دەبێ. لای هۆبز و لای لۆک و لای زۆری دیکەش بیری ئەوەی: ***دەوڵەت ئەرکی ئەوەیە بەرژەوەندی تاکەکەسان بپارێزێ***، دێتە کایەوە.

بە نۆڕینی لۆک مافی سروشتانە (بەپێی مافی سروشتەکی) ئەو مافانەیە کە بۆ تاکەکەسە. کەواتە هەر هەموو هەڵکەوتی سیاسی، دەستووردانان، دەسەڵاتدارییەتی و دادپەروەری دەبێ مافی تاکەکەس و پاراستنی تاکەکەس بە ئامانج بگرن.

لۆک و هۆبز باس لە بیری ***پەیمانی جڤاکی*** *social contract* دەکەن. لای هەردووکیان، هەروەها لای زۆربەی نووسەرانی سیاسیی سەردەمی ڕۆشناکیی سەدەی هەژدەیەم، بیرێکی تەواو سیاسی و تاکەکییە: ***دەوڵەت دەبێ ڕێک لەسەر ڕەزامەندیی یەکەیەکەی ئەندامانی بڕوات بەڕێوە.***

ئەم گوتەیەش نابێ خشت وەک خۆی وەربگیرێ. لە ڕاستیدا ئەم بیرە، لە لایەن بیریاری جۆراوجۆرەوە بە شێوەیەکی جۆراوجۆر دەربڕاوە. بەڵام بۆچوونی ناواز ئەوەیە کە دەڵێ دەوڵەت، بۆ ئەوەی کردە بێ، دەبێ بۆ ئەو کەسانەی ملیان بۆ دەوڵەت و بنگەکانی کەچ کردووە، شتێکی وەهایان بۆ دەستەبەر بکات کە بەبێ بوونی دەوڵەت دەستیان نەکەوێت. لەبەر ئەوەیە کە دەوڵەت دەبێ لەسەر ڕەزامەندیی ئەندامانی بڕوات بەڕێوە. ئەگەر هەموو ئەندامان زانیاری دەروەستیان هەبایە، ئەوا دەوڵەتیان پێ باشتر دەبوو لە ***دۆخی سروشتەکی***.

باوەڕی دۆخی سروشتەکی و پەیمانی جڤاکی، بۆ سەدەی حەڤدەیەم، بیرێکی نوێ نەبوو، بەڵام شێوازی تاکەکی تێیدا تازە بوو.

دۆخی سروشتەکی نابێ بە دۆخێکی بەر لە مێژوو یان بەر لە سیاسەتی تێبگەین، بەڵکوو، بە پلەی یەکەم، هۆنینەوەیەکی بیرەکییە: گەر مرۆڤ لە هەموو پێوەندییەکی کۆمەڵایەتی دابڕێ و ژیانێکی سەربەخۆ بژی، ئایە ئەو ژیانە چۆن دەبێ؟

هۆبز بەو پرسیارە هەوڵ دەدات ڕاڤەیەکی سایکۆلۆگیانەی چییەتیی تاکەکەس بکات، ئەوە چییە کە مرۆڤ هان دەدات و جڵەوی دەگرێتەوە. هۆبزیش وەک زۆری دیکەی بەر لە خۆی و دوای خۆی، پێی وابوو مرۆڤ سروشتێکی نەگۆڕی هەیە. بیری دۆخی سروشتەکی بەر لە هەر شتێک باوەڕێکە دەربارەی سروشتی مرۆڤ.

مرۆڤی هۆبز دوو کەرتە، بابڵێین دوو جۆر سروشتی هەیە. لە لایەک سۆزیارە و لە لایەکی دیکەش هۆشیارە. بەبێ دەوڵەت و دەسەڵاتی سەپێنەری دەوڵەت، بەناچاری لایەنی سۆز زاڵ دەبێ بەسەر لایەنی هۆشدا. لەبەر ئەوە، لە دۆخی سروشتەکیدا مرۆڤ کۆیلەی

سۆزە، هەوڵ دەدات هەموو شتێک بۆ خۆی بێت و خۆشیی لە هەموو شتێک وەربگرێ. بەوەش دەکەوێتە ململانێوە لەگەڵ مرۆڤی دیکەدا، کە ئەوانیش هەمان تەمای بێبڕانەوەیان هەیە. هۆبز دەڵێ، دۆخی سروشتەکی ***شەڕێکی هەموانە دژ بە هەموان***. بەڵام مرۆڤ بەرگەی ئەم دۆخە ناگرێ. خەڵکی لەیەک کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی شەڕی بێبڕانەوەیان ببڕنەوە. سۆز بەرەو شەڕیان دەبات و هۆشیش، بە پلەی یەکەم، فێری ئەوەیان دەکات هەوڵی ئاشتی بدەن. ئاشتی تەنیا بەوە وەدەست دێت کە خەڵکی هەموو دەسەڵاتێک بدەنە دەست دەوڵەت، واتە بیدەنە دەست ئەوانەی دەوڵەتەکە دەگێڕن: پاشا بێت یان ئەنجومەنێکی کارگێڕ. تەنیا لە دەوڵەتێکی ڕێکخراودا چەمکی وەک ***ڕەوا***، ***ناڕەوا*** و ***موڵکایەتی*** واتایان دەبێ.

بۆچوونی هۆبز دەربارەی دۆخی سروشتەکی، بە پلەی یەکەم، هۆنینەوەیەکی هۆشەکی rational یە، نایسەلمێنێ کە تێکڕای ئادەمیزاد، لە سەرەتاکانی مێژوو، لە دۆخی سروشتەکیدا ژیابن. بەڵام پێی ڕاگەیشتووە کە خەڵک لە زۆر شوێنی ئەمەریکا بە بێ دەوڵەت دەژین، واتە لە دۆخێکی سروشتەکیدا دەژین. ئەوانە ژیانیان ڕێک «ئاژەڵئاسایە».

لەگەڵ ئەوەشدا، هۆبز دەڵێ دۆخی سروشتەکی بەردەوام هەڕەشە دەکات. لە ڕاستیشدا هۆبز و ئینگلیزەکانی هاوزەمانی خۆی، لە شەڕی براکوژیدا، لە دۆخێکی سروشتەکیدا دەژیان. «ئەوا دەبینین کە دەسەڵاتێکی هاوکۆ نەبوو خەڵکی لێی بترسێت، گوزەران چی بەسەر دێت، گەلێک کە زووتر لە سایەی حکوومەتێکی ئاشتیخوازانەدا دەژیا، چۆن دەکەوێتە شەڕی براکوژییەوە». کەواتە دۆخی سروشتەکی بەلای هۆبزەوە دۆخێکی هۆشنەیار و بەدە، سروشتی سۆزیارانەی مرۆڤ تێیدا بەربەرەڵایە. بەڵام مرۆڤ سروشتێکی هۆشەکیشی هەیە، ئەمەیان خۆی لە دەوڵەتسازیدا دەنوێنێ. هۆشمەندیی دەوڵەتسازی لە دوو جێگەدا دێتە بەرچاو، یەکەم لە ***مافی سروشتەکی*** دا کە باس لە مافەکانی هاوزێدانی دەوڵەت دەکات، دێتە پێش، دووەم لە بەرانبەرە نایەتییەکەی مافی سروشتەکی، کە ***دەستووری سروشتەکی*** یە، لەوێدا باس لە ئەرکەکانی سەر شانی هاوزێدیان دێتە پێش. (وشەی «سروشت» لە لای هۆبز دوو واتای هەیە: لە چەمکی «دۆخی سروشتەکی» دا «سروشت» ئاماژەیە بۆ سروشتی سۆزیاری مرۆڤ، لە «دەستووری سروشتەکی» و «مافی سروشتەکی» دا، سروشتی هۆشیاری مرۆڤ دەبێتە دەراوی هۆبز).

گریمانە گرنگەکەی هۆبز ئەوەیە دەڵێ ***خەڵکی تەنیا لە چوارچێوەی ڕشتەی سیاسیدا مافیان هەیە و ئەرکیان لەسەرە***. هەر لەمەشدایە کە یەکەم جیاوازیی گرنگی نێوان هۆبز و لۆک دەردەکەوێ.

لۆک - یش باس لە دۆخی سروشتەکی دەکات، بەلام وێنەکەی ئەو زۆر ڕوونترە. بە نۆڕینی هۆبز، خەلکی لە دۆخی سروشتەکیدا نە مافیان هەیە نە ئەرک. شتێکیش نەبووە پێی بگوترێ *هی من* و *هی تۆ*، کەواتە *مولکایەتی* ش نەبووە.

بەرانبەر ئەوە، لۆک پێی وایە دەستووری سروشتەکی لە دۆخی سروشتەکیشدا برەوی هەیە. بەلگەش لە دینەوە دەهێنێتەوە: خودا هەموو ئافرێنراوێکی سەر ئەم زەوییە - گیانەوەر و ڕوەک - ی خەلاتی مرۆڤایەتی کردووە. کەواتە خەلک خاوەنی ئەم بەرهەمانەن. ئافرێنراوی خودا هێندە زۆرە بەشی ژیانی هەموو مرۆڤایەتی دەکات. (ئەم بۆچوونەی دەلێ خودا بەرهەمی سروشتی لەگەل پێداویستییەکانی ئادەمیزاددا گونجاندووە، بەشێکی بەرچاوی ئەو باوەڕەیە کە پێی دەلێن *physico-theology*، و باوەڕێکی کۆنە و لە سەدەی هەژدەیەمدا، بەتایبەتی لە بواری زانستی نێودنیایەکیدا، وەک بایۆلۆگی و ئابووری، شانۆرەی بینی). کەواتە، بە بۆچوونی لۆک، هەموو مرۆڤێک تەنانەت لە دۆخی سروشتەکیدا، بەشێکی ڕەوای پێ براوە. دەستووری سروشت داوای لێ دەکات بەو بەشەی خۆی ڕازی بێت. ئەگەر دەستی بۆ مولکی یەکێکی دیکە درێژ کرد، ئەوا لە دەستووری سروشتەکی لای داوە.

کەواتە، دۆخی سروشتەکی بە لای لۆکەوە، تاڕادەیەک دۆخێکی چاکەیە. هۆیەکی کەمسەنگی ئەو جیاوازییەی نێوان هۆبز و لۆک، لەم ڕایەدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لۆک ڕاگەیاندنێکی گەشتری پێگەیشتووە دەربارەی «ژیانی کێوییەکان» (لە تێکڕای دیمانەی سیاسیی سەدەی هەژدەیەمدا، بیری «کێوی بەگزادە» دەبێتە بۆچوونێکی باو و گرنگ). بەلام ئەم جیاوازییە هۆی گرنگتری هەبوو، ئەویش نۆڕینی ئەو دووانەیە لە پێوەندی نێوان *ماف* و *دەستوور* لە لایەک و *دەولەت* لە لایەکی دیکە. بە بیتنی هۆبز هیچ ماف و دەستوورێک نییە بێ بنگەی سیاسی، بە دیتنی لۆک ماف و دەستوور لە دەولەتسازی بنجیترن. بە نۆڕینی هۆبز دەولەت بە پلەی یەکەم بۆ ئەوە دروست دەبێ کە ماف و دەستوور دەرفەتی دروست بوونیان پەیدا بێ. بە نۆڕینی لۆک دەولەت تەنیا بۆ ئەوەیە کە ماف و دەستوور بسەلمێنێ و بپارێزێ.

بە دیتنی لۆک تاکە بنەمایەک ڕەوایەتی بدات بە بوونی دەولەت ئەوەیە تاکەکەس بپارێزێت لە لادانی مرۆڤەکە خۆی و خەلکی دیکەش لە دەستووری سروشتەکی. دۆخی سروشتەکی تەنیا یەک کەماسی هەیە: ئەگەر کەسێک لە دەستووری سروشتەکی لابدات، کەس ناتوانێ سزای بدات. ئەم تاکە کەماسییەیە دەبێتە هۆی پێویستبوونی دەولەتسازی.

وەک دەردەکەوێ، تاکەکیەتیی سیاسیی لۆک لەوەی هۆبز نەفەسدرێژترە. هەردووکیان

لەوەدا هاوبیرن کە بوونی دەوڵەت بۆ ئەوەیە تاکەکەس بپارێزێت. بەڵام بە دیتنی هۆبز، ئەگەر دەوڵەت تەنیا ئاسوودەیی و ئاشتی بۆ تاکەکەس تەرخان بکات ئەوا تاکەکەس بەرانبەر دەوڵەت هیچ مافێکی دیکەی نییە. بە دیتنی لۆک دەوڵەت، تەنیا ئەو کاتە دەتوانێ داوای هۆگری لە تاکەکەس بکات، کە دەوڵەت ئەو مافانە بۆ تاکەکەس دابین بکات کە لە دۆخی سروشتەکیدا هەیەتی.

## ٤- موڵکایەتی

ئەگەر بە وردی لە جیاوازیی بۆچوونی هۆبز و لۆک دەربارەی موڵکایەتی بکۆڵینەوە، ئەو دەمە جیاوازیی دیتنی سیاسیی هەردووکیانمان لێ ئاشکرا دەبێ. بارودۆخی موڵکایەتی، بە گشتی، تەگەرەیەک نییە بەلای هۆبزەوە، بەڵام لای لۆک بووتە شامەبەستی *Two Treatises of Government*.

دەبێ لەبیرمان بێت کە زاراوەی نەریتیی مۆڵکایەتی تەنیا بابەتی دەرەکی، واتە شتومەکی خاوەن بەهای ئابووری، ناگرێتە خۆ. هۆبز و لۆک زاراوە بەرفرەوانەکەی موڵکایەتی بەکار دەهێنن. تێبینییە کەمەکانی هۆبز دەربارەی موڵکایەتی، لەم چەند گوتەیەدا چڕ دەبنەوە:

« /.../ ئەوە کاری مەزنایەتییە / واتە ئەو یان ئەوانەی دەسەڵاتی سیاسییان بەدەستە / کە دەستووری وەها دابنێن کە هەر کەسێک لە ڕێیانەوە لێی ئاشکرابێت چ شتێکماڵی خۆیەتی و چ کردەوەیەکی لێ ئازادە بێ ئەوەی هیچ کەسێکی دیکەی ژێرکردە ڕێگەی پێ بگرێ، ئەمەش ئەوەیە کە خەڵک پێی دەڵێ موڵکایەتی. بەر لەوەی دەسەڵاتی مەزنایەتی پەیدابێ /.../ هەموو کەسێک مافی هەموو شتێکی هەبوو و ***ئەوەش*** بووە هۆی ناچارەبوونی هەڵگیرسانی شەڕ. لەبەر ئەوەیە ئەو موڵکایەتییەی بۆ پاراستنی ئاشتی گرنگە و پێوەندیی بە دەسەڵاتی مەزنایەتییەوە هەیە، لە لایەن دەسەڵاتی مەزنایەتییەوە لە پێناوی ئاشتیدا، بڕیاری لەسەر دەدرێ».

وشەی «موڵکایەتی» لە لای لۆک ناوەڕۆکێکی تەواو دیاریکراوتری هەیە. پێش هەموو شتێک، مرۆڤ لە لایەن سروشتەوە خاوەنێکی ڕەوای «کەسایەتی خۆیەتی»، واتە خاوەنی بوونی فیزیاوی خۆیەتی و لەو ڕێگەیەشەوە خاوەنی ***کار***ی خۆیەتی. کەواتە مرۆڤ خاوەنی خۆی و چالاکیی خۆیەتی. لەبەر ئەوەش دەبێ ببێتە خاوەنی ***بەرهەمی کاری خۆی***.

ئاشکرایە هۆبز، موڵکایەتی - بە واتا بەرفرەوانەکەیەوە - لە دەوڵەتدا، بە بابەتێکی دەستی دووەمی دادەنێ. یان بابڵێین دابەشینی جۆراوجۆری موڵکایەتی ڕێی پێ دەدرێ بە تاکە مەرجی ئەوەی لەگەڵ بنەما سەرەکییەکەی دەوڵەتدا بگونجێت کە پاراستنی تاکەکەسە لە شەڕ و ناکۆکی.

بە نۆڕینی لۆک موڵکایەتی، بە واتا فرەوانەکەیەوە، بەرزترین پلەی هەیە. مافی موڵکایەتی، تەنانەت بێ دەوڵەتسازیش، بوونی هەیە و «*هۆی سەرەکی* و گەورەی ئەوەی کە خەڵک یەک دەگرن و دەچنە ژێر ڕکێفی حکوومەتێکەوە ئەوەیە کە *موڵکایەتیی خۆیان بپارێزن*».

کەواتە موڵکایەتی لای لۆک ژیان و ئازادیش دەگرێتەوە، بەڵام ئەو بۆچوونەی لۆک کە دەڵێ ئەوەی کارێک دەکات بە تەنیا خۆی مافی بەرهەمی کارەکەی خۆی هەیە، جێیەکی تەواو درەخشانی هەیە.

بۆچوونەکە خۆی نوێ نییە - زووتر لە سەردەمی ئاڤینیدا هەبوو - و پاشان نەک هەر لە ناو ئەوانەی لۆکیان بە مامۆستا دادەنا بەڵکوو لە نەریتی سیاسیی دیکەشدا سەنگی هەبووە. ئەو بۆچوونە بووە بەڵگەیەکی گرنگی خەباتی سۆسیالیستان دژ بە موڵکایەتیی کەسیی سەرمایەداران: کرێکار، لە بەرهەمی کارەکەی خۆیدا، مافی هەیە. بەڵام لەو بارە سیاسی و ئابوورییەی کە لۆک تێیدا هەڵکەوتبوو، ئەم بۆچوونە ناوەڕۆک و تینێکی تەواو جیاوازی هەبوو. نە لە لایەن لۆکەوە و نە لە لایەن هاوبیرانییەوە، ئەم بۆچوونە بەوە لێک نەدرایەوە کە ئەو کەسەی کارێک ئەنجام بدات، بۆ نموونە کارێکی دەستەکی، سوودی ئابووری کارەکە بۆ خۆی دەبێت. بەڵکوو کرایە سەنگەرێک بۆ پاراستنی موڵکایەتیی کەسەکی بەرانبەر موڵکایەتی دەوڵەتی و گشتی. ئەم بۆچوونە، بە پلەی یەکەم، بووە پارێزگارێکی موڵکایەتی پەرەسێن، واتە پارێزگارێکی مافی زیادبوونی موڵکایەتیی کەسەکی.

لۆک ناڵێت ئەم گوتانە سەر بە مافی گرووپێک یان چینێکی تایبەتین - بەڵام لەو ژینگەیەدا، وشەکانی ڕاستەوخۆ ئەو ناوەڕۆکە دەگرنە خۆ.

ڕاوێژەکەی لۆک یەکڕەوییەکی ناوازی تێدایە. وەک باسمان کرد، ئەو پێی وایە خودا هێندەی خۆراک و بابەتی پێویستی دیکەی داوە بە ئادەمیزاد بەشیان بکات. بەڵام لە ڕێگەی کارکردنەوە، مرۆڤ، بەشێکی دیکەش دەخاتە سەر ئەوەی سروشت داویەتی: مرۆڤ بایەخی شتان زیاد دەکات، مرۆڤ جۆرە زیاد بوونێک دەهێنێتە کایەوە.

بەو جۆرە لە سەرئەنجامی فراژووتنی ڕەهای ئابوورییەوە نێزیک دەبینەوە، بەڵام لۆک ئەو سەرئەنجامە ناخوێنێتەوە، کاتێک باس لە پێوەندی ئابووریی *نێوان* دەوڵەتان دەکات هەر هۆگری بنەماکانی مەرکانتیلایەتییە: ئەوەی نەتەوەیەک دەستی دەکەوێ، دەبێ نەتەوەیەکی دیکە لە دەستی بدات. بەڵام کاتێک لە بواری ناوخۆی دەوڵەت دەدوێ، بێ دوودڵی باس لە پێشکەوتنی ئابووری دەکات. لۆک بە ئاسانی دەڵێ ئەوانەی بە چالاکیی خۆیان سامانی دەوڵەت زیاد دەکەن، بۆخۆیان مافی دەوڵەمەندبوونیان هەیە.

مافی موڵکایەتی، بەر لە هەر شتێک، دەبێ بە مافی موڵکایەتیی کەسەکی و مافی موڵکایەتیی کەسەکیی وەهاش کە نرخێکی هەبێت (جگە لە ژیان و پێداویستییە بنجییەکانی ژیان وەک خۆراک و پۆشاک) شتێک نەبوو، لە ئەورووپای سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەمدا، بەر زۆر کەس بکەوێت.

**٥- دەوڵەت و ئازادی**

هۆبز و لۆک، بۆ کارکردنە سەر یان چەسپاندنی ئەو دۆخە سیاسییەی هەیە، بەرهەمە سیاسییەکانی خۆیان داناوە. ئێمە دەبێ مەبەستی نێزیکی بەرهەمەکان لەو کاریگەرییەی لە پاشەڕۆژێکی دووردا پەیدایان کردووە، جودا بکەینەوە.

هۆبز بەرانبەر هەر بۆچوونێکی داوای بەشکردنی دەسەڵات بکات پشتگری لە تاکفەرمانی دەکات و دەڵێ دەسەڵات نەبەشە. پاشایەتی تاکفەرمان بە هەرە بەرز دادەنێ، بەڵام هەموو بەڵگەوازییەکی هۆبز بە شێوەیەکی بنەڕەتانە جیاوازە لەگەڵ ئەو ڕەوایەتی legitimism و نەریتەکیەتی traditionalism یەی خوونکارەی ستیوارتی Stuart ی دەسەڵاتی خۆی پێ چەپارە دەدا. هۆبز جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە نەبەشیی دەسەڵات شامەبەستە، جۆری دەسەڵاتداران لامەبەستە. لەبەر ئەوەشە هۆبز پێی وابوو *Leviathan* پارێزگارییەکە لە حوکوومەتی Oliver Cromwell یش.

لۆک، لە سەرەتای سالانی ١٦٨٠ دا، لە تاراوگە، *Two Treatises* ی نووسی، بەڵام هەتا پاش شۆڕشەکەی ١٦٨٨ بۆی نەلوا بڵاویان بکاتەوە. دیباجەی ئەو کتێبە پەسنێکە بۆ شۆڕشەکە و بەوەش دەبێتە پەسنێک بۆ ئەو دەسەڵات بەش کردنەی شۆڕشەکە بە ئامانجی گرتبوو.

هۆبز فەلسەفەی دەوڵەتی لەسەر ئەوە هەڵبەستبوو کە دەوڵەت **دەستکردە** *artefact* (واتە لە سروشتەوە نە ڕسکاوە بەڵکوو هەڵبەستراوێکە مرۆڤ شیرازەهۆنیەتی). دەوڵەت

جۆرە مرۆڤێکە، بەڵام بە شێوازێکی دیکە، زلەمرۆڤێکە لە یەکەیەکەی مرۆڤی دیکەی ئاسایی پێکهاتووە. هۆبز دەڵێ تاکەکەس خاوەنی خواست و هۆشە، بە هاوڕەنگیی ئەوەش، دەوڵەت – بۆ ئەوەی نەڕووخێ – دەبێ خواست و هۆشی هەبێت، واتە مەزنایەتی دەبێ خواست و هۆشی هەبێت.

هۆبز ناڵێت مەزنایەتی یان دەسەلاتی تاکفەرمان دەبێ یەک مرۆڤ بێت. هەر وەک چەندین بیریاری سیاسیی پێش خۆی و پاش خۆی، هۆبزیش ڕشتەی پاشایەتی (یەک کەس خاوەنی دەسەلات بێت) و ئەریستۆکرات (گروپێکی هەڵبژاردە خاوەن دەسەلات بێت) و دیمۆکرات (هەموو گەل، یان ئەو بەشە لێ سەلمێنراوەی گەل، خاوەنی دەسەلات بێت) جودا دەکاتەوە. هەڵبەت سەپاندنی ئەم جۆرە دابەش کردنە، کە لەگەڵ هەلومەرجی شارەدەوڵەتی یۆنانیدا گونجێنرابوو، لە ڕشتەی سیاسیی درەنگتردا، بەرگومان بوو. بەلام هۆبز دەیویست ئەوە روون بکاتەوە کە دەشێ چەند کەسێک ببنە نوێنەری دەسەلاتی مەزن – گرنگ بەلایەوە ئەوە بوو کە دەسەلات لە نێوان، بۆ نموونە، پاشا و پەرلەماندا بەش نەکرێت.

بەرانبەر ئەوەش، هۆبز دەڵێ دەوڵەت خۆڕاگرتر دەبێ ئەگەر دەسەلاتی مەزن بەدەست تاکە یەک کەسەوە بێت. ئەنجومەنی بڕیاردەر، لە هەر جۆرێک بێت، خواستی دژ بە یەکی تێدایە، **یەک** خواستیش دەبێ سەرکەوێت، هەر چۆنێک بێت هەر دەکاتەوە ئەوەی کە لە دوا هەنگاودا **یەک** مرۆڤ دەبێتە خاوەن دواگوتەی بڕیاردەر. کەواتە ڕشتەی سەنگگرانی ئەنجومەن هەر تەگەرەیە لە ڕێی بەجێهێنانی خواست و خستنەکاری دەسەلاتدا.

شایەنی سەرنج ئەوەیە کە هۆبز ناڵێت دەوڵەت دەبێ لە لایەن یەک کەسەوە ببرێت بەڕێوە، ئەو دەڵێت دەوڵەتی کردە ***لە ڕاستیدا*** لە لایەن یەک کەسەوە دەبرێت بەڕێوە. مەبەستی هۆبز لە فەلسەفە سیاسییەکەی ئەوە نییە شارێی ئاکارەکیی سیاسی پێشان بدات، بەڵکوو دەیەوەێ پێشانی بدات دەوڵەت لە ڕاستیدا چۆن بەڕێوە دەچێ و هۆی ڕووخانی چییە.

ئاشکرایە کە دەوڵەتسازی بەلای هۆبزەوە ئەوە ڕادەگەیەنێت کە کەسانی مافبەدەر و ناپەیوەست هەموو دەسەلاتێک بۆ مەزنایەتی تاکفەرمان بەجێ دەهێڵن. تەنیا ***دەستووری سروشتەکی*** یە سنوور بۆ دەستڕۆیی مەزنایەتی دادەنێ و ئەو مەزنایەتییەش تەنیا لەناو دەوڵەتدا برەوی هەیە. کەواتە مەزنایەتی تاکفەرمانانە فەرمانڕەوایەتی دەکات بە مەرجێک غەریزەی خۆپارێزی instinct of self-preservation ی ژێردەستان بریندار نەکات.

ئەمەش وەها ڕادەگەیەنێت کە فەرمانڕەوا بڕیاری ئەوە دەدات خەڵکی ژێردەستە بیروڕایان چۆن دەبێ. بیروڕای هاوچاو و ڕێبازی دینەکی دژ بەیەک تەنیا ئاژاوەی لێ دەزێتەوە. فەلسەفەی مەتێریالیستانەی هۆبز، بە زەحمەت نەبێ ناچێتەوە سەر گۆشەنیگایەکی مەسیحایەتی، هۆبز ڕووبەرێکی بەرفرەوان بۆ پێوەندیی نێوان کڵێسە و دەسەڵاتی دەوڵەت تەرخان دەکات. خاڵی گرنگ بەلایەوە ئەوەیە مەزنایەتی بڕیار بدات ژێر دەستان چ دینێکیان دەبێ.

بەڵام یەکیەتی لەناو دەوڵەتدا نابێ تەنیا بۆچوونی دینەکی بگرێتەوە، بەڵکوو دەبێ لایەنی وەک نۆرینی سیاسیش بگرێتەوە. بێگومان دەشێ بۆچوونی هۆبز ناکۆک ڕانوێنێ: لە لایەکەوە ڕشتەیەکی سیاسیی وەها هەڵدەبەستێ کە پێی وایە دروستە، لە لایەکی دیکەوە دەڵێ لە دەوڵەتدا، مەزنایەتی بڕیار دەدات چی دروستە و چی چەوتە. بە هەر جۆرێک بێت، دەبێ پێی وابێ کە ئەو دروستایەتییەی دەکاتەوە یەکیەتی و ئاشتی ناو دەوڵەت، دەبێ لە ڕوانگەیەکی فرەوانتریشدا هەر دروست بێت.

مەتێریالیزمی هۆبز نابێ لەگەڵ ئەو مەتێریالیزمە مێژووکرد historical materialism ەی مارکس Marx و ئەنگێلز Engels دوای چەند سەدەیەک دایان مەزراند، تێکەڵ بکرێت. هۆبز پێی وایە بیروڕا لە نێو دەوڵەتدا شانۆرەی هەیە لە ڕێکخستنی دەوڵەتدا. هۆبز، ڕێک و ڕەوان، دەڵێ بیروڕای بەش کردنی دەسەڵات لە نێوان پاشا و پەرلەماندا بوو، کە بووە هۆی نائارامی ناوخۆی ئینگلاند و لە ئەنجامدا براکوژی هەڵگیرساند.

بەرانبەر ئەوەی هۆبز پێی وایە ڕێبازی یەکبیرەکی بۆ ئارامیی دەوڵەت پێویستە، لۆک پێی وایە هاوزێد مافێکی سروشتەکی هەیە لە جۆرە ئازادییەکی بیروڕا. ئازادیی بیروڕا، لە باوەڕی سیاسیی لۆکدا، ڕوویەکی ئەو باوەڕیەتی کە دەربارەی مولکایەتییە: تاکەکەس هەروەها خاوەنی بیروڕای خۆیەتی. بەڵام ئازادیی باوەڕ سنووری خۆی هەیە. لۆک پێی وایە لە دەوڵەتدا دەشێ هەموو بۆچوونێکی دینەکی و نادینەکی ئازاد بێت، بە مەرجێک هەڕەشەی ڕاستەوخۆ لە بەردەوامبوونی دەوڵەت - واتە ڕەوتی سیاسیی چەسپاو - نەکات. لۆک دەڵێ کاتۆلیکایەتی، لە ئینگلانددا، پاش شۆڕشی ١٦٨٨، نابێ ڕێگەی پێ بدرێ، چونکە کاتۆلیک داوای ڕشتەیەکی تەواو جودا دەکەن کە تاکفەرمانیی پاشایەتی و تێرۆری بیرەکی کاتۆلیکانەی بە دەمەوەیە. لەبەر ئەوە کاتۆلیک تەنانەت لە خودانەناسانیش خەتەرترن.

باوەڕی سنگفرەوانەتیی لۆک، لە سەدەی هەژدەیەم و پاش ئەو سەدەیەش فرە کاریگەر بوو. لە ئینگلاندی پاش شۆڕشەکە، ئەرکی ئەم باوەڕە بوو بەوەی پشتیوانیی ئەو ڕشتەیە

بکات که هەیە، بەڵام لە وەڵاتەکانی دیکەدا - پێش هەموویشیان فرانسەی تاکفەرمانی کاتۆلیک - تینێکی شۆڕشگێڕانەیان پەیدا کرد. دیتنی بنەڕەتی لۆک، وەک باسمان کرد، ئەوەیە مرۆڤ لە دەوڵەتدا بەشێک مافی سروشتەکی هەیە، واتە تەواو جودا لە دەوڵەت. تاکە ئەرکی دەوڵەتیش ئەوەیە ئەم مافانە بپارێزێ. کەواتە دەوڵەت بەرانبەر ئەندامانی خۆی بەرپرسە.

دەربارەی دۆزە کۆنەکەی *مافی ڕاپەڕین* لۆک لە هەموو ئەو بیریارە سیاسییانەی هەتا ئێستا ناویان هاتووە، زیاتر دەڕوات. بە دیتنی لۆک، گەر مافە سروشتەکییەکان پێشێل بکرێن، ئەوا گەل مافی ئەوەی هەیە کە هەوڵ بدات ئەو ڕشتە سیاسییە چەسپاوە لابدات. بەڵام لێرەدا - و لە جێی دیکەشدا - داوای خۆڕاگری و پەلەنەکردن دەکات. ئەرکی دەمودەستی خۆی لەوەدا دەبینێ کە هەوڵ بدات ڕەوایەتی ئەو شۆڕشە ناخوێنینە و تارادەیەک نادراماتیکییەی ١٦٨٨ بسەلمێنێ.

بەڵام بۆچوونەکانی هۆبز بەرانبەر دۆزی ڕاپەڕین زێدە ڕوون و ساکارن و بەم دوو خاڵە کورت دەکرێنەوە:

١) ژێردەستان لە هیچ حاڵ و بارێکدا مافی ڕاپەڕینیان نییە، بەڵام

٢) ئەگەر ڕاپەڕین هەڵگیرسا و سەرکەوتنی دیار بوو، ئەو دەمە یەک واتای هەیە: مەزنایەتی مەزنایەتی نییە و دەسەڵاتێکی نوێ بەرێوەیە دابمەزرێ.

بەو بۆچوونەی هۆبز بێت کە دەربارەی دەوڵەتە، جیاوزیی نێوان دەسەڵاتی دەستووردانەر و دەسەڵاتی بەجێهێنەر کەمبایەخە: هەمان بنگە، هەمان مەزنایەتی دەبێ نوێنەرایەتی هەردوو لایەن بکات. بەڵام بە دیتنی لۆک جیاوازییەکی یەکلاکەرەوە لە نێوان دەسەڵاتی دەستووردانەر و بەجێهێنەردا هەیە. دەستوور دانان ئەو بوارەیە کە لە ڕێیەوە تاکەکەسان ئەو پێوەندییە دەچەسپێنن کە لە نێوانیاندا دادەمەزرێ. لەبەر ئەوە دەستوور دانان بە پلەی یەکەم بابەتێکی سەر بە گەلە - ئەگەرچی پەرلەمانێکی هەڵبژادە نوێنەرایەتی گەل دەکات. دەسەڵاتی بەجێهێنەر - کە پاشا و بنگە بەجێهێنەرەکانی دیکە دەگرێتەوە - دەبێ لە چوارچێوەی دەستووردا بجووڵێتەوە. کەواتە لۆک، تارادەیەک بە ڕوونی، ئەو هێڵە سەرەکییانە دەکێشێ کە پاشان لە دنیای بیری سیاسیی سەدەی هەژدەیەمدا نورەیەکی زێدە گەورەیان هەبوو.

باوەڕە سیاسییەکانی لۆک جاروبار بە دیمۆکراتییانە ناو نراون. بەڵام ئەو باوەڕانە تەنیا وێکچوونێکی دوورەدەستیان هەیە لەگەڵ ناوەڕۆکی دیمۆکراتیی یۆنانی دێرین و بەو

ناوەڕۆکەی ئەو وشەیە لە دیمانەی سیاسیی هاوچەرخدا پەیدای کردووە. کاتێک لۆک دەڵێ دەسەڵات لە لای گەلە، مەبەستی ئەوە نییە تێکڕای گەل بۆی هەبێ کار بکاتە سەر سیاسەت. دەسەڵاتی گەل، بەگشتی دەچێتە ڕێچکەی پەرلەمانەوە، پەرلەمانیش بەهیچ جۆرێک لە لایەن گەلەوە هەڵنەبژێردراوە و بەدەگمەن نەبێ لە ڕاپەڕینی گەلدا دەنگی نەکردووە، داخوازیی ڕاپەڕینەکەش ئەوە بووە کە ڕشتەی سیاسیی نوێ و هەڕەمی توندتر دابمەزرێنێ.

کاریگەریی لۆک لە فراژووتنی بیری سیاسیی دوای خۆی هێندە فرەوانترە لە کاریگەریی هۆبز بەراورد نەکرێن. بەڵام هەردووکیان ئەو سەنگەیان هەیە کە ببنە نوێنەری تاکەکیەتیی سیاسی. کە ئەمەش دەستنیشان کرا، دەبێ هەمان جەخت لەسەر هەردوو وشەی ***تاکەکیەتی*** و ***سیاسی*** بکرێت. بۆچوونەکانیان بە ڕادەیەکی ناواز ***سیاسین*** - لایەنی کۆمەڵایەتی دەکەوێتە بەر سێبەر. دابەشبوونی کۆمەڵایەتی بەسەر گرووپی پیشەدار و چیندا، بە لای ئەوانەوە تەگەرەیەک نییە. هەر وەک زۆربەی ئەو بیریارانەی دیکەی لە پەیمانی جڤاکی دواون، ئەمانیش پێیان وایە ئەم پەیمانە پێوەندی نێوان سەرکردە و ژێرکردەش دەگرێتەوە. هەموو خەڵک یەک سروشتیان هەیە - ئەمەش تەنیا پاشا و گەل ناگرێتەوە بەڵکوو وەستا و شاگرد، بەگ و جووتیارەکەشی دەگرێتەوە. بەڵام ئەگەر ئەو پێوەندییانەش بە جێگیربووی ناو پەیمانەکە دابنرێن، ئەوا ئەوانیش هەر دەبێ بە نەگۆڕ سەیر بکرێن.

ئەمە یەکێکە لە لایەنە سەیر و سەمەرە زۆرەکانی مێژوو. ئەو بیروڕایانەی تاکەکیەتی، کە کاریگەرییەکی چالاکیان لە فراژووتنی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا هەبووە، لە سەرەتادا وەک دیمانەیەکی سیاسی هەڵبەستران بێ ئەوەی هیچ خستنەکارێکی ڕاستەوخۆیان هەبێ لە بواری کۆمەڵایەتی و ئابووریدا. بەڵام مەسەلەکە زێدە سەیر نییە. نەدەکرا هۆبز و لۆک چاوەڕێی ئەو فراژووتنە بن کە خۆیان تەنیا سەرەتاکەیان دەبینی. پێوەندیی کۆمەڵایەتی لای ئەوان بنەمایەکی نەگۆڕ بووە، تەنیا ڕشتەی سیاسی بوو کە بارگۆڕ بوو.

## ڕۆشناكی و ڕوسۆ

### ١- پاشخان

له بواری دیمانەی سیاسیدا، سەدەی هەژدەیەم وەک سەدەی حەڤدەیەم و نۆزدەیەم بەجۆش نەبوو. بە پلەی یەکەم، ئەو بیر و باوەڕانەی لە سەدەی حەڤدەیەمدا هەڵبەسترابوون، لەم سەدەیەدا، تێکبەستران و پەرەیان پێ درا. بیری سەر بە دەوڵەت و سەر بە مافی ئازادی و یەکسانی، لەم سەدەیەدا پتر بڵاوبوونەوە. ئەگەرچی ئەم بڵاوبوونەوەیەش هەر سنووردار بوو - زۆربەی هەرە زۆری جووتیاران لەم باسە بێخەبەر بوون - لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەست بوو.

ڕووداوی هەرە مەزنی سیاسی، کە شۆڕشەکەی فرانسە بوو، لەگەڵ ئەو ناکۆکی و سەرلێشێوانەی تێیدا بوو، شایەتێکە بۆ ئەوەی ئەم باوەڕە تازانە بە شێوەیەکی قووڵی سەرنجڕاکێش بڵاوبوونەتەوە.

فرانسە بوو بە ناوەندی فراژووتنی بیری سیاسی. ڕۆشناکیی فرانسە، تەنانەت لە مێژووی بیری سیاسیشدا، بووە زاراوەیەکی گرنگ. هۆی ئەم گرنگییەش ئەوە نییە کە ئەو دیاردەیە نوێکارییەکی کردبێ یان ڕەسەنایەتی خۆی هەبێ، بەڵکوو لەوەدایە کە، لەچاو ئەوانەی دیکەدا، ئەمیان زیاتر بەربڵاو بوو، تینی گشتیتر بوو. کەسایەتی بەرچاوی ئەم ڕۆشناکییە دوو ئینگلیز بوون: ئیساک نیووتن Isaac Newton و جۆن لۆک John Lock. زۆربەی نووسەرانی شارەزای ڕۆشناکیی فرانسی لەسەر ئەوە ڕێکن. بەلای ئەمانەوە، دیمانەی ڕاکێشان- ی نیووتن نموونەیەکی سەرپەڕە بۆ بەرهەمی هۆشی مرۆڤ. بۆ نموونە ڤۆلتار Voltaire، کە گەورەترین پشتیوانی ڕۆشناکییە، داوای ئەوە دەکات هەر ئەو هۆشەی لە لایەن نیووتنەوە لە بواری میکانیکدا سەرکەوتنێکی تەواوی وەدەست هێنا، دەبێ لە بواری دیکەشدا، وەک بایۆلۆگیی و سایکۆلۆگیی و کۆمەڵناسی، بکەوێتە کار بۆ ئەوەی لە ئەنجامدا لە بنگە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا بەکاربهێنرێن.

کاریگەریی لۆک-یش ئاشکرا و دیارە. کاریگەریی لۆک لەوەی نیووتن زیاتر و قووڵترە بەڵام کەمتر بەرهەستە. لە بواری دیکەدا، جگە لە بواری فیزیک و ماتماتیک، بەرهەمەکانی نیووتن بوونە ڕێنمایەکی هەڵکەوتەکی ‹واقعی›. لۆک بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و گرنگ کاری کردە سەر ڕێبازی شارەزاکیەتی و مرۆڤنۆریی سەردەمی ڕۆشناکی. ئەو باوەڕەی لۆک کە داوای سنگفرەوانی دینەکی دەکرد، پەرەی پێ درا و کرایە باوەڕێکی پتر بنەڕەتی.

بەرهەمەکەی لۆک، *Two Treatiser of Government*، تاوێکی تەواوی لەسەر باوەڕی سەر بە مولکایەتی و ئازادی پەیدا کرد.

لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆشناکیی فرانسی لاسایی کردنەوەیەکی ڕووت نەبوو. ژینگەی کۆمەلایەتی و سیاسیی فرانسە هێندە لەوەی ئینگلاند جیاواز بوو کە تەنانەت باوەڕی وێکچووش ناوەڕۆک و ئەرکی جودایان بەخۆوە دەگرت. ڕاستە لۆک باوەڕەکانی خۆی پێش شۆڕشەکەی ١٦٨٨ نووسی بوون بەلام پاش شۆڕشەکە، وەک پارێزنامەیەک لە ڕشتەی سیاسیی دامەزراو، بلاوکرانەوە. لە فرانسەی پاشایەتیی تاکفەرماندا، هەر ئەو باوەڕانە، کەموزۆر، بوونە باوەڕێکی شۆڕشگێڕانە. لۆک، ئاگادارانە ئاوەڕی لە نەریتی سیاسیی کۆنی ئینگلاند دەدایەوە، لەو ژینگە ئینگلیزانەیەی خۆیدا ئەوەندەی نوێکار بوو هێندەش نەریتەکیخواز traditionalist بوو. ئەو فەیلەسووفە فرانسییانەی تەواو بەرتاوی باوەڕەکانی لۆک بوون، نەریتێکی لەو بابەتەیان نەبوو ئاوڕی لێ بدەنەوە. ئەوان ناچار بوون زۆر بە ڕوونی نەریت لە ڕشتەی سیاسیی هۆشمەندانە دابڕن.

جیاوازییەکی دیکەی گرنگ ئەوەیە ڕۆشناکیی فرانسی، گەر بە لۆک بەراورد بکرێن، نۆرەیەکی گەورەتر دەدەن بە پێوەندارییەتیی چینایەتی و ناکۆکیی چینایەتی. بێگومان بیروڕای لۆک دەربارەی مولکایەتی و ئازادی، لەگەڵ کۆڕی بۆرژوای پەرەسێندا، باشتر دەگونجا. بەلام ئەو پێی وابوو سەرەنجامی شۆڕشەکەی ١٦٨٨ لەو بابەتە بوو گەشە کردنێکی هاوئاهەنگ و ئاشتیخوازانەی بەدەمەوە بێ. بەگزادان بۆیان هەبوو پلەوپایەی ناوازی خۆیان بپارێزن ، هەروەها تەگەرەش لە ڕێی دەولەمەندبوونی تاکەکەسدا بەگشتی هەلگیرا. مانەوەی زۆرینەی گەل لە بارودۆخێکی نەگۆڕدا، بەلای لۆکەوە، مەترسییەک نەبوو.

لە فرانسە، سەرلەبەری دەسەلات لە دەست پاشا و دەستەی بیرۆکراتانی بەرزدا بوو – هەلبەتە ئەم دەسەلاتە بالی بەسەر گوزەرانی ئابووریشدا کێشابوو. بەگزادان کاریگەرییەکی سیاسیی بەرتەنگیان هەبوو، بەلام لەچاو ئاپۆرەی خەلکدا، پلەوپایەی بەرزی خۆی هەر مابوو.

لەبەر ئەوە مەسەلەیەکی سەیر نییە کە نووسەرانی ڕۆشناکیی فرانسی، لە لۆک زیاتر، خۆیان بە پێوەندارییەتیی چینایەتییەوە خەریک دەکرد و کەمتر بڕوایان بە فراژووتنێکی دلڕاگر بوو. مەبەستیش ئەوە نییە ئەمان خۆیان بۆ شی کردنەوەیەکی لۆگیکانەی چینایەتی تەرخان کردبێ یاخود ئالای دیمانەی خەباتی چینایەتییان هەلگرتبێ. هەموو گروپێکی بێئیمتیاز – جووتیارانی زۆرینە، وردەبۆرژوا و کاسبکاران، بۆرژوا، کرێکاری ژمارە

هێشتا یەکجار کەم... هتد - لەو نەریتە کۆنەدا، بە «بەرەی سێیەم» دەژمێردران. تەنانەت لە سەرەتاکانی شۆڕشی فرانسیدا، دروشمەکانی ئازادی هەموو بەرەی سێیەمی بەبێ جیاوازی دەگرتەوە. بیریارانی سیاسیی سەر بە ڕۆشناکیی فرانسیزمان وێنەیەکی پڕڕەنگی فرەجۆر و تاڕادەیەک شێوێنەریان نەخشاندووە. خاڵی هاوکۆی ڕەوتی ڕۆشناکی، لە دیمانە سیاسییەکاندا نییە، بەڵکوو لەوەدایە باوەڕێک هەبوو بەوەی هۆشی مرۆڤ دەتوانێ ڕووی درۆ و ئەفسانەپەرستی و ستەمکاری ئاشکرا بکات و بەسەریاندا زاڵ بێت.

لەبەر ئەوە هاسانتر ئەوەیە تێکستی وەها هەڵبژێردرێن لە بواری فەلسەفە و جیهاننۆڕیی گشتیی ڕۆشناکیدا نوێنەرەکی بێ نەک لەو بوارەی فیکری سیاسیی ڕووتدا. بەڵام یەک بەرهەم هەیە دەبێ باس بکرێ، ئەویش *De l'esprit des lois* (*گیانی دەستووران*، ١٧٤٨) کە شاکاری مۆنتیسکیۆ Charles Louis de Montesquieu (١٦٨٩-١٧٥٥) یە. ڕاستە پیاو دوودڵ دەبێ لەوەی ئەم بەرهەمە بە نموونەیەک دابنێ بۆ ڕادیکالیزمی نیسبیی ڕۆشناکی. مۆنتیسکیۆ بابایەکی وریا بوو، مەیلی گوتەی جووتواتای هەبوو. بەڵام دیمانە گرنگەکانی مۆنتیسکیۆ ئەو باوەڕەیەتی کە دەربارەی دابەش کردنی دەسەڵاتە و ئەو باوەڕەیەتی کە پێی دەڵێن باوەڕی کەش - ئەمانە هێندە کاریگەر و نوێنەرەکین داوای باس کردن دەکەن. خاڵی دووەمی ئەم بەشە بۆ مۆنتیسکیۆ تەرخانە.

ئەی لەگەڵ ئەو نووسەرانەی ڕۆشناکیدا چی بکەین کە لاوتر بوون و لە زۆر ڕووەوە تەواو بەرچاو بوون؟ چ نرخێک بدەین بە کۆڕی دەوری دیدرۆ Denis Diderot (١٧١٣-١٧٨٤) و لەویشەوە بە *زانیارستانی مەزن*؟ لەوێدا، بەشێکی زۆری مەبەست و گیانی ڕۆشناکی دەدۆزینەوە، بەڵام باوەڕی سیاسیی ڕازاوەی کەم تێدایە. ڤۆلتار François-Marie de Voltaire (١٦٩٤-١٧٧٨) چەندی لەباردا بووە؟ خۆ ئەو دیمانەیاری سیاسیی نەبوو، بەڵام چونکە سەرگەرمی دۆزی ئازادیی باوەڕ و دەربڕین بوو، زۆر چاک نوێنەرەکییە. هۆلبەک Paul Henri d'Holbach (١٧٢٣-١٧٨٩) لە ڕۆشناکی فرانسیدا، نوێنەرێکی هەرە ڕەوانبێژی هەستی چینایەتی بوو. ئەو مرۆڤە شمشێر بەدەستی بۆرژواکان بوو و سەرچین و ژێرچینی بەدڵ دەدزاند. کۆندۆرسێ Jan Antonie de Condorcet (١٧٤٣-١٧٩٤) لە هەمووان توندتر بانگەوازی پێشکەوتنخوازانەی هەڵدەدا.

وەها پێ دەچێ هەریەک لەم نووسەرانە و دەرزەنێکی دیکەش لە تەکیاندا، جێدەستی هێندە گرنگیان لە جیهاننۆڕیی سیاسیی ڕۆشناکیدا جێهێشت بێ کە نەکرێ کەسیان پشتگوێ بخرێن. زۆر بابەت هەیە کۆیان دەکاتەوە، بەڵام هەر یەکەیان هێندەی ڕەسەنایەتی هەیە کە بەرهەست بێت.

بۆ ئەوەی خۆم لە چڕیی ناوی نووسەر و کتێبان لادەم وام بەباش زانی نووسەرانی ڕۆشناکی، لە ڤۆلتارەوە هەتا کۆندۆرسێ، *in corpore* (واتە بەکۆمەڵ) باس بکەم و بەراوردیان بکەم بە ڕوسۆ Jean-Jacques Rousseau (١٧١٢–١٧٧٨) ی هەردەم بەرەنگاری ڕۆشناکی.

بەرهەمە پڕ ناکۆکییەکەی ڕوسۆ – *Du contract social* (***پەیمانی جڤاکی***، ١٧٦٢) کە لەم بوارەدا لە هەمووان گرنگترە – زۆری بابەت تێدایە بشێن بە ماڵی ڕۆشناکی بناسرێن. بەڵام بە پلەی یەکەم ڕوسۆ بە نا-بێژێکی ڕۆشناکی دادەنرێ. کاتێک ڤۆلتار هۆش ڕەپێش دەخات، ڕوسۆ باس لە هەست و غەریزە دەکات. کاتێک ڤۆلتار لەسەر بابەتی گەشەکردوو و ڕسکاو دەکاتەوە، ڕوسۆ لەسەر بابەتی بنجی دەکاتەوە. کاتێک ڤۆلتار بە باوەڕ و بۆچوونی تاکەکەسیدا هەڵدەدات، ڕوسۆ ئازادیی تاکەکەس لە سایەی فەرمان و خواستی گشتیدا هەڵدەداتەوە.

خاڵی سێیەمی ئەم بەشە بریتییە لە بەراورد کردنی بیر کردنەوەی سیاسیی ڕوسۆ و نووسەرانی ڕۆشناکی. بەم جۆرە ناوی چەندین بەرهەمی گرنگی سەدەی هەژدەیەم دەکەونە پشت پەردەی بێدەنگییەوە. فراژووتنی تیژڕەوی دیمانەی ئابووری، لە دووەم نیوەی سەدەکەدا، تەنیا لابەلا باس دەکرێت. ئەو دەمە باوەڕێکی پتەو هەبوو بەوەی کە فێرکاری و پەروەردە توانستێکی گەورەیان لە گۆڕینی مرۆڤدا هەیە – ئەم باوەڕە پێوەندی بە دەروونناسی و مرۆڤنۆڕیی سەردەمی ڕۆشناکییەوە هەبوو- ئەم دیاردەیەش تەنیا ئاماژەی بۆ دەکرێ. داڤید هیوم David Hume (١٧١١–١٧٧٦) ی فەیلەسووفی سکۆتی ‹خەڵکی سکۆتلاند› بە ڕەخنە کوشندەکانی بەرانبەر مافی سروشتەکی، بایەخێکی گەورەی هەیە لە فراژووتنی دیمانەی سیاسیدا، بەڵام لێرەدا باسی لێ ناکرێت.

## ٢- مۆنتێسکیۆ

لە ***گیانی دەستووران*** *De l'esprit des lois* دا سێ خاڵی هەرە گرنگ هەیە مۆنتێسکیۆی وەها بەناوبانگ کردووە. یەکەمیان ئەو نۆڕینەیەتی کە دەربارەی مەرجە دەرەکییەکانی سیاسەتە، هەر ئەوەشە ناوی لێ نراوە ***باوەڕی کەش***، کە ناوێکی کەمێک هەڵەبەرە. پاش ئەوەش باوەڕی ***دابەش کردنی دەسەڵات*** ـە لە نێوان دەستووردانەر، بەجێهێنەر و دادپرسیدا. سێیەم خاڵیش ئەو باوەڕە تاڕادەیەک ڕچەشکێنەیە کە لە هەڵاواردنی حوکومڕانیی پاشافەرمانی و ستەمفەرمانی و کۆمار دەدوێ.

*گیانی دەستووران* کارێکی گەورە و بەرفرەوانە. ڕاڤەکاری وەها هەیە دەڵێ ئەم بەرهەمە لە پلان و یەکرەوی بێبەشە، هی وەهاش هەیە بڕوای بە پەیمانی خودی مۆنتێسکیۆ هەیە و لە پشت ئەو هەموو بەشە نارێکخراوەی ناو کتێبەکە بۆ شیرازەهۆنییەکی شاراوە دەگەڕێن. هەیە دەڵێ مۆنتێسکیۆ، بۆ خۆ لادان لە ستەمی پاشایەتیی تاکفەرمان، ئاگادارانە چەند بیروڕایەکی ڕووپۆش کردووە. هەشە دەڵێت مۆنتێسکیۆ پێویستی بەوە نەبووە هیچ شتێک لە پاشافەرمانیی فرانسە بشارێتەوە، چونکە ئەو ئەوەندەی حوکومڕانیی ئینگلیزی لا پەسەند بووە، هێندەش لایەنگری پاشافەرمانیی فرانسی بووە. ئێمە خۆمان بەوەوە خەریک ناکەین مۆنتێسکیۆ وەک کەس دۆست و لایەنگری کێ بووە.

لەوە دەچێ مۆنتێسکیۆ توانیبێتی ڕیزێک شابیری ڕۆشناکی لەگەڵ وریابوونی ئەریستۆکراتانە و کۆنەواردا کۆبکاتەوە. بەڵام ئەوەی لە لایەن ئەوەوە کاری لە خەڵکی دیکە کرد بیروڕاکان بوون نەک وریابوونەکە. ئاشکرایە کە مۆنتێسکیۆ، لە بواری سیاسیی ڕۆشناکیدا، بایەخێکی یەکجار گەورەی هەیە. مۆنتێسکیۆ نووسینەکانی خۆی و سەرنجی هاوڕێ بیریارەکانی خۆی ئاڕاستەی دۆزی سەر بە ئەرکی دەوڵەت و ڕەوایەتیی دەستووران کرد. کاریگەریی مۆنتێسکیۆ ناگەڕێتەوە بۆ ڕەسەنایەتییەکی قووڵ. ئەگەر لە بوارێکیشدا ڕەسەنایەتییەکی هەبێت ئەوا لەوەدایە کە چەند نەریتێکی ڕاهێزاوە، ناوەڕۆکی نوێی بە چەمکی کۆن بەخشیوە و بابەتی وەهای کردووەتە شامەبەست کە زووتر لاوەکی بوون.

باوەڕی کەش-ی مۆنتێسکیۆ، یان بابڵێین بیروڕای ئەو دەربارەی گرنگیی هەلومەرجی دەرەکی لە بواری سیاسیدا، ئاوەڕدانەوەیەکە لە نەریتێکی تاڕادەیەک شکۆدار. بەڵام مۆنتێسکیۆ یەکەم کەسە لە دیمانەی سیاسیدا جێگەیەکی هێندە گرنگ بۆ ئەم بیروڕایانە تەرخان بکات.

باوەڕی کەش دەکرا ببێتە سەرەتایەک بۆ نیسبییەت relativism یەکی سەرلەبەر. دەشیا وا ڕانوێنێت کە هەر دەوڵەتێک ڕەنگدانەوەی مەرجگەلی ئەو ژینگەیە تێیدا هەڵکەوتووە و گەشەی کردووە. بەڵام مۆنتێسکیۆ خۆی لەو سەرەنجامە دەپارێزێت و ڕێبازی لۆک هەڵدەگرێتەوە و دەڵێ یەک *مافی سروشتەکی* هەیە و ئەویش ئاکاری هاوکۆ و، هەموو دەوڵەتسازییەک دەگرێتەوە. بەڵام ئەم چەمکی مافی سروشتەکییە، لای ئەم، تەماوی و تاڕادەیەکیش ناجۆرە. ئەوەش خۆی لە خۆیدا ڕێخۆشکەرێکە بۆ ڕمانی سەرلەبەری ڕامانی سەر بە مافی سروشتەکی. تاکە خاڵی - کە تەواو بنەڕەتییە - ئەوەیە کە هەوڵ

دەدات بیسەلمێنێ ماف جودایە لە خودی دەوڵەتسازیی بەرهەست. مۆنتێسکیۆ لەمەدا پشتی لۆک دەگرێ دژ بە هۆبز.

باوەڕی کەش مەبەستی ئەوەیە جیاوازی نێوان دەستوور و نەریتی نەتەوەی جۆراوجۆر روون بکاتەوە. گەر لە ڕوانگەیەکی تەسکەوە لێی بنۆڕی، گریمانەکانی مۆنتێسکیۆ دەربارەی کەش، تایبەتی نین. ئەو پێی وایە خەڵک لە کەشێکی گەرمدا، خەستتر هەست بە ژان و ئارەزوو دەکەن، وەک لە کەشی ساردا. خەڵک هەستەوەرتر دەبن بەڵام کەمتریش ئامادەن ئاگادارانە کار بکەن. زووتریش گریمانەی وەها ساکار کراوە و تەنانەت ئەمڕۆش کار لە گوزەرانی گەشتەوەرەکانی مالۆرکا دەکات. مۆنتێسکیۆ دەڵێ کەشێکی مامناوەند لەبارترین کەشە بۆ خۆشگوزەرانی و هاوژینیی مرۆڤایەتی، بەڵام ئەوەش دەڵێ کە دەستووردانەری وەڵاتێکی زێدە گەرم یان زێدە سارد دەبێ بارودۆخی کەش ڕەچاوبگرێ و خواست و تەمای خۆی لەگەڵ ئەو کەشەدا بگونجێنێت.

ئەوەی پتر سەرنجڕاکێشە ئەوەیە مۆنتێسکیۆ بایەخ دەدات بە بارودۆخی گشتیی جیۆگرافیای وەڵات و دەوڵەتان، نێزیکبوونیان لە زەریاوە، ڕەوتی ڕووبارەکانیان، زەوی بەپیتیان ...هتد. دەشێ ئەو یەکەم کەس بێت ڕشتەی سیاسیی ئینگلاندی تەنیا بەوە لێک نەدابێتەوە کە بەشێکە لە نەریتێکی سیاسی یان مێژووکردیی گشتی، یان بە نموونەیەکی دروست یان نادروستی دابنێت، بەڵکوو باس لەوەش دەکات کە ئینگلاند دورگەستانێکە، باشترین هەلومەرجی دانوستاندن و بازرگانی هەیە.

کەواتە باوەڕی کەش – ی مۆنتێسکیۆ، لەوە زیاترە تەنیا لە کەش بدوێ. مۆنتێسکیۆ باس لە چەندین هۆکار دەکات کە کار دەکەنە سەر هەڵبەستنی بنگە و دەستوورانی وەڵات. ڕانواندن و پۆلینی ئەو مەرجانە، بەو جۆرەی مۆنتێسکیۆ کردوویەتی، شیرازەدار نین بەڵام بۆ دواڕۆژ بوونە بنەمایەک بۆ دیمانەی ڕێکتری دیکەی سەر بەم بوارە.

مۆنتێسکیۆ، هەر لەبەر ئەوەی چەند هۆکارێکی مایەکی ڕەچاو دەگرێ، نابێت مەتێریالیست. خزمایەتییەکی کەمیشی هەیە لەگەڵ نووسەرانی مەتێریالیستی ڕۆشناکی – وەک baron d'Holbach – و زۆر زەحمەتیشە وێکچوونێک لە نێوان باوەڕی مۆنتێسکیۆ و ئەو مەتێریالیزمە مێژووکرد historical materialism ەدا بدۆزینەوە، کە مارکس و ئەنگیلز لە سەدەی نۆزدەیەمدا هەڵیان بەست. ئەوەی شارەزای دیمانەی سیاسیی زووتر نەبێت و *گیانی دەستووران* بخوێنێتەوە، پتر ئاکارەتی moralism و ئایدیالیزم idealism ی دێتە بەرچاو وەک لە مەتێریالیزم. پێوەندارییەتیی چینایەتی، لای مۆنتێسکیۆ، دیاردەیەکی تاڕادەیەک شلە. وا پێدەچێ مۆنتێسکیۆ ئەو پێوەندارییە بە بابەتێکی وەها دابنێت چارە

کردنی بۆ نەبێت و ترسی ئەوەشیان لێ بکرێت کە لەوانەیە ببنە هۆی ئاژاوە و فرەبەرەکی لە نێو دەوڵەتدا. کارمەندییەتی بەرز، دەبێ لە دەستووردا دیاری بکرێن. ڕاستە بەو کارە جیاوازیی نێوان پلەوپایەی خەڵک فرەوانتر دەبێ لەوەی ڕێ بدرێ جیاوازیی نێوان بەرز و نزم، بە ئازادی گەشە بکات. بەڵام هۆیەکی پاڵەپەستۆ و هەرا لەسەر پلەوپایە نامێنێ و ئەوەی پلەی خۆی بەپێی دەستوور پارێزرابێ دەتوانێ بێترس هاوکاریی گەل بکات.

مۆنتێسکیۆ، پلەی پارێزراوی بەگزادانی ئینگلاند دەکاتە نموونە. دابەش کردنی پەرلەمان بەسەر سەرخان و بنخاندا، بە کارێکی هۆشمەندانە دادەنێت: «لە دەوڵەتدا، هەردەم خەڵکی وەها هەیە کە بە هۆی بنەماڵە، ساماندارى یان بەهرەدارییەوە بێت، پێشەمیان هەیە. بەڵام ئەگەر تێکەڵ بە گەل بکرێن، ئەوا ئازادیی گشتی بۆ ئەوان دەبێتە کۆیلەیەتی و هیچ بەرژەوەندیکیان لەوەدا نابێ ئەو ئازادییە بپارێزن، چونکە زۆربەی بڕیار دژ بە خۆیانە. لەبەر ئەوە، ئەو بەشەی دەستووردانانەی بەر ئەمان دەکەوێت دەبێت پەیوەند بێت بەو ئیمتیازانەی هەیانە: بۆ ئەوە دەبێت ئەنجومەنێکی وەها ساز بکەن مافی ڤیتۆیان بەرانبەر سازمانی گەل هەبێت وەک ئەوەی سازمانی گەل بەرانبەر ئەمان هەیەتی»

کەواتە ئەو بیرەی دەڵێ دەزگەی سیاسی دەبێ بە جۆرێکی وەها ڕێک بخرێن ببنە ڕێگەخۆشکەری گۆڕانی بارودۆخی چینایەتیی نێو کۆمەڵ، بیرێکە لە مۆنتێسکیۆ تەواو نامۆیە. بەڵام ئەوە وەها ناگەیەنێت کە مۆنتێسکیۆ پێی وابێ باری چینایەتی نەگۆڕێکی پەتییە. ڕاستە مۆنتێسکیۆ دەڵێ بەرژەوەند و ئیمتیازی بەگزادان دەبێ بپارێزرێ، بەڵام ئەوەش دەڵێ کە، لە وەڵاتێکی تیروتەژی وەک ئینگلاندا، دەبێ پایەی ناوازی بەگزادان لاوازتر بکرێت: ئەگەرچی ئەو ئیمتیازە ڕەسمییانەی پەیوەندە بە بنەچەوە دەبێ بپارێزرێن و بچەسپێن، بەڵام تەنیا دوو لایەن هەن دەبنە بڕیاردەری پلەی کۆمەڵایەتی: «سامانداری و کارامەیی ئەو کەسە».

ئەم ڕێبازەی مۆنتێسکیۆ کە باس لە مەرجی دەرەکی دەکات سەرەنجامێکی گرنگ بەڵام نادیاری لێ دەکەوێتەوە: لە فراژووتنی کۆمەڵایەتیدا، چارەسەر کردنی سیاسی ئەو نۆرە یەکلاکەرەوە ڕەهایەی نییە کە زۆربەی بیریارانی سیاسیی پێش ئەم بۆیان دادەنا. ڕشتەیەکی سیاسیی هۆشمەندانە، بە تەنێ نابێتە دەستەبەری خۆشگوزەرانی، هۆکاری جیۆگرافیش مەرجێکی گرنگە – لەوانەیە ئەمیان لە بەرایی هەموو خاڵەکانی دیکەوە بێت. پێوەندیی کۆمەڵایەتیش لە کۆمەڵگەدا زادەی بڕیار و ڕێککەوتنی سیاسی نین: دەشێ دەستوور دانان بۆ خەفە کردن و ڕێک خستنی فراژووتنێک بخرێتە کار، بەڵام پەیدابوونی خودی ئەو فراژووتنە پەیوەندی دەستوور دانان نییە.

دەراوی ئەم باوەڕانەی مۆنتێسکیۆ ئەو بۆچوونانەی لۆک - ن کە دەربارەی ئازادی و موڵکایەتی دەریبڕیون، بەڵام بۆ یەکەم جار لە لای مۆنتێسکیۆ بوونە هۆی فرەواندنی هەموو بواری دیمانەی سیاسی. دیمانەی سیاسیی زووتر، هەر ئەوەندەی بوارێکی سەربەخۆ نەبایە، سەری دەنا بە خوداناسی و مێتافیزیکەوە. بەرئەنجامی ئەم ڕوانگەیەی مۆنتێسکیۆ ئەوەیە کە دەبێ بنەمایەکی زانیاری وەهای بۆ داڕێژرێت سەر بە جیۆگرافیا و کۆمەڵایەتی و ئابووری بێت. ئەوەش بەرەنجامێکە تەنیا مۆنتێسکیۆ خۆی وردەوردە و پارەپارە دەیسەلمێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا بە پەنهانی لە بەرهەمەکەیدا هەیە.

گەر بتەوێ، لە بوارێکی بەرتەنگدا، لە دیمانە سیاسییەکەی مۆنتێسکیۆ بگەیت، بەتایبەتی لە بیروڕاکانی دەربارەی دابەش کردنی دەسەلات و دەربارەی هەلاواردنی جۆرەکانی حوکومڕانی، دەبێ ئەو خاڵەی سەرەوەت لە یاد بێت. دەشێ وەها ڕانوێنێ کە مۆنتێسکیۆ بێ تەیار کردنێکی چاک دەستی بەسەر بیری نەریتەکیدا گرتبێ و دەستکاری کردبێ. ئەو باوەڕەی ئەو دەریدەبڕێ دەربارەی دابەش کردنی دەسەلات، دەشێ وەها ڕانوێنێ کە پەرەپێدانێکی ئەو بۆچوونە کۆنەیە کە لە حوکومڕانیی تێکەڵاو دەدوێ و هەر زوو لە لایەن پۆلیبیۆس و سیسێرۆوە هەڵنران. ئەو هەلاواردنەی جۆری حوکومڕانییەی ئەو دەیکات، لەوانەیە لە یەکەم چاولێکردندا، وەها ڕانوێنێ کە لادانێکی شێواوە لەو پۆلینە نەریتییەی سەردەمی ئەفلاتۆن و ئەریستۆ.

باوەڕی دەسەلات دابەش کردن ئەوەیە دەڵێ دەسەڵاتی دەستووردانەر، بەجێهێنەر و دادپرسی دەبێ لەیەک جودا بکرێنەوە. کەواتە باوەڕێکی پێوەرەکییە. ئاشکرایە مۆنتێسکیۆ ئیلهامی ئەم باوەڕەی لە ئینگلاندەوە بۆ هاتووە، بەڵام لاسایی کردنەوەیەکی ڕووتی بارودۆخی ئینگلاند نییە و ڕەخنەیەکی ڕوونیش نییە لە پاشافەرمانیی ڕەهایەتیی فرانسە.

وەک دیمانەیارە گەورەکانی سیاسەتی سەدەی حەڤدەیەم، مۆنتێسکیۆیش پێی وابوو دەستوور دانان شائەرکی سیاسەتە. لە ڕێی دەستوورەوە گوزەرانی سیاسی دەچەسپێ، لە ڕێی دەستوورەوە یەکەی دەوڵەتەکی هەڵدەبەسترێ. مۆنتێسکیۆ هاوبیریشە لەگەڵ ئەو بۆچوونە نەریتەکییەی دەڵێ ئەوانەی ژێرفەرمانی دەستوورن دەبێ دەرفەتی ڕاستەوخۆ یان تیانیان هەبێ کار بکەنە سەر ئەو دەستوورە. ئەم کارەش بەوە دەبێ کە پەرلەمانێکی نوێنەرەکی بە تەنیا دەسەلاتی دەستوور دانانی هەبێت. مۆنتێسکیۆ پێی وایە پێکهاتی پەرلەمان دەبێ ڕەنگدانەوەی هەلومەرجە چینایەتییە نەریتەکییەکان بێت، بۆ نموونە دابەش بێت بەسەر سەرخان و بنخاندا.

دەسەلاتی بەجێهێنەر دەبێ تەواو لە دەسەلاتی دەستووردانەر دابڕابێت. دەسەلاتی بەجێهێنەر دەبێ فەرمانی دەستوورەکان جێبەجێ بکات، ئەو دەسەلاتە لە چوارچێوەی دەستووردا ئازادە، بەلام هەرگیز نابێ لە دەستوور دەربچێ یان دەستوور پەک بخات. مۆنتێسکیۆ پێی وایە کە، بە پلەی یەکەم، پاشا و کۆڕی سەر بە خۆی (واتە حکوومەت) ئەم ئەرکەیان دەبێ، بەلام ئەمەش بە هیچ جۆرێک ناکات بە مەرج.

بەڕێوەبەرایەتیی ئەمەریکای باکوور، کە سەرکۆمار و حکوومەتەکەی خاوەنی دەسەلاتی بەجێهێنەرن، نەک تەنیا لە ژێر تاوی بۆچوونەکانی مۆنتێسکیۆدایە، بەلکوو بە ڕادەیەکی بەرز لەگەل ئەو نۆرینانەدا یەک دەگرنەوە. بەلام پەرلەمانەتی parliamentarism، واتە ئەو ڕشتەیەی حکوومەت یان دەسەلاتی بەجێهێنەر تێیدا بەرپرسە لە بەردەم پەرلەماندا، لەگەل ئەم باوەڕی دابەش کردنی دەسەلاتەدا یەک باوەڕ نین. زۆر جار ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کەوا مۆنتێسکیۆ، لە ئینگلاندیکەوە کە بەڕێوە بووە بەرەو پەرلەمانەتی، پشتیوانییەکی شارەزاکی بۆ باوەڕەکەی خۆی خواستووە. مۆنتێسکیۆ لەوە ناچێت گوێ دابێ بەوەی ڕاوێژکارانی پاشا، زۆربەی جار لە پەرلەمانەوە دەهێنران. ئایە نەدەبا خەمی ئەوەی بایە کە کاری وەها بەپێی باوەڕەکەی خۆی دەبێتە مایەی هەڕەشە ئەگەر دەسەلاتی دەستووردانەر و بەجێهێنەر یەک بگرنەوە. نەخێر، ئاشکرایە کە باوەڕی دابەش کردنی دەسەلات، لای ئەو، هێندە کۆنکرێت نەبووە ڕێگە لەوە بگرێ مرۆڤێک لە یەک کاتدا هەم ئەندامی دەسەلاتی دەستووردانەر بێت و هەم ڕاوێژکاری دەسەلاتی بەجێهێنەر بێت. لەوە دەچێ مۆنتێسکیۆ تەواو پشتی بستبێ بەو بۆچوونە نەریتەکییەی دەلێ «پاشا-لە-حکوومەتدا» (واتە بەرزەدەسەلاتی بەجێهێنەر)، وەک بنەمایەک، وەک بیرێک، دەبێ جودا بێت لە «پاشا-لە-پەرلەماندا» (واتە بەرزەدەسەلاتی دەستووردانەر).

هەروەها ئەوەش ئاشکرایە کە کاتێک مۆنتێسکیۆ باس لە دەسەلاتی دەستووردانەر دەکات مەبەستی سەرەکیی مۆنتێسکیۆ ئەو کارە بەردەوامەی دەستووردانانە نییە کە لە پەرلەماندا دەکرێ. گرنگ ئەوەیە گەل - یان دەستەی هەلبژاردەی گەل، یان بێژەران - شارێی حوکومڕانیی دەولەتییان داڕشتبێ. هەر لەبەر ئەوەشە مۆنتێسکیۆ تاکفەرمانیی فرانسی، کە دەمێک بوو پەرلەمانی پەک خستبوو، هەروا بە ئاسانی بە بێکەلک دانانێت: بە نۆرینی مۆنتێسکیۆ ئەو ڕژێمە هەر چۆنێک بێت هەر ڕەوایە.

ئەوەی لە باوەڕی دابەش کردنی دەسەلاتدا شامەبەست بێت، ئەوە نییە دەسەلاتی دەستووردانەر و بەجێهێنەر لەیەک دابڕێن، بەلکە سەرخۆبوونی دەسەلاتی دادپرسییە. ئا لەم خالەشدایە فرانسە بەهیچ جۆرێک بە بالای باوەڕەکە نییە: تاکفەرمانی پاشایانە هەر

ئەوە نەبوو پاشا خۆی دەستووری بۆ خۆی دادەنا بەڵکوو دەسەڵاتێکی خۆسەپێنیشی بەسەر دادپرسایەتیشدا هەبوو.

لە ڕاستیشدا هیچ دەوڵەتێکی وەها نەبوو مۆنتێسکیۆ شارەزای بێت کە دەسەڵاتی دادپرسیی تێدا لە دەسەڵاتی دەستووردانەر دابڕا بێت. تەنانەت لەم حاڵەشدا ئامادە بوو مامەڵەیەک لەگەڵ باوەڕەکەی خۆی بکات. مۆنتێسکیۆ، ڕای لە دادپەروەرایەتیی ئینگلیز بوو، کە سەرخان دادپرسی بەگزادان بوو، مۆنتێسکیۆ ئەو ڕشتەیەی بە پێوەر و نموونە دادەنا: «گەورەپیاوان هەمیشە جێی ئیرەییی خەڵکن، ئەگەر گەل دادپرسیان بێت دەکەونە مەترسییەوە و لەو مافە بێبەش دەبن کە لە لایەن هاوشانی خۆیانەوە دادپرسییان لێ بکرێت، کە بچووکترین هاوزێدیش لە دەوڵەتی ئازاددا ئەو مافەی هەیە. لەبەر ئەوە پێویستە ئەو بەشەی ئەنجومەنی دەستووردانەر کە لە بەگزادان پێک هاتووە، نەک دادگەی ئاسایی نەتەوە، ببێتە دادپرسی بەگزادان».

ئەمەش هەر تایبەتمەندییەکی مۆنتێسکیۆیە کە هەموو جۆرە دەربڕینێکی نارەزایی لە لایەن گەلەوە دژ بە خواپێداوەکان، بە گەندەڵیی ئاکار دادەنرێ.

هەڵاواردنی جۆرەکانی حوکومڕانی، لە لای مۆنتێسکیۆ، خزمایەتییەکی هەیە لەگەڵ ئەو باوەڕەی خۆیدا کە دەربارەی دابەش کردنی دەسەڵاتە مۆنتێسکیۆ، ستەمفەرمانی و پاشافەرمانی و کۆمار لەیەک جودا دەکاتەوە، کۆماریش هەیە ئەریستۆکراتە و هەیشە دیمۆکرات. هەڵاواردنی کلاسیک، ژمارەی فەرمانڕەوایانی کردبووە پێوانە و پاشان حوکومڕانیی چاک و ڕەوای لە خراپ و ناڕەوا جودا دەکردەوە. ئەو دەوڵەتەی پاشایەکی هەبایە ئۆتۆماتیک دەبووە پاشافەرمانی (ئەگەر حوکومڕانییەکەی پاشاکە بە ناڕەوا دانرابا، ئەوا دەبوو بە ستەمفەرمانی). مۆنتێسکیۆ بنەمایەکی تەواو جودا بەکار دەهێنێ. بەلای ئەمەوە دەشێ پاشا لە حوکومڕانیی ئەریستۆکرات یان دیمۆکراتدا هەبێ. فرانسە بەلای ئەوەوە، نموونەیەکە بۆ پاشافەرمانی، بەڵام ئینگلاندی پاشانشین، بەو پێکهات و دەسەڵاتەی پەرلەمان، دەبووە حوکومڕانییەکی تێکەڵ لە ئەریستۆکرات و دیمۆکرات.

پاشافەرمانی، لە لای مۆنتێسکیۆ، حوکومڕانییەکی دەستوورەکییە، بەڵام ستەمکار، لە ستەمفەرمانیدا حوکمی ڕەهایە، بە ئارەزووی خۆی ڕێ دەکات. ستەمفەرمانی تاکە حوکومڕانییەکە مۆنتێسکیۆ بەبێ دوودڵی دەیدزێنێ.

ئەم جودا کردنەوەیەی حوکومڕانییە، چ نۆرەیەکی گرنگی لە باوەڕی سیاسیی مۆنتێسکیۆدا نییە، بەڵام بۆ دیمانەی سیاسیی پاشەڕۆژ ناکاریگەر نەبوو. ئەو جودا کردنەوەیەی ئەو لەگەڵ جودا کردنەوەکەی کلاسیکی یۆنانیدا، لەوانەیە یەکڕەو نەنوێنێ،

لەگەڵ ئەوەشدا نێزیکترە لەو پۆلینانەی لە پاشەڕۆژدا هاتنە کایەوە. زۆر جار بەریتانیا و سوێد بە دیمۆکراتی ناو دەبرێن ئەگەرچی پاشایەتی، بە شێوەیەکی ڕەسمی، لە هەردوو وەڵاتەکەدا هەر ماوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، کاریگەریی کوتومتی مۆنتێسکیو، لەوەوە نییە ناوەڕۆکی تازەی ئاخنیوەتە بیری کۆنەوە. بەڵکوو سەیر لەوەدایە مۆنتێسکیو، بەوەی بایەخێکی کەمتر یان بایەخێکی نیسبی دەدات بە بنگەی سیاسیی دامەزراو، ڕێگە بۆ ڕۆشناکیی ڕسکاوتر و ڕادیکالتر خۆش دەکات. لە نێوان فیکری سیاسیی سەدەی هەژدەیەم و سەدەی بیستەمدا خەرەندێک هەیە: لە سەدەی بیستەمدا بە شێوەیەکی سەرسەختانە سەرنج لە شێوازی سیاسیی گیر کراوە – کە بۆ نموونە وەهای کردووە دیمۆکراتی تەنیا ببێتە پرۆسەی بڕیار دان – ئەو جۆرە نۆڕینە لە سەدەی هەژدەیەمدا نموونەی نەبوو. مۆنتێسکیو دەڵێ: «دەوڵەتی دیمۆکرات و ئەریستۆکرات دەوڵەتێکی ئازاد نین. ئازادیی سیاسی تەنیا لە دەوڵەتی مامناوەندیدا هەیە. بەڵام مەرجیش نییە لە هەموو دەوڵەتێکی مامناوەندیدا هەبێ...». ئەم بۆچوونە، پاشان لە ڕۆشناکیدا، پتەوتر دەکرێ.

٣- ڕۆشناکی و ڕوسۆ

ئەوەی نوێنەرە هەرە ناودارەکانی ڕۆشناکیی وەک ڤۆلتار و دیدرۆ و دی هۆلبەک کۆدەکاتەوە، باوەڕە بە هۆشی مرۆڤ. بەڵام هۆش چەمکێکی تاکواتا نییە. ئەوەی ڕاستی بێت، گەلێک هاسانترە باس لەو بابەتانە بکەین کە ناگونجێن لەگەڵ ئەوەی نووسەرانی ڕۆشناکی پێی دەڵێن هۆش، وەک لەوەی خەسڵەتەکانی هۆش دەستنیشان بکەین. باوەڕی نەگونجاو ئەوەیە دەڵێ دەسەڵاتی خودایەکی ڕاستەوخۆ دەست دەخاتە ژیان و گوزەرانی خەڵکەوە. لایەنی نەگونجاو زۆربەی بەزم و نەریتی دینەکی دەگرێتەوە. هۆش، دروستاندنی دینەکی بۆ دەستوور و بنگە کۆمەڵایەتییەکان، ڕەت دەکاتەوە. دەسەڵاتی پاشایەتی خودایەکی نییە و تەنیا ئەگەر لە سوودی هاوژینیی مرۆڤایەتیدا بوو، ئەوجا شایانی بەرگری لێ کردنە. پلەوپایەی بەگزادان و کۆڕی کەشیشانیش هەروەها. بیانوی سەر بە نەریت و شکۆمەندی، بەجارێک وەدەر نراون.

باوەڕی هۆشمەندی، بەگشتی، ئەوەیە مرۆڤ دەتوانێ زانیاری هۆشەکیی ڕاست دەربارەی گوزەرانی مرۆڤایەتی پەیدا بکات، ئەمە لە لایەک و لە لایەکی دیکەش ئەگەر ئەم

زانیارە، ببێتە ڕێنمووی کردەوە و بڕیارەکانمان، ئەوا دەگەین بە شادمانی و سەرکەوتنی هەرە بەرزی مومکین.

ئەم باوەڕە پێوەندیی بە بیری گەشبینایەتیی پێشکەوتن - ی سەردەمی ڕۆشناکییەوە هەیە. بەرچاوترین نموونەی ئەم هۆشە لە بواری زانستدا سەر هەڵدەدات، نموونەی گەشیش میکانیکی نیووتنە. بەڵام هەمان هۆشیش دەبا هەموو بوارەکانی دیکەش بگرێتەوە. گرتنەوەکەش نەدەبا بە شەڕی خوێنین بێ. نووسەرانی ڕۆشناکی بەر لە هەر شتێک، بڕوایان بە ڕێبازی بیرکارانە بوو. یەکێک لەو ڕێبازانە، فرەواندنی ڕۆشناکی بوو: ئەدیبان دەبێ دژایەتی ئەفسانەپەرستی و بوختان بکەن و نۆرینەکانیان بۆ خەڵکی دیکە بڵاو بکەنەوە. کە ڤۆلتار پەلاماری دادگەکانی لێپرسینەوە دەدات، بۆ بەرژەوەندی ڕۆشناکی ئەوە دەکات. بڵاوکردنەوەی *زانیارستانی مەزن* لە لایەن دیدرۆ و هاوکارانییەوە، هەر بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆشناکی بوو.

ڕێبازێکی دیکەی پێوەند بە ڕێبازی یەکەمەوە، پەروەردە و فێرکارییە. یەکێک لەو خەسڵەتانەی بووەتە نیشانەیەک بۆ نووسەرانی ڕۆشناکی ئەوەیە کە پێیان وایە مرۆڤ بەرهەمی ژینگە و هۆکارە دەرەکییەکانە. ئەوەی ژیر لە گەمژە، هۆشمەند لە ئەفسانەپەرست، پیاوچاک لە بەد، جودا دەکاتەوە بەر لە هەر شتێک پەروەردە و فێرکارییە. گەر لە سەرەتاوە تەنیا (انطباع) ێکی دروست بدرێت بە مرۆڤ، ئیدی ئەو مرۆڤە مۆرکی ڕێبازی هۆشمەندی هەڵدەگرێ.

ئەم بۆچوونە ئەگەر یەکڕەوانە بخرایەتە کار، دەشیا ببێتە هۆی سەرهەڵدانی داخوازیی وەها کە داوای سەرەوژێرکردنەوەی کۆمەڵگەی دامەزراو بکات، چونکە، بەو نۆڕینە بێ، جیاوازیی نێوان هەژار و دەوڵەمەند، ئاغا و نۆکەر، تەنیا بەرهەمێکی لاوەکیی ژینگە و پەروەردەیە. لە ژینگەیەکی چاکدا، هەژار و چەوساوەش دەتوانن ببنە خاوەن ئەو سەلیقە و زانین و هۆشمەندی کەسانی دەرفەت بۆ ڕەخسیوو، هەیانە. کە وەهاش بوو، ئەوا لە کۆمەڵگەی هۆشمەندا، یەکسانییەکی سەرلەبەر پەیدا دەبێ. خەڵک، کاتێک دەخرێنە ژێر تاوی یەک هەلومەرجەوە، لە هەموو ڕوویەکی گرنگەوە وەک یەکیان لێ دێت. کەواتە جیاوازیی گەورەی چینایەتیی نێوانیان مەسەلەیەکی هۆشنەیارانەیە.

بەڵام، بە دەگمەن نەبێ، نووسەرانی ڕۆشناکی ئەم سەرەنجامە ناخوێننەوە: هەتا نەگەینە دوا سالانی ئەو سەدەیە، بیری یەکسانیی دروست پەیدا نابێ، ئەو بیرەش هێندەی بەندە بە ڕۆشناکییەوە، هێندەش و لەوانەیە پتریش بەند بێ بە فەلسەفەی ڕوسۆوە.

ڕوسۆ بڕوای بەو بیرەی هاوزەمانی خۆی هەبوو کە دەیگوت پەروەردە هێزی

ئافراندنەوەی هەیە. بەڵام ڕوسۆ بەگشتی بابایەکی بوو هەردەم بەرهەڵست و بەهۆی هەرا نانەوەیەک ناوی دەرکرد: سالّی ١٧٥٠ لە وتارێکدا دەڵێ پێشکەوتن لە بواری هونەر، فەلسەفە و زانستدا، لەم سەدانەی ڕابوردوودا، زیانی لە سوودی زیاتر بووە. ئەمەش بۆچوونێکە یەکەوڕاست دژ بە ڕێبازی گەشبینیایەتیی پێشکەوتن بوو کە نووسەرانی ڕۆشناکی کرتبوویانە بەر. هەر ئەمەشە بووەتە بنەمای ئەو دیاردەیەی کە - تاڕادەیەک نادروستانە - پێی دەگوترێ ساکارەتی premitivism ی ڕوسۆ.

پاشان، ڕوسۆ بەرهەمێکی زۆری دەرکرد کە بە ناوەڕۆک دژ بەیەک بوون و ئەوەندەش شیرازەدار نەبوون. خەڵکی، بە زێدەڕۆییەوە، لەو بەرهەمانە سەرەنجامێکی وەهایان هەڵێنجا، کە گوایە ڕوسۆ ئاشقی ژینی ساکار و سەرەتاییە. بۆ نموونە، ئەو دروشمەی دەڵێ «بابگەڕێنەوە بۆ سروشت»، کە هەردەم بە گوتەی ڕوسۆ ناسراوە، هەرگیز لە نووسینەکانی ڕوسۆدا نەدۆزراوەتەوە.

بەهەر حاڵ، ئەو نۆڕینەی ڕوسۆ کە دەڵێ فراژووتنی سەردەمی نوێ تاوێکی نایەتی هەبووە، یەکجار سەرنجڕاکێش بوو. ئەم نۆڕینە لادانێک بوو لە مێژووناسیی ڕۆشناکی. نووسەرانی ڕۆشناکی باوەڕیان وەها بوو کە گوزەرانی خەڵک، بە چاکبوونی هەلومەرجی گیانەکییان، چاک بووە. ئەم بۆچوونەیان لەگەڵ باوەڕیان بە هێزی هۆش تەواو لە یەکتر ئالابوون. بەڵام ڕوسۆ باوەڕی بە توانستی هۆش نەبوو. ڕوسۆ پێی وا نەبوو خەڵک بە توانستی هۆش بتوانن کۆمەڵگەیەکی چاک دابمەزرێنن. ڤۆڵتار و دیدرۆ و دی هۆلبەک پێیان وا بوو مرۆڤ، ئەگەر کردەوەی خۆی بخاتە ژێر ڕکێفی شی کردنەوەیەکی هۆشەکی، داهات و دەرفەتی دوارۆژی خۆی هەر بەو شێوەیە لێک بداتەوە کە زانستکارێک خولێکی سروشتەکی لێک دەداتەوە، ئەوا دەشێ ئەو مرۆڤە ببێتە ئادەمیزادێکی بەختەوەر. ڕوسۆ ئەو جۆرە لێکدانەوەیەی بە دزێو دادەنا. ڕوسۆ، لە بری هۆش *ویژدان* دادەنێت. دەنگی ویژدان گوێڕایەڵی هۆش نییە. ویژدان پتر بەندە بە هەستەوە، بەڵکوو بە غەریزەوە. ڕوسۆ دەڵێ ویژدان بەهەڵەدا ناچێت، بەڵام هۆش مەترسی ئەوەی لێ دەکرێ هەموو پێوەندییەکی چاکەخوازانەی مرۆڤایەتی هەڵوەشێنێتەوە و فرەبەرەکی و ئاژاوەی لێ بزێتەوە.

باوەڕ بە ویژدان بەندە بە باوەڕ بە خێرخوازیی خۆڕسکی مرۆڤەوە. نەک تەنێ ڕوسۆ بەڵکوو زۆربەی نووسەرانی ڕۆشناکی باوەڕیان بەوە هەبوو کە بە شێوەیەکی سروشتەکی مرۆڤ خێرخوازە. بەڵام بەلای نووسەرانی ڕۆشناکییەوە، ئەم گریمانەیە بە پلەی یەکەم ئەوەی ڕادەگەیاند کە مرۆڤ لە سەرەتاوە بێگوناهێکی پەتییە. ئەم خێرخوازییەشی بە ڕێنمووی پەروەردەیەکی هۆشەکی دەپارێزرێ و پتەوتر دەکرێ. پەروەردەی هۆشنەیار و چەوت دڕندە دەخوڵقێنێت.

بەلام بەگشتی، کاتێک ڕوسۆ باس لە خێرخوازیی مرۆڤ دەکات، بیر لەو بێگوناهییە سەرەتاییە ناکاتەوە. ڕوسۆ، بە پلەی یەکەم، بیر لەو هەستە سروشتەکی یان غەریزەکییە دەکاتەوە کە، بە نۆڕینی خۆی، لە ویژداندا بەدەر دەکەوێت. بە بۆچوونی ڕوسۆ، ئەوەی جڵەوی خۆی بداتە دەست ویژدانی پاک، بە بەرزترین ئامانجی ژیان دەگات کە دەکاتەوە: ئارامیی ناوەکی و ئاشتیی دەرەکی لەگەڵ خەڵکی دیکەدا.

ڕوسۆ دەڵێ ئەم فراژووتنە کۆمەلایەتییە ناسروشتەکی و شەڕخوازە، ویژدانی زۆربەی خەڵکی چەپاندووە. ئەو خەڵکە ڕێبەری غەریزەکیی خۆیان لەدەست داوە و لەبەر ئەوە هەردەم وێڵن. جاروبار ئەم گریمانەیە وەها لێک دراوەتەوە کە گوایە ڕوسۆ پێی وایە مرۆڤ تەنیا لە دۆخی سروشتەکیی ڕەهادا، خێرخوازە. بەلام ڕوسۆ مەبەستی وەها نییە. ڕوسۆ، هەر وەک هۆبز– و بەپێچەوانەی لۆک، مۆنتێسکیۆ و نووسەرانی پاشتری ڕۆشناکی – پێی وایە چەمکی وەک *چاکە و خراپە، ڕەوا و ناڕەوا*، بە هیچ جۆرێک لە دەرەوەی کۆمەڵگە و بەر لە کۆمەڵگەسازی، ناخرێنە کارەوە. ڕاستە ئادەمیزادێکی کێوی تەنیا دوای غەریزەی خۆی دەکەوێ، بەلام ئەوەی ئەو دەیکات نە چاکەیە و نە خراپەیە – بێلایەنە. بەلام کۆمەڵگەسازی کاری پێویستە و لە ڕاستیشدا غەریزەیە مرۆڤ بەرەو کۆمەڵگەسازی دەبات.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە کۆمەڵگە بەرهەمێکی ناهۆشەکی irrational ڕووتە. ڕوسۆ تەواو لایەنگری باوەڕی *پەیمانی جڤاکی* یە – تەنانەت شاکارە سیاسییەکەی خۆی ناوی *پەیمانی جڤاکی* یە. بەلام ئەم باوەڕە لای ئەم، پتر لەوەی لای نووسەرانی ڕۆشناکی، داشۆراوە. بە نۆڕینی ڕوسۆ، ئەگەر پەیمانی جڤاکی نەبایە کەس لەوە نەدەگەیشت بۆ دەبێ کەمینە سەر بۆ زۆرینە فروو بێنێت. ئێستا ئاشکرایە کە ئەو بنەمایانەی لەم پەیمانی جڤاکییەدا هەیە تەنیا لە بەرزەکۆمەڵگەی ڕوسۆدا بەدەر دەکەون. پێوەری هەرە گرنگی نێو پەیمانی جڤاکی ئەوەیە کە، ***هەموو ئەوانەی ناچار دەکرێن ملکەچی دەستوورێک بن، دەبێ بۆخۆیان دەستیان لە دانانی ئەو دەستوورەدا هەبێ.*** ڕاستە ئەم پێوەرە لە پەیمانە نەریتییەکەشدا هەر هەبوو، بەلام لەوێدا بەهەند هەڵنەدەگیرا و «ڕەزامەندی بێدەنگ» یان دەکردە پارسەنگ. ڕوسۆ پێی وایە بەڕاستی دەبێ هەموو هاوزێدێک ڕاستەوخۆ دەستی لە دانانی ئەو دەستوورانەدا هەبێ کە پێوەندییان بە ژیان و گوزەرانی خۆیەوە هەیە. ڕوسۆ لایەنگری ئەوەیە کە دواتر بوو بە ***دێمۆکراتی ڕاستەوخۆ.***

بە دیتنی ڕوسۆ، پەیمانی جڤاکی شاڕێی کۆمەڵگەی چاکەمان بۆ دەکێشێ. بەلام هەموو – یان نێزیکەی هەموو – ئەو کۆمەڵگە چەسپاوانەی هەن، کۆمەڵگەی خراپەن. کۆمەڵگەی

بەد، بەگشتی، هاوزێدانی بەدی وەها دروست دەکات دەنگی ویژدان تێیاندا خەفە کراوە. بە دیتنی ڕوسۆ، بۆ دروست کردنی مرۆڤی چاک تەنیا دوو دەرفەت هەیە. دەرفەتی یەکەم، کە تەنیا بۆ چەند کەسێکی ژمارە کەمە، ئەوەیە لە ڕێگەی پەروەردەوە، منداڵ لە کارتێکردنی کۆمەڵگەی گەندەڵی دەوروبەری خۆی ڕزگار بکرێت. دەرفەتی دووەم ئەوەیە هەر لە بنەڕەتەوە هەر هەموو کۆمەڵگەکە بگۆڕدرێت.

ئەم بۆچوونەی دووەم بووە هۆی ئەوەی بیروڕای سیاسیی ڕوسۆ بە **شۆڕشگێڕ** ناو دەرکات و بووە هۆکارێکی دنەدەری کردەوەی شۆڕشگێڕانە، چ لە ڕۆژگاری شۆڕشی فرانسی و چ پاش ئەوەش. لە لایەکی دیکەوە، ڕوسۆ لە ڕوانگەیەکی تاڕادەیەک ڕەشبینەوە دەیڕوانییە بوونی دەرفەتێک بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگەی چاکە. لەبەر ئەوە جێی بڕوا نییە ڕوسۆ بەڕاستی پڕوپاگەندەی بۆ شۆڕشێکی کۆنکرێتی سیاسی و کۆمەڵایەتی کردبێ.

لەگەڵ ئەوەشدا، ڕوسۆ بێوچان وێنەی بەرزەکۆمەڵگەی خۆی دەهێنایە پێش. بە دیتنی ڕوسۆ، بەر لە هەر شتێک، یەکەی سیاسی چ بە ژمارەی دانیشتوانی بێت و چ بە ڕووبەر دەبێ یەکجار سنووردار بێت. لە یەکەی گەورەدا هیچ دەرفەتێک بۆ هاوزێدان نامێنێت ڕاستەوخۆ کاربکەنە سەر بڕیاری سیاسی. ڕوسۆ بەرانبەر زۆربەی ئەو دەوڵەتە تازانە ڕەخنەگرە، چونکە یەکجار بەرفرەوانن و خەسڵەتی هەمەبنجیان هەیە.

دەوڵەتی سروشتەکی دەبێ خاوەنی سازمانێکی نائاڵۆز بێت. هاوزێدان دەبێ پتر هۆگری سەرلەبەری کۆمەڵگە بن نەک هۆگری سازمانی خۆ و هاوکارانی خۆی نێو کۆمەڵگە بن. لە هەموو بوارێکی سیاسیدا، دەبێ هەموو کەسێک وەک یەک هاوزێد – واتە تاکەکەس – بێتە پێش، نەک وەک نوێنەری لایەنێک یان بەرژەوەندێکی تایبەتی. لەبەر ئەوە کۆمەڵگەیەکی چینچین و خاوەن گرووپ و سازمانی سیاسی، ناپەسەندە.

باوەڕی سیاسیی ڕوسۆ، دەشێت تاڕادەیەک بە زیندەڵ دانرێت – چونکە خواستی ڕوسۆ ئەوەیە کۆمەڵگە بە شێوەیەکی زیندەڵ کار بکات. بەڵام ڕوسۆ لە تاوی تاکەکیەتیی سەپێنراوی ڕۆشناکی بەدەر نییە. ڕوسۆ یەکەی سروشتەکی و ناسروشتەکی جودا دەکاتەوە. خێزان یەکەیەکی سروشتەکییە، دەوڵەت دەبا سروشتەکی بایە. بەڵام گرووپی هاوپیشە، چین و دەستەی هاوبەرژەوەند یەکەی ناسروشتەکین. لە دەوڵەتدا هاوزێدان دەبێ وەک تاکەکەسی یەکسان بێنە پێش.

ئەم شێوە دەربڕینەی ڕوسۆ لە تاکەکیەتی بەندە بەو باوەڕە بەناوبانگ و سەخت و مشتومڕ لەسەر کراوەی خۆی کە پێی دەگوترێ باوەڕی ***خواستی گشتی*** *la volonté générale*. ڕوسۆ پێی وایە لەو دەوڵەتەی لەسەر بنەماکانی خۆی هەڵنرابێ، بڕیاری

هاوکۆی هاوزێدان - یان چاکتر وایە بڵێین بڕیاری زۆرینە - بڕیارێک دەبێت لە بەرژەوەندی دەوڵەتدا. بەڵام، ئەگەر هەر کەسە تەنیا دەنگی خۆی بدات نەک دەنگی گروپ و لایەن، جیاوازیی بیروڕای تاکەکەسان دەبنە پارسەنگی یەکتر.

لەگەڵ ئەوەشدا ئاشکرایە کە چەمکی خواستی گشتی لەوە زیاترە: خواستی گشتی دەکاتەوە خواستی یەکەی دەوڵەتەکی و لەویشەوە بنەما چەوتینەبەری ڕێنمای دەوڵەتەکە. بەم جۆرە ڕوسۆ ڕێگە بۆ چەمکێکی دەوڵەتەکی پاشەڕۆژ خۆش دەکات، کە پاشان لە لایەن هێگل و بیریاری دیکەشەوە گەشەی پێ درا. ڕوسۆ بۆخۆی پیاوی ئەوە نەبوو هەڵاواردنی فەلسەفیی ئەبستراکت بکات، لە نێو کۆڕی دیمانەیارانی سیاسەتدا، ڕوسۆ، بە ڕاهاوێژەری بیر و (انطباع) دادەنرێ.

بەهەر حاڵ، باوەڕی سیاسیی ڕوسۆ دوو ناوتوێژ implication ی تێدایە، کە تاڕادەیەک هەمەڕەنگی و کاریگەریی دژوەستاوی باوەڕەکە ڕوون دەکەنەوە. لە لایەک، دەوڵەتی سروشتەکی دەبێ ساکار و سنووردراو بێت، ئەوەی ئەو لە خەیاڵیەتی دەوڵەتی هاوچەرخ نییە بەڵکوو شارەدەوڵەتێکی تەواو نائاڵۆزە. لە لایەکی دیکەوە ئەو دەوڵەتە لەسەر بنەماکانی دیموکراتی هەڵدەنێ. مەرجیش ئەوەیە هاوزێدان هۆشیار و ئاگادار بن. کە وەها بێت، ئەوە دەوڵەتێکی پێشکەوتووە. ڕوسۆیش، وەک نووسەرانی ڕۆشناکی، دەسەڵاتی دەستووردانەری بە دابڕ و لە هەمووان دەستڕۆتر دادەنا. گەل لە بەرزەدەوڵەتی ئەودا دەستووردانەر بوون، دەسەڵاتی بەجێهێنەریان خستۆتە ملی سازمانێکی تایبەتی. جۆری ئەو سازمانە چییە، بەلای ڕوسۆوە مەبەست نییە، گرنگ ئەوەیە ئەو سازمانە مانداتی گەلی هەبێت و پەیڕەوی دەستوورەکانی گەل بکات. ئەوجا حەز دەکات پاشا بێت، حەز دەکات ئەنجومەنێکی بەڕێوەبەر بێت.

لەبەر ئەوەیە نۆڕینی ڕوسۆ دەربارەی دەزگەی سیاسی تەماوی و نادیاریکراو رادەنوێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا تەواوێک دیاریکراوترە لەوەی لە نێو نووسەرانی بەناوبانگی ڕۆشناکیدا باوە. باوەڕی ڕوسۆ بە هەست یان ویژدان دەیگەیەنێتە ئەو دیتنە تەواو دیاریکراوەی دەڵێ، هەر هەموو دەبێ بەشدار بن لەو بڕیارانەی هەمووان دەگرێتەوە، دەنا بە هیچ جۆرێک ژیانێکی هاوئاهەنگ مومکین نییە پەیدا بێت. باوەڕی هۆش لای ڤۆلتار و دی هۆلبەک، یەکێک لە ماناکانی ئەوەیە کە شێوازی سیاسی گرنگ نییە - هۆش دەتوانێ ڕۆح بکات بەبەر هەموو شێوازێکدا. کاتێک مۆنتێسکیۆ دەڵێ «مامناوەندیەتی» نیشانەیە بۆ چاکە یان خراپەی ڕژێمێک، ئاماژەیەکە بۆ ئەم باوەڕە. بەڵام نووسەرانی درەنگتری ڕۆشناکی لەمەش زیاتر دەڕۆن. خەسڵەتێکیشیان ئەوەیە کە، چونکە بەگشتی شێوازی

سیاسی بەهەند هەڵناگرن، زۆربەی جار وەهای بەباش دەزانن پاشایەتی بمێنێت. بەو جۆرەش بڕیاردان هەر دەکەوێتەوە دەست تاکەکەس. ئەگەر ئەو تاکەکەسە هۆشمەند بێ، ئەوا هۆشمەندی گوزەرانی سیاسیش دەگرێتەوە.

باوەڕ بە تاکفەرمانی ڕۆشناک باڵی بەسەر نووسەرانی ڕۆشناکیدا کێشاوە - ئەمە دەستەی سەر بە زانیارستانی دەوری دیدرۆ دەگرێتەوە، ڤۆلتار دەگرێتەوە و بارۆن دی هۆلبەکی شۆڕشگێڕتریش دەگرێتەوە. ئەمانە هەر هەموویان، بەرانبەر تاکفەرمانیی فرانسی، ڕەخنەگرێکی توندن. بەڵام ڕەخنەی ئەمانە لە شێوازە سیاسییەکە نییە، بەڵکوو لە هۆشنەیاری، ئەفسانەپەرستی و بێدادییە. هۆی ئەم دیاردانەش بەلای ئەو ڕەخنەگرانەوە دەگەڕێتەوە بۆ هۆشنەیاری ڕێبەران، بۆ خۆویستی چینی دەستڕۆ، بۆ خۆویستی بەگزادەی بەرز و کوڕی کەشیشانی بەرز. کەواتە ئەم ڕەخنەگرانە چاویان پتر بڕیوەتە گۆڕانکارییەک بواری بیرکاری و ئاکار بگرێتەوە نەک بواری سازمان و دامودەزگە.

بەڵام ئەو ئامانجانەی ئەمانە لەو گۆڕانکارییە ڕەچاویان گرتبوو بەرهەست و فرەوانن، بەتایبەتی دی هۆلبەک کە چاوەڕێی هەڵگەڕانەوەی هەلومەرجە چینایەتییەکانی نێو کۆمەڵگە بوو. ئەوەی بەلای هۆشەوە نرخدارە، لایەنی لاوەکی و کاتەکی وەک مەسەلەی بنەچە نییە، بەڵکوو کارامەیی ئەو کەسەیە، چالاکییەتی، بەرزی ئاکاریەتی. دی هۆلبەکیش وەک نووسەرانی دیکەی ڕۆشناکی پێی وایە پەروەردە و فێرکاری ئەم خەسڵەتانە لە مرۆڤدا پتەوتر دەکەن. بەڵام فەلسەفەی سیاسیی دی هۆلبەک دەربارەی مرۆڤایەتی بە پلەی یەکەم بۆچوونێکی ئوتۆپی نییە، بریتیبێ لە مرۆڤی چاکەخوازی نموونەیی و هۆشمەند. بەڵکوو ڕاستەوخۆ پەلاماری ئەو دۆخە ئابووری و کۆمەڵایەتییەی ئەو دەمەی فرانسە دەدات. دی هۆلبەک دڵگەرمانە بەرگری لە بۆرژوای وەلاوە نراو دەکات، کە بۆیان نییە سوود لە بەرهەمی کاری خۆیان وەرگرن، چونکە دەبێ بەگزادە و کوڕی کەشیشان بەخێو بکەن. دی هۆلبەک لە ناخی دڵەوە «غەوغا»، واتە خەڵکی ئاسایی، دەدرێنێ، چونکە نەزانین و ئەفسانەپەرستی وەهای لێ کردوون بۆ هیچ کارێکی پەرپرسایەتی دەست نەدەن.

بیروڕاکانی دی هۆلبەک، بۆ هەموو ڕۆشناکی، نموونەی هەڵوێستی دوو لایەنن لە ئاست فیکری یەکسانیدا. بەشێوەیەکی تاڕادەیەک کەمتر ورد بەڵام ڕەوانتر، هەمان دوو لایەنی لای ڤۆلتاریش هەیە. ڤۆلتار پێی وایە ڕاستە هەموو خەڵک «وەک یەک دەزێن» بەڵام لە هەمان کاتیشدا پێویستییەکی تراژیدییە کە ئەمیان دەبێ ببێتە نۆکەر و کۆیلەی ئەوەی دیکە. خێری سروشت بەشی یەکسانی ناکات.

«ئەو دەستکورتییەی دووچاری ئادەمیزاد هاتووە مرۆڤێک دەخاتە ژێر دەستی مرۆڤێکی دیکەوە، نەگبەتی ڕاست ئەوە نییە مەرجی وێکنەچوو هەیە، بەڵکوو بەندبوونە... لەم زەوییە ناشادمانەدا دابەشبوونی مرۆڤی نێو کۆمەڵگە بەسەر دوو چیندا، ستەمکاران و ستەمدیدە، کاری ناچارییە...

لە گوتەکانی ڤۆلتاردا زایەڵەیەکی کزی باوەڕی سەر بە ئابووریی مێرکانتێلایەتی هەیە: خێری زەوی هەتاهەتایە سنووردارە، بەهای ئابووری سەرلەبەر نەگۆڕە. مێرکانتێلایەتی لەمێژ بوو بەرەو هەڵوەشان دەچوو، بەڵام هەتا ساڵانی ١٧٥٠ ئەوجا دیمانەیەکی ئابووری شیرازەداری نوێ هاتە جێی، ئەویش باوەڕی فیزیۆکراتەتی physiocratism یە و، لە زۆربەی نووسەرانی بەتەمەنی ڕۆشناکی تێدەپەڕێ، بەڵام ڕوسۆ لە زۆر لایەنی گرنگەوە تەواو نێزیکیەتی.

شابنەمای فیزیۆکراتەتی ئەوەیە کە ***دەشێ سەرلەبەری سامان زیاد بکات*** بەڵام ئەمە تەنیا بە ***کار کردن لە زەویدا*** دەبێت، واتە بە پلەی یەکەم، بە کشتوکاڵ دەکرێ. فیزیۆکراتەکانی زوو - بەڵام نەک ڕوسۆ - هاوبیر بوون لەگەڵ کەمتەرخەمیی ڕۆشناکی بەرانبەر هەڵکەوتی سیاسی: ئەگەر پاشا و فەرمانڕەوایان هۆشمەند بن و ڕێ بدەن فراژووتنی سیاسی ڕێچکەی سروشتەکی خۆی بگرێ، ئەوا دوارۆژ ڕوونە.

تەنیا چەند دەساڵێک پاش ئەوەی باوەڕی فیزیۆکراتەتی بەیان کرا، ئادەم سمیت Adam Smith (١٧٢٣-١٧٩٠) ی سکۆتی، لە بەرهەمە بەناوبانگەکەیدا *On the Wealth of Nations* ***دەربارەی بەرهەمی نەتەوەکان***، ١٧٧٦) دیمانەیەکی ئابووریی تەواو فرەوانتری داڕشت، کە بە ناوی ئابووریی سیاسیی کلاسیک ناسراوە (جاروبار پێی دەڵێن دیمانەی لیبەڕال). سمیت پێی وایە هەموو کارێکی بەرهەمهێن، نەک تەنیا کشتوکاڵ بگرە تەنانەت، و لەوانەیە بەر لە هەموو، پیشەسازیش، بەهای ئابووری بەرهەم زیاد دەکات و بەوەش سامان زیاد دەبێت. نۆرەی دەزگەی حکوومەتی لەم دیمانەیەدا کزتر دەبێتەوە: دەزگەی حکوومەتی کاریان تەنیا ئەوەیە ڕێگە خۆش بکەن ئابووری خۆی خۆی بەرێت بە ڕێوە و بە پێی بنەماکانی ناوخۆی گەشە بکات. فیزیۆکراتەتی و بەتایبەتی ئابووریی سیاسیی کلاسیک، بە دواکاتەوە کاریگەرییەکی یەکجار قووڵی لە دیمانەی سیاسیدا هەبوو. ئەم باوەڕە ئابوورییانە، کە دەیانگوت ئادەمیزاد بە کار کردن زاووزێ بە سەرلەبەری سامان دەکات، هەلومەرجی ناوخۆی ئابووریی هەر هەموو چین و توێژی هاوکار و نەتەوەی خستە بەر تیشکێکی نوێ.

ئەمەیان هەر زوو لای ڕوسۆ ئاشکرا بوو. «کاسبکارانی شار»، واتە ئەوانەی خەریکی پیشەی دەستەکین و، لە ڕشتەی سەر بە مێرکانتیلایەتیدا بەگەرمی لەسەریان دەکرایەوە، لە لایەن فیزیۆکراتانەوە بە چاوێکی نەیارانە سەیر دەکران. ڕوسۆیش ئەم هەڵوێستەی بە توندی دەردەبڕی. ئەو داکۆکییەی ئەو لە کۆمەڵگەی ساکاری دەکات، کە کشتوکاڵ تێیدا سەرچاوەی سەرەکی داهاتە، دەبێ لە چوارچێوەی باوەڕی فیزیۆکراتەتیدا سەیر بکرێت. ڕوسۆ شەیدای هەژاری تێیە بگرە بە پێچەوانەوە، بڕوای بە تەژمەندێکی پەرەسێن بوو لە بەرزەدەوڵەتەکەی خۆیدا.

لە بیروڕای ڕوسۆدا، دەربارەی موڵکایەتی و یەکسانی، ئەم ڕواندنە نورەیەکی گەورەی هەیە. گوتەکانی ڕوسۆ دەربارەی موڵکایەتی یەکجار دژبەیەک ڕادەنوێنن، تا ئەو ڕادەیەی بۆ پشتیوانی لە نۆڕینی تەواو پێچەوانەی یەک بەکار هێنراون. ڕوسۆ لە لایەکەوە دەڵێ موڵکایەتیی تاکەکەس پیرۆزترین مافە (دی هۆلبەکیش هەروا دەڵێ) لە لایەکی دیکەوە دەڵێ هەموو موڵکایەتییەک مافی دەوڵەتە، «چونکە دەوڵەت لە ئاست هاوزێدانی خۆیدا، بەپێی پەیمانی جڤاکی، دەسەڵاتی بەسەر هەموو موڵکایەتیی هاوزێدا دەشکێ...»، ئەم گوتەیەی – لەسەر بنەمایەکی یەکجار لاواز – بووە هۆی ئەوەی ڕوسۆ بە سۆسیالیست و تەنانەت بە کۆمیونیستیش ناو ببرێ.

بەڵام بۆچوونەکانی ڕوسۆ، لەم خاڵەدا، هێندە ناکۆک نین. ڕوسۆ پێی وایە هەموو هاوزێدێک دەبێ دەسەڵاتی بەسەر موڵکایەتییەکدا هەبێ و بەکاری بهێنێت بۆ ئەوەی پێوەندیی بە هاوزێدێکی دیکەوە هەبێ. بەڵام دەوڵەت – واتە دەوڵەتی چاکە و بە خواستی گەل حوکومڕان – دەبێ کارێک بکات هیچ هاوزێدێک موڵکایەتیی خۆی بە شێوەیەکی وەها زیاد نەکات کار بکاتە سەر موڵکایەتی و سەرخۆبوونی هاوزێدێکی دیکە. کەواتە ئەرکی دەوڵەت ئەوەیە یەکسانیی ئابووری نێو کۆمەڵگە بپارێزێ. ڕوسۆ وەهای بۆ دەچێ کە خواستی گشتی دەبێ ببێتە بنەمایەکی زۆر باشی پارسەنگ. ئەوانەی بەتەمان لەسەر حسابی خەڵکی دیکە سوودی ئابووری بەدەست بێنن دەبێ خۆیان لەناو کەمینەدا بدۆزنەوە.

ڕوسۆ لەوەی کە ڕادەی یەکسانیی ئابووری دەبێ چەند بێت، بڕیاری بە پێچوپەنا دەدات. ڕوسۆ هەر ئەوەندە دەڵێ ئەو یەکسانییە پێویست ناکات ڕەها بێت، بەڵام ناشبێ کەسێک ئەوەندەی هەبێ کە بە هێزی دەوڵەمەندیی خۆی بتوانێت ئازاری کەسێکی دیکە بدات یان بیکڕێت، کەسیش نابێ هێندە هەژار بێت کە ناچار بێت خۆی و کاری خۆی بفرۆشێ. کەواتە یەکسانییەکە نیسبییە.

جیاوازیی نێوان نۆڕینی ڕوسۆ و ئایدیۆلۆگیی ڕۆشناکیی باو، له هیچ بوارێکدا هێندەی بواری *ئازادیی سیاسی* ئاشکرا نییه. بەلای نووسەرانی ڕۆشناکییەوە مەسەلەیەکی بەڵگەنەویستە کە ئازادی، بە پلەی یەکەم، ئازادیی دەربڕینی بیروڕایە. تەنیا هۆشە دەتوانێ دنیا چاک بکات، هۆشیش، ئەگەر دەستی سەنسوور ئاواڵە بێت ڕێگەی لێ بگرێ، ناتوانێ بێتە گۆ و بیری خەڵک ڕوون بکاتەوە. کەواتە دەشێ بڵێین نووسەرانی ڕۆشناکی هەڵوێستێکی بیرکارانەیان لە ئاست دۆزی سیاسیدا هەیە. ئەم حاڵە لای ڤۆلتار لە هەمووان ڕوونتر خۆی دەنوێنێ. لەم دنیایەدا ژان و هەژاریی بێ چارەسەر هەیە، بەڵام باشترین گوزەران بەوە دروست دەبێ کە ڕێگە بدرێ بە هۆشمەندان، واتە فەیلەسووف و ڕۆشنفیکر و تێگەیشتووان کە بە ئازادی ڕەخنە و پێشنیازی خۆیان دەربڕن. لە بیرکردنەوەی ڕۆشناکیدا، تاکەکیەتییەکی سیاسی و ئابووریش هەیە، بەڵام ئەم تاکەکیەتییە کراوەتە ژێردەستەی تاکەکیەتیی بیرکاری: دەبێ مرۆڤە ژیرەکان جڵەوی فراژووتن ڕاکێشن.

بە نۆڕینی ڕوسۆ تاکەکەس تەنیا بەوەی مل بۆ دەوڵەت، واتە بۆ خواستی گشتی، کەچ دەکات بە ئازادی دەگات. مرۆڤ بەوەی پەیڕەوی دەستووری دەوڵەت بکات - کە دەکاتەوە ئەو مافانەی خواستی گشتی بە ڕەوای داناون - دەکرێ ئازادییەکی سروشتەکی پەیدا بکات.

مەبەست ئەوە نییە ئازادیی دەربڕین و ئازادیی بیروڕا قەدەغە بکرێن. بەڵام بە پلەی یەکەم، بەهایەکی نیسبییان هەیە. کاتێک لە کۆبوونەوەیەکی گەلێردا، خواستی گشتی دێتە گۆ، واچاکە هەموو هاوزێدێک تەواو ئاگاداری ئەو باسانە بێت کە دێنە کایەوە و لە جڤینەکەشدا دەبێ بە ئازادی بۆچوونی خۆی دەرببڕێ. بەڵام نابێ بەر لە جڤینەکە پروپاگەندە بڵاوکرێتەوە، چونکە تاکەکەس بەو کارە باشترین و زیرەکانەترین بۆچوونی خۆی دەدۆڕێنێ. ئەوجا کە زۆرینەش بڕیاری خۆی دا ئیدی هەموو گوتوبێژێکی دیکە تەنیا خراپەی لێ دەزێتەوە.

نووسەرانی ڕۆشناکی و ڕوسۆیش، دەربارەی ئازادی، نەرێتی خۆیان هەیە. هەردوو نەرێتەکە لە سەدەی نۆزدەیەمدا، گەشەیان پێ دەدرێ و نۆرەیەکی چالاکتر لە گوزەرانی سیاسیدا دەنوێنن.

## کۆنەوارەتی: هێگل

### ١- ئایدیۆلۆگییەکانی سەدەی نۆزدەیەم

لە سەدەی نۆزدەیەمدا ئایدیۆلۆگییە هاوچەرخەکانی کۆنەوارەتی، لیبەڕالیزم و سۆسیالیزم، هەڵنران. فاشیزم و نازیزمیش ڕەگ و ریشەیان هەر لە سەدی نۆزدەیەمدایە. ئەمەش مانای ئەوە نییە بیرکردنەوەیەکی سیاسیی نوێ لە سەدەی نۆزدەیەمدا سەرهەڵدەدات. کۆنەوارەتی لە زۆر لاوە بەرتەکێکی بۆچوونەکانی ڕۆشناکی سەدەی هەژدەیەمە و لیبەڕالیزم بەردەوامییەکی نەریتی، لە سەرێک لۆکە و لە سەرێکی دیکەوە ئادەم سمیت Adam Smith ـە. تەنانەت سۆسیالیزمیش بنجی لە سەدەی زووتردا هەیە.

ئەوی نوێ بێت ئەوەیە ئەم ئایدیۆلۆگیانە تاڕادەیەک لە شێوازێکی سەرلەبەر و ڕسکاودا خۆ دەگرن، وەک گۆشەنیگای لێکنۆر و وەک ئالتێرناتیڤی یەکتر هەڵچنران. لە ئاست باوەڕی دەوڵەت لە کۆنەوارەتیدا، تاکەکیەتیی لیبەڕالیزم ڕاست دەبێتەوە. بەرانبەر خواستی لیبەڕالانەی چوستیی ئابووری، سیاسەتی خۆشگوزەرانیی کۆنەوارەتی دێتە پێش. لە سۆسیالیزمدا دیمانەی چینایەتی هەیە، کۆنەوارەتی باس لەوە دەکات کە لە ژێر سایەی دەوڵەتدا دەبێ هاوئاهەنگیی چینایەتی هەبێ.

بەم جۆرە، ئەم ئایدیۆلۆگیانە، ڕەنگ لە یەکتردا دەدەنەوە، ئەگەر بە نۆڕین و نرخاندن نەبێت ئەوا بەوەی ڕوویان لە چەند دۆزێکی تایبەتییە. ئەم باوەڕەیان وەرامێکە بۆ ئەو باوەڕەیان.

ئەمەش دیاردەیەکی سەیر نییە. ئایدیۆلۆگییەکانی سەدەی نۆزدەیەم، لە یەک ژینگەی ئەورووپایی تاڕادەیەک سنووردراودا گەشەیان کردووە. لیبەڕالیزم لە ئینگلاند پاکترین و ڕسکاوترین شێواز وەردەگرێت. گەورەترین بیریاری کۆنەوار هێگلی ئەڵمانییە. نوێنەرە یەکەمەکانی سۆسیالیزم فرانسی و ئینگلیز بوون. جیاوازیی نێوان ئینگلاند و فرانسە و ئەڵمانیا، لە بواری فراژووتنی پیشەسازی و کۆمەڵایەتی، نەریتی سیاسی و پاشخانی فیکری، کەم نەبوون. بەڵام هەر هێندەش فرەوان بوون کە لە وەڵاتی جوداڵا پێشەمی جودا بدەن بە ڕێبازە ئایدیۆلۆگییە سەرەکییەکان.

لە بواری ئابووریدا ئینگلاند لە پێش فرانسە بوو و تەواوێکیش لە ئەڵمانیای تێپەڕاندبوو. پیشەسازی لە ئینگلاند لە سەدەی هەژدەیەمەوە سەری هەڵدا، بەڵام ماوەیەکی سەدەی نۆزدەیەم تێپەڕی ئەوجا گەیشتە فرانسە، ئەڵمانیا لەویش درەنگتر بە

پیشەسازی گەیشت. لەگەڵ ئەوەشدا فراژووتنەکە هەر ویکچوو بوو. نەک تەنیا ئینگلیز بەڵکوو فرانسی و ئەڵمانیش هەڵویستیان لەو فراژووتنەی ئینکلاند دەگرت. بەلای ئەڵمان و فرانسییەکانەوە مەسەلەی هەڵگرتنەوەی شوینپیی فراژووتنی پیشەسازی و ئابووری و کۆمەلایەتیی ئینگلاند، مەسەلەیەکی سیاسیی گەورە بوو، هەبوو پیی باش بوو، هەبوو دژ بوو. چاکەی ئەو فراژووتنە لە چوستی و فرەبەرهەمیدا بوو، لە دەوڵەمەندبوونی چینی بورژوا و بەدوا ئەویشەوە ڕاهیزانی نەتەوە بوو. گەورەترین لایەنی خراپەی بەرهەستیشی ئەوە بوو پرۆلیتارێکی هەژار و شڕی پەیدا کردبوو. گوتوبیژ دەربارەی هۆکار و چارەسەر کردنی ***نابووتایەتی*** *pauperism* جێیەکی تەواو بەرچاوی لە ئەورووپای سەدەی نۆزدەیەمدا گرتبوو، کۆنەوار و لیبەڕال وەک سۆسیالیستەکان پێوەی خەریک بوون. جگە لەوەش، پیشەسازی گرفتێکی دیکەشی بۆ کۆنەوارەکان بەدەمەوە بوو، ئەویش لاواز بوونی نرخاندنە دینەکی و فەرهەنگییە نەریتییەکان بوو. بەلام هەر هەمان ڕەوت، بەلای لیبەڕال و تاڕادەیەکیش سۆسیالیستەکانەوە، بە سەرکەوتنی هۆشمەندی و بە ڕەها بوون لە نیگاتەسکی دادەنرا.

***شۆڕشی فرانسی ١٧٨٩***، ڕووداوێکی سیاسیی وەها بوو سیبەری بەسەر گوتوبیژی سیاسیی سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا کیشابوو. فراژووتنی ئەو شۆڕشە بەرەو دەوڵەتی ترس و بەرەو تاکفەرمانیی ناپۆلیۆن Napoleon، لە لای کۆنەوارەتیی هاوچەرخ، بە باشی بەڵگە دادەنرا بۆ ئەو گریمانەیەی دەڵێ نەتەوە ناتوانێ بە شۆڕش ڕابوردوو لە خۆی بتەکێنێ. بەلام بیریارانی کۆنەوار - وەک هیگل - جیاوازییان لەگەڵ نوینەرانی کۆنەپەرستی reaction لەوەدا بوو کە کۆنەواران نەیان دەسەلماند گوزەرانی سیاسی بگەڕێتەوە بۆ دۆخی بەر لە ١٧٨٩. کۆنەوارەتیی هاوچەرخ، هەر وەک لیبەڕالیزم و سۆسیالیزم بڕوای بە پێشکەوتن و فراژووتن هەیە.

بە دیتنی لیبەڕالی، شۆڕشەکە ئەنجامێکی خۆڕسکی ڕەهایەتی absolutism و حوکومڕانیی ئیمتیازداران بوو. لیبەڕالەکان داوای ئازادیی بازاڕ و ئازادیی دەربڕین دەکەن، سیاسەتی نموونەیی خۆیان لە پەرلەمانی ئینگلیزیدا دەبینن. لەبەر ئەوەیە لیبەڕالیزم لە ئینگلاند، بەگشتی دەبێتە هیزێکی کۆمەڵگەپارێز، بەلام لە ئەورووپا دەبێتە هیزێکی شۆڕشگێڕ.

بە دیتنی سۆسیالیستان، شۆڕشی فرانسی شۆڕشێکی تەواو بۆرژوایانە بوو، بەلام بە ڕێنمووی شۆڕشی داهاتووی سۆسیالیستانەیان دادەنا.

ئەو هۆکارانەی دەستیان لە هەڵبەستنی ئایدیۆلۆگییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا هەبوو،

هەر هەلومەرجە بنەڕەتییەکانی بواری کۆمەڵایەتی و ئابووری نەبوون، تەنیا ئەوەش نەبوو کە گۆڕانکاریی سیاسیی سەرلەبەری نوێ چەسپێندرا، بەڵکوو ئەو پاشخانە فیکرییە ناکۆکەش بوو کە ژینگەی سەدەی نۆزدەیەمی پێک دەهێنا. ململانێی نێوان بیری ڕۆشناکیی سەدەی هەژدەیەم و ڕۆمانتیکی نوێ، بە چەندین بار، کاری لەم ئایدیۆلۆگیانە کرد. ڕۆشناکی بە باوەڕێکی ئەتۆمایەتی atomism دەیڕوانییە سروشت و بە باوەڕێکی تاکەکیەتی دەیڕوانییە کۆمەڵگە، لە نێوان ئەم دوو ڕوانگەیەشدا پێوەندییەکی ئاشکرا هەبوو. هەر بەو شێوەیەش بۆچوونی ڕۆمانتیکی دەربارەی سروشت پەیوەستی ئەو ڕایە بوو کە دەیگوت گەل و نەتەوە نە تاکەکەس خاڵی بڕیاردەرن لە یەکەی سیاسیدا.

ئایدیۆلۆگییەکانی سەدەی نۆزدەیەم تەنیا ئەوە نین پێشنیازی کردەوەی سیاسی بکەن بەڵکوو جیهانبینیی جۆراوجۆریش پێکدێنن یان دەبنە بەشێک لێیان. ئەمانە وزە لە ڕامانی سەر بە فەلسەفەی سروشتەکی وەردەگرن، کە ڕیشەی لە ڕۆشناکی و ڕۆمانتیکدا هەیە، بەڵگە لە باوەڕی سەر بە فەلسەفەی مێژوویەکی بۆ دوارۆژبینیی خۆیان دەهێننەوە، ئەمانە بەشێک بوون لە ڕشتەیەکی بیرەکیی تێفکرین. ئەوەی ئێمە پێی دەڵێن کۆنەوارەتی و لیبەڕالیزم و سۆسیالیزم تەواو دوورن لەوەی ببنە مەزنایەتییەکی پڕاوپڕ. لەگەڵ ئەوەشدا هەر یەکەیان خەسڵەتی بیرکارانەی وەهای هەیە تەواو ئاشکرا بێ.

پاشان بە دواکاتەوە، مشتومڕ لەسەر ئەوە پەیدا بوو ئایە چ لایەنێک دەبێتە خەسڵەتی هەڵاوێری ئەم یان ئەو ئایدیۆلۆگییە: نرخاندنەکانی ئایدیۆلۆگییەکە یان گریمانەی دیمانەکیی ناو ئایدیۆلۆگییەکە (گریمانەی هەڵکەوت). گەر بە قووڵیش سەیر بکرێ لەوانەیە وەک زرەگوتوبێژێک ڕانوێنێ. دەشێ بگوترێ لیبەڕالیزم تاکەکەس دەکاتە شامەبەست بەڵام کۆنەوارەتی و سۆسیالیزم کۆی جۆراوجۆر (وەک دەوڵەت و چین ...هتد) دەکەنە شامەبەست. بەڵام ناشێ بگوترێ بەم خاڵە و بە چەندین خاڵی دیکەی سەر بە نرخاندنە بنەڕەتییەکانی ئەو ئایدیۆلۆگیانە، خەسڵەتی هەڵاوێری ئایدیۆلۆگییەکان دیاری دەکرێن. تاکەکیەتیی لیبرالیزم تەنیا ئەوە نییە تاکەکەس دەنرخێنێ، بگرە چەندین گریمانەی دیمانەکین دەربارەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی سەر بە بایۆلۆگی و کۆمەڵایەتی. ئەم تاکەکیەتییە لە دیمانەی سەر بە بایۆلۆگی و ئابووری و سایکۆلۆگیدا پشتیوانی بۆ بۆچوونەکانی خۆی، دەربارەی فراژووتنی مێژووکردی مرۆڤ، دەدۆزێتەوە.

بەڵام ئەگەر چەند نرخاندنێکی بنەڕەتی، لیبراڵەکانی بەرەو سەلماندنی جۆرە دیمانەیەک ببردایە و کۆنەوارەتی بەرەو جۆرێکی دیکە، ئەوسا مەسەلەکە جودا دەبوو. ئەم مەسەلەیە دەچێتەوە سەر دۆزێکی دیکەی گەورەتر، ئەویش ڕەگداکوتانی ئایدیۆلۆگییەکانە لە نێو

چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگەدا. لیبەڕالیزم، تارادەیەک، لە نێو چینی بورژوادا پتەوە، کۆنەوارەتی لە نێو بەگزادە و کەشیش و جووتیارانی زەویداردا پتر بڵاودەبێتەوە، واتە لە نێو ئەوانەی پێیان وایە فراژووتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەڕەشە لە پلەوپایەیان دەکات. لەبەر ئەوە ئاشکرایە کە هەلومەرجی چینایەتی کار دەکاتە سەر هەڵوێست لە دیمانە و گریمانەی دیمانەکی. بەڵام ئەم پێوەندییە خاڵی نییە لە نموونەی ڕیزپەڕ و ناشبێ ببێتە هۆی ئەوەی ئایدیۆلۆگییەکان بە ڕەنگدانەوەیەکی ساکاری چەند بەرژەوەندێکی دیاریکراوی چینایەتیی دابنرێن. ناشبێت وەهای لێک بدەینەوە کە ئەو بیریارانەی ئەم ئایدیۆلۆگیانەیان بەو هەموو ئاڵۆزییەوە داڕشتووە تەنیا پێوەندیی چینایەتیی خۆیان دەربڕیوە و بەس. پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە ئایە ئایدیۆلۆگییەکان لە ڕاستیدا چ ئەرکێکیان دەبێ واتە تا چ ڕادەیەک سوودیان بۆ ئەم یان ئەو چینەی کۆمەڵ دەبێ.

## ٢- هێگل و کۆنەوارەتی

یەکەم نوێنەری کۆنەوارەتیی هاوچەرخ Edmund Burke (١٧٢٩-١٧٩٧) ی ئینگلیزە و لە *Reflections on the Revolution in France* (١٧٩٠) دا بیروڕای وەهای نووسیوەتەوە کە لە کۆنەوارەتی سەدەی نۆزدەیەمدا برەویان دەبێت. ئەمەش بەر لە هەر شتێک ئەو بۆچوونەی Burke دەگرێتەوە کە دەربارەی فراژووتنی سیاسییە. Burke پێی وایە شۆڕشێکی وەک ئەوەی فرانسە تەنیا ئاژاوڵە و نائازادییەکی نوێی لێ دەزێت، چونکە مومکین نییە بە یەکجار بنگە سیاسییەکانی نەتەوەیەک بگۆردرێت. لە هەموو گۆڕانکارییەکدا دەبێ نەرێت و ڕابوردووی نەتەوەکە ڕەچاو بگیرێ. فراژووتنی نەتەوە کارێکی زیندەڵە، واتە هەنگاو بە هەنگاو و بەردەوامە. بە نۆڕینی Burke، فراژووتنی ئینگلیزیی پاش شۆڕشی ١٦٨٨، باشترین نموونەیە بۆ فراژووتنی چاک و زیندەڵی لەو بابەتە.

نەتەوە، نەرێت، یەکگرتنی زیندەڵ، وێڕای ئەوانەش فراژووتن – ئەمانە چەمکی نێوەندەکین لە کۆنەوارەتیی هاوچەرخدا.

لای هێگل Gorg Wilhelm Friedrich Hegel (١٧٧٠-١٨٣١) ئەم چەمکانە تێهەڵکێشی ڕشتەیەکی فەلسەفی گشتلا دەکرێن. هێگل یەکێکە لە فەیلەسووفە هەرە سەختنووسەکانی هەموو دنیا. دیمانەی سیاسی – یان خۆی گوتەنی «فەلسەفەی ماف» – تەنیا بەشێکی بچووکی بواری هێگلە. مەودای نووسینەکانی هێگل، فەلسەفەی سروشتەکی، فەلسەفەی

مێژوویەکی، فەلسەفەی دینەکی و زانستی جوانی aesthetics یش دەگرێتەوە. هێگل بۆ خۆی ئەو بڕیارەی دابوو کە هەموو زانستێکی مرۆڤایەتی تێهەڵکێشی ڕشتە فەلسەفییەکەی خۆی بکات. هێگل پێی وایە هەموو زانیار، بەو مێتۆدەی خۆی دایناوە، ڕوون دەکرێنەوە و ڕاڤە دەدرێن. ئەو مێتۆدە پێی دەگوترێ ***مێتۆدی دیالەکتیکی***، هێگل بۆ خۆی پێی دەڵێ «لۆگیک»، مەبەستیشی لەو زاراوەیە تەواو جیاواز بوو لەوەی ئێمە پێی دەڵێین «لۆگیک». هێگل پێی وابوو لۆگیکەکەی خۆی دەتوانێ بەسەر ئەو لۆگیکە نەریتییەی ئەریستۆ دایهێناوە، زاڵ بێت و جێگەشی بگرێتەوە. هێگل پێی وابوو خۆی ئەریستۆی زەمانی نوێیە و وەک ئەریستۆ هەموو زانستێکی زەمانی خۆی تێهەڵکێشی ڕشتەیەکی سەرلەبەر کردووە. دەشێ هێگل، بۆ زەمانی پاش خۆی، لەم خاڵەدا سنگدەرپەڕێن ڕانوێنێ، بەڵام لە نێو هاوزەمانەکانی خۆیدا، ئەو داخوازییانەی هێگل سەنگیان هەبوو.

دیمانەی سیاسی، لە ڕشتەکەی هێگلدا بەشێکی بچووک بەڵام گرنگ پێک دێنێ. مەرجێکی بنەڕەتیی فیکری هێگل ئەوەیە کە هەموو بوارەکانی زانیار ساختاری وێکچوویان هەیە. واتە دەکرێ زاراوەی بوارێک بۆ ڕاڤە دانی بوارێکی دیکە بەکار بێت. کاتێ هێگل باس لە دۆزی سیاسی دەکات، زاراوەی سەر بە بایۆلۆگیی وەک ئۆرگانیزم، گەشە کردن و گۆڵ کردن بەکار دێنێ، یان شاوشەی وەک تێگەیشتن و هۆش لە دیمانەی زانیار و سایکۆلۆگییەوە دەهێنێت. سیاسەت یەکڕەوانە دەخرێتە ژێر فەرمانی ڕوانگەیەکی سەرلەبەری سروشتبەدەرایەتی کە بۆخۆی هەڵیناوە. بەو جۆرە هێگل لە تێکبەستەی جۆراوجۆردا باس لە گیان دەکات: گیانی جیهان، گیانی گەل و هتد. هەڵبەتە ئەم جۆرە زمانە ڕووی لە لایەنی دینەکیشە.

بێگومان هۆیەکی گرنگی ئەم سەختنووسییە بەناوبانگەی هێگل دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاژاوەی زاراوەیە. بەڵام نارەوایەتییەکی گەورە دەکەین ئەگەر وەهای دابنێین کە هێگل شۆڕەسوارێکی وشەوازی بووە و بۆشاییی فیکریی لە پشت پەردەی زاراوەی هەمەلاوە شاردۆتەوە. ڕشتەکەی هێگل لەسەر ژمارەیەکی سەرسوڕهێنەر لە زانیاری دروست و ڕاستۆک بنیات ناوە، کە هەر هەموویان بە جۆرێکی بلیمەتانە و سەرسەختانە تێهەڵکێشی ڕوانگەیەکی سەرلەبەر کراون. بۆ ئەوەی لە فیکری هێگل بگەین دەبێ ئەو زانیارە ڕاستۆک و دروستانە ڕەچاو بگرین. دیمانە سیاسییەکەی هێگل بوارێکی زێدە بەخشەندە ئاواڵە دەکات. خولی مێژوو دەکاتە دەراو، بەڵام لە ئیدیال و پێشنیازەکانیدا، هێگل خۆی لە هەلکەوتە سیاسییەکانی زەمانی خۆی دوور ناخاتەوە. شۆڕشی فرانسی، حوکومڕانیی ناپۆلیۆن و فراژووتنی دەوڵەتی پروسی لە ساڵانی زووی سەدەی هەژدەیەمدا، گرنگترین بنەمای ئەم بوارەن لای هێگل.

بواری دیمانەی سیاسی، یەکێکە لەو بوارانەی هێگل تێیدا یەکجار کاریگەر بووە (نموونەی بوارەکانی دیکە سروشتبەدەری ڕەها و فەلسەفەی دینەکین). هەموو کۆنەوارەتییەکی درەنگ، کەموزۆر، پێوەندی هێگلە. بەڵام کاریگەریی هێگل لەوەش زیاترە. مێژوونۆڕیی مەتێریالیستانەی مارکسیانە، یەکێک لە مەرجەکانی لە فەلسەفەی هێگلدایە. فەلسەفەی هێگل، تەنانەت بۆ ڕاستڕەوی پەڕگیریش، تینی هەبوو. ئایدیۆلیجیستە فاشیست و نازیستەکان، ئەوانەی نەک ڕەگەز بەڵکوو مەزنایەتیی دەوڵەتیان لە باوەڕی خۆیاندا کردووەتە شامەبەست، خۆش خۆش گوتەکانی هێگل دووبارە دەکەنەوە - بە مەزن دانانی ڕەگەز باسێک بوو هێگل لێی نامۆ بوو.

لە ڕۆژگاری پاش مەرگی هێگلەوە، مشتومڕ زۆر بوو لەسەر ئەوەی ئایە هێگل بەڕاستی تەنیا کۆنەوار بووە یان ئەو پەسنەی ئەو لەو حوکومڕانییە کۆنەوار و نێوەندەکییەی پرۆسیای دەکات تەنیا کارێکی ناچارییە لە پرۆفیسۆرێکی بەرلینەوە بۆ حکوومەتێکی ئەمی بەخێو دەکرد. ئاشکرایە کە هێگل بۆخۆی هیچ ناجۆرییەکی لە نێوان دیمانەکەی خۆی و پەسن کردنی پرۆسیادا نەدیوە، بەڵام ئەوەش هەر ئاشکرایە کە مەیلی سیاسیی هێگل لەگەڵ ڕێگوزەری زەمانەدا گۆڕا، هێگل لە دواساڵانی تەمەنیدا بوو بە کۆنەوار.

هێگل، وەک زۆربەی بیرکارانی ئەڵمانیی هاوزەمانی خۆی، خۆشامەدی لە شۆڕشی فرانسە کردووە. دروشمەکانی شۆڕشەکە کە دەربارەی هۆش و ڕزگاری بوون، بەدڵی هێگل بوون. پاشان بڕوای بەوە هێنا کە حوکومڕانیی ناپۆلیۆن نموونەی قۆناخێکی ئایەتی و گرنگە لە فراژووتنی مرۆڤایەتیدا. سەرگورشتەی هێگل بۆمان دەگێڕنەوە کە هێگل دیباچە پەنجا لاپەڕەکەی، کە لەوانەیە گرنگترین تێکستی هێگل بێت و بۆ ***فینۆمینۆلۆگیی گیان،*** یان ***شێوەی خۆیابوونی گیان،*** (*Phänomenologie des Geistes* ۱۸۰۷) داناوە، لەو کاتەدا نووسیویەتی کە ناپۆلیۆن لە Jena - ئەو شارەی هێگل ئەو دەمە لێی دەژیا - یەکێک لە سەرکەوتنە هەرە گەورەکانی خۆی وەدەست هێنا. ناپۆلیۆن بەلای هێگلەوە بووبوو بە یەکێک لە شێوەکانی خۆیابوونی گیانی جیهان، گوایە گیانی جیهان، لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، لە ناپۆلیۆندا بەرجەستە بووە.

هێگل هەرگیز لای نەدا لەو ڕشتە فەلسەفییەی خۆی لە ***فینۆمینۆلۆگیی گیان*** دا بناخەی بۆ ڕشتبوو. بەڵام ئەو لایەنەی هێگل لە ڕووی سیاسییەوە هۆگری دەبوو، دەگۆڕا: پاش کەوتنی ناپۆلیۆن، پرۆسیای بە بەرزترین شێوەی خویا بوونی گیان، لەسەر زەوی، دادەنا. هێگل بۆخۆی پرۆسی نەبوو بەڵام ناسیۆنالیزمی پرۆسی، کە پاش هەژەندی تێکشکانی بەرانبەر ناپۆلیۆن خێرا بەرەو ڕاهێزان فراژووت، کاری لە هێگل کردبوو.

لەوانەیە ناسیۆنالیزمی هێگل نایەکرەو ڕانوێنێ: پروسیا بوو بە پاشافەرمانییەکی نەریتەکی، دینیش – مەسیحایەتیی لوتەری – ئەرکی کۆمەڵگەپارێزی خۆی پاراست. بەڵام لە بواری دیکەدا ڕوویەکی هاوچەرخی بەرهەستی هەبوو. دەوڵەتی ناپۆلیۆن، لە زۆر ڕووەوە، یەکەم دەوڵەت بوو بەڕاستی هاوچەرخ بێت. فێرکاری و هەموو بواری بیرکاری ڕاستەوخۆ خرانە ژێر فەرمانی دەسەڵاتی بەرزی دەوڵەتەوە. بە هۆی ڕشتەی پۆلیسەوە، چاودێری کردنی هاوزێدان ئاسان بوو. ئەرتەش بوو بە ئەرتەشی سەربازگری نەک ئەرتەشی پیشەکیی ئیمتیازدار. پروسیا پەرەی دا بە بەشێکی ئەو لایەنانەی فرانسەی ناپۆلیۆن. خەریک بوونی دەوڵەت بە ڕشتەی فێرکارییەوە و بەتایبەتی بە زانستگەکەی بەرلینەوە، بایەخێکی تایبەتی هەبوو لای هێگل و بیرکارانی دیکە. پروسیا دەوڵەتی هۆش بوو. بەگشتیش هێگل پێی وابوو کە ئەو تێکەڵ کردنە تایبەتییە لە نێوان کۆنباو و هاوچەرخکاریدا بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە پروسیا نوێنەری تێکەڵێکی بەرزی نەریت و نوێکارییە.

دەیسا بابزانین ئەم فیکرە چی پێیە.

### ٣- دەوڵەت و مێژوو

*Grundlinien der Philosophie des Rechts* (*شارێی فەلسەفەی ماف، ١٨٢١*) گرنگترین بەرهەمی هێگلە لە بواری دیمانەی سیاسیدا. بەڵام بەرهەمەکانی دیکەشی لەم بوارەدا هەر نرخدارن، بۆ نموونە وانەکانی لە فەلسەفەی مێژوویەکی و مێژووی فەلسەفە و ئەو بەرهەمەی باسمان کرد: ***فینۆمینۆلۆگیی گیان*** و *Enzyklopädie der philosophischen Wissenschaften* (*زانیارستانی زانستە فەلسەفییەکان، ١٨١٧*).

لە فەلسەفەی هێگلدا چەمکی فراژووتن، نێوەندەکییە. هێگل خۆیش یەکێکە لە نوێنەرە هەرە گرنگەکانی فیکری فراژووتن، کە نۆرەیەکی نێوەندەکی لە هەموو سەدەی نۆزدەیەمدا هەبوو.

هێگل دەڵێ هەموو فراژووتنێک، فراژووتنێکی گیانەکییە، یان چاکترە بڵێین ***فراژووتنی گیانە*** (هێگل لێرەدا وشەی خودا بەکار ناهێنێت، چونکە خودا وشەیەکە سەر بە بواری دینە نەک فەلسەفە). هەرچی ئێمە بتوانین زانیارێکی دەربارەوە پەیدا بکەین لە ئەنجامدا هەر گیان ئافراندوویەتی. مەبەست لەمەش ئەوە نییە کە، بۆ نموونە، بابەتی مایەکی

بوونێکی ڕاستینەیان نابێ. هێگل خۆی وەها ڕوون دەکاتەوە: گیانی پاک یان گیانی ڕەها بنجی هەموو شتێکە بەڵام ئەم گیانی ڕەهایە بەو «لۆگیک» ـەی فراژووتنی ڕاستینە و فیکریش دەبات بەڕێوە، «بەرپوەتەوە» بۆ دژوەستاوی خۆی، کە دەکاتەوە سروشتی ڕەها (سروشتی نازیندەل، سروشتی مردوو). دژوەستان لە نێوان گیانی ڕەها و سروشتی پاک، پاڵ بە فراژووتنەوە دەنێن بەرەو بابەتی بەرزتر و ئاڵۆزتر: ڕووەک، گیانەوەر و لە کۆتاشدا مرۆڤ، کە جیاوازیی لەگەڵ بوونەوەری دیکەدا ئەوەیە مرۆڤ خۆئاگا self-consciousness ی هەیە.

بەڵام هێگل وەک داروین Darwin ی پاش خۆی نییە، هێگل باوەڕی بەوە نییا ئەم فراژووتنە گرێدراوی کات بێت، بەو مانایەی بوونەوەری ژینەوەر، لە سەرەتاوە لە مایەی مردووەوە پەیدا بووبێت و پاشان وردەوردە بەرەو جۆری ئاڵۆزتر هەڵکشابێت. هێگل دەڵێ، تانیا مرۆڤایەتییە خاوەن مێژووە. «گۆڕانکاریی نێو سروشت، با ئەوەدیویش بن، تەنیا خولن و بەردەوام خۆیان فرەپات دەکەنەوە، لە سروشتدا هیچی نوێ لە ژێر خۆردا پەیدا نابێ». گزساران بەردەوام لە هەمان خولگەدا دەبزوێن. هەمان ڕووەکجۆر و گیانەوەرجۆر هەمیشە هەر هەبوون. تەنیا مرۆڤە «توانای گۆڕانی هەیە، گۆڕانێکی بەرەو باشتر، بەرەو پتر ڕەسین».

هۆی ئەمەش ئەوەیە مرۆڤ ئاگا consciousness ی هەیە. دەستووری گیانەکی یان هۆشەکی بڕیاری فراژووتنی ئۆرگانیزمی تاک دەدات. بەڵام ئۆرگانیزمەکە خۆی ئاگای نییە. هەرچی مرۆڤە ئەوا خاوەنی بیر و ڕامان و تەگبیری خۆیەتی. مرۆڤ بۆخۆی گیانەکییە. سروشتی دیکە بێسەرپێچی دوای ویستی گیان کەوتوون بەڵام مرۆڤ سەرپێچی دەکات. لەبەر ئەوەشە مێژووی مرۆڤایەتی یەکجار ئاژاوڵە. لە لایەک گیان پلانی خۆی هەیە بۆ مرۆڤایەتی و لە لایەکی دیکەوە ئادەمیزادان پلان و بۆچوونی خۆیان هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا مێژوویەکی، بە پێوانەی هێگل، ڕاستینە دەکاتەوە فراژووتنێکی ڕاستینەی بەرەو باشتر و بەرزتر. هێگل باس لە زۆرزانی گیان یان هۆش دەکات، مەبەستیشی ئەوەیە گیان، خەلک و نەتەوە، بەکار دەهێنێت بۆ ئامانجی خۆی - کە دەکاتەوە پێشخستنی مرۆڤایەتی - ئەگەرچی خەلک و نەتەوە ئاگادارانە ئامانجی تەواو جیاوازیشیان گرتبێتە بەر.

هێگل بەهیچ جۆرێک بە گەشبینیایەتییەکی ڕووناک و ساکاری فراژووتندا هەڵنادات. ئامانجی مێژوو بریتییە لە سەرلەبەری هۆشمەندی یان گیانی مرۆڤ - یان وەک هێگل خۆش خۆش دەڵێ - ئازادیی مرۆڤ. بەڵام ڕێگەی ئەو ئامانجە پڕە لە پەژارە و شەڕ و

هەژەند. بێ ئەو تێگەیشتنە فەلسەفییەی، کە هێگل پێی وایە خۆی هەیەتی، مێژوو وەک زنجیرەیەک ڕێکەوت و درندەکاریی بێهودە ڕادەنوێنێ.

لەبەر ئەوەیە کە ناکرێ، تەنیا بە دیراسەتی ئەوەی لە هەلکەوتدا ڕوویداوە، لە تێکبەستنی مێژوو بگەین. ئەوەی نەزانێت ئامانجی مێژوو چییە، ناشتوانێت تێبگات چییە ئەوەی مێژوو بەرەو پێشەوە دەبات. ئەوەی چەمکە فەلسەفییەکانی دەولەت نەناسێت، ناشتوانێ بزانێت کامە حوکومڕانی ڕووەوپێشە و کامە وەها نییە. ئەوەی تەنیا لەوە بگەڕێت دەولەتان لە هەلکەوتدا چۆن دروست بوون، یەکجار کەم لەوە تێدەگات دەولەت چییە.

کاتێک هێگل باس لە پێویستیی دەولەت دەکات، لەوانەیە وەها ڕانوێنێ هێگل مەبەستی ئەوە بێت مرۆڤگەل بەر لە دەولەتسازی لە دۆخی سروشتەکیدا ژیابن. بەلام هێگل مەبەستی ئەوە نییە دۆخی سروشتەکیی ڕاستینە بەرجەستە بکات، بەلکوو دەیەوەێ پێشانی بدات نەبوونی دەولەت چی بە دەمەوەیە. لە فەلسەفەی مافدا هێگل دەلێ:

«بیرۆکەی دەولەت هیچ پێوەندییەکی نییە لەگەل بنجی **مێژووییەکی** دەولەت، پەیوەستی بنجی یەکەیەکەی دەولەتان نییە -واتە: مەبەست لە بنجی دەولەت ئەوەیە ئایە بنجی دەولەتەکە لە کوێوە سەری هەلداوە، لە هەلومەرجێکی پاتریارکیەوە یان لە ترس و باوەڕەوە یان لە ئەنجوومەنەوە... هتد. بیرۆکەی دەولەت پەیوەند نییە بەوەی ئایە دەولەت لە سەرەتاوە لە ئاگادا وەک مافێکی خوداکرد، مافێکی دانانەکی، یان وەک پەیمانێک، یان وەک بەرهەمێکی نەرێت سەری هەلداوە».

کەواتە هێگل بە توندی ڕیزێک کێس ڕەت دەکاتەوە، ئەو کێشانە نۆرەیەکی سەرەکییان لە فیکری سیاسیی سەدەی هەژدەیەمدا هەبوو و لە بەشێکی فرەوانی گوتوبێژەکانی سەردەمی خۆیشیدا ڕەنگیان دابۆوە.

هێگل بڕوای وایە بۆچوونمان دەربارەی ئەزەل هەر چۆنێک بێت، شتێک ناگۆڕێت لەوەی ژیانی مرۆڤی تاکەکەس هەمیشە خەباتێکی بێبزە بووە. مرۆڤ بەو خۆئاگایەی هەیەتی دەبێ خەبات بکات بۆ ئەوەی هەم زال بێت بەسەر سروشتدا و هەم لە لایەن خەلکی دیکەوە لێی بسەلمێنرێت. لە خەباتی مەرگ و ژیندا لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤدا - بۆ نموونە لە دەمی شەڕدا - مرۆڤ داوای لێ سەلماندن لە دوژمنەکەی دەکات. بەلام ئەو لێ سەلماندنە تەنیا بە مردنی بەرانبەرەکەی دێتە دی. ئەگەر ئاگای مرۆڤ لەو شەڕەی زیاتر تێدا نەبایە، ئەوسا هیچ فراژووتنێک مومکین نەدەبوو. مومکین بوونەکە تەنیا بەوە دەبێت کە لایەنێک ئەوەی دیکە بە *ئاغا* بسەلمێنێت و بۆخۆشی بچێتە بەرگی **نۆکەرەوە** (خزمەتکار یان کۆیلە). نۆکەر

ئاغا دەسەلمێنێ بەلام ئاغا نۆکەر ناسەلمێنێ. هێگل لە هەموو ڕێگوزەری مێژوودا ئەم پێوەندییەی ئاغا – نۆکەرە دەبینێ بێ ئەوەی سەرنج بداتە جۆرە جوداکانی ناکۆکیی چینایەتی. وادیارە هێگل پێی وایە پێوەندیی ئاغا-نۆکەر، بۆ فراژووتنی مرۆڤایەتی پێویستە و ناشلێ ئەم پێوەندییە *لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە* دەشێ نەمێنێت. لەگەل ئەوەشدا پێوەندییەکی ناجۆرە، ئاغا بۆخۆی ناتوانێ کردەوەیەک بنوێنێ بەلکوو لە ڕێی نۆکەرەکەیەوە دەیکات، نۆکەریش تەنیا ئامرازێکە بە دەست ئاغاکەیەوە. هیچ لایەکیان بە فراژووتنی هەمەکی universal ناگەن، کە بەلای هێگل – و بەلای هاوزەمانەکانی خۆی لە ئایدیالیست و پەیڕەوانی ڕۆمانتیک – ـەوە ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ لە یەک کاتدا هەم بیری هەیە و هەم کردەوە.

ناکۆکیی نێوان ئاغا و نۆکەر تەنیا لە ڕێیەکی سیاسییەوە لە ناو دەبرێ، واتە بە *دەولەت*. بەوە هێگل شاچەمکێکی کۆنەوارەتی دەردەبڕێ: جیاوازیی چینایەتی پێویستە بۆ پێشڕەوتی بەلام لە دەولەتی چەسپاودا دەکرێ چینەکان بە هاوئاهەنگی هەلبکەن.

هێگل بڕوای وایە دەولەت فراژووتنێکی مێژووکرد دەکات بەرەو ئازادی و هاوئاهەنگییەکی فرەوانتر. بەلام ئەم فراژووتنە بەردەوام نییە و هەموو دەولەتسازییەکیش ناگرێتەوە. تەنیا چەند دەولەتێک – و تەنیا چەند ڕێبەرێکی دەولەت – وەک بلێی فەرمانی گیانیان پێیە کە قۆناخی نوێ لە فراژووتنی دەولەت و، لەویشەوە هی مرۆڤایەتی، دەست پێ بکەن.

لێرەدا مەودای ئەوە نییە باسی نۆرینە ئالۆزەکانی هێگل بکەین دەربارەی ئەوەی کامە «گیانی گەل» لە کاتی جۆراوجۆردا فراژووتنی بەرەو پێش هاژواوە. بێگومان یۆنان و ڕۆما بەشێکن لەوان، ئەلمانیای جێرمان و پرۆتێستانتیش هەر لەوانن. فرانسەی سەردەمی شۆڕش و سەردەمی ناپۆلیۆن بووە هەلگری بیرۆکەکانی گیانی جیهان. پاش کەوتنی ناپۆلیۆن، پروسیا، ئەو نۆرەیەی گرتە خۆ.

ئەوجا بابزانین، بەلای هێگلەوە، دەولەت چۆن بەسەر جیاوازی و ناکۆکیی کۆمەلایەتیدا زال دەبێ.

## ٤- دەوڵەت و کۆمەڵگەی بورژوا

هێگڵ زاراوەی *کۆمەڵگەی بۆرژوا* لە ڕوسۆوە وەردەگرێ. لە کۆمەڵگەی بۆرژوادا چار نییە هەر دەبێ خەڵک وەک تاکەکەس بێنە پێش، چونکە وەک تاکەکەس بژێو و پێداویستییەکانی دیکەی ژیانی خۆیان پەیدا دەکەن. بە نۆڕینی هێگل، کۆمەڵگەی بۆرژوا «کۆمەڵگەی پێداویستی» یە.

کەواتە کۆمەڵگەی بۆرژوا نیشانەیەک نییە بۆ سەردەمێکی مێژووکرد، بەڵکوو هەمیشە هەبووە و هەر دەشمێنێ، بەڵام پلەی فراژووتنی و پێوەندیی ئەو کۆمەڵگەیە بە دەوڵەتەوە، لە گۆڕاندایە.

ئەگەرچی هێگل فراژووتنی مایەکی و ئابووری لە چاو فراژووتنی گیانەکی و سیاسیدا بە لاوەکی دادەنێت، بەڵام لە سەنگی ئەو فراژووتنە بێئاگا نییە. بێگومان هێگل تەواو هۆگری بنەماکانی ئابووریی سیاسیی کلاسیکە و ئەو بنەمایانە، لە تێڕوانینی هێگلدا دەربارەی کۆمەڵگەی بۆرژوا، ڕەنگی داوەتەوە. لەسەر ڕێچکەی ئادەم سمیت، ئەمیش ئاماژە بۆ گرنگیی دابەشینی کار و فراژووتنی تەکنیکی دەکات. بەگشتیش پێی وایە فراژووتنی تەکنیکی و ئابووری نیشانەیەکی هەوڵدانی مرۆڤە بەرەو زاڵ بوون بەسەر سروشتدا و نیشانەیەکە بۆ سەلماندنی ئەوەی مرۆڤ بوونەوەرێکی گیانەکی و ئاگادارە. ڕاستە مرۆڤ بەرهەستترین زاڵبوونی خۆی لە ڕێی زانیاری دیمانەکی ڕەهای خۆیەوە دەربارەی سروشت (واتە لە ڕێی زانستەوە) دەسەلمێنێ، بەڵام مرۆڤ سەردەستیی خۆی بەوە دەچەسپێنێ کە چەند شێوازێکی بە سروشت نامۆ بەسەر سروشتدا دەسەپێنێ (واتە لە ڕێی تەکنەلۆگییەوە).

ئەم فراژووتنە ئابووری و تەکنیکییە لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی بۆرژوادا دێتە کایەوە. بەڵام ناکۆکی لەو کۆمەڵگەیەدا لەناو ناچێت. لەوێدا خەڵک وەک تاکەکەس خۆ دەنوێنن، تاکەکەسانیش سەرگەرمی هاوچاوییەکی ناوەکیی بێوچانن. هێگل دەزانێ ئەم هاوچاوییە تیژبۆتەوە بەڵام ئەم، بە پێچەوانەی ئادەم سمیت و لیبەڕالەکان، پێی وانییە ئەو تیژبوونەوەیە نیشانەیەکە بۆ سەرکەوتنی هۆش. ڕاستە بازاڕی ئازاد دەبێتە هاندەرێک بۆ فراژووتنێکی ئابووریی پەتی، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دۆخەکە خۆی هۆشنەیارە.

هێگل لە شیکارییە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیدا، چەمکە کۆنەکەی بەرە دەکات بە دەراو – بیریارانی کۆنەواری سەدەی نۆزدەیەم بە گشتی بە پێچەوانەی لیبەڕال و سۆسیالیستەکان باس لە بەرە دەکەن نەک چین. ئاشکرایە کە چەمکی چین لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا

جێی دەبێتەوە و چەمکی بەرە لە دنیای سەر بە سیاسەت و دەستوورناسیدا خاوەن ماڵە. بەڵام بەرە بە نۆڕینی هێگل ئەو واتا نەرێتەکییەی نییە. هێگل ئەو بەرەیەی زەویدارە و بوونی گرێدراوە بە بەرهەمی زەوییەوە، جودا دەکاتەوە لەو بەرەیەی سەرگەرمی چاک کردن و دابەش کردنی بەرهەمی هەمەجۆرە و بوونی تەنیا بە کاری خۆیەوە گرێ دراوە. بەرەی سێیەم، *بەرەی گشتییە*، کە لە بری بەرژەوەندی خۆی خزمەتی بەرژەوەندی گشتی دەکات. بەرەی گشتی وەک پاسەوانەکانی نێو بەرزەدەوڵەتی ئەفلاتوون - دەبێ لە خەمی دنیایەکی ڕەهابن. بە بۆچوونی هێگل، ئەندامانی ئەم بەرەیە بەوە بێخەم دەبن خۆیان سامانێکی باشیان هەبێت یان دەوڵەت، کە سوود لە چالاکیی ئەوان وەردەگرێت، گوزەرانێکی وەهایان بۆ بڕەخسێنێ لە ڕووی ئابوورییەوە بێخەمیان بکات.

بەرەی دووەم، *بەرەی کاسبکاران*، دابەش دەبێت بەسەر: بەرەی پیشەی دەستەکی، کە تاکەکەسێک شتومەک بۆ یەکەیەکەی داواکاران دروست دەکات. بەرەی فابریک کە کارێکی «ئەبستراکت» - واتە دیارینەکراو - بە ژمارەیەکی زۆر دروست دەکات. بەرەی بازرگانی شتومەک ئاڵوگۆڕ دەکات «بە پلەی یەکەم بە پارە، کە دەستاوێژێکی گشتیی ئاڵوگۆڕ کردنە و نرخی هەموو بەرهەمێکی ئەبستراکت دیاری دەکات».

هەڵبەتە بەرەی گشتییە لە بواری سیاسیدا دەسترۆیە و لەبەر ئەوە دەشێ ناویان بنرێ بەرەی دەوڵەتگێڕ. ئەندامانی بەرەی دیکە، لە گوزەرانی خۆیاندا پێوەندی بەرژەوەندی کەسەکیی خۆیانن. دەشێ خێری ئەمیان بۆ ئەویان شەڕ بێت، سوودی ئەمیان بۆ دەوڵەت زیان بێت. ئەوەش ئەرکی بەرەی گشتییە کە ئەو خەباتە بێبزەیەی بەرژەوەندی کەسەکی سنووربەست بکات و ڕێکی بخات و کارێکی وەها بکات کاسبکاران بە شێوەیەکی هۆشمەندانە ئەو کارەی خۆیان جێبەجێ بکەن، واتە بە شێوەیەکی وەها ڕێ بدات بە هەموو کەس لە پێداویستییەکانی ژیان ئەو بەشەی بەر بکەوێت کە بە ئەندازەی پلەی کۆمەڵایەتی خۆی پێی ڕەوایە. ڕاستە کاسبکاران وەک ئەوەی لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە ئەندامی کۆمەڵگەن مافی خۆیانە خەبات بۆ بەرژەوەندی خۆیان بکەن، بەڵام وەک هاوزێدی دەوڵەتێکی چاک دەبێ بەرژەوەندی دەوڵەت بخەنە پێش بەرژەوەندی تاکەکەسەوە.

بەم جۆرە هێگل سێ بنەمای فیکری گرنگی کۆنەوارەتی دەردەبڕێ:

١) سیاسەت دەبێ سەردەست نەک ژێردەستی پێوەندارییەتیی ئابووری و کۆمەلایەتی بێت، بۆ مەبەستی پێشکەوتن، فراژووتنی سیاسی لە فراژووتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی گرنگترە.

٢) تەنیا بە دەوڵەتی خاوەن سازمانی چەسپیو و تەنیا بە یارمەتی دەوڵەت دەکرێ خەباتی نێوان چینەکانی کۆمەڵ و خەباتی نێوان ئەندامانی یەک چین بکرێنە پێشبڕکێیەکی هۆشەکی و هاوئاهەنگی وەها کە خزمەتی تەژەند و ڕاهێزانی نەتەوە بکات.
٣) دەوڵەت تەنیا بەوە دەبێتە دەوڵەتێکی باش و هاوئاهەنگ، کە «بەرەی گشتی» ی هەبێت، واتە گرووپێک هاوزێدان کە بەرژەوەندی دەوڵەت نەک بەرژەوەندی خۆیان ڕەچاو بگرن.

هێگل پێشکات ژیا، یان با بڵێین لە ژینگەیەکدا ژیا لە ڕووی ئابوورییەوە هێندە دواکەوتوو بوو دەرفەتی نەبێ لە باسی نۆرەی دەوڵەت بدوێ لە چارەسەر کردنی کێشەی ئەو هەژارییەی بووە زادەی فراژووتنی ئابووری و پیشەسازی. ئەم باسە لە کۆنەوارەتیی درەنگی سەدەی نۆزدەیەمدا بوو بە باسێکی سەرەکی. هێگل لەم باسەدا بە شێوەیەکی گشتگر و لاواز دێتە گۆ، بەلام کۆنەوارەتیی جڤاکی social conservatism ی درەنگتر داوای سیاسەتی خۆشگوزەرانی دەکات، کە دەبێ گوزەرانێکی لەبار بۆ هەموو هاوزێدێک دەستەبەر بکات. لە هەژاری و پرۆلیتاراندن گشتیدا هێزێکی ترسناکی کۆمەڵگەڕمێن و دەوڵەتڕمێن سەر هەڵدەدات، لەو کاتەشدایە ئاپۆرەی کرێکاران ڕوو دەکەنە سۆسیالیزم.
لە بری ئەوە، هێگل پتر سەرنج دەداتە خەسڵەتی سیاسی و دەستوورییەکانی دەوڵەت: هێگل ڕاوێژێک لەسەر چەمکی «خواستی گشتی» ی هەمەڕووی ڕوسۆ دەکات. بە نۆڕینی هێگل، ڕوسۆ باشی بۆ چووە کە خواستی گشتی کردووە بە مەزنایەتییەکی بان-تاکەکی. بەلام پێشی وایە ڕوسۆ بە باوەڕی سەر بە پەیمانی جڤاکی وەهای کردووە خواستی گشتی پێوەند بێت بە خواستی تاکەکەسەوە، چونکە تاکەکەسان لە ڕێی ئەو پەیمانەوە خواستی گشتییان سەلماندووە. هێگل بەم جۆرە بەرپەرچی ڕوسۆ دەداتەوە:
«خواستی گشتی (یان بابەتەکی objective) خۆی چەمکێکی هۆشەکییە، بێ ئەوەی پێوەند بێت بەوەی ئایە تاکەکەس وەهای بۆ دەچێت یان نا. ئێمە دەبێت لەبیرمان بێت کە دژوەستاوی خواستی بابەتەکی، واتە بیر و خواستی تاکەکەس، تەنیا خاوەنی یەک دیوە و لەبەر ئەوە خاوەنی یەک دیوی بیر و خواستی هۆشەکییە...».

ئاشکرایە کە هێگل و ڕوسۆ وشەی «گشتی» و «بابەتەکی» بە واتای جیاواز بەکار دێنن. «بابەتەکی» دەشێ لە لایەک بە «نێوزاتەکی inter subjective» لێک بدرێتەوە، بە واتای ئەوەی تاکەکەس (زات subject) ی جۆراوجۆر بە متمانەیەکی تایبەتی لەسەری ڕێک دەکەون، بە گشتی ئەمە مەبەستی ڕوسۆیە لە «خواستی گشتی». بەلام «بابەتەکی

objective» دەشێ بە واتای «دروست و دوور لە هەموو تێبینییەک» بێت (بۆ نموونە: «ئەوە ڕاستییەکی بابەتکییە کە کۆسارەی پلوتۆ Pluto هەبووە بەر لەوەی هیچ کەسێک تێبینیی کردبێت»).

هەڵبەتە جیاوازیی سەرەکی لە بۆچوونی هێگل و ڕوسۆدا، دەربارەی خواستی گشتی، جیاوازییەکی سەر بە زمان نەبووە. تێڕوانینیان هەر لە بنەڕەتەوە جودایە.

بە بۆچوونی هێگل *چەمکی دەوڵەت* هەر لە ئەزەلەوە لە ئاگای گیانی جیهاندا هەبوو و دەوڵەتی ڕسکاویش بریتییە لە ئامانجی مێژووی جیهان. چەمکی دەوڵەت گرێ نەدراوە بە نۆرینی مرۆڤ لە دەوڵەت. فراژووتنی مێژووکرد پێشانی داوە کە پروسیای هاوچەرخ یەکێکە لە بەراییەکانی ئەو دەوڵەتە دامەزراوانەی لە چەند ڕوویەکی گرنگەوە لە دەوڵەتی ڕسکاو دەچێت (واتە لەوەی کە چەمکی دەوڵەتی تێدایە). بەڵام ئەم فراژووتنە ڕووی دا بێ ئەوەی پێوەندیی هەبووبێت بەوەی کە ئەو خەڵکەی دەستیان تێدا هەبووە زانیاریان دەربارەی دەوڵەت هەبووبێ، بەڵام خەڵک بە دواکاتەوە دەتوانن لە ڕێی ورد بوونەوە لەو دەوڵەتە چاکانەی کە دامەزراون، فێر بن دەوڵەت چییە. ئەمەش بە پلەی یەکەم ئەرکی فەیلەسووفانە. بەڵام کاری فەیلەسووفان ئەوە نییە لەسەر کاخەز نەخشەی دەوڵەت، *«بەو جۆرەی دەبا وەها بێ»*، بکێشن. فەیلەسووفان نابێ «ڕێنمووی ئەوە بکەن دەوڵەت دەبێ چۆن بێت» بەڵکوو «تەنیا پێشانی بدەن چۆن لە دەوڵەت، لەو گەردوونی ئاکارە، تێبگەین».

گوتەی سەختواتای لەم بابەتەی هێگل کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لە فراژووتنی کۆنەوارەتیدا یەکجار دەگمەن بوو. بەڵام ئەو ڕامانەی پاشخانی ئەو گوتانەی پێکدەهێنا، تایبەتمەند بوون: مەسەلەی چۆنیەتی دەوڵەت مەسەلەیەک نەبوو هاوزێدان لە ڕێی هەڵبژاردن و کاری ئەوتووە بڕیاری تێدا بدەن، دەوڵەت هەر خێرە بێ ئەوەی گرێدراو بێت بەوەی ئایە زۆرینەی هاوزێدان ئەم گوتەیە دەسەلمێنن یان نا. ئەرکی سەرەکی ئایدیۆلۆگیستانی سیاسی و فەیلەسووفان ئەوەیە بۆ هاوزێدانی ڕوون بکەنەوە دەوڵەت بۆچی خێرە. دەوڵەت لە ژووررووی هەموو گوتوبێژێکەوەیە.

### ٥- ئازادی و یەکسانی

لەوانەیە وەها ڕانوێنێ کە هێگل بەو چەمکی دەوڵەتەیەوە تەواو هاوبیرە لەگەڵ بۆچوونی سیاسیی ئەرتەکیدا. گەر وەهاش بێت ئەوا گوتەکانی هێگل دەربارەی ئەوەی دەوڵەتی پروسیا ئادگاری دەوڵەتسازیی وەهای پێوەیە کە لە شۆڕشی فرانسیدا هەڵنرابن، بە گوتەیەکی بۆش و بێناوەڕۆک دەردەچن. بە شێوەیەکی کۆنکرێت ئەو داکۆکییەی ئەو دەیکات لە دەوڵەتی پروسیای دامەزراو دەبێتە داکۆکییەک لە پاشایەتی و کڵێسە، لە پێوەندارییەتیی مولکایەتیی نیمچە فیودالانە، لە ئەریستۆکراتی زگماک و ئەریستۆکراتی کارمەندایەتی و لە هێزی ئەرتەشەکیی پەرەسێن.

گەر وەها بێت هێگل دەبێتە کۆنەپەرستێکی وەک ئەوانەی لە فرانسە نوێنەرایەتی کۆنەپەرستییان دەکرد، ئەوانەی دەیانویست هەموو بەرهەمەکانی شۆڕشی فرانسی لەناو بەرن و دنیا بگەڕێننەوە بۆ زەمانی بەر لە ساڵی ١٧٨٩ . جیاوازییەکە هەر ئەوە دەبوو هێگل گوزەرانی لە پروسیادا کردووە کە شۆڕشی لێ نەبووە.

ئەمە وێنەیەکی شێوێنراوە. هێگل بە توندی بەرپەرچی کۆنەپەرستانی هاوزەمانی خۆی دەداتەوە و چەندین بیرۆکەی گرنگی لە ڕۆشناکییەوە هێناوەتە ناو فیکری سیاسیی خۆیەوە.

خاڵی یەکەم ئەوەیە هێگل هۆشەکیخواز rationalist ێکی توندە. ڕووبەڕووی ئەو بۆچوونە باوەی کۆنەپەرستان دەبێتەوە کە دەڵێ بنگەی سیاسی، هەر لەبەر ئەوەی کۆن و پیرۆزە، دەبێ بپارێزرێ. ئەم پێی وایە هەموو بنگەیەک دەبێ هۆشەکیانە ڕەوا بێت. پێشی وایە هەموو بنگەیەک دەبێ گەشە بکات واتە بگۆڕدرێت.

خاڵی دووەم ئەوەیە هێگل ڕووبەڕووی ئەو بۆچوونەی کۆنەپەرستان دەبێتەوە کە دەربارەی دەسەڵاتی سیاسییە. دەسەڵاتی پاشایەتی، بە تێڕوانینی کۆنەپەرستان، دەبێ لە پەیمان و دەستوور و ڕێسا ڕەها بێت، بە لالووتییەوە دۆکیومێنتی وەک Magna charta ی ئینگلیزییان ڕەت دەکردەوە. بە نۆڕینی هێگل و بیریارانی ڕۆشناکی، قانوون و دەستووری وەها کە ئەرک و مافی دەزگە سیاسییەکان دەستنیشان دەکات یەکجار سەنگینن چونکە تەنیا لەو ڕێگەیەوەیە کە دەکرێ هۆشمەندیی دەوڵەت شێوازرێژ و چەسپ بێت.

کەواتە بیر و ئیدیالی کۆنەپەرستی تەواو لە هێگل نامۆن. بەڵام بابزانین هێگل چەندی لە بیروڕای ڕۆشناکی و فیکر و ئیدیالی سیاسیی شۆڕشی فرانسی وەرگرتووە.

باشترین بوار بۆ دۆزینەوەی وەرامی ئەو پرسیارە ئەوەیە کە وردبینەوە لە گوتوبێژەکانی هێگل دەربارەی چەمکی *ئازادی* و *یەکسانی*. هێگل لێرەدا ئاماژە بۆ

بۆچوونە باوەکەی ڕۆشناکی دەکات کە دەڵێ، بنگەی دەوڵەتی دەبێ بەر لە هەر شتێک ئازادی و یەکسانی بە هاوزێدان ببەخشێ. هێگل دەڵێ ئەو گوتەیە ڕاستە بەڵام دەشێ لە تێگەیشتنی ئەو چەمکانەدا بە هەڵەدا بچین. ئەگەر ئەوپەڕی ئاکام لە باوەڕی یەکسانی بگیرێت ئەوا دەکرێ دژ بە هەموو دەوڵەتسازییەک بەکار بهێنرێت. دەوڵەت مەرجی نایەکسانی تێدایە، جیاوازی دەخاتە نێوان، حوکومڕان و حوکومکراو، سەردەست و ژێردەستەوە.

هەڵبەتە بیرۆکەیەکی یەکسانی کە لەگەڵ چەمکی دەوڵەتدا ناکۆک بێت، بۆ هێگل دەبێتە تەگەرە. هێگل دژی ئەو بۆچوونەش دەوەستی کە دەڵێ مرۆڤ ***لە ڕووی سروشتەوە وێکچوون***. بێگومان چەمکی «سروشت» هەتا سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەم بە واتای «پێوەر» و «ماک» بەکار دەهێنرا، کە دەگوترا «خەڵک لە ڕووی سروشتەوە وێکچوون» وەک ئەوە بوو بگوترێ مرۆڤ لە ناخدا وەک یەکن یان ماکی مرۆڤ وەک یەکە.

بە دواکاتەوە ئەوجا «سروشت» لەم بوارەدا بە واتای «بنج»، وەک لای ڕوسۆ، بەکار هێنرا. بە نۆڕینی هێگل ئەم بۆچوونی وێکچوونی مرۆڤ لە ڕووی سروشتەوە دەکاتەوە ئەوەی ئادەمیزاد لە دۆخێکی بنجیدا یەکسان بووبن. هێگل گاڵتەی بە بۆچوونی وەها دێت. سروشتی مرۆڤ جودایە و لەبەر ئەوەشە نایەکسانن. وەک تاکەکەسانێکی سروشتەکی، واتە وەک کەسانێکی خاوەن خەسڵەتی دیاریکراوی لەشەکی و دەروونەکی، هەر بە نالەیەکچوو دەمێننەوە: بەهێز یان بێهێز، ژیر یان گێل، بەڵێ هێگل دەوڵەمەند و هەژاریشی دەخاتە سەر (کە دەشێ ئەوەش بە خەسڵەتێکی سروشتەکی دابنرێ).

وێکچوونی ئادەمیزادان مەسەلەیەکی خۆڕسکی نییە بەڵکوو **چەمکەکییە**، واتە ئادەمیزاد خاوەن یەک ماکن. ئەم گوتەیە لە بواری سیاسیدا ئەوە دەگەیەنێت کە هەر هەموو لەبەردەم دەستووردا وەک یەکن. بەڵام دەستوور ئەوەی بە مەرج گرتووە کە لە ڕووی سروشتەوە خەڵکی وەک یەک نین. ئەوەی تاوانێک بکات دەبێ بە شێوەیەکی دیاریکراو سزا بدرێت و سزاکە پێوەند نییە بە کەسایەتی ئەو مرۆڤەوە، بەڵام لە تاوانباریدا هەموو خەڵک وەک یەک نین.

لە باسی ئازادیدا، هێگل ئازادیی نایەتی و ئایەتی لەیەک جودا دەکاتەوە. ئازادیی نایەتی، ئازادبوونە لە خواستی خەڵکی دیکە، لە مامەڵەتی دەستووربەدەر. ئازادیی ئایەتی، وەک باوە، ئازادیی تاکەکەسە کە ئەو کارە بکات ئارەزووی لێیەتی.

بە نۆڕینی هێگل جۆری یەکەم هەر چۆنێک بێت، جۆری دووەمی بە مەرج گرتووە. مەرجێکی دیکەی ئازادیی تاکەکەس ئەوەیە دەبێ مولکایەتی و ئاسوودەکی مرۆڤ

بپارێزرێ. لە لایەکی دیکەوە ئەو پاراستنە داوای ئەوە دەکات ئازادیی کردەوەی تاکەکەس سنووررێژ بکرێت. کەواتە هیگلیش وەک بیریارانی ڕۆشناکی مەسەلەی ئەوەی دەستوور دەبێ ببێتە دەستەبەری ئازادی و ماف، بەرز دەنرخێنێت بەڵام بە پێچەوانەی ئەوان، ئەم پێی وایە دەستەبەر کردنی دەستووریی وەها مانای ئازادییەکی تاکەکیی فرەوان نادات.

هیگل بەرپەرچی ئەو بۆچوونەش دەداتەوە کە دەڵێ ئازادیی فرەوانتر، دەکاتەوە یەکسانیی فرەوانتر. هیگڵ دەڵێ «بە پێچەوانە، ئەم ئاستە بەرزەی فراژووتنە لە دەوڵەتی هاوچەرخدا کە فرەوانترین نایەکسانی لە نێوان تاکەکەساندا پەیدا کردووە». لەوانەیە هیگل لێرەدا کەمتر جیاوزیی ئابووری ڕەچاو گرتبێ و پتر بیری لای ئەو پێوەندییە توند و تۆڵە بێ کە لە نێوان سەرکردە و ژێرکردەی نێو دەوڵەتی هاوچەرخدا هەیە. ئەوجا دەشڵێ «بەڵام دەوڵەتی هاوچەرخ بە هۆی دەستوورەکانییەوە هۆشمەندییەکی زیاتر و چەسپێنێکی زیاتری بەدەمەوەیە وەک لە ئازادییەکی چەسپیوی فرەوانتر و پتەوتر». بەڵام *ئازادی* لێرەدا ئەوە نییە تاکەکەس دەرفەتی ئەوەی هەبێت بە دڵی خۆی بکات، بەڵکوو «دەستەبەر کردنی موڵکایەتی» یە و «دەرفەتە بۆ پێشخستنی بەهرە و خەسڵەتی چاک». کەواتە بە نۆڕینی هیگل، ئازادیی مرۆڤی هاوچەرخ بە پلەی یەکەم ئەوەیە مافی موڵکایەتیی کەسەکی هەبێت و ئەوەیە دەرفەتی هەبێت پەرە بە بەهرەی خۆی بدات، واتە بتوانێت کەسایەتی خۆی بنوێنێ.

کاتێک هیگل لە بواری دیکەدا دەڵێ، مرۆڤ لە دەوڵەتدا ئازادیی خۆی دەدۆزێتەوە، مەبەستی لەم جۆرە ئازادییەیە. لە کۆمەڵگەیەکدا کە مرۆڤ ئازادیی بزووتنی بێسنووری هەبێ و بتوانێت بەبێ زەبری قانوون بجووڵێتەوە، ئازادیی ئەم دەبێتە ملکەچیی تەواو و نائازادیی بۆ ئەوەی دیکە. لە کۆمەڵگەی تاکەکیدا، نە موڵکایەتی دەستەبەر دەبێ و نە کەس دەرفەتی دەبێت پەرە بە بەهرەکانی خۆی بدات.

بەڵام لە دەوڵەتی گەشەکردوودا، هەموو کەسێک لە گشتدا تێکبەستە و بە ئەندازەی بەهرەکانی خۆی نۆرەی هەیە، مافێکی هەیەتی و ئەرکێکی لەسەریەتی وەهان کە دەرفەتی فراژووتنی کەسایەتی و ئاسوودەکی برەخسێنن، چ بۆ خۆی و چ بۆ ئادەمیزادانی دیکە. هیگل دەڵێ: «دەوڵەت هەڵکەوتێکی کۆنکرێتی ئازادییە، بەڵام ئازادیی کۆنکرێت لەوەدایە کە، تاکایەتی کەسەکی /واتە تاکەکەس/ و خواستە تایبەتییەکانی تاکەکەس *فراژووتنی* تەواویان هەبێ و مافیان *لێ بسەلمێنرێت*... بەوەش ئەوەی تاکەکییە دەبێتە گشتی... و گشتاندن *دوا ئامانجە*».

## ٦- هێگل و دوارۆژ

به دەگمەن نەبێ کۆنەوارەتی مۆرکی بۆچوونی ئوتۆپی و دوارۆژبینیی بوێرانەی پێوە نابێ. ئەوەی لە نەرێتدا چاکە دەبێ بپارێزرێ و پەرەی پێ بدرێت. کۆنەواران هەرگیز بەرپابوونی شۆڕش ناسەلمێنن بەلام دەشێ شۆڕشێک بسەلمێنن کە ڕووی دابێت (Burke پیرۆزبایی لە شۆڕشی ١٦٨٨ ی ئینگلاند دەکرد و هێگل پێی وابوو شۆڕشی فرانسی ١٧٨٩، ڕەوایەتی خۆی هەبوو).

دۆزینەوەی وێنەیەکی سافی تێڕوانینی هێگل، دەربارەی فراژووتنی سیاسیی پاشەڕۆژ، یەکجار سەختە. ئەمەش لە ڕاستیدا بووە هۆیەکی دابەشبوونی شاگردەکانی هێگل بە سەر چەندین ڕێبازدا، هەر لە چەپەوە هەتا ڕاست. لە ناو خۆیاندا لەسەر ئەوە ناکۆک بوون ئایە ناخی فەلسەفەی هێگل کۆمەڵگەپارێزە یان شۆڕشگێڕە. باسەکەش لەوەدا خڕدەبۆوە ئایە پروسیای دامەزراو، بەلای هێگلەوە، دوا وێستگەی مێژووە یان تەنانەت پروسیاش دەبێ هەڵوەشێت و جێ بۆ دەوڵەتسازیی بەرزتر و هۆشمەندتر چۆڵ بکات.

ئەگەرچی ئاشکرایە کە هێگل خۆی لە ڕووی سیاسییەوە تەنیا بە کۆنەوار دادەنرێ، بەلام دەشێ چەندین ڕێبازی فیکری جیاجیا لە بەرهەمەکانی هێگلدا پشتیوانی بۆ خۆیان بدۆزنەوە.

لە لایەکەوە هێگل پێوەندێک لە نێوان فەلسەفەکەی خۆی و دەوڵەتی پروسیادا دەبینێت. هێگلیش بوو کە بە دەربڕینی بیروڕا بووە بنیاتنەری پروسیای دەستوور و دەزگە (تەنانەت فەرمانڕەوایانی پروسیاش ئەم ڕێککەوتنەیان لا پەسەند بوو و بۆ ماوەیەکی کورتیش فیکری هێگل وەک فەلسەفەی دەوڵەت سەیر دەکرا). بەلام هێگل پێی وایە فەلسەفەکەی خۆی دوایەکییە، یان هەرنەبێ ئەو مێتۆدە بنجییانەی خۆی دایناون، لە بواری زانستدا، هەرگیز پشتگوێ ناخرێن. جاروباریش هێگل دەڵێ پروسیا وەک نموونەیەک هەر نەبێت شارێی بۆ هەموو دەوڵەتێکی چاک و دروستی دوارۆژ داڕشتووە.

لە لایەکی دیکەوە، هێگل لە بواری دیکەدا بە هیچ جۆرێک خەریکی پێشبینی نابێ. هێگل دەڵێ «فەلسەفە هەمیشە درەنگ دەکەوێت» لە ئاست پێشبینیدا. فەیلەسووفان یارمەتیمان دەدەن لە دەوڵەتە دامەزراوەکان بگەین، بەلام ناتوانن باس لەوە بکەن ئایە ئەم دەوڵەتانە جێ بۆ دەوڵەتسازیی دیکە چۆڵ دەکەن یان نا. «کوندەبەبووی مینەرڤا Minerva کە تاریکی داکەوت ئەوجا دەفڕێ» ‹مینەرڤا خواوەندی ژیرییە لای یۆنانییەکان›.

له لایەکی سێیەمەوە، گومان لەوە دەکرێ کە ئەو ڕەسینە نیسبییەی پروسیا لەگەڵ ئەو مێژوونۆڕیە دیالەکتیکییەی هێگلدا یەک بگرنەوە. ئایە دەشێ ئەو تێکبەستەی ئازادی و ڕشتە دەستوورییەی هێگل پێی وایە لە پروسیادا دەیبینێ، ببێتە تێکبەستەیەکی دوایەکی؟ ئەدی نابێ ئەم تێکبەستەیەش وەک هەموو تێکبەستەکانی زووتری مێژوو هەڵوەشێنرێتەوە؟ - ئەمە بووە کۆڵەکەیەکی ئەو ڕێبازی هێگلپەروەرانی لاو یان هێگلپەروەرانی چەپ، گرتیانە بەر، زۆر بە لاوی مارکس و ئەنگیلز سەر بەوانە بوون.

بەم دژوەستانە، هێگل وەک تاکە ئایدیۆلۆگیستێکی گرنگی کۆنەوارەتی، کاری کردە سەر فیکری سیاسیی شۆڕشگێڕ و ڕادیکالی سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم.

## ١- ئایدیۆلۆگیی لیبەڕالیزم

وشەی «لیبەڕالیزم» ئەگەر مومکین بێت ئەوا لە وشەی «کۆنەوارەتی» لێڵتر و فرەواتاترە. لیبەڕالیزم دەشێ بۆ باوەڕێکی گشتی وەها بەکار بێت کە پێی وا بێت شادمانی و خۆشگوزەرانیی تاکەکەس ئامانجی سیاسەتە، دەشێ بۆ بەرز نرخاندنی ئازادیی بیر و ئازادیی دەربڕین بەکار بێت، یان بۆ باوەڕێکی ئابووری بەکار بێت کە پێی وا بێت فراژووتنی ئابووری بەوەی پێی دەگوترێ بازاڕی ئازاد، دوور لە دەست تێوەردانی دەوڵەت، سوودمەند دەبێت. ئەمڕۆ هەر تێڕوانینێکی دژەکۆمیونیستانە و دژەسۆسیالیستانە زۆر جار پێی دەگوترێ لیبەڕال. لە زۆر وەڵاتدا، وشەی لیبەڕال بۆ ئەو حیزبانە بەکار دێت کە لە نێوان ڕاست و چەپی نەریتەکیدا جێیەکی ناوەندیان گرتووە.

دەربارەی ئەوەی ئایە بیری لیبەڕال لە چ ماوەیەکدا تەواو ڕسکا، دیسان بۆچوونی هەمەجۆر هەیە. زۆر جار جۆن لۆک John Locke بە بنیاتنەری لیبەڕالیزم دادەنرێ. جاروبار بە ئابوورییە سیاسییە کلاسیکەکەی ئادەم سمیت Adam Smith دەگوترێ لیبەڕالیزمی ئابووری – ئەم بۆچوونەش لە هیچە نییە. بەڵام لە بەرهەمی لیبەڕالی نوێدا گەلێک جار وا پێشان دەدرێ کە بڕوا بە دیمۆکراتیی نوێنەرەکی representative government و مافی دەنگدانی وەک یەک و بۆ هەمووان، بەشێکی بنەڕەتی و تایبەتە بە ئایدیۆلۆگیی لیبەڕال. ئەگەر وا بێت ئەوا لیبەڕالیزم زادەی دەمە درەنگەکانی سەدەی نۆزدەیەمە.

لەمەولا «لیبەڕالیزم» بۆ ئەو باوەڕە بەکار دێنم کە، تێکبەستنێکی بۆچوونی کەم وێکچووە، کە لە ڕێگوزەری سەدەی نۆزدەیەمداماڵی جودا کردەوە، چ لە کۆنەوارەتی هاوچەرخ و چەند تێڕوانینێکی کۆنەپەرستانە و چ لە بزووتنەوەی سۆسیالیستانەی پەرەسێن. دیارە ئەم باوەڕە ڕەگی توندی لە فیکری ڕۆشناکیدا هەیە، واتە لە بیروڕای سەر بە هۆشمەندی و ئازادیی بنەتای سەدەی حەڤدەیەم و سەدەی هەژدەیەم. بەڵام وەک باسکرا، ئەو دەمەی کەوتە ئەوەی بەرپەرچی ڕاست و چەپ بداتەوە ئەوجا گەییە پلەی فراژووتنی تەواو. بنەمای ئەم دەستنیشان کردنەش تاڕادەیەک ئاسانە.

دابەشینی چینایەتیی هاوچەرخ بەسەر، سەرچینێکی ئیمتیازدار، چینی بۆرژوای سەرمایەداری ڕووەوپێش و چینی کرێکاری خێرا پەرەسێن، لە سەدەی نۆزدەیەمدا تەواو پێگەیی. لە سەدەی هەژدەیەمدا بیروڕای بۆرژوایانە تەنیا دژایەتی سەرچینی نەریتەکی

دەکرد. بەیاننامە جۆراوجۆرەکانی فرانسی و ئەمریکایی کە لە مافی مرۆڤایەتی دەدوان ***بۆ هەموو گەل بوون*** دژ بە ئیمتیازدار و بەگزادە و کەشیشان بوون.

باوەڕی وێکچوونی خۆرسکی هەموو ئادەمیزادان، باوەڕێکی نێوەندەکی بوو. لیبەڕالە بەرچاوەکانی سەدەی نۆزدەیەم – زۆربەی جار دەیان ویست نوێنەرایەتیی بەرژەوەندی چینی کرێکارانیش بکەن و گەلێ جاریش بوونەتە جێی باوەڕی کرێکاران. بەڵام دەبا خەباتێکی بێوچان دژ بە سۆسیالیستەکانیش بگێڕن. لیبەڕالەکان لێکدانەوەی نوێیان بۆ بیرۆکەی وێکچوونی خۆرسکی مرۆڤ دەدۆزییەوە، یان هەر بەجارێ لایان دەدا. ئەمانە بە ئاسانی نەیان دەسەلماند کە ڕێ بدەن کرێکاران بە ئەندازەی ژمارەی خۆیان دەسترۆ بن. تاکەکیەتیی سەدەی هەژدەیەم خەسلەتێکی تاڕادەیەک نوێی وەرگرت: ئەو تاکەکیەتییە بووە داکۆکییەک لە مرۆڤی تاکەکەس، نەک تەنیا دژ بە خواستی سەرچین و ئیمتیازداران بەڵکوو دژ بە «ئاپۆرەی نەخوێندوو» و «ڕای گشتی» ش و... هتد، بیری چینایەتیی سۆسیالیستانە و بیری دەوڵەت و گەلی کۆنەوارانە و کۆنەپەرستانە، بووبوونە یەکەم کێلەنیشانی لیبەڕالەکان.

بەڵام لیبەڕالیزمی سەدەی نۆزدەیەم دەبێ دژ بە کۆنەوارەتیی هاوچەرخیش بخەبتێ، کە ئەمیان جیاوازیی لەگەڵ کۆنەوارەتیی سەدەی هەژدەیەمی کۆمەڵگەپارێزدا ئەوە بوو کۆنەوارەتیی هاوچەرخ بەڵگەی هۆشمەندانەی دەهێنایەوە بۆ داکۆکی کردن لە نەرێت و دەوڵەت و دین. لیبەڕالیزمی سەدەی نۆزدەیەم نەک هەر خۆی دوور ناخاتەوە لەو مێژوونۆڕییەی لە فەلسەفەی هێگلدا چووە بەرزترین شێوازەوە، بەڵکوو لە زۆر خاڵی گرنگیشدا کەوتۆتە ژێر تاوی ئەو مێژوونۆڕییە. ئەو باوەڕی پێشکەوتنە گەشبینەی بیریارانی ڕۆشناکی ناچار بوو سەر فروو بێنێ بۆ باوەڕی فراژووتن، کە ئەمیان لە مەسەلەی دوائامانجی مێژوودا کەمتر گەشبین نەبوو بەڵام پێی وا بوو ڕێگەی بەرەو ئەو دوائامانجە سەخت و دژوارترە. سەرکەوتنی هۆش ڕاستەوخۆ لە بەردەمماندا نییە.

کەواتە دەشێ لیبەڕالیزمی تەواو ڕسکاو بە زادەی سەدەی نۆزدەیەم دابنرێت. بەڵام ئەو گوتەیە مانای ئەوە نییە لیبەڕالیزم لە سەدەی نۆزدەیەمدا خەسڵەتێکی تەواو یەکگرتووی گرتە خۆی. بەپێچەوانەوە، لیبەڕالیزم دوو شارێبازی لە سەدەی نۆزدەیەمدا هەبوو، هەردووکیانیش هەتا ئەمڕۆ بەرژیانن. ڕێبازی یەکەمیان ناوێکی وەهای نییە لە گشت لاوە سەلمێندرابێ. جاری وەها هەیە ڕاست و ڕەوان پێی دەگوترێ لیبەڕالیزم، جاری وا هەیە دەبێتە لیبەڕالیزمی پەتی. ناوی هەیە باوە، پێی دەگوترێ لیبەڕالیزمی مانچێستەر یان Laisseze-faire-Liberalism. جاروبار پێی دەگوترێ داروینایەتیی جڤاکی Social

darwinism. مەبەستیش لەو باوەڕەیە کە گوایە دیمانەی فراژووتنی جۆر - ی داروینی کردووە بە دەراو بەلام پتر پێوەندیی بە فەلسەفەی هەربەرت سپێنسەر Herbert Spencer ەوە هەیە و پتر لە ئەمەریکا برەوی پەیدا کرد. من لێرەدا سپێنسەر دەکەم بە نوێنەری ئەم جۆرە لیبەڕالیزمە.

ڕێبازی دووەمی بە ناوی لیبەڕالیزمی جڤاکی social liberalism بەناوبانگە. بەگشتی، جیاوازیی ئەمیان لەوەی یەکەم ئەوەیە کە ئەمیان چەند جۆرێکی دەست تێوەردانی دەوڵەتی دەسەلمێنێت، بەو مەبەستەی چارەیەکی هەژاری و نەداریی چینی کرێکاران بکات و دژ بەوە بوەستێت مۆنۆپۆلی ئابووری ڕێگە لە هاوچاویی ئازاد بگرێ. جۆن ستیوارت میلل John Stuart Mill یەکەم نوێنەری گەورەی ئەم لیبەڕالیزمە جڤاکییەیە.

**٢- جۆن ستیوارت میلل و هەربەرت سپێنسەر**

میلل و سپێنسەر لە چەندین بواردا کاریگەرییان هەبووە. چالاکییان، جگە لە دیمانەی سیاسی، چەندین بواری دیکەشی گرتۆتەوە.

میلل (١٨٠٦-١٨٧٣) زۆربەی تەمەنی کارمەند بووە لە کۆمپانیای ڕۆژهەلات-هیند و چەند ساڵێکیش سەرۆکی ئەو کۆمپانیایە بووە. لە ساڵی ١٨٦٠ دا، ئەندامی بنخانی ئینگلیزی بووە و نوێنەرایەتی سیاسەتێکی لیبەڕالی دەکرد بەتایبەتی لە بواری دەستووردانان و فێرکاریدا. بەلام بە پلەی یەکەم، لە چەند بوارێکدا، نووسەرێکی چالاک بوو. لە بواری لۆگیک، دیمانەی زانیار، ئاکارناسی Ethics و ئابووری سیاسیدا تاوێکی زۆری هەبوو. تەنانەت بەرهەمە سیاسییەکانی فرەوان و سەنگینن، بۆ نموونە میلل لە ئازادیی سیاسی، مافی سیاسی، حوکومڕانیی نوێنەرەکی و دۆزی ژنان، دواوە.

میلل وەک فەیلەسووفێک بە پەیڕەوی سوودخوازەتی utilitarianism و شارەزاکیەتی دادەنرێ. بە نۆڕینی میلل هەموو زانیارێک، تەنانەت ئەوەی سەر بە لۆگیک و ماتماتیکە، لە ڕێی شارەزابوونەوە پەیدا دەکرێ نەک لە ڕێی تێفکرین و ڕامانەوە. سوودخوازەتی دەڵێ کردەوەی چاک ئەوەیە خۆشیهێن بێت - نەک تەنیا بۆ تاکەکەس، بەڵکوو بۆ هەموو مرۆڤایەتی. میلل بەوەی خۆشیی بەرز و نزم لە یەک جودا دەکاتەوە خۆی لە سوودخوازانی دیکە دادەبڕێ، لای ئەم: خۆشیی زگتێری لەو خۆشییە نزمترە کە لە کۆپلەیەک شیعر یان مۆسیقا پەیدا دەبێ. ئەم سوودخوازەتییە چاککراوە تاوێکی بنەڕەتیی هەیە تەنانەت لە تێڕوانینی سیاسیی میللدا.

لەو بەرهەمانەی میلل کە بۆ هەڵسەنگاندنی تۆرینە سیاسییەکەی خۆی بایەخدارە، ئەمانەن: *Principles of Political Economy* (***بنەماکانی ئابووریی سیاسی***، ١٨٤٨). کتێبی *On Liberty* (***دەربارەی ئازادی***، ١٨٥٩) لە ئازادیی سیاسی دەدوێ و برەوی زۆرە. کتێبی *Consideration on Representative Government* (***چەند تێبینییەک دەربارەی حوکومڕانیی نوێنەرەکی***، ١٨٦١) و پاشان *Autobiography* (***بیرەوەرییەکانم***، ١٨٧٣).

هەربەرت سپێنسەر Herbert Spencer (١٨٢٠-١٩٠٣) ماوەیەک وەک ئەندازیاری ئاسنەڕێ کاری دەکرد بەڵام هەر زوو وەک نووسەر و زانایەک خۆی سەپاند. وەک هێگل ئەمیش لەوە دەدوا کە هەموو زانیاری مرۆڤایەتی لە یەک ڕشتەی فەلسەفی سەرلەبەردا کۆدەکاتەوە، بۆ خۆی ناوی لێ ناوە فەلسەفەی تێکبەستە synthetic philosophy. هەموو دیاردەیەک هەر لە ئەتۆمەوە هەتا کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، ملکەچی یەک جۆر دەستووری فراژووتنن. هەموو شتێک لە گۆڕاندایە، لە دۆخێکی ئاژاوڵە بەڵام گشتگر بەرەو دۆخێکی لێکدراو و جوداکراو. هەر وەک چۆن ڕشتەی خۆر بەم هەموو کۆسارانەوە لە بارستە گازی شەبەنگی nebulous یەوە پەیدا بوون، هەروەهاش کۆمەڵگەی هاوچەرخ، کە چوستە و کاری تێدا دابەشە، لە سەرەتادا بریتی بووە لە کۆمەڵگەی بچووکی ساکار و بەگشتی هەموو کەسێک هەموو کارێکی دەکرد. سپێنسەر دەڵێ کە، کاتێک ئەم فراژووتنە دەگات بە ئەوپەڕی ڕەسین ئەوجا دەگاتە دۆخێکی هەڵوەشان کە بەردەوام دەبێ هەتا دەگاتەوە ئەو دۆخەی سەرەتا کە بێساختار و ناجوداکراوەیە. بەڵام ئەو تێڕوانینەی سپێنسەر دەربارەی خولی هەمیشەکی تۆرەیەکی ئەوتۆی نەبوو لە فەلسەفەی کۆمەڵایەتی و فیکری سیاسیی خۆیدا.

سپێنسەر شاڕێیەکانی فەلسەفە تێکبەستەکەی خۆی لە کتێبی *First Principles* (١٨٦٢) دا ڕوون دەکاتەوە. ئەگەرچی سپێنسەر لە نێزیکەی هەموو لکەکانی زانست دواوە، لەگەڵ ئەوەشدا بایۆلۆگی شانۆرەی هەیە لە باوەڕەکەیدا. بەر لەوەی داروین کتێبی *On the Origin of Species* (***دەربارەی بنچی جۆر***، ١٨٥٩) بڵاو بکاتەوە، سپێنسەر باسی لەوە کردبوو کە جۆرەکانی ڕوەک و گیانەوەر، لە جۆری کەمتر و ساکارترەوە هەڵکشاون بەرەو پتر و گەشەکردووتر.

فەلسەفەی کۆمەڵایەتیی سپێنسەر بەگشتی لەسەر بایۆلۆگی بنیات نراوە. مێژووی مرۆڤایەتی بە بەردەوامبوونێکی ڕاستەوخۆی مێژووی جۆرە بایۆلۆگییەکان داناوە و دەڵێ هەر ئەو دەستوورانەن لە هەردوو لا کاریگەرن. ئەم تێڕوانینە کۆمەڵایەتییەی کە ڕووەو بایۆلۆگییە، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا، برەوی فرەوان بوو. سپێنسەر وەک

کۆمەڵناس و دیمانەیاری سیاسی، دواکەوتەی زۆر بوون. ئەم باوەڕە تازەیەی فراژووتن وەک پشتیوانێک بۆ ئایدیۆلۆگیی لیبەڕاڵ بەکار هێنرا.

لە نموونەی بەرهەمەکانی سپێنسەر، لە بواری دیمانەی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا ناوی ئەم دوو کتێبە دەهێنین: The Study of Sociology (١٨٧٣) و The Man versus the State (١٨٨٤) کە یەکێکە لە کتێبە هەرە ناسراوەکانی.

### ٣- فراژووتنی مێژووکرد

چەمکی *موڵکایەتی* لە فیکری ڕۆشناکیدا شانۆرەی هەبوو. بەڵام مەبەست لە موڵکایەتی هەر پێوەندیی ئابووریی نێوان شتومەک و خاوەن شتومەک نەبوو، مافی موڵکایەتیی تاکەکەس دەکاتەوە مافی تاکەکەس لە لەش و گیانی خۆی، لە بیر و دەربڕینی خۆی. ئازادیی ئابووری و ئازادیی سیاسی لە یەک جودا دەکرانەوە.

ڕاڤە دانی ئەم بۆچوونە لە ڕووی مێژووەوە ئاسانە. ئەو ڕشتە کۆمەڵایەتی و سیاسییەی بیریارانی ئابووری دەچوون بەگژیدا، کۆسپێک بوون هەم لە ڕێی فراژووتنێکی ئازادیی ئابووری و هەم لە ڕێی ئازادیی بزووتنی تاکەکەسدا. لە ڕوانگەی ئەو دەوڵەتنۆڕی و کۆمەڵگەنۆڕییە نەرێتەکییەی، کەموزۆر مۆرکی فیوداڵانەی پێوە بوو، پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ هەیە لە نێوان سەرڕاستیی دینەکی و فەلسەفی لە لایەک و ئیمتیازی پلە و پایە و سازدانی ئابووری لە لایەن دەوڵەتەوە، لە لایەکی دیکەوە. بیریارانی ڕۆشناکی بەگژ هەموو ئەو بۆچوونانەدا دەچوون نەک تەنیا یەکێکیان.

لە لیبەڕالیزمی سەدەی نۆزدەیەم و بیستەمدا، کە بەردەوام داکۆکی لە ئازادیی ئابووری و ئازادیی سیاسی کردووە، پێوەندیی نێوان ئەم دوو ئازادییە تەگەرەدار بووە. باوەڕی سەر بە ئابووری پێی وا بوو تەژەند و سامان لە ڕێی گەمەی هێزە ئازادەکانی ئابوورییەوە پەیدا دەبێ، ئیدی چ پێوەندییەکی سەر بە لۆگیک و سەر بە چەمک نامێنێ لەگەڵ باوەڕی سەر بە ئازادیی ڕا و دەربڕین و کۆبوونەوە. لە لیبەڕالیزمی هاوچەرخدا زۆرتر باس لەوە دەکرێ کە پێوەندییەکی هۆیەکی causal لە نێوان هەردوو ئازادییەکەدا هەیە: ئازادیی ئابووری مەرجە بۆ ئازادیی سیاسی. لە کۆمەڵگەیەکدا کە موڵکایەتیی کەسەکی تێدا نەبێ و ئابووری بە شێوەیەکی نێوەندەکی ساز بدرێت هیچ دەرفەتێک بۆ ئازادیی سیاسی نامێنێ.

لیبەڕالیزمی هاوچەرخ لە هەلومەرجی دەوڵەتانی سۆسیالیستی دامەزراودا پشتیوانی

بۆ ئەو بۆچوونە دەهێنێتەوە. لیبەڕالەکانی سەدەی نۆزدەیەم ئەو دەرفەتەیان نەبوو، ناچاربوون نموونە لە دیتنی دیکە بهێننەوە.

باوەڕ بەوەی ئازادیی ئابووری پیرۆزە هەر لە سەردەمی ئادەم سمیتەوە گرێ درابوو بە دیمانەیەکی پێشکەوتووی ئابوورییەوە. بەڵام لە بواری ئازادیی سیاسیدا دیمانەیەکی وەک ئەوە لە ئارادا نەبوو. لەم بوارەیاندا هێشتا پشت بە بۆچوونی گشتی دەربارەی سروشتی مرۆڤایەتی و هۆش و... هتد دەبەسترا. بەڵام لە سەدەی نۆزدەیەمدا، لیبەڕالە بەرچاوەکان بۆ بەڵگەی نوێ دەگەڕان باوەڕی سەر بە ئازادیی پێ پتەو بکەن.

ئەمەش مانای ئەوە نییە باوەڕی ئابووری و سیاسی، بێ بەربەرەکانێ خۆی دا بەدەستەوە و کرا بە بەشێک لە ڕوانگە فرەوانەکەی بۆچوونی سەر بە پێشکەوتن. دوو شارێبازەکەی لیبەڕالیزم، کە لێرەدا لێیان دەدوێین، دەگەڕان بۆ چارەسەری جۆراوجۆری ئەم تەگەرەی یەکگرتنەی لیبەڕالیزمی سیاسی و لیبەڕالیزمی ئابووری. ئەگەر بە ساکاری لێی بدوێین دەشێ بڵێین ئەو لیبەڕالیزمەی سپێنسەر نوێنەرایەتی دەکرد، ئازادیی ئابووریی بە بنەما دادەنا، بەڵام لیبەڕالیزمی جڤاکی، لە مۆدێلەکەی ستیوارت میلل، داکۆکیی لەوە دەکرد ئازادیی سیاسی پێشەمی هەبێ. سپێنسەر دەیگوت، ئەگەر ئازادیی ئابووری پێشێل بکرێت هەموو فراژووتنی مرۆڤایەتی زیانی کوشندەی لێ دەکەوێت. بە نۆڕینی میلل، ئازادیی سیاسی – و بەتایبەتی ئازادیی دەربڕین – ئەو شانۆرەیەی هەیە.

سپێنسەر لەم خاڵەدا تەواو دڵنیایە و هەرگیز ڕێگۆڕی ناکات، بەڵام میلل زۆر جار ڕاڕایە و لە دەمی جۆراوجۆردا چارەسەری جۆراوجۆر دەدۆزێتەوە. میلل هەوڵێکی ئاگادارانە دەدا بۆ ئەوەی لیبەڕالیزمی سیاسی تەواو لە لیبەڕالیزمی ئابووری جودا بکاتەوە. لە *On Liberty* دا، دەڵێ:

«هەر وەک چۆن بنەمای ئازادیی تاکەکی بەشێک نییە لە باوەڕی سەر بە بازرگانیی ئازاد، هەروەها زۆربەی ئەو دۆزانەی لەوانەیە لە سنووری ئەو باوەڕەدا پەیدا بن، سەر بە ئازادیی تاکەکی نین، وەک ئەوەی تا چ ڕادەیەک ڕێگە بدرێ بەوەی چاودێریی دەوڵەتی هەبێت بۆ ئەوەی ڕێگە لە تەزویر بگیرێ، یان تا چ ڕادەیەک دەبێ کاربەخشان ناچار بکرێن چارە بۆ مەسەلەی خاوێنی کارگە و سەلامەتی کرێکارانی پیشەی خەتەرناک بدۆزنەوە. ئەم دۆزانە لە سنووری بواری ئازادیی تاکەکی دەخشێن بەڵام تەنیا لەو مەودایەدا کە، وەک لە هەموو بوارێکی دیکەی هەلومەرج وێکچوودا، وا چاکترە ڕێگە بدرێ خەڵک خۆی کاری خۆی جێبەجێ بکات نەک زۆریان لێ بکرێ. ئەوجا ئەگەر هۆی لەباریش هەبوو بۆ چاودێری کردنیان بۆ مەبەستی لەو بابەتانە، ئەوا لە ڕووی باوەڕەوە کارێکی ناجۆر نییە».

ئەمە کاری ڕێکەوت نییە کە سپێنسەر و میلل ڕای تەواو جیاوازیان هەیە بەرانبەر ئەو ڕێساگەلەی لە ئینگلاندی سەدەی نۆزدەیەمدا بۆ چاکەی کار و هەژاری سەپێندران. بەڵام وەک باسمان کرد، میلل و سپێنسەر، هەردووکیان لە ژێر تاوی ئەو بۆچوونەی سەدەی نۆزدەیەمدا بوون کە لە فراژووتنی مێژووکرد دەدوا. تەنانەت میلل نەیتوانی هەتا سەر داکۆکی لەوە بکات کە هەڵکشانی ئابووری و ئازادبوونی سیاسی دوو ڕێبازی لەیەک جودای فراژووتنن.

میلل و سپێنسەر هەر بەوەی ڕێگەی ڕوانگەیەکی فراژووتنی مێژووکرد دەگرنە بەر، خۆیان لە شارێی فیکری ڕۆشناکی و لیبەڕالیزمی سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم جودا دەکەنەوە. بۆچوونێکی چەوت هەیە دەڵێ فەیلەسووفانی ڕۆشناکی هەستی مێژوویەکی یان ئاگای مێژوویەکیان نەبووە. بەڵام دیارە ئەو فەیلەسووفانە نرخاندنیان بۆ فراژووتنی مێژووکرد و بۆ دوارۆژ جودا بوو لە نرخاندنی بیریارانی بەرچاوی سیاسەتی سەدەی نۆزدەیەم – هێگل یان مارکس بێت، میلل یان سپێنسەر بێت. ڕێبازی فیکری ئەو فەیلەسووفانە گەر بە ساکاری دەربببڕین ئەمەیە: ئەگەر هۆش باڵ بەسەر هەموو بوارێکی مرۆڤایەتیدا بکێشێت، ئەوا دنیا دەبێتە چاکە و شادمانی. کەواتە ئەو دنیا چاک و شادمانە نێزیکە لێمانەوە. – ئەو بۆچوونەی زۆربەی ڕێبەرانی شۆڕشی فرانسی بڕوایان پێی بوو، کە گوایە هەر ئەوەندەی دەزگە سیاسییەکانی کۆمەڵگەی کۆن بڕووخێن، ئیدی شادمانستان پەیدا دەبێ، لەگەڵ ئەم باوەڕەی سەرەوەدا هاوئاهەنگ بوو.

بەپێچەوانەی ئەم بۆچوونە، بیریارانی سیاسیی سەدەی نۆزدەیەم، کە ئەزموونی شۆڕشی فرانسییان لە پشت بوو، پێیان وابوو کۆمەڵگەی هۆشمەند (ئەوجا مەبەستیان لەوە هەرچییەک بووبێت) تەنیا پاش فراژووتنێکی مێژووکردی سەخت و درێژخایەن پەیدا دەبێت و کۆمەڵگەی جۆراوجۆر ڕێگەی دوور و نێزیکیان لەبەردەمدایە بەرەو ئەو ئامانجە، هەر یەکەیان بە پێی ئەو پلەی فراژووتنەی پێی گەیشتووە.

ڕاستە میلل لە پێوەندیدا بەو باوەڕی فراژووتنەی لە سەدەی نۆزدەیەمدا باو بوو ڕاڕاتر بوو لە سپێنسەر، بەڵام میلل سنوورێکی ئاشکرا، لە نێوان تێڕوانینی خۆی و بۆچوونەکانی سەدەی هەژدەیەمدا، دەکێشێ. میلل لە بیرەوەییەکەیدا باس لەوە دەکات چۆن لە ژێر تاوی فەیلەسووفە فرانسییەکانی مێژوو گەیشت بەوەی هۆش و ڕۆشناکی ناتوانن ڕاستەوخۆ هەموو جۆرە ژینگەیەکی سیاسی و ئابووری بگۆڕن. میلل نۆڕینی فراژووتنەکەی خۆی لە دیمانەیەکدا دەچەسپێنێ کە سەر بە دەروونی مرۆڤە – لە ئەنجامدا هەموو کارەکە دێتەوە سەر ئەوەی گەشە بە دەروونی مرۆڤ بدرێت– میلل دەڵێ «لە دەروونی مرۆڤدا جۆرە

نارێکییەک هەیە لە ئاست بەرەو پێش چوونی مومکین و وەها دەکات کە چەند بابەتێک پێش بابەتی دیکە بکەون، حکوومەت و ڕێبەرانی فیکری گەل دەتوانن ئەو نارێکییە تارادەیەک بگۆڕن بەڵام مەودای گۆڕینەکەیان بێسنوور ئاواڵە نییە».

میلل لە کتێبی *Considerations on Representative Government* دا، لە بواری دەزگەی سیاسی و فراژووتنی ئەو دەزگەیانەدا، نۆڕینی میکانیکی لە نۆڕینی زیندەڵ جودا دەکاتەوە. بە نۆڕینی میکانیکی، کە دەکرێ بە مالی ڕۆشناکی دابنرێ، بەگشتی دەشێ ڕشتەی سیاسی لە هەر جێیەک و لە هەر دەمێکدا بێت دابمەزرێ - هەر ئەوەندەی بەسە مرۆڤ خۆی بڕوای بەوە هەبێ ئەو ڕشتەیە ڕشتەیەکی هۆشمەندانەیە و بتوانێت بە خەڵکی دیکەشی بسەلمێنێت. بە بۆچوونی زیندەڵ، بەهیچ جۆرێک ناکرێ بەزگەی سیاسیی بکرێتە بابەتێک بۆ هەڵسەنگاندن، «بەگشتی دەبێ ئێمە وەک خۆیان وەریان بگرین».

بە بڕوای میلل هەردوو بۆچوونەکە ناجۆرن و پێشنیازی سازانێک دەکات. ڕشتەی سیاسی بەرهەمی خواست و هەڵسەنگاندنی مرۆڤانەیە. فراژووتنی سیاسی وەک فراژووتنی درەختێک کوێرانە نییە، خەڵک هەمیشە دەرفەتی ئەوەیان هەیە لە نێوان ڕشتەی جۆراوجۆردا هەڵبژێر بن.

بەڵام ئەو ئازادییە بێسنوور نییە. حوکومڕانیی هەمەجۆر داوای ڕەسێنێکی گیانەکیی هەمەجۆر لە خەڵکی ژێر فەرمانی خۆیان دەکەن. گەلێکی نارۆشناک نابێتە خاوەنی ئازادیی سیاسی و مافی سیاسی. خێڵە ساکارەکان تەنیا بە زۆرداری دەچنە ژێر فەرمانی حوکومڕانییەکی ژیارمەند (میلل لە ناو ئیمپێریالیستاندا ئیمپێریالیستێکی خەست بوو).

مێژووینۆڕیی میلل یەکجار *ئایدیالیستانە* بوو. فراژووتنی مێژووکرد، سەرەما و بنەمای هەر فراژووتنی هۆش و زانیاری مرۆڤە. پرسیار لێرەدا ئەوەیە چۆن ئەم مێژوونۆڕییە لەگەڵ ئەو باوەڕی ئابووریی سیاسیی کلاسیکە دەگونجێت کە میلل بڕوای پێیەتی و فراژووتنی چوستیی بەرهەم هێنانی مایەکی تێیدا بۆتە جێگەی سەرنج. میلل ئەم کارەی بەوە بۆ چۆتە سەر کە - بەپێچەوانەی ئادەم سمیت و داڤید ڕیکاردۆ David Ricardo و ئەوانەی دیکەی بەر لە خۆی - توانیویەتی سنوورێکی ئاشکرا لە نێوان ***بەرهەم هێنان*** *production* و ***دابەش کردن*** ی *distribution* شتوومەکدا بکێشێ. بەرهەم هێنان پێوەندە بە سروشتی ئەو شتانەی بەبەرهەم دێن، گەشە کردنی بەرهەم هێنان پلەوپایە لە دەستووری سروشتەوە وەردەگرێ، بێ ئەوەی خواستی مرۆڤ دەستێکی لەوەدا هەبێ. بەڵام دابەش کردن - واتە دابەش کردنی بەرهەم بەسەر چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا - مەسەلەیەکە بەندە بە هەڵسەنگاندنی مرۆڤانەوە. بەو جۆرە دابەش کردن - بەدوا ئەویشەوە پێوەندیی ئابووری -

هەمان پلەی حوکومڕانی و ئازادیی سیاسی و مافی سیاسی وەردەگریّ: خەسڵەتەکانیان لە دوا هەنگاودا هەر بەندە بە پلەی فراژووتنی گیانەکیی مرۆڤ و چینەکانی کۆمەڵگەوە. جۆرە ئازادییەکیش هەیە لە هەڵبژاردنی شێوەی دابەشینی ئابووریدا، بەڵام ئازادییەکە بێسنوور نییە.

میلل کە دێتە سەر باسی ئازادیی سیاسی، بێ پێچوپەنا لە گرنگیی فراژووتنی گیانەکی دەدویّ. ئازادیی دەربڕین جێگیر نابێ لە نێو «کۆمەڵگەی دواکەوتووی وەهادا کە سەرلەبەری گەل تێیدا ناڕسکاو بێت». «ستەمکارەتی despotism شێوە حوکومڕانییەکە لەگەڵ بەربەردا ڕەوایە». ئەوجا دەڵێ: «ئازادی وەک بیرێک بەهیچ جۆرێک جێگەی کارپێکردنی نییە لەو هەلومەرجانەدا کە هێشتا مرۆڤایەتی تێیاندا نەگەیشتۆتە ئەو دۆخەی بە گوتوبێژی ئازاد و هاوشان ڕێگەی پێشکەوتن بگرنە بەر». خەڵکی وەها دەبێ شوکرانە بکەن یەکێکی وەک «ئەکبەر Akbar یان کارل Karl ی مەزن» ڕێبەرییان بکات.

سپێنسەریش هەر بەو بۆچوونە دێتە گۆ، ئەمەش کۆپلەیەکی بەناوبانگی ئەوە: «من پێم وایە ستەمکارەتی، ئەریستۆکراتی، حوکومڕانیی کەشیشان و هەموو بەڵایەکی دیکەی ئازاری مرۆڤایەتی دەدەن پێویستن بۆ ئەوەی دەروونی مرۆڤ زاخاو بدریّ، پێشم وایە هەموو گەلێک دەبێ، بە هەموو دۆخە جۆراوجۆرەکانی نێوان ڕەهایەتی و دیمۆکراتیدا گوزەر بکەن بۆ ئەوەی بە ئازادییەکی چەسپاو بگەن. ئەگەر نەتەوەیەک بە زەبر و زۆری هێزی لەش خۆی ڕزگار بکات و بێ ئەوەی بەو ئەزموونە ئاکارەکییانەدا گوزەر بکات بە ئامانجی خۆی بگات، ئەوا بڕوا ناکەم ئازادیی وەها بەردەوامیی هەبێت».

لەم بوارەدا، میلل و سپێنسەر، تەنیا لە ڕابوردوو نادوێن. گەلانی ئەورووپا بەو زاخاودانەدا تێپەڕیون و ئێستە بۆ ئازادیی سیاسی پێگەییون، بەڵام زۆربەی گەلانی ئەورووپابەدەر هێشتا هەر بەربەرین. لەبەر ئەوەیە کە دیاردەیەکی ئاساییە ئیمپراتورییەتی ئینگلیزی وەک ستەمکارێک لە بەشەکانی دیکەی دنیادا حوکومڕانی دەکات.

کەواتە جیاوازی لە نێوان نۆڕینی میلل و سپێنسەردا، لە قۆناخەکانی فراژووتنی سیاسی، تەنیا جیاوازیی پلەیە نەک جیاوازیی جۆر. میلل لە قۆناخە جۆراوجۆرەکانی فراژووتندا، دەرفەتێکی هەڵبژادنی کەمێک فرەوانتر دەدات بە مرۆڤ وەک لەوەی سپێنسەر دەیدات. بەڵام جیاوازیی بۆچوونی ئەو دووانە لە هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی سیاسیی «ژیارمەند» – واتە ئەورووپی – دا دەردەکەوەیّ. لای سپێنسەر هیچ گومانێک نییە لەوەی چ ڕشتەیەکی سیاسی دەبێ لەوێدا دابمەزریّ. میلل پێی وایە ئاڵتێرنەتیف زۆرە و دەکریّ یەکیان هەڵبژێردریّ.

دەتوانین جیاوازیی نێوانیان وەها دەرببڕین: ***بە نۆڕینی میلل مەسەلەی باشترین ڕشتەی سیاسی دۆزینی ئاکارەکییە، بە نۆڕینی سپێنسەر ئەم مەسەلەیە، لە ئەنجامدا، هەر دۆزینێکی بایۆلۆگیانەیە.***

کۆمەڵگەنۆڕیی سپێنسەر ڕەگی لە دیمانەکەی خۆیدا داکوتاوە کە دەربارەی فراژووتنی بایۆلۆگیانەیە. ئەو دەستوورانەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەبەن بەڕێوە هەر ئەوانەن فراژووتنی بایۆلۆگی دەبەن بەڕێوە.

سپێنسەر کۆمەڵگە ناو دەنێ «ئۆرگانیزمی کۆمەڵایەتی». ئەمەش مانای ئەوە نییە سپێنسەر خۆی دەداتە پاڵ ئەو کۆمەڵگەنۆڕییە زیندەڵەی کە میلل باسی لێوە دەکات و بۆ نموونە لە کۆنەوارەتیی سەدەی نۆزدەیەمدا بووە باو. مەبەستی سپێنسەر ئەوەیە لە قۆناخە بەرزەکانی فراژووتنی «ئۆرگانیزمی کۆمەڵایەتی» دا، هەر دەبێ تاکەکیەتی سەر هەڵدات. سپێنسەر پێی وایە ئەم دیاردەیە تەواو هاوئاهەنگە لەگەڵ دەستوورە گشتییەکانی فراژووتندا، کە خۆی دایرشتوون و دەڵێن: فراژووتنی کۆمەڵگە دەکاتەوە جیاکارییەکی بەهێزتر کە لە ئەنجامدا تاکەکەسان، لە کۆمەڵگەی توند سازدراودا، وەک یەکەیەکی سەربەخۆ دێنە پێش.

کە گوترا کۆمەڵگە، ئۆرگانیزمێکی کۆمەڵایەتییە مانای ئەوەیە ئەو دەستوورانەی فراژووتنی ئۆرگانیزمی بایۆلۆگی دەبەن بەڕێوە، بەگشتی هەر خۆیانن کە فراژووتنی کۆمەڵگەش دەبەن بەڕێوە. فراژووتنی بایۆلۆگیانە جودابوونەوە و یەکگرتنی بەهێزی بە دەمەوەیە. ئۆرگانیزمی هەرە نزم ئەندامی تەواو جوداکراوەی نییە، بەڵام ئەوانە یەکەیەکی تەواو ڕسکاویش نین: ئەمیبیا Amoeba بریتییە لە یەک خانە، بە دابەشبوون زاووزێ دەکات. ئۆرگانیزمی هەرە بەرزیش چەندین ئەندامی تایبەتکاری هەیە و هەر یەکەشیان یەکەیەکی تەواو جودایە.

ئۆرگانیزمی کۆمەڵایەتیش بە هەمان جۆرە گۆڕانکاریدا گوزەر دەکات. یەکەم یەکگرتن لەو دەمەدا پەیدا دەبێ «کە خێزانی ڕەوەند، وەک پوشمانەکان ‹گەلێکن لە خوارووی ئەفەریقا› یەک دەگرن و خێڵی گەورەتر پێک دێنن. پێشکەوتنی دیکەی لەو بابەتە، کە لە هەموو جێیەک خۆی دەنوێنێ، ئەوەیە خێڵی بەهێز سەر بە خێڵی بێهێز شۆڕ دەکات و سەرخێڵی ئەمیان سەر فروو دێنێ بۆ سەرخێڵە بەهێزەکە». لە ئاستێکی نزمی فراژووتندا، بەدەگمەن نەبێ، ئەم یەکگرتنانە بەردەوامییان نابێ بەڵام لە ئاستێکی بەرزی فراژووتندا بەردەوام و چەسپاو دەبن. سپێنسەر پێی وایە، لە ژیاری ئەورووپاییدا نیشانەی یەکگرتنێکی نەتەوەبەدەر هەیە، سپێنسەر «بۆ شوێنپێی سەرهەڵدانی کۆدەوڵەتێکی ئەورووپایی دەگەڕێ».

له ناو یەکەی نەتەوەییشدا جودابوونەوە و یەکگرتنی وەها دروست دەبێ. جودابوونەوە بەر لە هەر شتێک دەکاتەوە ئەوەی کە خەڵک لە کار و ئەرکی جۆراوجۆردا تایبەتکار بن. «دوو ڕشتەی جیاواز پەیدا دەبێ، ڕشتەی فەرماندەر و ڕشتەی کارگەر». لە ناو ئەم دوو ڕشتەیەدا جودابوونەوەی دیکەش دروست دەبێ. بەلام ئەو یەکانەی پەیدا دەبن سازمانەکانیان بەردەوام توندتر دەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەستترین وێکچوون لە نێوان فراژووتنی ئۆرگانیزمی بایۆلۆگیانە و فراژووتنی کۆمەڵگە لەم دەستوورە گشتییانەی فراژووتندا نییە، کە بە بڕوای سپێنسەر بۆ هەموو بوارێکی هەڵکەوت دەست دەدەن، بەڵکوو وێکچوونەکە ***لەو میکانیزمەدایە کە فراژووتنەکە بەرەو پێش دەبەن.***

دیمانەکەی داروین دەربارەی فراژووتنی جۆر لەسەر ئەو گریمانەیە بنیات نراوە کە دەڵێ: گۆڕینی جۆر بە پێی ***هەڵبژاردنێکی سروشتەکی*** ڕوو دەدات. داروین دەڵێ لە ناو هەموو جۆرێکدا نیمچە جیاوازییەک هەیە. لە ناو هەموو جۆرێکیشدا ئەوەندە تاکی تازە دەزێ کە ناکرێ هەر هەموویان بەرژیان بن. لەبەر ئەوە دەبێ لە پارزۆنگ بدرێن، هەڵبژاردەیەک، واتە ئەو تاکانەی باشتر لەگەڵ ژینگەکەدا دەگونجێن، دەمێننەوە. پاش ماوەیەکی یەکجار درێژخایەن سەرلەبەری جۆرەکە دەگۆڕدرێت.

بەر لەوەی داروین ئەو دیمانەیەی خۆی پێشکەش بکات، سپێنسەر باسی لەوە کردووە کە جۆر بەرگۆڕە و دەشڵێ گۆڕانەکە بە هەڵبژاردن دەبێ. سپێنسەر زاراوەی ***هەڵبژاردنی سروشتەکی*** بەکار نەهێناوە، بەڵکوو *survival of the fittest* ی بەکار هێناوە ‹کە لەوانەیە بە کوردی ببێت بە ***مانەوەی هەرە لەبار***› مەبەستی گوتەکەش ئەوەیە کە مانەوە بۆ ئەوەیە لە هەمووان لەبارترە. داروین گوتەکەی سپێنسەری هەڵگرتەوە، ماوەیەکی درێژخایەن ئەم گوتەیە بووە جۆرە بانگدانێک بۆ ئەو دیاردە فرەپەلهاوێژەی پێی دەگوترێ داروینیایەتی darwinism.

سپێنسەریش وەک داروین، ئیلهامی دیمانەی هەڵبژاردنەکەی خۆی لە دیمانەی دانیشتوانەوە هێناوە کە توماس مالتوس Thomas Malthus (١٧٦٦-١٨٣٤) ی کەشیشی ئینگلیز و پسپۆڕی ئابووریی سیاسی، داینابوو. ئەم دیمانەی دانیشتوانە دەڵێ لە باری ئاساییدا زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان خێراترە لە زیادبوونی خۆراک. دیمانەکەی مالتوس تەنیا دەربارەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە و دەڵێ مەسەلەی هەژاری هەرگیز بە زیاد کردنی چوستیی بەرهەم هێنان، چارە نەکراوە. مالتوس ئاکامێکی ڕەشبینانەی گرتبوو. سپێنسەر هەر ئەو دیمانەیەی فرەواند بۆ ئەوەی هەموو گیانلەبەرێک بگرێتەوە و کردیە بەڵگەی ئەوەی هەموو فراژووتنێک و هەموو پێشکەوتنێک لە ڕێی هەڵبژاردن و هاوچاوییەوە

پەیدا دەبێ و هاوچاوی گرنگترین مەرجە بۆ ئەوەی پێشکەوتنی دیکەش ڕوو بدات. کۆمەڵگەیەک ڕێگە نەدات هەرە بەهێز و لەبار بەسەر ئەوانەی دیکەدا سەرکەوتوو بێت، کۆمەڵگەیەکە نەیاری فراژووتن.

سپێنسەر، بەم شێوەیە، دیمانەیەکی بایۆلۆگیانەی یەکجار بەدەسەڵات کۆدەکاتەوە بۆ باوەڕە لیبەڕالەکەی خۆی دەربارەی کۆمەڵگە. سپێنسەر پێی وەها بوو ئەو کۆمەڵگە لیبەڕالەی هاوچاویی تێدا ئازادە و دەرفەت دەدات بە هەموو کەسێک بێسنوور خۆی دەوڵەمەند بکات، تاکە کۆمەڵگەیە، کە پاش ئەوەی خەڵک دەگەنە پلەیەکی «ژیارمەند»، بتوانێت فراژووتن بەرەو پێشەوە ببات.

سپێنسەر یەکڕەو لەگەڵ ئەو ڕوانگە بایۆلۆگییەدا باسی فراژووتنی کۆمەڵایەتی بە زاراوەی وەک ڕەگەز و بنچی بایۆلۆگیانە دەکات. لە کۆمەڵگەی تاڕادەیەک سەربەخۆدا، بنچێکی نوێ لە جۆری *homo aspiens* (مرۆڤ) پەیدا دەبێ. نوێنەرانی باوەڕی ڕەسین evolution – کە سپێنسەر یەکێکە لەوان – مەودایەکی یەکجار درێژخایەنیان بۆ گۆڕانکاریی بایۆلۆگیانە دادەنا، کەچی زۆر جار ئامادە بوون گۆڕانکاریی نێو خەڵک لە ماوەی چەند سەدە یان دەساڵێکدا ببینن. سپێنسەر دەڵێ: «ئێمەی ئەنگلۆ-ئەمریکان نموونەیەکین لە بنچێکی نوێ کە لەم چەند نەوەیەی داوییدا پەیدا بووە، ئەگەر بڕوا بە دەنگ وباسیش بکەین، ئەوا نموونەیەکی وەها خەریکە لە ئاوسترالیاش پەیدا دەبێ».

سپێنسەر فراژووتنی بایۆلۆگیانە بە هێزی چارەنووس دادەنێ کە خەڵک دەبێ ملی بۆ کەچ بکەن. ئەگەر ***پەلەی ژیان*** *struggle for existence* لە کۆمەڵگەیەکدا نەمێنێ، ئەوا هەر زوو ئەو کۆمەڵگەیە لە کاروانی فراژووتن بەجێ دەمێنێ. سپێنسەر جەخت لەسەر ئەوە دەکات و دەڵێ: «ئەگەر کۆمەڵگەیەک زیان لە ئەندامە بەرزەکانی خۆی بدات و سوودی بۆ ئەندامە نزمەکانی هەبێت، توانای نامێنێت لە خەباتی دژ بە کۆمەڵگەی دیکەدا خۆی ڕابگرێ، ئەمەش وەک چۆن بۆ جۆر و بنچی دیکە دەست دەدات هەروەهایش بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیش دەست دەدات».

سپێنسەر پێی وایە ئەو خەتوخاڵەی خۆی بۆ سازمانی سیاسیی کۆمەڵگەی پێشکەوتووی دەکێشێ، ڕاست و ڕەوان لەسەر ڕێبازی باوەڕی بایۆلۆگیانە دەڕۆن بەڕێوە. ئەمەش گوتەیەکی تەواو بەرگومانە. جاروبار ئاوازێکی ئاکارەکی تێکەڵ بە نۆڕینە بابەتەکییەکانی سپێنسەر دەبن، ژێر کەوتنی کۆمەڵایەتی و داماوی، دەبنە سزایەکی ڕەوا بۆ ئەوانەی بێکەڵکن – ئەگەر سزاکە لە خوداوە نەبێ، ئەوا لەو ***نەناسراو***ەوەیە کە وەستای نادیاری فراژووتنە:

«داماویی مرۆڤی بێکەڵک، ئەو نەگبەتییانەی تووشی کورتبینان دەبن، برسیەتی تەمبەڵان و دەرکردنی لاوازان لە لایەن خەڵکی بەهێزەوە، کە ئەو هەموو خەڵکە ڕەوانەی هەژاری و مەینەتی دەکەن، بەرهەمی چاکەخوازییەکی گەورە و فرەوانبینە».

### ٤- ئازادی و شێوازەکانی حوکومڕانی

سپێنسەر و میلل ڕێکن لەسەر ئەوەی کۆمەڵگەی کارا دەبێ کۆمەڵگەیەکی چیندار بێت. خەڵک ئەرکی جۆراوجۆریان لە گشتەی کۆمەڵایەتیدا هەیە و دەبێ تاوی ئابووری جۆراوجۆر و پلەوپایەی کۆمەڵایەتیی جۆراوجۆریان هەبێ.

میلل وسپێنسەر پێیان وایە کۆمەڵگەی وەها دەشێ ببێتە کۆمەڵگەیەکی هاوئاهەنگ. ئەمان بروایان بە هاوکاریی چینایەتی هەیە نەک خەباتی چینایەتی. تەنانەت سپێنسەریش پێی وایە کرێکاران - بەڵام مەبەست لێرەدا کرێکاری زیرەک و سەلار و بەڕاستی بەرهەمهێنە - مافی ئەوەیان هەیە داوای داهات و سەلامەتیی خۆیان بکەن. بەڵام بە ڕکەوە ڕووبەڕووی بیرۆکەی سازمانی سیاسی و سەندیکای خەبات دەبێتەوە. میلل لە ئاست بۆچوونی سۆسیالیستانەدا بەگومانە و تەنیا پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد ئەوجا وێڵیان دەکا، بەڵام سپێنسەر هەموو داواکردنێکی یەکسانی ڕەت دەکاتەوە و بە ساکارەتییەکی سانای دادەنێ: کۆمیونیزم و سۆسیالیزم لە قۆناخێکی فراژووتنی یەکجار زوودا جێگەیان دەبێتەوە.

ڕشتەی سیاسی بەلای سپێنسەرەوە تەنیا ئۆرگانێکی یاریدەرە بۆ ڕشتەی ئابووری و کۆمەڵایەتی. مادام ڕشتەی سیاسی فراژووتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەپارێزێ و تەنانەت دنەشی دەدات، ئەوا دەبێ ئەو ڕشتەیە بپارێزرێ. بەڵام هەر ئەوەندە بووە کۆسپ ئەوا دەبێ لاببرێ و بگۆڕدرێت بە ڕشتەیەکی دیکەی وەها کە لەبارتربێت بۆ فراژووتن.

گوتەکانی سپێنسەر لەم بوارەدا کورت و بێتەگەرەن. بەڵام میلل سەنگێکی سەربەخۆ دەدات بە هەلومەرجی سیاسی. گوتەکانی میلل لەم بوارەدا - بە تایبەتی لە *Considerations on Representative Government* - تێروتەسەل و پڕ لە ڕا و بۆچوونن و نۆرەیەکی یەکجار گەورەیان لە گوتوبێژی سیاسیی داهاتوودا بینی.

وەک باسمان کرد، میلل بەوە خۆی لە نووسەرانی ڕۆشناکی جودا دەکاتەوە، کە پێی وایە شێوازی حوکومڕانی بەندن بە قۆناخی فراژووتنی مێژووکردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا چەند ئادگارێکی ڕۆشناکی لە دنیای بۆچوونی میللدا هەیە. بۆ نموونە، میلل شێوازی

حوکومڕانی بە «تەنیا ئامراز» ێک دادەنێ و - وەک مۆنتێسکیۆ - پێی وایە بڕوا هێنان بەوەی خودی شێوازەکە دەستەبەری چاکی و هۆشمەندیی حکومەتەکەیە، کارێکی ناجۆرە. دەشێ بڵێین میلل لە نێوان دوو لایەندایە، کەمتەرخەمیی سەدەی هەژدەیەم لە ئاست خەسڵەتی ڕەسمیی حوکومڕانی لە لایەک و سەرگەرمیی ناوازی سەدەی بیستەم بە شێوازی سیاسییەوە لە لایەکی دیکەوە.

میلل گومانی نییە لەوەی حوکومڕانییەکی گەلیز، واتە جۆرێک لە دیمۆکراتی، شێوازێکی لەبارە و بەرپەرچی نووسەرانی ڕۆشناکی دەداتەوە لەوەدا کە بڕوایان بە خێری ستەمکاری ڕۆشناک هەیە - ئەو باوەڕە لە ڕۆژگاری میللدا هێشتا تەواو لەناو نەچووبوو. بێگومان لەو باوەڕەدا، کۆکردنەوەی هەموو بڕیارێکی سیاسی لەدەست تاکە یەک کەسدا، کارێکی باش بوو. بەڵام میلل دەپرسێ: ژێردەستانی ستەمکارێکی وەها چییان بەسەر دێ؟ خۆ ئەوانە ناتوانن خۆیان لە هیچ بوارێکدا گورج بکەنەوە. ئەوانە دەبنە ئاپۆرەیەکی بێخواست. ئەوجا ئەگەر لە مەسەلەیەکی تایبەتدا، زۆرینەی ئەمان خاوەن یەک ڕا بوون - ستەمکارەکە چی دەکات؟ ئەگەر خواستی زۆرینە بسەلمێنێت لە ستەمکاری دەکەوێت، ئەگەر نایسەلمێنێت، ڕاپەڕین هەڕەشە دەکات.

ئەم ڕەخنەیەی میلل پیشانی دەدات کە جۆرە نیسبییەتێک دزەی بۆ ناو باوەڕی هۆشی میلل کردووە. لای نووسەرانی ڕۆشناکی هەرگیز گومان لەوە نەدەکرا کە هەموو پرسیارێک یەک و تەنیا یەک وەرامی هەیە هۆشمەندانە بێت. پاشان گرنگ نییە ئەگەر تاکە یەک ستەمکار وەرامە هۆشمەندەکەی لابێت یان زۆرینە، ئەگەرچی هۆی کارەکی وا دەخوازێ ستەمکارەکە بێت.

بە بۆچوونی میلل ڕێگەی بەرەو ڕاستی یەکجار دژوارترە. چۆنی بیر لێ دەکاتەوە، ئەوا ئێستە باسی دەکەین.

بە نۆڕینی میلل مەسەلەیەکی بەڵگەنەویستە کە هەموو گەل - یان چاکتر وایە بڵێین بەشێکی لێهاتووی گەل - دەبێ لە بڕیاری سیاسیدا بەشدار بن. ئەوجا دەشڵێ تەنیا لە یەکەی یەکجار بچووکدا - واتە لە شاری یەکجار بچووکدا - گەل دەتوانێ ڕاستەوخۆ بەشداری بڕیاردان بێت - ***و تەنیا لەبەر هۆی کارەکی*** - دەبێ حوکومڕانییەکی نوێنەرەکی دابمەزرێت، کە تێیدا گەل ڕێگە دەدات بە چەند کەسێکی ژمارە کەم و باوەڕپێکراو کە، لە ئەنجومەنە بڕیاردەرەکاندا، نوێنەرایەتی زۆرینەی گەل بکەن.

ئەم بیرەی دیمۆکراتیی نوێنەرەکییە (بەپێچەوانەی دیمۆکراتیی ڕاستەوخۆی ڕوسۆ) بەلای ئێمەوە پتر دەستەمۆیە. ئەم باوەڕە دۆزەوەی میلل نییە، بەڵام میلل یەکێکە لەوانەی

نۆڕینی *نوێنەرایەتی* داڕشتووە. زۆر لەمێژ بوو بیروڕا دەربارەی ئەنجومەنی نوێنەرەکی، وەک پەرلەمان و بنگەی دیکەی بڕیاردەر، هەبوو. بەڵام بۆ نموونە ئەندامانی پەرلەمان بە پلەی یەکەم بۆ ئەوە نەبوون نوێنەرایەتی خەڵکی دیکە بکەن، بەڵکوو بۆ ئەوە بوون نوێنەرایەتی هەرێم و شار و بەشەکانی کاسبی بکەن. ئەگەر بۆ ئەوەش بانایە نوێنەرایەتی خەڵک بکەن، ئەوا نوێنەری خەڵکی هاوشانی خۆیان نەبوون بەڵکوو نوێنەری ژێردەستەکانی خۆیان بوون: ئەمانە نوێنەرایەتی کۆمەڵێک خەڵکیان دەکرد هەر وەک چۆن جاروبار دەگوترێ فلانە سەرۆک نوێنەرایەتی هەموو دامەزراوەکانی ئەم کۆمپانیایە دەکات.

دیدی نەریتەکی دەربارەی نوێنەرایەتی هیچی بەسەر دیمۆکراتییەوە نەبوو، هەروەها پەرلەمانی نەریتەکیش هیچی بەسەر بنگەی دیمۆکراتییەوە نەبوو. بەستنەوەی بیری دیمۆکراتیی نوێنەرەکی بە بنگەکانی پەرلەمانەوە نوێکارییەکی سەیر بوو لە مێژووی بیری سیاسیدا.

ئەوجا بۆ ئەوەی ئەم بۆچوونە ڕەوایەتییەکی هەبێت، ئەوا دەبوو مەرجی ئەوە دابنێت پەرلەمان و بەتایبەتی پرۆسەی هەڵبژاردن بۆ پەرلەمان دەبێ بگۆڕدرێت. چونکە ئەگەر هەموو گەل - یان زۆربەی هەرە زۆری گەل - مافی دەنگدانی نەبێت و بۆی نەبێت دەنگی بۆ بدرێت، ئەو کاتە پەرلەمان مەگەر بە شێوەیەکی تیان و نادروست بە نوێنەری گەل دابنرێ.

مەسەلەی فرەواندنی مافی دەنگدان یەکێک بوو لە دۆزە هەرە گەورەکانی ئینگلاندی زەمانی میلل. ئەم مەسەلەیەش بەشێکی هەرە گرنگی ئەو نووسینانەی میللن کە دەربارەی شێوازی حوکومڕانیی نوێنەرەکین.

میلل داوای فرەواندنێکی یەکجار بەرین دەکات، بەڵام کاتێک دێتە سەر باسی مافی دەنگدانی وەک یەک و گشتی، ڕاڕایە. میلل چەند گومانێکی هەیە و لێی بوونەتە خەسڵەتێکی تەواو ئاشکرا و لە ناو بیرە سیاسییەکەیدا تەواو درەخشانن. میلل دەڵێ مافێکی دەنگدانی تاڕادەیەک سەرلەبەر ئامانجێکە هەوڵی بۆ دەدرێ. بەڵام مەرجی ئەو کارەش لەوەدایە ڕادەی تێگەیشتنی گەل بەرز بکرێتەوە، گەلێک ئەندامانی پەرلەمان هەڵبژێرێت نابێ نەزان بێت. گەر وەها بن، ڕایەکی خۆشجڵەو و خەتەرناک پێک دەهێنن. میلل لێرەدا ڕێک مەبەستی لە کرێکارانە، کرێکاران لە دنیای بیری لیبەڕالی ئەودا، گرفتێکی بەردەوامن. کرێکاران دەبێ دەرس دادرێن بەر لەوەی ببنە هاوزێدی تەواو ڕسکاو.

لەگەڵ ئەوەشدا، گرووپێک هەیە بە بۆچوونی میلل هەرگیز ناشێ مافی دەنگدانیان هەبێ. ئەو گرووپەش بریتییە لەوانەی هەژارانە وەردەگرن. ئەوەی نەتوانێ بە کاری خۆی، خۆی بژێنێت بۆی نییە دەنگی لە ئەنجومەنەکاندا هەبێ، کە بەشێکی کاریان ئەوەیە بڕیاری مەسرەف و باجی ڕەسمی بدەن. ئەم جۆرە کەسانە هیچ بەرژەوەندێکیان لەوەدا نییە پارە پاشەکەوت بکرێ، بەپێچەوانە، ئەمانە زیاتر لە خەمی زێدەمەسرەفیدان.

ئەم بۆچوونەی میلل دەربارەی وەرگرانی هەژارانە، داشکانێکە بەلای ئەو بۆچوونەی لە دەستووری دەنگداندا ئەو دەمە زۆر توندتر خۆی دەنواند، بۆ نموونە لەوانەی پێیان دەگوترا بڕیاری تایبەتمەندی و وەهای کردبوو مافی دەنگدانی هاوزێدان بەپێی سامانی ئابوورییان بڕیاری لەسەر دەدرا. میلل نەیتوانیوە خۆی لەو بۆچوونە ڕزگار بکات کە دەڵێ مرۆڤ دبێ بەوەی باج دەدات، لە ڕووی ئابوورییەوە ببێتە خاوەن مافی دەنگدان. بەڵام دەشڵێ ئەوانەی باج دەدەن دەبێ هەر هەموویان وەک یەک مافی دەنگدانیان هەبێ و، ئەوانەی داهاتیان لەوە کەمترە باجی لێ بدرێت دەبێ بۆیان هەبێ مافی دەنگدان بە پارەیەکی کەم بۆ خۆیان بکڕن.

کاتێک میلل باس لەو شێوە حوکومڕانییە نوێنەرەکییە دەکات کە نەخشەی بۆ کێشاوە، مەبەستی ئەوە نییە ئەو حوکومڕانییە خۆی گرفتە گرنگەکانی سیاسەت و کۆمەلایەتی و ئابووری چارە بکات، نەخێر ئەو پێی وایە ئەمە ڕێگەیەکە لە هەمووان مەترسیی کەمترە بەرەو ئەوەی لە دەوڵەتانی ڕۆژاوای ئەو دەمەدا بگەیت بە چەند ئامانجێکی گرنگ.

بە نۆڕینی میلل، دیمۆکراتیی نوێنەرەکی مەترسیی گەورەشی تێدایە. چینی کرێکاران لەناو ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەیە دەبنە زۆرینە. ئەمەش گرفتی گەورەی بەدەمەوەیە: دەشێ ڕای گشتیی هەڵبژێر نابەهرەمەند دەرچێ و پاڵێوراوی نابەهرەمەند بۆ پەرلەمان و ...هتد پێشکەش بکات. بەڵام تەگەرەی گەورە لەوەدایە ئەم چینە وەک چین بێتە پێش و بەرژەوەندی چینایەتیی خۆی پێش بەرژەوەندی گشت کۆمەڵگە بخاتەوە. دوور نییە چینگۆڕکێ ڕوو بدات.

ئەم مەترسییانەی میلل لێیان دەدوێ، کە چین و دەستە لە بری تاکەکەس، لە دنیای سیاسەتدا دەسترۆ بن، وێنەی بەرهەستیان هەیە لە وریاکردنەوەکانی ڕوسۆدا دەربارەی بەرژەوەندی گرووپ و دەستە. بەڵام بۆچوونی میلل دەربارەی چارەسەر کردنی ئەم گرفتانە تەواو جیاوازە. کاری نموونەکی لای میلل ئەوە نییە خواستی گشتی لە ڕادەبەدەر تاکەکی بێت، بەپێچەوانەوە، دەبێ چەندین خواستی تەواو تاکەکی هەبن و ئەوەی لەنێویاندا لە هەمووان بەرزترە، سەنگینتر دەبێ و بۆی هەیە ڕێبەرایەتی فراژووتن بکات.

میلل پێی وا نییە یەکەم هێزی بزوێنەری فراژووتن لە پەرلەمان و کۆڕی گەورەی هەڵبژێراندا بێت. ئەوەی لە ئەنجامدا فراژووتن بەرەو پێشەوە دەبات ئەو بیروڕا بلیمەت و مەزنانەیە کە لە مرۆڤی بلیمەت و مەزنەوە پەیدا دەبن. حوکومڕانی لە دەوڵەتدا دەبێ بە شێوەیەکی وەها بێت کە بنەمایەک بۆ ئەو بلیمەتییە خۆش بکات و بە کردەوە بیانخاتە کار.

میلل لە *On Liberty* دا کە یەکێکە لە کتێبە هەرە باو و ناسراوەکانی خۆی، باس لەم بۆچوونانە دەکات. ئەم کتێبە ڕوونی دەکاتەوە بۆچی میلل هێندە سوورە لەسەر ئەوەی شێوازی حوکومڕانی «تەنیا ئامرازە».

پیرۆزترین مافی سیاسی، بەلای میللەوە، مافی دەنگدان نییە، بەڵکوو ئازادیی دەربڕینە. نرخی ئەمیشیان بە پلەی یەکەم لەوەدا نییە ڕەزامەندی بە تاکەکەس دەبەخشێ، بەوەی تاکەکەس ڕێگەی پێ بدرێ بێکۆسپ دیتنی خۆی دەرببڕێ. بەڵکوو لەوەدایە بەر لە هەر شتێک ڕێگە خۆش دەکات بیروڕای نوێ بێتە کایەوە. لە کۆمەڵگەی وەک ئەوانەی ڕۆژاوا ***بیروڕای نوێ مەرجە بۆ پێشکەوتن.*** لەبەر ئەوە دەبێ ئازادیی دەربڕینی بیروڕا سەرلەبەر بێت. گرنگ ئەوەیە بیروڕای سەرپەرێش دەرفەتی دەربڕینیان هەبێ. دەشبێ پێشەمییان بدرێتێ نەک بترسێنرێن و پاشەکشەیان پێ بکرێ، چونکە لەوانەیە بابەتی نوێ و نەزموو ئەندازەیەک ڕاستیی بیر لێ نەکراوە – و خەیاڵبەدەر– یان تێدابێ.

میلل هەڵکشانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بە هاوشانی فراژووتنی زانستی دادەنێ. لە ڕاوێژی زانستیدا دەبێ هەموو بیروڕایەک بە ئازادی باس بکرێن، تەنیا بەو جۆرەش دەکرێ بخرێنە ئەزموونەوە بۆ ئەوەی هەرە دروستەکەیان بدۆزرێتەوە. بە هەمان شێوەش دەبێ هەموو بیروڕایەک لە بواری گوتوبێژی گشتیدا باس بکرێن. ئەوەش تاکە ڕێگەیە بەرەو «ڕاستی». بێ ئەوەی بزانین ڕاستی چییە ناتوانین لە سنووری مومکیندا دنیا چاک بکەین. ڕێگە نەگرتن لە بیروڕای ناواز یەکجار گرنگە، چونکە بیروڕای ناواز یان شێتانەن یان بلیمەتانەن. ئەوجا بەلای میللەوە، هەر دەسەلاتی ستەمکار و دەستوور دانانی چەوت نین دەبنە کۆسپ لە ڕێی بیروڕای ناوازی لەو بابەتە، بەڵکوو ڕای گشتیش هەمان مەترسی لێ دەکرێت. ڕای گشتی دەشێ خاو و گوێنەدەر بێت. لەمیشدا، وەک لە کۆڕی بەرفرەوانی هەڵبژێراندا، مەترسیی ماندووبوون و هۆشکوڵی و نەزانی هەیە.

لە باوەڕی ئازادیی میللدا خاڵێکی خەتەرناک هەیە، ئەویش ئەو خاڵەیە بیر تێیدا دەبێتە کردەوە، واتە لەو خاڵەدا کە بیری چاک تێکەڵ بە هەڵکەوت دەکرێ. ئەو گوتوبێژە گشتییەی ئەو لێی دەدوێ هەر بەڕاستی تەنیا گوتوبێژە. هەرگیز نابێ بیر، هەرچەندێکیش باش بێت، یەکسەر بە کردەوە بسەپێنرێت. ئالێرەدایە شێوازی حوکومڕانی، بۆ نموونە: پرۆسەی

هەڵبژاردن، رۆتینی پەرلەمان و پرۆسەی بڕیاردان، دەبنە لایەنی ڕێکخەر و پارسەنگ. میلل ترسی لە کردەوەی پەلە هەیە. نموونەیەکی هەیە بەناوبانگە و گەلێک جاریش لە لایەن سۆسیالیستە نەیارەکانییەوە دووبارە دەکرێتەوە:

«بۆ نموونە بۆچوونێکی دەڵێ بازرگانی گەنم خەڵکی هەژار دەکوژێ لە برسان، یان ئەوەی دەڵێ مولکایەتیی کەسەکی دزییە، ئەگەر تەنیا لە ڕۆژنامەکاندا خول بخوات، دەبێ بێکۆسپ ڕێگەی دەربڕینی هەبێت، بەڵام ئەگەر لەناو ئاپۆرەی خەڵکی وورووژێنراودا کە لە بەردەم مەخزەنی کابرای گەنمفرۆشدا خڕبوونەتەوە، جاڕی بۆ بدرێ ئەوا دەبێ بدرێت بە دادگە...».

### ١- سۆسیالیزمی سەدەی نۆزدەیەم

لە سەدەی نۆزدەیەمدا چەندین ڕێبازی لە ناو خۆدا دژ بەیەک، بە ناوی سۆسیالیزمەوە، هەڵنران. خاڵی هاوکۆ لەم ڕێبازانەدا ئەوەیە هەر هەموویان خۆیان بە نوێنەری بەرژەوەندی بۆرەپیاو و هەژار و داماوان – بەڵام مەرج نییە هەموو جارێک هەر پرۆلیتاریای پیشەسازی بێت – دەزانن دژ بە چینە ئیمتیازدارەکان (بەگزادە و کەشیشان) لە لایەک و بورژوای پەرەسێن لە لایەکی دیکەوە. سۆسیالیزم پێی وایە بێدادیی کۆمەڵایەتی و ئابووری بەوە لەناو دەبرێن کە موڵکایەتیی کەسەکی بە هەر شێوەیەک بێ بگۆڕدرێت بە موڵکایەتیی گشتی.. بەڵام چارەسەر کردنی ئەم مەسەلەیە، لەو ڕێبازانەدا، هێندە جیاوازە کە خاڵی هاوکۆیان هەر شتێکی بۆش دەردەچێ.

فرەڕێبازیی سۆسیالیزم وەهای کرد وشەی «سۆسیالیزم» فرەواتا بێ و تەمی لێ بنیشێ. بە نۆڕینی کۆنەواران، نێزیکەی هەموو ئەو باوەڕانەی دژ بە ڕشتەی دامەزراون بە سۆسیالیستانە دادەنرێن. لیبەڕاڵەکانیش، ئەو بۆچوونەی داوای ڕێک کردنی بازاڕی بکردایە بە سۆسیالیستانەیان دادەنا. وێڕای ئەوەش، لە ناو ڕێبازە سۆسیالیستەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا یەک ڕێباز هەیە، لە رووی دیمانەکی و ئاڵۆزی و مەودای کاریگەرییەوە لە هەمووان هەڵکشاوترە، ئەویش ئەو ڕێبازەیە کە سەرچاوە لە کارل مارکس Karl Marx و فریدریک ئەنگیلز Friedrich Engels ەوە هەڵدەگرێ. لێرەدا ئەم ڕێبازە دەکەینە تاکە نوێنەری سۆسیالیزمی سەدەی نۆزدەیەم.

بەشێکی بەرچاوی نووسینەکانی مارکس و ئەنگیلز بەرپەرچ دانەوەی بیریارانی سۆسیالیستی دیکەیە. بەشێکی باوەڕە نێوەندەکییەکانی مارکس و ئەنگیلز، ئەگەر بە پاشخانی ئەو باوەڕە هاوچاوە سۆسیالیستانەی دیکەوە بگیرێن، ڕوونتر دەبنەوە. مارکس لە نامەیەکی بەناوبانگیدا، خزمەتی خۆی لە بواری دیمانەی سیاسیدا، لەم سێ خاڵەدا کۆدەکاتەوە:

١) گریمانەی ئەوەی جۆرە جیاوازەکانی کۆمەڵگە (بۆ نموونە: کۆمەڵگەی فیوداڵ و کۆمەڵگەی سەرمایەدار) مێژووکردن، واتە قۆناخن.

٢) باوەڕی ئەوەی ئەم کۆمەڵگە سەرمایەدارە دامەزراوە تەنیا بە شۆڕش دەشکێ، کە دەکاتەوە ئەوەی دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا دابمەزرێ.
٣) باوەڕی ئەوەی ئەم دیکتاتۆرییەی پرۆلیتاریا ڕێگەی بەرەو کۆمەڵگەی بێچین دەکاتەوە.

لەو سێ خاڵەی سەرەوە، دووەم و سێیەمیان دەبنە سنوور و ئەم ڕێبازە لە ڕێبازەکانی دیکەی سۆسیالیزم جیادەکەنەوە. خاڵی یەکەمیش ئاراستەی ئەو گریمانەیە کراوە کە لە ئابووریی سیاسیی کلاسیکدا هەبوو و دەیگوت فراژووتنی مێژووکرد بە پلەی یەکەم مانای ئەوەیە کۆمەڵگە وردە وردە بەرەو کۆمەڵگەی سەرمایەداری ڕسکاو دەچێت. ئەم بۆچوونە تاوی بەرفرەوانی لەسەر چەندین سۆسیالیستیش هەبوو.

لەو سۆسیالیستە بەرچاوانەی مارکس و ئەنگیلز ڕووبەڕوویان دەبوونەوە، ناوی ئەم چەند کەسە دەهێنێ: C-H de Saint-Simon ی فرانسی (١٧٦٠–١٨٢٥)، Charles Fourier ی فرانسی (١٧٧٢–١٨٣٧)، Pierre-Joseph Proudhon ی فرانسی (١٨٠٩–١٨٦٥) و Robert Owen ی ئینگلیز (١٧٧٢–١٨٥٦). مارکس و ئەنگیلز بە ئەمانەیان دەگوت ***سۆسیالیستی ئوتۆپی*** – ئەم وەسفە پاشان لە بواری نامارکسیانەشدا بەکار دەهێنرا بەڵام واتاکەی هەر بەو پاشخانەیەی مارکس و ئەنگیلزەوە دیارە.

Saint-Simon، Fourier، Proudhon و Owen ڕێبازی سۆسیالیستانەی جۆراوجۆریان هەڵنا، بەڵام ئێرە بواری ئەوە نییە بە وردی باسی باوەڕەکانیان بکرێ. لە بری ئەوە چەند خاڵێکی گرنگی جیاوازیی نۆڕینی سۆسیالیزمی ئەوان و مارکسایەتی marxism دەخەینە ڕوو.

١) ئەوەی مارکسایەتی ناوی ناوە سۆسیالیزمی ئوتۆپی پێی وایە چارەسەر کردنی ناکۆکی و بێدادیی کۆمەڵایەتی لە بواری بەرتەسکی ئابووریدایە – کە دەکاتەوە بازرگانیی هەمەجۆر، کشتوکاڵ و کۆبەرهەمی پیشەسازی – بە نۆڕینی مارکسایەتی ئەو چارەسە کردنە لە دەوڵەتدایە: بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بە ڕشتەیەکی کۆمەڵایەتیی سۆسیالیستانە بگات، دەبێ هەر هەموو یەکەی نەتەوەیی بگۆڕێت و پاشان لای بدات.

٢) سۆسیالیزمی ئوتۆپی گەر بەراورد بکرێت بە مارکسایەتی، ناشۆڕشگێڕە. بە ڕای بەشێک لە نوێنەرانی ئەو هێڵانە، سۆسیالیزم بە شێوەیەکی هاوئاهەنگ لە چەند مەیلێکی ناو کۆمەڵگەی سەرمایەدارەوە گەشە دەکات. بەشێکی دیکەیان پێی وایە بواری کۆمەڵایەتی

و ئابووری دەبێ سەرەوژێر بکرێت، بەڵام نەک بواری سیاسی. بەرچاوترین نوێنەری ئەم دوا ڕایە Proudhon ـە، کە بۆچوونەکانی دەبنە ئیلهامبەخشی ئەنارکیزم anarchism (کە تاکەکیەتی و دزاندنی هەموو جۆرە دەسەلاتێکی سیاسی، تێیدا بەهێز بوو) و سەندیکالیزم (کە پێی وایە تاکە ڕێگەی گەیشتن بە سۆسیالیزم خەباتێکی سەندیکاگەری <نەقابی> نانێوەندەکییە).

بە نۆڕینی هەموو سۆسیالیستەکان، هۆی سەرەکیی ئەو بێدادییە کۆمەڵایەتییە دەگەڕێتەوە بۆ هەلومەرجی موڵکایەتیی دامەزراو. بەڵام بە نۆڕینی مارکس و ئەنگێلز، سۆسیالیستە ئوتوپییەکان نوێنەرایەتی مێژوونۆڕییەکی ئایدیالیستانە دەکەن. ئەمەش بەر لە هەر شتێک مانای ئەوەیە کە ئەم جۆرە سۆسیالیستانە چەند بیرێک بە هۆکاری بڕیاردەر دادەنێن بۆ دامەزراندنی سۆسیالیزم - بیرەکانیش بە پلەی یەکەم سروشتێکی ئاکارەکییان هەیە. ئەمانە، بۆ نموونە Proudhon، هەموو فراژووتنی مێژووکرد بەوە لێک دەدەنەوە کە لە بنەڕەتدا بریتییە لە فراژووتنی بیری هەمەجۆر و بەرەبەرە ئاڵۆزتر. ئەمانە پێیان وایە، ئەگەر خەڵک لە ڕێی تێگەیاندنێکی هۆشمەندانەوە لەوە بگەن کە بیروڕای سۆسیالیستانە بیروڕایەکی چاک و دادپەروەرانەیە، ئەوا خەڵک لە هەموو جۆرە چینێکەوە ڕوو دەکەنە سۆسیالیزم.

لەبەر ئەوەیە مارکس و ئەنگێلز پیان وایە سۆسیالیزمی ئوتۆپی مێژوونەکردە و بەگشتیش نازانستانەیە. بەڵام بێگومان هۆی سەرەکیی ئەم چەمکی «ئوتۆپی» یە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی نوێنەرانی ئەم ڕێبازە زۆر جار تاویان دەدا بە پەسنی کەموزۆر خەیاڵمەند دەربارەی ئەوەی کە دەوڵەتی دواڕۆژ چەند بەختەوەر دەبێت. بەتایبەتی Fourier کە هەوڵێکی زۆری داوە نیگاری ئوتۆپی لەو بابەتە بکێشێت. Fourier پێی وابوو ئەگەر خەڵک گوزەرانیان لە ئەوەی خۆی پێی دەگوت *لابال*، واتە کۆمەڵگەی بچووک و تەواو سەربەخۆ، دا ببردایەتە سەر، ئەوا هەموو کەسێک دەرفەتی دەبوو بەهرەکانی خۆی بنوێنێ و هەموو جۆرە دووبەرەکییەک لەناو دەچوو. نەک تەنیا خەڵک دەگۆڕان، بگرە گیانەوەریش کاریان تێ دەکرا و جۆری نوێ و باشتر پەیدا دەبوو. لە شێری کێوی ناشێرێک پەیدا دەبوو خاوەن خەسڵەتی ئاشتیخوازانە.

مارکس و ئەنگێلز نەفرەتیان لەم جۆرە بۆچوونانە دەکرد. نۆڕینی ئەمان دەربارەی کۆمەڵگەی بێچین لەچاو خەیاڵستانی ئوتوپییەکاندا لاواز بوو. مارکس و ئەنگێلز بەو کەسانەی ڕێبازە زانستییەکەی ئەمانیان نەدەسەلماند، دەگوت پێشبین.

### ٢- سێ سەرچاوەکەی مارکسایەتی

کارل مارکس Karl Marx (١٨١٨-١٨٨٣) و فریدریک ئەنگیلز Friedrich Engels (١٨٢٠-١٨٩٥) بەگشتی یەک باوەڕ و دیمانەیان هەبوو. ئەمەش مانای ئەوە نییە هەردووکیان لە ڕووی بیرکارییەوە تەواو وەک یەک بوون: فراژووتنیان، بواری هۆشگیرییان، جۆری زانین و بەهرەوەرییان لایەنی تەواو جیاوازی هەبوو. بەڵام هەردووکیان هەوڵیان دەدا خۆیان لەگەڵ یەکتر بگونجێنن، لە بواری دیمانەکی و کارەکیدا، گوێیان بۆ ئامۆژگاریی یەکتر شل دەکرد و سوودیان لە بۆچوون و توانستی گیانەکیی یەکتر وەردەگرت. لەبەر ئەوەشە بەرهەمەکانیان ئادگاری یەک گرتنی پێوەیە و هەردووکیان بەیەکەوە بوونەتە بنیاتنەری مارکسایەتی.

باوەڕی مارکسایەتی یەک بنچی نییە. مارکس و ئەنگیلز پێوەندییان بە چەند ڕێبازێکی بیرکارییەوە بووە و ئەو ڕێبازانە ڕەنگیان لە دیمانەکانی ئەماندا داوەتەوە. بەگشتی باس لە سێ سەرچاوەی مارکسایەتی دەکرێ: ***فەلسەفەی ئایدیالیستانەی ئەڵمانی*** کە هێگل تێیدا گەورەترین ناوە، ***ئابووریی سیاسیی کلاسیک*** کە بنج و نوێنەرە بەرچاوەکانیشی هەر لە ئینگلاندا بووە و ***سۆسیالیزمی زوو*** کە لە فرانسە سەری هەڵداوە.

مارکس و ئەنگیلز، لە بەرلین فەلسەفەی هێگلیان ناسی. هەردووکیان کەوتنە بەر تاوی ئەو ڕێبازە فیکرییەی لە نێو ئەوانەی پێیان دەگوترا هێگلپەروەرانی لاو یان هێگلپەروەرانی چەپ باو بوو. پەیڕەوانی ئەم ڕێبازە پێیان وابوو مێتۆدی دیالەکتیکیی هێگل لەگەڵ ئەو کۆنەوارەتییەدا نەدەگونجا کە هێگل خۆی دابووە پاڵ. هێگلپەروەرانی لاو پێیان وابوو خۆیان نوێنەرایەتی ڕێبازێکی شۆڕشگێڕانە دەکەن، بەڵام ئەمانە بەر لە هەر شتێک بەتەمای شۆڕشێکی گیانەکی بوون، شۆڕشێک لە ناو دیندا. ئەمانە پێیان وابوو شۆڕشێکی لەو بابەتە شۆڕشێکی سیاسی بە دوای خۆیدا کێش دەکات. کەواتە مێژوونۆڕیی ئەمان بە ئاشکرا ئایدیالیستانە بوو.

مارکس و ئەنگیلز هەر زوو پشتیان کردە ئەم ئایدیالیزمە و هەوڵی هەڵنانی دیالەکتیکی مەتێریالیستانەیان دا. ئەمان بەردەوام دانیان بەودا دەنا کە جۆرە پێوەندییەکیان بە مێتۆدی هێگلەوە هەیە، ئەو مێتۆدەی مارکس گوتەنی، ئەمان سەرەوژێریان کرد، هێگل بەسەردا ڕایگرتبوو، واتە لەسەر بیر ڕایگرتبوو، مارکس و ئەنگیلز خستیانە سەر پێ.

ماوەیەکی درێژخایەن مشتومڕ لەسەر ئەوە هەبوو ئایە هێگل چ سەنگێکی لە دیمانەی مارکسیدا هەیە. باوەڕێکیان دەڵێ مارکس و ئەنگیلز لە بەرهەمە ڕسکاوەکانیاندا تەنیا چەند ئاماژەیەکی بەئەدەبانە بۆ مامۆستای لاوێتییان دەکەن. دەستەی بەرانبەریش دەڵێت

مارکسایەتی تەنیا جۆرە گەشە کردنێکە لە فەلسەفەی هێگڵەوە. لەبەر ئەوە، ئەوەی دەیەوێ بەڕاستی لە مارکسایەتی بگات دەبێ لە هەموو فەلسەفەی هێگل بگات، چونکە کلیلی مارکسایەتی لەویدایە. – لەوە دەچێ ڕای لەبار جێیەکی ناوەندی ئەم دوو سەرپەرە بگرێ. لە لایەکەوە ئاشکرایە کە دیالەکتیکی هێگلی نۆرەیەکی گرنگی لە داڕشتنی دیمانەی مارکسیدا هەبووە. لە لایەکی دیکەشەوە ئاشکرایە کە مارکس و ئەنگێلز لە چەندین خاڵی گرنگدا – نەک تەنیا ئایدیالیزم و مەتێریالیزم – لە فەلسەفەی هێگل لایان داوە.

سەرچاوەی دووەمی مارکسایەتی، ئابووریی سیاسیی کلاسیکە. ئەنگێلز لە ئینگلاند بە دیمانەکانی ئادەم سمیت و داڤید ڕیکاردۆ ئاشنا بوو، مارکس لە پاریس ئەو دیمانەگەلەی ناسی، ئەو دەمە مارکس پروسیای نائازادی بەجێ هێشتبوو. مارکس بە دەیان ساڵ سەرگەرمی دیمانەی ئابووریی سیاسی بوو، ڕیکاردۆی کردبووە نێزیکترین دەراو بەڵام لە خاڵی گرنگیشدا لەوی لادابوو. مارکس پێی وابوو دیمانەی زێدەبەها بنەمایەکی پتەوی بۆ خەباتی شۆڕشگێڕانە داڕشتووە. «لەوە دەچێ ئەمە گەورەترین بەرد بێت گیرابێتە سەرمایەداریەتی capitalism»، مارکس ئەم گوتەیەی پاش بڵاوکردنەوەی یەکەم بەرگی ***سەرمایە*** *Das Kapital* (١٨٦٧) نووسیوە. (ئەنگێلز پاش مردنی مارکس دوو بەرگەکەی دیکەی بڵاو کردەوە).

مارکس، دیسان لە پاریس، سۆسیالیزمی زووی ناسی. هەر لە ژێر تاوی ئەوەشدا بوو مارکس – و ئەنگێلزیش – بڕوایان بەوە هێنا پرۆلیتاری پەرەسێنی پیشەسازی ئەو چینەیە شۆڕش دژ بە کۆمەڵگەی دامەزراوی بۆرژوا دەکات. پاشان مارکس و ئەنگێلز پشتیان کردە ئەو ڕێبازە سۆسیالیستانەی لە ئارادا بوون و دیمانەیەکی شۆڕشگێڕانەی سەربەخۆیان داڕشت. ئەم دیمانەیە یەکەم داڕشتنی ڕسکاوی لە *Manifest der Kommunistischen Partei* (***مانیفێستی کۆمیونیستانە***، ١٨٤٨) دا بوو، کە هەردووکیان بەیەکەوە لەسەر خواستی یەکیەتیی نیونەتەوەیی کۆمیونیستانە نووسیان، خۆشیان لە ١٨٤٧ دا چووبوونە پاڵ ئەو سازمانەوە. نۆڕینی مارکس و ئەنگێلز دەربارەی دەرفەت و ئامرازەکانی خەباتی شۆڕشگێڕانە لەگەڵ دەورانی زەمانەدا گۆڕا، بەڵام مانیفێستەکە پایەی خۆی، وەک ڕێبەرێکی گشتی و بەرنامەیەکی بەهێز، پاراست. بەڵام مارکس و ئەنگێلز نە ئەم بەرهەمە و نە هیچ بەرهەمێکی دیکەیان بە بەڵگەنامەیەکی وەها دانەدەنا کە هەتاهەتایە شاڕێی کردەوەی سیاسی پێشان بدات. ئەوان زۆر جار دەریان بڕیوە کە دیمانەی سیاسی دەبێ بەردەوام بگۆدرڕێت و بە ئەزموونی کارەکیی نوێ دەوڵەمەند بکرێت. شۆڕشەکانی ئەورووپای ساڵی ١٨٤٨ سەرچاوەیەکی ئەزموون بوو بۆیان. هەروەها

سەختانگی گەورەی ئابووریی کۆدەوڵەتی ئەمەریکا USA و ئینگلاند لە ساڵانی ۱۸٥۰ و ۱۸٦۰دا و ئەو ڕژێمە شۆڕشگێڕە کەمتەمەنەی بە ناوی کۆمیونی پاریس ناسراوە (۱۸۷۱)، ئەزموونی دیکەی بەخشی بە مارکس و ئەنگیلز. بەشێکی زۆری بەرهەمی ئەم دووانە بۆ سازمانە شۆڕشگێڕەکان تەرخان کرابوو، بەر لە هەمووشیان یەکەم سازمانی نێونەتەوەییی کرێکاران بوو کە ساڵی ۱۸٦٤ دامەزرا و ساڵی ۱۸۷٦ لەبەر ناکۆکیی نێوان مارکسیست و ئەنارکیستەکان هەڵوەشایەوە. مارکس و ئەنگیلز زۆر بە گەرمی سەرنجیان دابووە پارتی سۆسیال دیمۆکرات (دیمۆکراتیی جڤاکی) ی ئەڵمانی، کە پاشان مۆرکێکی پتر مارکسیانەی بە خۆوە گرت. هەردووکیان لە ئینگلاندەوە، بە ئامۆژگاری و ڕێنموو یارمەتی ڕێبەرانی کرێکارانی ئەڵمانیایان دەکرد. ئەوەی پێیان وابووایە هەڵەی دیمانەکییە و لادانە لە ڕاستەڕێی شۆڕشگێڕی، دڵگەرمانە دژی دەوەستان. گرنگترین نموونەی ئەم ڕەخنەگرییە بەرهەمەکەی مارکسە بەناوی *ڕەخنە لە بەرنامەی گۆتا* (۱۸۷٥).

زاراوەکاریی نێو مارکسایەتی کە بووەتە خەسڵەتێکی باوەڕەکە و تاڕادەیەکیش ئاڵۆزە، هەر ڕەنگدانەوەی سێ سەرچاوەکەی مارکسایەتییە. شاوشەی نێو بەرهەمەکانی مارکس و ئەنگیلز بنجیان لە نەریتی بیرکاریی جۆراوجۆردا هەیە. بۆ نموونە:

***چەمکی فەلسەفی (هێگل سەرچاوەی هەرە نێزیکە لێرەدا):*** دیالەکتیک، دژواتا، دژوەستاو، دەرەکی، ناوەکی، ناچارەکی، کاتەکی، چەندایەتی، جۆرایەتی.

***چەمکی ئابووریی سیاسی:*** بەهای بەکار هێنان، بەهای گۆڕینەوە، زێدەبەها، سەرمایە، بەرهەم هێنان، دابەش کردن.

***ئەو چەمکانەی پتر گرێدراوی نەریتی سۆسیالیستانەن:*** شۆڕش، چینی کرێکار، بۆرژوا.

بێگومان بەشێک لەو چەمکانە مۆرکی چەند نەریتێکیان پێوەیە: (وشەی «شۆڕش» لای هێگلیش نۆرەی هەیە، وشەی «کار» لای مارکس و ئەنگیلز ئادگاری ئابووریی سیاسی، سۆسیالیستی و هێگلیشی پێوەیە). بەڵام باسی گرنگ، باسی بنج و بناوانی ئەم وشانە نییە بەڵکوو ئەو ئاستی وردەکارییەیە لە دیاری کردنی ئەم وشانە لە لایەن مارکس و ئەنگیلزەوە. مارکس و ئەنگیلز لەگەڵ چەمکی ئابووریی سیاسیدا یەکجار وردەکارترن وەک لەوەی لەگەڵ شاچەمکی فەلسەفیدا.

با کتێبی ***سەرمایە*** بە نموونە بگرین. سەرمایە وەک لە سەردێڕی دووەمیەوە دەردەکەوێ ڕەخنەیە لە ئابووری سیاسی. ڕاستە چەمکی ئابووری لە بواری وەهادا نۆرەیەکی گەورەتری هەیە وەک لە چەمکی سەر بە سۆسیالیزم و فەلسەفە، بەڵام کتێبەکە بۆ ئەوەش دانراوە کە نۆڕینی ئابووریی سۆسیالیزم و لە ئەنجامیشدا بەشێکی گرنگی بنەمای

دیمانەکی سۆسیالیزم پێشان بدات. ئەوجا مارکس دەڵێ مێتۆدی دیالەکتیکی بەکار هێناوە. ڕاستیش دەکات، *سەرمایە* شاوشەی سۆسیالیستی و دیالەکتیکیشی تێدایە نەک هەر شاوشەی ئابووریی سیاسی. بەڵام مارکس هەوڵێکی خەمخۆرانەی گەورە دەدات بە وردی چەمکەکانی سەر بە ئابووریی سیاسی دیاری بکات. چەمکی وەک «بەهای بەکار هێنان»، «بەهای گۆڕینەوە»، «هێزی کار»... هتد زۆر بە وردی دەناسێنێ. پاشان بەگوێرەی ئەو ناساندنە بەکاریان دەهێنێت.

بەڵام شاوشەکانی سەر بە سۆسیالیزم و سیاسەت، لە *سەرمایە* دا ئەو نۆرە نێوەندەکییەیان نییە. بۆ نموونە ئەگەرچی مارکس بە ئاشکرا مەبەستی خۆی لە وشەی «شۆڕش» ڕوون دەکاتەوە بەڵام دەست ناگێڕێتەوە لەوەی بە واتای خەیاڵیش بەکاری بهێنێت (بۆ نموونە «هێزی بەرهەمهێنی شۆڕشگێڕانە»).

چەمکی سەر بە فەلسەفە و دیالەکتیک دەچنە بارێکی تایبەتییەوە. مارکس باسی ئەوە ناکات وشەی وەک «دژوەستان contradiction»، «زاتەکی subjective» و «جۆرایەتی Quality»، *چۆن* بەکار دەهێنێت. خوێنەر دەبێ لە تێکڕای بابەتەکە واتای ئەو وشانە دەربێنێت. ئەم کارەش هەروا ئاسان نییە. تەنانەت لە نێو نەریتی مارکسایەتیدا ئەم سەختییە بووەتە هۆی فرەبەرەکی دەربارەی بنەما فەلسەفییەکانی مارکسایەتی.

ئەم تەگەرەیە هەر زوو لە لایەن مارکس خۆی و بەتایبەتی لە لایەن ئەنگیلزەوە هەستی پێکرا. ئەنگیلز خەریکی فەلسەفەیەکی مارکسیانەی وەها بوو دیمانەی زانیار و فەلسەفەی سروشت بگرێتەوە. ئەنگیلز ئەم فەلسەفەیەی ناونابوو مەتیریالیزمی دیالەکتیکی و دەشی گوت ئەم فەلسەفەیە بنەمایەکی پێویست پێک دێنێ بۆ مێژوونۆڕیی مارکسایەتی و ئەو باوەڕانەی سەر بە ئابووری و کۆمەڵناسی و سیاسەتن و پەیوەستی ئەو مێژوونۆڕییەن.

بەناوبانگترین بەرهەمی ئەنگیلز دەربارەی ئەم مەتیریالیزمی دیالەکتیکییە Anti-Dühring ـە (*سەرەوژێر کردنی زانست لە لایەن* Eugen Dühring *ـەوە، ١٨٧٨*). ئەم بەرهەمە تاوێکی بەهێزی لەسەر مارکسایەتی پاش خۆی هەبوو. بەڵام مشتومڕ لەسەر ئەوە هەیە کە تا چ ڕادەیەک مەتیریالیزمی دیالەکتیکی بنەمایەکی پێویست پێک دێنێ بۆ: دیمانەکانی بەرهەم هێنانی مایەکی و شێوازەکانی کۆمەڵایەتی، کە بێگومان بەشی نێوەندەکین لە مارکسایەتیدا. لە باسێکی سەرانسەری وەها دەربارەی مێژووی بیری سیاسی لەوانەیە پێویست نەکات بچینە باسی دیالەکتیکی گشتییەوە. شارپییەکانی مێتۆدی دیالەکتیک لە باسی مێژوونۆڕیی مەتیریالیستانەدا ئاشکرا دەبن.

### ٣- مێژوونۆڕیی مەتێریالیستانە

بۆ تێگەیشتنی چەمکی «مەتیریالیستانە» لە زاراوەی «مێژوونۆڕیی مەتیریالیستانە»دا، دەبێ ئەوە ڕەچاو بگیرێ کە واتای ئەو چەمکە لەو ژینگە بیرکارییەی مارکس و ئەنگیلز تێیدا گەشەیان کردووە جیاواز بوو لەگەڵ ئەو واتایەی ئەمڕۆ هەیەتی. لە ڕۆژگاری مارکس و ئەنگیلزدا وشەی «مەتیریالیزم» بە سێ واتای جیاواز بەکارهێنراون:

١) لە نۆڕینێکی سەر بە هەبوونناسی ontology، (واتە لە نۆڕینی سەر بە ماکی هەڵکەوت)، ئەم نۆڕینەش دەڵێ ئەوەی بوونێکی سەربەخۆ و ڕاستەکی هەبێت تەنیا لەش و بزووتنی لەشە.

٢) نۆڕینی سەر بە دیمانەی زانیار، کە دەڵێ زانیار بە تێبینی (هەستەکی) پەیدا دەبێ نەک لە ڕێی تێفکرینی فەلسەفییەوە.

٣) نۆڕینی سەر بە دەروونناسی (سایکۆلۆگی) و کۆمەڵناسی (سۆسیۆلۆگی) یەوە، کە پێی وایە تاکە مرۆڤ و هەروەها کۆمەڵگەش بە بیروباوەڕ دیاری ناکرێن بەڵکوو بە چالاکیی («هەستەکی»)ی کارەکی دیاری دەکرێن.

لە زەمانی ئەم ڕۆژگارەدا وا باوە چەمکی «مەتیریالیزم» تەنیا بە واتای یەکەمیان بەکاربهێنرێت. خاڵی دووەم پتر دەچێتە چوارچێوەی نۆڕینێکی گشتی شارەزاکییەوە. بەڵام تەنیا بە واتای سێیەمیانە مێژوونۆڕیی مارکسی دەشێ پێی بگوترێ مەتیریالیستانە. ناکرێ دیمانەیەک دەربارەی فراژووتنی مێژووکردی مرۆڤایەتی ڕاستەوخۆ لەسەر نۆڕینێک دابمەزرێ کە دەربارەی سروشتی هەڵکەوتە، بەڵام کە گوترا هێزی بزوێنەری فراژووتن بریتییە لە بیر و خواستی خەڵک یان بریتییە لەو شێوازانەی خەڵک بۆ بەبەرهەم هێنانی پێداویستییەکانی ژیانیان بەکاری دەهێنن، ئەوا دەبێتە گوتەیەکی یەکلاکەرەوە.

ئەم فرەواتایەی وشەی «مەتیریالیزم» بووەتە هۆی ئەوەی کە هەیە بەهەڵەدا چووە و دەڵێ مێژوونۆڕیی مارکسی دەبا پێی بگوترایە ئابوورەکی نەک ماتیریالیستانە. لێرەدا ڕوون دەکرێتەوە کە مارکس و ئەنگیلز بەهیچ جۆرێک مەبەستیان ئەوە نەبووە فراژووتنی *ئابووری* ڕاڤەی سەرجەمی فراژووتنی مێژووکرد بکات. (پیرە ئەنگیلز و پاش ئەویش لێنینی لاو دژ بەو ***ئابوورایەتی*** *economism* یەی لەدەمەو بنەتای سەدەی نۆزدەیەمدا جارویار لەگەڵ مارکسایەتیدا تێکەڵ دەکرا، وەستان).

مارکس و ئەنگیلز مێژوونۆڕییەکەی خۆیان لە سێ لاوە پەرژین داوە. لای یەکەمیان ئەوەیە ڕووبەڕووی ئەو ئایدیالیزمە دەبنەوە کە لە مێژووڕانانی هێگل و هێگلپەروەرانی لاودا ئاشکرابوو، ئەم مێژووڕانانە دەیگوت فراژووتنی مرۆڤایەتی بەر لە هەر شتێک فراژووتنی بیر و ئاگایە. لە *Deutsche Ideologie* ***(ئایدیۆلۆگیی ئەڵمانی)*** کە لە ١٨٤٥–١٨٦٥ مارکس و ئەنگیلز بەیەکەوە نووسیان بەڵام هەرگیز تەواویان نەکرد، نووسراوە: «دەشێ بگوترێ جیاوازیی ئادەمیزاد و ئاژەڵ لە ئاگادایە، لە دینداییە یان لە هەر شتێکی دیکەدایە. لە ڕاستیدا ئادەمیزاد لەو دەمەدا لە ئاژەڵەتی دەکەوێ کە دەکەوێتە ئەوەی پێداویستی ژیانی خۆی بەبەرهەم بێنێ، ئەم هەنگاوەش بەندە بە سازمانی لەشەکی مرۆڤەوە».

ئەوجا مارکس و ئەنگیلز تەنیا ڕووبەڕووی مێژوونۆڕیی ئادیالیستانە نابنەوە بەڵکوو ڕووبەڕووی ئەو جۆرە نۆڕینانەش دەبنەوە کە ئەگەرچی مەتیریالیستانەیە بەڵام ڕەنگێکی ئامانجناسی teleology یشی پێوەیە و فەیلەسووفی ئەڵمانی Ludwig Feuerbach دایناوە و تەنانەت مارکس لە نووسینە زووەکانیدا ڕەنگێکی ئەم باوەڕەی پێوە بووە. بە نۆڕینی ئەم باوەڕە مرۆڤ ماکێکی هەیە، سروشتێکی ئایدیالی هەیە، کە لە ڕێگوزەری مێژوودا لێی دوور خراوەتەوە بەڵام دەبا لە ڕۆژگاری خۆیدا بیچەسپێنێت. لە *Deutsche Ideologie* دا مارکس و ئەنگیلز ئەوە ڕەت دەکەنەوە کە ماکێکی وەها هەبێت هاوکۆی هەموو مرۆڤایەتی بێت. سروشتی خەڵک – ئەگەر شتێک هەبێت بە ناوی سروشتی خەڵک – بە گۆڕانی ئەو هەلومەرجەی خەڵک تێیدا دەژی، ئەویش دەگۆڕدرێت.

هەر لەسەر بنەمای وەهایشە مارکس و ئەنگیلز پشت دەکەنە ئەو نۆڕینەی سەر بە فراژووتنی مێژووکردە و کەموزۆر بە پەنامەکی لە ئابووریی سیاسیی کلاسیکدا هەیە و لەویشەوە پشت دەکەنە چەندین لایەنی گرنگی لیبەڕالیزم. ئەم بۆچوونە دەڵێ مێژوو بەر لە هەر شتێک نێزیکبوونەوەیەکی لەسەرەخۆیە بەرەو کۆمەڵگەی هاوچەرخی سەرمایەدار و بورژوا. ڕشتەی سەرمایەداری بە هەر شێوەیەک بێت هاوشانی سروشتی مرۆڤ بووە. هەردەم جۆرە سەرمایەدارەتییەکی کەموزۆر نارسکاو هەر هەبووە: فراژووتنی بەرەو ئەم ئاستە هاوچەرخە تەنیا بە شێوەیەکی کاتەکی، لە لایەن ڕێککردنی هۆشنەیارانە و دەست تێوەردانی دەسەڵاتدارانە، کۆسپی خراوەتە بەر. هەر وەها ڕشتەی سەرمایەداری گوایە هەتاهەتا هەر دەمێنێ. ئادەم سمیت و کەسانی دیکەش باس لە «ئاستی دوایەکی» دەکەن، واتە ئابووریی بۆرژوای تەواو ڕسکاو.

مارکس بەم مێژوونۆڕییە دەڵێ مێژوونەکرد. مارکس و هەروەها ئەنگیلزیش دەیان گوت سەرمایەدارەتی سەرەتای هەبووە و کۆتابوونێکی ئاشکراشی هەیە. هیچ شتێک نییە، نە لە سروشتی مرۆڤدا نە لە ماکی مێژوودا، کە سەرمایەدارەتی کردبێتە ناچارەکی. بەڵام کە سەرمایەدارەتی پەیدا بوو، ئەوجا بە هۆی ناکۆکیی ناوەکیی پەرەسێن گەشەی کرد، ئەو ناکۆکییانە لە کۆتادا هێندە بەهێز دەبن خودی ڕشتەی سەرمایەداری لەناو دەبەن.

لیبەڕالەکان - کە هەربەرت سپێنسەر یەکێکە لە هەرە بەرچاوەکانیان - لە دیمانەی بایۆلۆگیانەی دەربارەی فراژووتنی جۆردا ئاکامگری سەر بە کۆمەڵناسی و سیاسەتیان هەبوو. مارکس و ئەنگیلز، چۆن بەرپەرچی هەموو مێژوونۆڕییەکیان دەدایەوە باوەڕی سەر بە سروشتی مرۆڤایەتییان کردبایەتە دەراو، هەروەهاش یەکرەوانە دژ بەم ئاکامگریی لیبەڕالەکان وەستان. وەک باسمان کرد سپێنسەر پێی وابوو فراژووتنی مرۆڤایەتی ملکەچی ئەو دەستوورانەن کە فراژووتنی جۆریش دەبەن بەڕێوە. بە نۆڕینی ئەنگلیز و مارکس فراژووتنی مرۆڤایەتی بێمانەندە.

بەرتەکی مارکس و ئەنگیلز لە ئاست دیمانەکەی داروینڤا بەشە هەرە گرنگەکەی مێژوونۆڕیی ماتێریالیستانە ڕۆشن دەکاتەوە. گریمانەکەی داروین دەربارەی فراژووتنی جۆر دەمودەست لە لایەن مارکس و ئەنگیلزەوە سەلمێندرا، مارکس لە نامەیەکدا بۆ ئەنگیلزی نووسیوە، دیمانەی بنجی بایۆلۆگیانەی مرۆڤ دەبێتە «بنەمایەکی مێژووی خۆرسک بۆ نۆڕینی ئێمە». بەڵام مارکس ئەوە ناسەلمێنێ کە داروین دیمانەکەی مالتوس بەسەر تێکڕای فراژووتنی بایۆلۆگیانەدا بسەپێنێ - «مەگەر خاڵی سەرەکی بە لای سەیدا مالتوسەوە ئەوە نییە کە دیمانەکە ناشێ لەگەڵ ڕووەک و گیانەوەردا بەکار بهێنرێت و تەنیا بۆ خەڵکە». مارکس مەبەستی ئەوەیە داروین، لەم بۆچوونەیدا بەرانبەر گۆڕانی جۆر، کەوتۆتە ژێر تاوی ئەو کۆمەڵگە ئینگلیزییەی تێیدا ژیاوە، «بە دابەش کردنی کارەوە، هاوچاوی، کردنەوەی بازاڕی نوێ، "دۆزینەوە" و "پەلەی ژیان" ی مالتوسی».

مارکس و ئەنگیلز پێیان وایە مرۆڤ بنجێکی تەواو خۆرسکی هەیە لە جۆری دیکەدا، بەڵام فراژووتنی مێژووکردی مرۆڤ مەسەلەیەک نییە پێوەندیی بە دیمانەی بایۆلۆگیانەوە هەبێت. مرۆڤ بە بەرهەم هێنانی مایەکیی خۆی دەبێتە مرۆڤ. تەنانەت نێچیرەوان وماسیگری ساکاریش شتێکی وەها .بەبەرهەم دێنێ و پەیدا دەکات کە فراژووتنی بەردەوامی پێ پتەو بێت، کەچی نێچیر و ماسی لە دنیای گیانەوەراندا لە خولگەیەکی هەمیشەکیدان. جۆری گیانەوەران پارچەیەکن لە سەرجەمی سروشت، پاسیڤانە بۆشاییەک پڕ دەکەنەوە. مرۆڤ بەوە دەبێت بە مرۆڤ کە لە ڕێی بەرهەم هێنانی خۆیەوە

چالاکانە سروشت بگۆڕێت، سوود لە سامانی سروشت وەربگرێت و بە شێوەیەکی بەرفرەوان سروشت بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. لە گۆشەنیگایەکی مارکسایەتییەوە دەشێ مێژوو بە گەمەیەکی نێوان مرۆڤ و سروشت دابنرێ، مرۆڤ لە سەرەتاوە بەشێکی تێهەڵکێشراوی سروشت بووە و بەرەبەرە خۆی سەربەخۆ دەکات و فێر دەبێ باشتر بەسەر سروشتدا زاڵ بێت.

کەواتە مرۆڤایەتی بە فراژووتنێکی مێژووکرددا گوزەری کردووە و بەرهەم هێنانی مایەکیش مەرجی ئەم فراژووتنەیە. بەڵام پاشان ئەم بەرهەم هێنانە مایەکییە - واتە شێوازی پەیدا کردن و دروست کردنی پێداویستییەکانی ژیان لە لایەن مرۆڤەوە - چوارچێوەیەکی دا بە فراژووتنە مێژووکردەکە. ئەمەیە گریمانەی نێوەندەکی لە مێژوونۆڕیی مەتیریالیستانەدا.

شێوەی بەرهەم هێنان لە ڕێگوزەری مێژوودا گۆڕاوە. ***هێزەکانی بەرهەمهێن*** پەرەیان پێ دراوە: گەر کاری ئەمڕۆ بەراورد بکەیت بە کاری سەد یان هەزار ساڵی بەرەو پاش، دەبینیت بە هەمان کار - یان ڕاستتر وایە بڵێین بە هەمان کاتی کار - بەرهەمی کاری ئەمڕۆ زۆر زیاترە لە بەرهەمی کاری ئەو دەمە. هێزی بەرهەمهێنی سەرەتایی بریتی بووە لە تەنیا هێزی لەش و ڕادەیەکی کەمی لێکدانەوەی زیرەکانە کە مرۆڤی ساکار لە باریادا بووە. ئامرازی سەرەتایی بوون بە هێزێکی نوێی بەرهەمهێن. وردەوردە ئامرازەکان زیاتر بوون و باشتر بوون: بەرهەم هێنانی مایەکی هەڵکشا.

ئەوجا هەڵکشانی بەرهەم هێنانیش، بە نۆڕینی مارکسایەتی، جۆرێک نییە لە دەستووری سروشتەکی. هێزەی بەرهەمهێن لە بۆشاییدا گەشە ناکەن بەڵکە تەواو پەیوەستی ئەو ***هەلومەرجی بەرهەم هێنان***ـەن کە باون. هەلومەرجی بەرهەم هێنان بریتین لە پێوەندییە ئابوورییە بنەڕەتییەکان. دەست نیشان کردنی هەلومەرجی بەرهەم هێنان لە وەرامدانەوەی ئەم پرسیارانەدایە: «کێ خاوەن فلانە شتە؟»، «کێ فلانە کار دەکات؟ بۆ کێی دەکات؟ بەرانبەر کارەکەی چی وەردەگرێ؟».

پێوەندیی نێوان هێزی بەرهەمهێن و هەلومەرجی بەرهەم هێنان تەنیا بەوە ڕوون دەبێتەوە کە ***دابەشینی کار*** ڕەچاو بگیرێ. لە سەرەتادا وەها بوو هەموو کەسێک بەگشتی هەموو کارێکی کردووە. بەڵام بە فراژووتنی هێزی بەرهەمهێن تایبەتکاری و بەش کردن دێتە کایەوە، هەر یەکە خۆی فێری جۆرە ئامرازێک دەکات.

لەبەر ئەوە کۆمەڵگە دەبێتە سازمانێکی کار. بەوەش جۆرە هەلومەرجێکی بەرهەم هێنان لە کۆمەڵگەدا پەیدا دەبێ. دەستەیەکی بەڕێوەبەریش پەیدا دەبێ: چینێکی دەسترۆ.

بەو جۆرەش بنەمای گرنگترین خاڵی بەش کردنی کار دەرێژرێت کە دەکاتەوە جیا کردنەوەی کاری لەشەکی لە کاری گیانەکی. چینی دەسترۆ وردەوردە لە کاری لەشەکی دوور دەکەونەوە. ئەوەش بێگومان کۆمەڵگە ناچار دەکات بەرهەمێکی زیادە دروست بکات. واتە ئەوانەی لە بەرهەم هێنانی مایەکیدا کار دەکەن، نەک تەنیا بەشی بوونی فیزیکی خۆیان، بەڵکوو بەشی ئاغاکانیشیان، بەرهەم پەیدا دەکەن.کاتێک دەگوترێ فلانە چین دەسترۆیە، بەر لە هەر شتێک، مەبەست لەوەیە ئەو چینە دەسەڵاتی بەسەر ئەو زیادبەرهەمەدا رادەشکێ و بڕیاری چۆنەتیی دابەش کردنی دەدات.

کەواتە سازمانێکی چەسپاوی کۆمەڵایەتی کە خاوەن هەلومەرجی چەسپاوی بەرهەم هێنانە، چوارچێوەیەک بۆ فراژووتنی هێزی بەرهەمهێن پێک دێنێ. ئەوجا هێزی نوێی بەرهەمهێن و گەشە کردنی هێزی کۆنی بەرهەمهێن پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەگۆڕن: چینی کۆمەڵایەتی نوێ پەیدا دەبێ. ئەم گۆڕانکارییەش هەرەشە لە دۆخی دەسەڵات دەکەن. چینی دەسترۆ بەرژەوەندی لەوەدایە دۆخی دەسەڵات وەک خۆی بمێنێ. بەرەبەرە ناکۆکی ڕاستەوخۆ لە نێوان هێزی بەرهەمهێن و هەلومەرجەکانی بەرهەم هێناندا پەیدا دەبێ. ئەم ناکۆکییانە *شۆڕش* یان بەدەمەوەیە، کە دەکاتەوە گۆڕینی هەلومەرجەکانی بەرهەم هێنان و دۆخی دەسەڵات بە گشتی. هەڵگرانی ئەم هێزە نوێیەی بەرهەمهێن دەسەڵات دەگرنە دەست و دەبنە چینی دەسترۆ.

ئەمەیە دیمانەی ئەبستراکتی مارکسایەتی دەربارەی فراژووتنی مێژووکرد. بەڵام ئەم دیمانەیە تەواو بەرفام نابێت و سەختتریشە بە کردەوە بخرێتە کار ئەگەر نەبەسترێتەوە بە باوەڕە نێوەندەکییەکانی سەر بە ئابووریی سیاسیی مارکس و ئەنگیلز و شیکارییان دەربارەی دۆخی چینایەتی و سیاسی و فیکریی قۆناخە جۆراوجۆرەکان.

**٤- دیمانەی بەها**

*سەرمایە* ی مارکس، هەر وەک لە سەرناوەکەیەوە دیارە، لە ئابووریی سەرمایەداری دەدوێ. بەڵام مارکس بۆ ڕاڤەدانی ئەم ئابوورییە باسەکە دەداتە بەر پاشخانی جۆرەکانی دیکەی ئابووریی زووتر، بەر لە هەمووشیان، ڕشتەی ئابووریی دێرین کە لەسەر بنەمای کۆیلەیەتی دامەزرابوو، ڕشتەی فیوداڵەتی کە بۆ نموونە سەرلەبەری ئەورووپای سەردەمی ناقینی گرتبووە. ئەوجا نەخشەی شارێیەکانی ئابووریی پاش-سەرمایەداری، ئابووری سۆسیالیستانە دەکێشێ.

مارکس ئاگایانە ئاوڕ لە دیمانە و چەمکە نێوەندەکییەکانی ئابووری سیاسی دەداتەوە، بەر لە هەمووشیان، ئەو گریمانەیەی دەڵێ ***کار بەهای گۆڕینەوە دروست دەکات. بەهای گۆڕینەوە*** ئەو نرخەیە شتومەک لە گۆڕینەوەدا لەگەڵ شتومەکی دیکەدا هەیەتی. لە ڕشتەی ئابووری هەڵکشاودا بەهای گۆڕینەوە بە هۆی دەستاوێژێکی تایبەتی، کە ***پارە*** یە، دیاری دەکرێ. پارەش وا باوە لە شێوەی میتالی ناواز بێت. پارەکاری finance لە ئابووریی سەرمایەداریدا ئەوجا تەواو سەرلەبەر دەبێت. پارە بە شتومەک دەگۆڕدرێتەوە، شتومەک بەو ناساندنە دەبێتە بابەتێکی خاوەن بەهای گۆڕینەوە.

ئەوجا دەبێ بەهای گۆڕینەوە بە وردی لە بەهای بەکار هێنان جیا بکەینەوە. هەر بابەتێک پێداویستییەکی مرۆڤ دابین بکات ئەوا بەهای بەکار هێنانی هەیە. هەوا بەهای بەکار هێنانی هەیە، بەڵام بەهای گۆڕینەوەی نییە، بەردێکی ناواز بەهای گۆڕینەوەی هەیە بەڵام بەهایەکی بەکار هێنانی تاڕادەیەک کەمی هەیە.

بەهای گۆڕینەوە پەیوەستی بەهای بەکار هێنان نییە، بەڵکوو لە ئەنجامدا هەر ئەو کاتی کار کردنەی لە بەبەرهەم هێنانی شتەکەدا سەرف کراوە بڕیاری بەهای گۆڕینەوەکەی دەدات. ***کاتی کۆمەڵایەتی پێویست*** بۆ دروست کردنی ئەو شتە بڕیاری ***تێکڕای*** بەهاکەی دەدات. مەبەستیش لەو کاتەیە کە بەو ئاستە زانستی، تەکنیکی و فراژووتنە سازمانەکییەی کە هەیە، دەبێ سەرف بکرێ بۆ ئەوەی بەرهەمێکی تایبەتی دروست بکرێت.

بەڵام بۆ نموونە نرخی چاکەتێک تەنیا بریتی نییە لەو کاتەی پێویستە بۆ دروومانی قوماشەکە. قوماشەکە خۆیشی بە چەندین پرۆسەی کاردا تێپەڕیوە. ئەمەش نموونەیەکە لە کاری کۆکراوە. ئەو ئامراز و ئامێرانەش کە لە دروست کردنی چاکەتەکەدا بەکار دێن، کاری کۆکراوەیان هەیە. ئەوجا بە فراژووتنی تەکنیکی و ئابووری پشکی کاری کۆکراوە لە مەکینە و... هتد زیاتر و زیاتر دەبێ، لە ئابووری سەرمایەداریدا ***سەرمایەی توند*** مەیلی زیاد بوونی هەیە.

خاڵی گرنگ لەم دیمانەیەدا دەڵێ خواست و پێداویستی مرۆڤ نییە لە ئەنجامدا بڕیاری پێوەندییە ئابوورییەکان دەدات. مارکس و ئەنگیلز دەڵێن فراژووتنی ئابووری هەتا دەگاتە شۆڕشی سۆسیالیستی، کوێرە، واتە پەیڕەوی دەستووری وەها دەکات بەند نییە بە هۆشی مرۆڤایەتییەوە، مرۆڤیش دەبێ بە گوێرەی ئەو فراژووتنە ڕێ بکەن. سەرمایەدار و کرێکاری پیشەسازی – هەروەها فیوداڵ و ڕەشەجووتیار – لە ئاست فراژووتنی ئابووریدا نائازدن.

دیاری کردنی پێوەندیی گرنگ لە کۆمەڵگەدا لە وەرامی ئەم پرسیارەدایە: کێ خاوەنی بەرهەمی کارە؟ واتە کێ دەستی بەسەر کاتی کاردا گرتووە؟ وەک باسمان کرد، هەر کۆمەڵگەیەک چینێکی تێدا هەبوو ڕاستەوخۆ بەشداری لە بەرهەم هێنانی مایەکیدا نەکات، دەبێ *زێدەبەرهەم* یێک دروست بکات و بیکاتە بژێوەی ئەوانەی ناکاران. زێدەبەرهەم داوای *زێدەکاری* دەکات، واتە خەڵکی کارا دەبێ کار زیاتر بکەن لەوەی خۆیان پێویستیانە. چینی دەسترۆ بۆ مانی خۆی و دەسەڵاتی خۆی دەبێ ئەم زێدەکارییە بپارێزێ. لە ڕشتەی سەرمایەداریدا، تەنانەت ئەمەش تێر ناکات: زێدەکاری دەبێ زیاد بکرێت، چونکە سەرمایەدارەتی هەڵکشانی ئابووریی بەردەوامی کردووەتە مەرج، ئابووریی دێرین و فیوداڵەتی ئەم مەرجەیان نەبوو. ئەم گریمانەیە لە دیمانەی ئابووریی مارکسیدا جێیەکی نێوەندەکی گرتووە و دەبێ زیاتر لێی بدوێین.

دەبێ جیاوازیی شێوەی بەرهەم هێنان لە ڕشتەی سەرمایەداری و ڕشتەکانی زووتری وەک دێرین و فیوداڵەتی، بە نۆڕینی مارکس چی بێت؟

سەنعەتکارێک، پێڵاودروویەکی زەمانی زوو بێنەرە بەرچاوت. ئەم پێڵاودرووە تەنیا لە کۆمەڵگەیەکدا پەیدا دەبێ بەش کردنی کار هێندە هەڵکشا بێت کە مرۆڤێک بتوانێ لە پێڵاودروونی تایبەتکار بێت و هیچ کارێکی دیکە نەکات. وەهاش باوە کە لە کۆمەڵگەی وەهادا پارەش هەبێ، ئەگەرچی دەشێ هەموو مامەڵەیەک بە پارە نەکرێ. کابرای پێڵاودروو، پێڵاو دەفرۆشێ و پارەی دەست دەکەوێ. بە پارەش ئەو کەرەستانە دەکڕێ بۆ خۆی پێویست بێت. خۆی کەرەستەیەک دروست دەکات بۆ ئەوەی کەرەستەی دیکەی پێ پەیدا بکات. پارە تەنیا پردێکە لەو نێوانە.

شێوەی کاری سەرمایەدار تەواو جیاوازە. سەرمایەدار لە بەرهەم هێنانی ڕاستەوخۆ جیابۆتەوە، ئەم بە کاری خۆی نایەتە پێش بەڵکوو بە پارەی خۆی. سەرمایەدار (استثمار) دەکات. ئەم (استثمار) ەش دەرفەتی دروست کردنی کەرەستە دەڕەخسێنێ. بەڵام مەبەستی سەرمایەدار ئەوە نییە لە بری ئەو پارەیەی دایناوە کەرەستە بۆ خۆی پەیدا بکات، بەڵکوو مەبەستی ئەوەیە پارەی زیاد (واتە قانزاج یان سوود)ی دەستکەوێت، بۆ ئەوەی زیاتر (استثمار) بکات و بەرهەمی زیاتر بێت. ئەم کارەش پارەکەی زیاد دەکات و ئەمیش دەتوانی (استثمار) زیاتر بکات و... هەتاهەتایە بەو جۆرە بەردەوام بێت.

مەرجێکی سەرمایەدارەتی ئەوەیە مامەڵەی کرێدیت credit ی هاوچەرخی تێدا هەبێت، سەرەتای ئەم جۆرە مامەڵەتە لە سەردەمی ناڤینی بەرزدا، لە شارە بازرگانەکانی ئیتالیادا پەیدا بوو. بانکدار کار بۆ ئەوە ناکات پارەی دەست کەوێت و شتومەکی پێ بکرێت

(بێگومان دەبێ پێداویستییەکانی خۆی پڕ بکاتەوە، بەڵام ئەمەیان کەمە ناچێتە ئەم حیسابەوە).

جگە لەوەش سەرمایەدارەتی، بە نۆڕینی مارکس، مەرجێکی دیکەی پێویستی هەیە ئەویش بوونی *کرێکاری ئازادە*، کە هێزی کاری خۆی دەفرۆشێ بەو کەسەی دەستاوێژی بەرهەم هێنانی هەیە، واتە بە سەرمایەدار. کۆیلە و ڕەشەجووتیار و شاگردە سەنعەتکاری سەردەمی ناڤین ئازادیی وەهایان نەبوو. بۆ یەکەم جار لە کۆمەڵگەی سەرمایەداردا، خەڵک دەرفەتی بۆ ڕەخسا بازرگانی بە هێزی کاری خۆیەوە، واتە بە خۆیەوە، بکات. ئەم دەرفەتەش لە کەلێنەکانی نێوان ڕەشەجووتیاری و دەستەکانی کار ی سەردەمی ناڤین، لە ڕێی کارگە دەستەکییەکانەوە پەیدا بوو.

پرۆلیتاریای پیشەسازیی هاوچەرخ ئەو چینەیە بازرگانی بە هێزی کاری خۆیەوە دەکات بۆ ئەوەی بژێوی دەست کەوێت. سەرمایەدار مووچەیەک دەدات بە کرێکاران، بەڵام ئەو مووچەیە بە ئەندازەی هەموو ئەو کارە نییە کرێکاران دەیکەن. بۆ ئەوەی سەرمایەکە بمێنێ و گەشە بکات، دەبێ زێدەبەها هەبێت. کرێکار لە ڕشتەی سەرمایەداریدا هیچ مافێکی لەو زێدەبەهایەدا نییە کە خۆی بەبەرهەمی دێنێ: «کاتێک کرێکار هێزی کاری خۆی بە سەرمایەدار فرۆشت، ئیدی هەموو بەهایەکە یان بەرهەمەکەی دروستی کردووە دەبێتەماڵی ئەو سەرمایەدارە، کە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو خاوەنی هێزی کاری کرێکارەکەیە».

ئەمەش خراپەخوازی و دەستگیری نییە لە لایەن سەرمایەدارەوە کە هەوڵ دەدات هێزی کار بە هەرزانترین نرخ بکڕێ و گەورەترین زێدەبەهای دەست کەوێت. سەرمایەدار ناچارە وەها بکات، دەنا لە سەرمایەداری دەکەوێت. مارکس، (هەر نەبێ لە بەرهەمە درەنگەکانیدا) لەگەڵ ئەوەدا نییە کە پێی دەگوترا مووچەدانانی سەخت، کە داڤید ڕیکاردۆ دایڕشتبوو و دەیگوت کرێکاران دەبێ مووچەیان لە ئاستێکی ژێرپەڕدا بێت. مارکس دەڵێ، کرێکاران، لەو بەرهەم هێنانەی بەردەوام ڕوو لە زیادبوونە، بە هۆی هێزی هاوچەرخی بەرهەمهێنەوە، بە شێوەیەکی نیسبی پشکێکی بەردەوام ڕوو لە کەمبوونیان بەر دەکەوێت . مانای ئەم گوتەیەش ئەوەیە زێدەکار و زێدەبەها ڕووەو زیادبوونن و ئەمەش دەکاتەوە ئەوەی دادۆشینی چینی کرێکار بەردەوام زیارتر دەبێت.

جیاوازیی سەرمایەدارەتی و ڕشتە ئابوورییەکانی دیکە لەوەدایە کە ئەمیان ڕشتەیەکە هاوچاویی ئازادی تێدایە، هەم لە نێوان سەرمایەداراندا لەسەر بازاڕ و هەم لە نێو کرێکاراندا لەسەر دەرفەتی کار. بەڵام فراژووتنی هێزی بەرهەمهێن، چڕبوونەوەیەکی

بەردەوام بەهێزتری بەدەمەوەیە. هێزی هەڵکشاوی بەرهەمهێن پێویستی بە سەرمایەی توندی گەورەیە. یەکێک لە هێزە گرنگەکانی بەرهەمهێن بریتییە لە هاوکاریی نێوان کرێکاران، بگرە لە نێوان کرێکاران و «ڕشتە ئامێری گەورە» دا و ئەو هەموو کرێکارانەی کە خزمەتی مەکینەکان دەکەن.

بەو جۆرە، سەرمایەی تاک بە نۆڕینی مارکسایەتی بەردەوام گەورەتر و بە ژمارە کەمتر دەبێ. سەرمایە بۆ ئەوەی لە هاوچاویدا نەشکێ دەبێ هەتا دەتوانێ، هەموو توانستێکی تەکنیکی و زانستی بەکار بهێنێت. مارکس بڕوایەکی چەسپاوی هەیە بەوەی بەشێکی فرەوانی فراژووتنی زانستی و تەکنیکی ئەم سەردەمە نوێیە بەرهەمێکی سەرمایەدارەتییە، واتە بەرهەمی ئەو پێداویستییە ناوەکییەی سەرمایەیە بۆ هەڵکشان و پەلە کردن لە فراژووتنی هێزی بەرهەمهێن. بەلام فراژووتنی سەرمایەدارەتی دەکاتەوە فراژووتنی ناکۆکیی ناوەکی، یاخود گەر وردتربین ناکۆکیی نێوان هێزی بەرهەمهێن و هەلومەرجی بەرهەم هێنان. فراژووتنی هێزی بەرهەمهێن، وەک باسمان کرد، دەکاتەوە بەرز کردنەوەی پلەی هاوکاریی نێوان خەڵک: مارکس دەڵێ، خەڵک ***کۆمەڵایەتیتر*** دەبن. هەرچی هەلومەرجی بەرهەم هێنان هەیە ئەوا بەرەو سەرپەڕی ئەولا گەشە دەکات. ژمارەی سەرمایەداران کەم دەبێتەوە و سامانی سەرمایەدار زیاتر دەبێت. ناکۆکیی نێوان هێزی بەرهەمهێن و هەلومەرجی بەرهەم هێنان (واتە لە نێوان خاوەن سەرمایە و بۆرژوا لە لایەک و چینی کرێکار لە لایەکی دیکە) هەر دەبێ لە کۆتادا بگاتە شۆڕش. مارکس لە *سەرمایە* دا دەڵێ:

«هاودەم لەگەڵ کەم بوونەوەی تەوەرەکانی سەرمایە، کە دەرفەتی ئەوەیان هەیە هەموو سوودێکی فراژووتنی کۆمەڵگە بۆ خۆیان ڕاکێشن و دەستی بەسەردا بگرن، دادۆشینی ئاپۆرەی خەڵک زیاد دەکات، داماوی و کۆیلەتی و سەرشکێنی زیاد دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا ڕکی چینی کرێکاری بەردەوام پەرسێنیش زیاد دەکات، کە هەر لەو کاتەدا خەریکی فێربوون و یەکگرتن و سازدانە، لە لایەن میکانیکی شێوازی بەرهەم هێنانی خودی سەرمایەدارییەوە. مۆنۆپۆلی سەرمایە دەبێتە کۆت لە پێی ئەو شێوازی بەرهەم هێنانەی لە ژێر دەسەلاتی خۆیدا گەشەی کردووە. دەستاوێژی بەرهەم هێنان شێوەیەکی نێوەندەکی وەردەگرێ و خەسڵەتە کۆمەڵایەتییەکانی کار گەشە دەکات تا ئەو ڕادەیەی جێگەی نابێتەوە. ئەم شەق دەبات. زەنگی مافی موڵکایەتیی سەرمایەداری لێ دەدات. زەوتکاران دەبنە زەوتکراوان».

به نۆرینی مارکس، چڕبوونەوەی سەرمایە و هەڵکشانی پشکی سەرمایەی توند لە تاکە سەرمایەدا دەبێتە هۆی ***کەمبوونەوەی پشکی سوود***. ئەم کەمبوونەوەیەش هۆکارێکی گرنگە بۆ ڕمانی ڕشتەی سەرمایەداری. سەرمایە بەردەوام داوای فراژووتنی بازاڕیش دەکات. گرنگ نییە ***چی*** دروست دەکرێ – پێداویستییەکی ژیان بێت یان شتی پووچ بێت – گرنگ ئەوەیە بەهەر جۆرێک بێت بفرۆشرێ.

به بۆچوونی مارکس، هەر لەبەر ئەوەشە کە دەمدەم دەبێ ***سەختانگی*** ئابووریی وەها پەیدا ببێ کە پێوەند بێت بە بەرهەم هێنانی زیاد لە پێویست: دانراو لە داواکراو زیاترە. مارکس پێی وایە لە ڕۆژگارێکی وەهادا دەبێ ڕشتەی سەرمایەداری هەراسان بکرێ و پرۆلیتاریا دەسەڵات بگرنە دەست.

### ٥- ڕشتە و بیروڕای سیاسی

دیمانەی مارکسی دەربارەی فراژووتنی سەرمایەدارەتی و شۆڕشی پرۆلیتاریا، دیمانەیەکە باس لە چەند مەیلێکی گشتی دەکات. ئەو دیمانەیە ناڵێت فراژووتنی بەرەو ناکۆکیی بەردەوام بەهێزتر و لە ئەنجامدا بەرەو هەڵوەشان، ڕاستەڕێیەکی تەواو ڕاستە. ماناشی ئەوە نییە هەموو هۆکارێکی دیکە لە فراژووتنی کۆمەڵگەدا بێ سەنگن.

بەڵام مارکس و ئەنگیلز دەڵێن، فراژووتنی هێزی بەرهەمهێن و هەلومەرجی بەرهەم هێنان هۆکاری ***بنەڕەتین***: هەلومەرجی سیاسی و دەستووری، هەروەها بیروڕا و ئیدیال سەرچاوەیان هەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆکارە بنەڕەتییانە و بۆ پێوەندیی نێوان ئەو هۆکارانە، پێچەوانەی ئەمە ڕاست نییە. مارکس دەڵێ: «شێوازی بەرهەم هێنانی مایەکی، سەرچاوەیە بۆ پرۆسەی کۆمەڵایەتی، سیاسی و گوزەرانی گیانەکی بەگشتی». «ئاگای مرۆڤ نییە بڕیاری گوزەرانی مرۆڤ دەدات بەڵکوو بەپێچەوانەوەیە». ئەو دەمەی ناکۆکیی نێوان هێزی بەرهەمهێن و هەلومەرجی بەرهەم هێنان دەگاتە ئاستێکی تایبەتی: «دەمێکی تایبەت بە شۆڕشی ***کۆمەڵایەتی*** دێتە پێش. بە گۆڕینی ژێرخانی ئابووری، سەرلەبەری ئەو ژوورخانە مەزنە دەگۆڕدرێت – ئیدی بە پەلە بێت یان بە خاوی. کاتێک لە هەڵگەڕانەوە ورد دەبینەوە دەبێ هەردەم هەڵگەڕانەوەی مایەکی سەر بە باری بەرهەم هێنان، کە دەکرێ بە وردییەکی زانستانە حیساب بکرێ، جودا بکرێتەوە لە هەڵگەڕانەوەی سەر بە بواری دەستووری، سیاسی، دینەکی، هونەرکاری و فەلسەفی، بە کورتی بواری ئایدیۆلۆگی، کە لە ڕێیەوە مرۆڤ ئاگاداری ناکۆکییەکە دەبێ و خەباتی دژ دەکات».

مەبەست لەم گوتانەی مارکس ئەوەیە کە ناکۆکیی نێو ***ژوورخان*** سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ناکۆکیی نێو ***ژێرخانی*** مایەکی. بەڵام وشەکانی لێکدانەوەیەکی بەرتەسکتریش هەڵدەگرن. واپێدەچێ مارکس لێرەدا باس لە پێوەندییەکی ***کاتانە*** بکات لە نێوان هەڵگەڕانەوەی نێو ژوورخان و ژێرخان و ئاسانیشە وشەکانی وەها لێک بدرێنەوە کە گوایە هەموو ناکۆکییەک – بە دوا ئەوەشدا هەموو ڕووداوێک – لە ژوورخاندا، ڕاستەوخۆ لە هەلومەرجی ژێرخانەوە پەیدا دەبن.

مارکس گوتەی دیکەی هەیە لەگەڵ ئەم لێکدانەوەیەدا دژ دەوەستن، بەڵام باوەڕی مارکسایەتی زۆر جار بەم واتایە فامکراوە. پیرە ئەنگیلز ڕەنجێکی زۆری داوە بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەم ***ئابوورایەتی*** یە. لە نامەیەکی بەناوبانگیدا دەنووسێ:

«بە مێژوونۆڕی مەتێریالیستانە، ئەوەی لە دوا هەنگاودا بڕیاری خولی مێژوو دەدات بریتییە لە بەرهەم هێنان و بەرهەم هێنانەوەی گوزەرانی ڕاستەکی. نە مارکس و نە من لەمە زیاترمان نەگوتووە. ئەگەر ئەم ڕستەیە وەها بشێوێنرێ کە گوایە مەبەست لێی ئەوەیە هۆکاری ئابووری تاکە هۆکاری بڕیاردەرە، ئەوا ڕستەکە دەبێتە دەربڕینێکی بۆش، ئەبستراکت و پووچ. باری ئابووری بنەمایە، بەڵام لایەنە جیاوازەکانی ژوورخان – شێواز و ئەنجامەکانی خەباتی سیاسیی چینایەتی – ئەو بنگە دەستوورییانەی کە چینی سەرکەوتوو دایدەمەزرێنێ، شێوازی قانوونی و ڕەنگدانەوەی هەموو ئەو ململانێ کۆنکرێتانە لە ئاگای بەشداراندا، دیمانەی فەلسەفی و دەستووری، نۆڕینی دینەکی و گەشە کردنیان بەرەو ڕشتەی دۆگما، بەهەمان ڕادە کار دەکەنە سەر ململانێی مێژووکرد و لە زۆر باریشدا دەستێکی بڕیاردەریشیان هەیە لە ***شێوەی*** ئەو ململانێییەدا. لە نێو کارلەیەک کردنی ئەم هەموو لایەنەدا، فراژووتنی ئابووری لە ناو چەندین ڕێکەوتی بێهەژماردا وەک پێداویستییەک خۆی دەنوێنێ».

ئەنگیلز ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە جەخت نەکردنی مارکس و خۆی، لەسەر ئەو لایەنە لەبەر ئەوە بووە کە ناچاربوون ڕووبەڕووی مێژوونۆڕیی ئایدیالیستانەی جۆراوجۆر بوەستن.

لەگەڵ ئەوەشدا پێویست ناکات پەنا بەرینە بەر ڕاڤە دانی فیکری لەو بابەتە بۆ ئەوەی تێبگەین کە مارکس و ئەنگیلز سەنگێکی سەربەخۆ، بۆ نموونە، دەدەن بە هەلومەرجی سیاسی. گریمانەیەکی یەکجار نێوەندەکی لای ئەوان ئەوەیە کە دەڵێ پرۆلیتاریا، بۆ ئەوەی شۆڕشەکەی خۆی جێبەجێ بکات، دەبێ دەسەڵاتی سیاسی بگرێتە دەست. کۆمەڵگەی

سۆسیالیستانە هەر لەخۆوە، لە ڕێی ناکۆکیی نێو فراژووتنی سەرمایەداری پەیدا نابێت، تەنیا بە خەباتی سەندیکاگەریش پەیدا نابێت. دروست بوونی کۆمەڵگەی وەها پێویستی بە بزووتنەوەیەکی کرێکارانەی گەورە هەیە کە لە ڕووی سیاسییەوە هۆشمەند بێت و خۆی فێری ئەوە بکات دەست نەک تەنیا بەسەر دەستاوێژی بەرهەم هێناندا بگرێت بگرە بەسەر بنگەی سیاسی و دادپرسیشیدا بگرێت.

دەوڵەت بە نۆڕینی مارکسی، دەزگەیەکی دەسەڵاتە و لە خزمەت چینی دەسترۆدایە. هەڵبەت مەبەست لە چینی دەسترۆ ئەو چینەیە دەستی بەسەر دەستاوێژەکانی بەرهەم هێنانی مایەکیی ئەو زەمانەی خۆیدا گرتووە. بەڵام تەنیا بە دەستاوێژی بەرهەم هێنان حوکوم ناکرێت. ئەو چینە پشتیوانییەکی بەهێز، لە بنگەی جۆراوجۆری دەوڵەتدا، بۆ خۆی پەیدا دەکات: هێزی پۆلیس، هێزی دەستووردانان و هێزی سزادان بە گوێرەی ئەو دەستوورانە، هێزی باج سەندن و ئیمتیاز دان... هتد. چینی دەسترۆ، تەنیا بەم شێوەیە دەتوانێ دەسەڵاتی خۆی بچەسپێنێ.

ڕشتەی سیاسی، بە نۆڕینی مارکسی، دوا بنجی دەگەڕێتەوە بۆ هەلومەرجی بەرهەم هێنانی مایەکی، ئەمەش خزمەتی چەند بەرژەوەندیکی چینایەتی دەکات - کەموزۆر هاوئاهەنگ لەگەڵ ئامانجدا. شێوازی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری هاوشانێکی خۆی هەیە لە ناو ڕشتەی سیاسیی بۆرژوادا. شۆڕشی ئینگلیزی ١٦٨٨ و شۆڕشی فرانسی ١٧٨٩ نموونەی شۆڕشی بۆرژوان. دەرفەتی ئەم شۆڕشانە لەوەوە پەیدا بووە کە ناکۆکیی نێوان هێزی بەرهەمهێنی نوێ و ڕشتەی دامەزراوی نیمچە فیودالەتی، تەواو فرەوان بوو. ئەو هەموو دەست تێوەردانەی ڕژێمە کۆنەکان لە ئازادیی بازرگانیدا و ڕێک کردنی گوزەرانی ئابووری بەگشتی، کۆسپێک بوون لە ڕێی بڵاوبوونەوەی پیشەسازیدا و لەویشەوە بۆ بەکارهێنانی زانست و تەکنیک لە بەرهەم هێناندا. لە ڕشتەیەکی سەرمایەداری وەهادا کە بۆ فراژووتن لەبار بێت دەبێ، خەڵک، لە ڕوویەکی دیمانەکییەوە، وەک تاکەکەسانێک سەیر بکرێن کە مافی وەک یەکیان هەیە بۆ خۆ دەوڵەمەند کردن، بۆ بازرگانی، بۆ پیشەسازی، بۆ فرۆشتنی هێزی کاری خۆ بە بەرزترین نرخ. ڕژێمە سیاسییەکانی بەر لە ڕژێمی بورژوا ڕێگەیان لە هەموو ئەم لایەنانە دەگرت و قەدەغەیان دەکردن.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو بەرنامەگەلەی بەر لە شۆڕشەکانی بۆرژواگەل و لە دەمی ئەو شۆڕشانەدا هاتنە کایەوە، تەنیا لە ئازادیی ئابووری نە دەدوان، بگرە لە هەموو بوارێکدا: سیاسەت، دین و ئاکار، داوای ئازادی دەکرا.

مارکس شی کردنەوەیەکی دەربارەی چەمکی ئازادی و یەکسانی کردووە کە دەشێ بەراورد بکرێ بەوەی هێگلی یەکرەو کردوویەتی (بڕوانە بەشی ئازادی و یەکسانی لای هێگل). داوا کردنی ئازادی و یەکسانی، بە نۆڕینی مارکس، بە پلەی یەکەم ئازادی و یەکسانی ئابوورییە. لە سەروکاری گۆڕینەوەدا، کە لەسەر بنەمای بەهای گۆڕینەوە بنیات نراوە (واتە ئەوەی تەنیا پێوەندە بە نرخی ئەو کەرەستانەی دەگۆڕدرێنەوە) ئەگەر نەبەستنەوە و وەکیەکیی ڕەسمیی تەواو هەبێت، ئەوا بە گوتەی مارکس: «دەبنە بنەمایەکی ڕاستەکی و بەرهەمهێن بۆ هەموو *یەکسانی* و *ئازادی* یە». لە کۆمەڵگەی پێش بورژوادا، گۆڕینەوە لە نێوان بەرهەمهێن و بەرهەمبەردا تەنیا گرێدراوی بەهای گۆڕینەوەی ئەو کەرەستەیە نەبوو کە دەگۆڕدرایەوە، بەڵکوو ڕێساش هەبوو بڕیاری دەدا کێ بۆی هەیە بەرهەمهێن بێت و کێ بۆی هەیە بەرهەمبەر بێت و چ شتێک دەبێ دروست بکرێت. تەنانەت هێزی کاریش کڕین و فرۆشتنی بۆ نەبوو. «لە سەردەمی ناڤیندا کار ئیمتیاز بوو، شتومەکی خاوەن بەهای تایبەتی دروست دەکرد نەک خاوەن بەهای گۆڕینەوەی گشتی».

فراژووتنی نێو ژێرخان، واتە فراژووتنی هێزی بەرهەمهێن و هەلومەرجی بەرهەم هێنان، دەبێتە دنەدەرێک بۆ داخوازیی ئەوەی هەموو کەسێک مافی ڕەسمیی هەبێت بتوانێ هەموو جۆرە شتومەکێک بگۆڕێتەوە. ئەمەش بۆ سەرلەبەری فراژووتنی کۆمەڵایەتی پێویستە. بەڵام ناکرێ بپەستێنرێ بۆ داوا کردنی ئازادی و یەکسانیی تەنیا ئابووری. ئیمتیازە ئابوورییە کۆنەکان پشتیان بە ئیمتیازی دیکە بەستبوو، بۆ نموونە بە ئیمتیازی سیاسی کە پێشەمی دەدات بە بەرەیەکی تایبەت و بەگشتیش خەڵک بە بەرەی جۆراوجۆر دادەنێ نە بە تاکەکەس، یان ئیمتیازی دینەکی کە ڕێگە دەدات گرووپێک بڕیار بدەن خەڵکی دیکە بیروڕایان چی بێت و بەو جۆرەش شووردیەکی دینەکی لە دەوری ڕشتەی کۆمەڵایەتی چەسپاو بکێشێ. هەموو ئەم ئیمتیازانە دەبێ لابدرێن. خەبات دەبێ لە هەموو بەرەیەکدا بکرێت. کەواتە مارکس پێی وایە ململانێی شۆڕشگێڕانەی بۆرژوا دژ بە کۆمەڵگەی کۆن پێویستە و ڕەوایە. مارکس دەڵێ، ئازادیی ئابووری، سیاسی و دینەکی کە بۆژوا بەدەستی دێنێت، لە ماوەیەکی تایبەتیدا سوودی بۆ هەموو کۆمەڵگە هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا، مارکس دەڵێ، ئەو ئازادی و یەکسانییەی زەدەی ڕشتەی سەرمایەدارە، تەنیا لە ماوەیەکی کەمخایەندا ناوەڕۆکی ڕاستی خۆی دەپارێزێ چونکە سەربەخۆیی تاکەکەس بە مەرج دەگرێ بەڵام تاکەکەس تەنیا بە شێوەیەکی ڕەسمی سەربەخۆیی بۆ دەمێنێتەوە. پرۆلیتاری هاوچەرخ مافی ئەوەی هەیە هێزی خۆی، بە هەر کەسێک بێت، بفرۆشێ. بەڵام هاوچاوی لەسەر دەرفەتی کار ئەم ئازادییە بۆش دەکات.

کرێکاران وەک تاکەکەس سەیر ناکرێن، بەڵکوو وەک چین، خودی فراژووتنی سەرمایەدارەتی بەرەو پتر چڕبوونەوە، خەسڵەتی کۆیەکی collective لە چینی کرێکاردا بەهێز دەکات. سەرمایەدارەکانیش لە لای خۆیانەوە دەبێ وەک بەرەیەک ڕووبەڕووی کرێکاران ببنەوە و ڕێک لەبەر ئەوەی لە هەمان کاتیشدا ناچارن لە ناو خۆیاندا خەریکی هاوچاویی مەرگ و ژیان بن، زیاتر کۆیلەئاسا دەبەسترێنەوە بە بارودۆخی ئابوورییەوە.

ئازادییە سیاسییەکانیش بەرەو هەمان ڕووگە گەشە دەکەن و بەربەرە دەبنە ئازادیی دەربڕین و پەیڕەوی کردنی نرخاندنی بۆرژوایانە. بۆچوونی نوێی سۆسیالیستانەی شۆڕشگێڕانە بەربەرەکانێ دەکرێن و دەچەوسێنرێنەوە.

مارکس دەڵێ سەرلەبەری ئەم فراژووتنە لەتەک ئامانجی ڕشتەی سەرمایەداریدا کۆکە: «ئەوەی فراژووتنی ئازادی و یەکسانی دەشێوێنێ، بەڕاست گێڕانی ڕێک ***ئازادی*** و ***یەکسانی*** یە، چونکە لە ڕاستگێڕانەکەدا دەبنە نائازادی و نایەکسانی».

مارکسایەتی دەڵێ، بە پلەی یەکەم دەبێ پرۆلیتاریای پەرەسێنی پیشەسازی خەبات دژ بە ڕشتەی سەرمایەداری و دژ بە کۆمەڵگەی دارزاوی بۆرژوا بکەن. ئەم خەباتەش هەر وەک خەباتی بۆرژوا دژ بە ڕشتەی کۆن، دەبێ هەموو بەرەیەک بگرێتەوە. دەبێ خەباتێک بێت دژ بە بیر و باوەڕ و ڕامانی وەها کە ڕشتەی دامەزراو دەدروستێنێ. دەبێ خەباتێکی سیاسی بێت و هەوڵی هەراسان کردنی ڕشتەی سیاسی بدات، ڕشتەی سیاسیی وەک ئەوەی لە ئینگلاند بریتییە لەو پەرلەمانگەرییەی هێدی هێدی بەرەو دیمۆکراتیی نوێنەرەکی گەشەی کردووە، یان وەک ئەوەی فرانسەی ناپۆلیۆنی سێیەم (لە ساڵانی ١٨٥٠ و ١٨٦٠دا) کە شێوە تێکەڵێکی مەزنایەتی بیرۆکراتی و قەیسەری. دەشبێ لە کارگەکاندا خەباتێکی سەندیکاگەریش هەبێت، ئەمیان خەباتی ڕاستەوخۆی کرێکارانە دژ بە سەرمایەداران.

هەتا ئێرە ڕێکەوتنێکی تەواو هەیە دەربارەی نۆڕینی مارکس و ئەنگیلز و هەموو لایەنێک ڕوونە. بەڵام مشتومڕ لەسەر ئەوە هەیە ئایە، بە بۆچوونی مارکس و ئەنگیلز، پێوەندیی نێوان ***دەستاوێز*** و ***ئامانج***، کە کۆمەڵگەی بێچینە، چۆنە. مارکس و ئەنگیلز لە لایەکەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە گەیشتن بە ئامانج تەنیا لە ڕێی شۆڕشێکی پرۆلیتاریەوە دەبێ. لە لایەکی دیکەوە دەڵێن هیچ ڕێنمایەک دوایەکی نییە، بەڵکوو دەبێ بە پێی فراژووتنی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی، ڕێنماکان بگۆڕدرێن.

بژارخواز revisionist ان، لە دەمەو بنەتای سەدەی نۆزدەیەمدا پەیدا بوون و پاشان ڕەنگیان لە هەموو بزووتنەوەی سۆسیال دیمۆکراتدا دایەوە. ئەمانە جەختیان لەسەر

گۆڕانکاریی نێو مارکسایەتی دەکرد. بەرانبەر بژارخوازان، لایەنێکی دیکە هەبوو پێی وابوو باوەڕی شۆڕشی پرۆلیتاریانە بەشێکی دانەبڕاوە لە مارکسایەتیدا، ئەمانە پاشان ناوی کۆمیونیست communist یان لێ نرا. لە بوارێکی دیکەدا باس لە هەردوو لایەن دەکەین. لێرەدا هەوڵ دەدەین گۆشەنیگا بنچینەکانی مارکسایەتی ڕوون بکەینەوە.

١) مارکس و ئەنگیلز جەخت لەسەر بزووتنەوەی سازدراوی کرێکاران دەکەن. بۆ ئەوەی بزووتنەوەی کرێکاران بەڕاستی بتوانێت سازمانێکی توند دروست بکات، پێویستە ڕشتەی سەرمایەداری تارادەیەک گەشەی کردبێ: کارگەی گەورە بە کرێکاری زۆرەوە، بازاڕێکی نێونەتەوەیی بۆ سەرمایە و کەرەستە ...هتد. ئەمانە دەبنە بنەمایەکی خۆڕسک بۆ ئەو شێوە هاوکارییە کۆیەکییە پێویستەی ناو بزووتنەوەی کرێکاران.

٢) کرێکاران دەبێ فێر بکرێن و ئامادە بکرێن بۆ دەسەڵات گرتنە دەست. مارکس و ئەنگیلز ئەم بیرەیان لە شۆڕشی ١٨٤٨ ـەوە وەرگرت، ئەو دەمە ئەمان بەتەمابوون سەرهەڵدانێکی کرێکارانەی عەفەوی ڕوو بدات، ڕووی نەدا. لەو دەمەوە پێیان لەسەر ئەوە داگرت کە چینی کرێکار ناتوانێ ڕاپەڕینێک بەرەو ئەنجامی چاک و جێگیر بەرێت بەڕێوە ئەگەر تەواو لە ڕشتەی دامەزراو و ئامانج و مێتۆدی خەبات ئاگادار نەکرابێت.

٣) مارکس و ئەنگیلز جەختیان لەسەر گرنگیی ململانێی دیکەی نێزیکەدەست دەکرد: لە بواری سیاسی و سەندیکاگەری و فیکریدا. ئەوان پشتیوانییان لە داخوازیی هەشت سەعات کار کردن دەکرد، پشتیوانییان لە مافی دەنگدانی وەک یەک و گشتی دەکرد، پشتیوانییان لەوە دەکرد کە پارتە سۆسیال دیمۆکراتەکان بەشداری هەڵبژاردن بن. بەشێکی بەرچاوی چالاکییان بۆ بەرپەرچ دانەوەی ڕۆژانە تەرخان کرابوو دژ بە کۆمەڵگەنۆڕیی دیکە، بەتایبەتی ئەوانەی مۆرکی سۆسیالیستانەی گشتی و ئەنارکیستانەیان پێوە بوو.

ئەوجا ئەوەش ئاشکرایە کە بە بۆچوونی مارکس و ئەنگیلز، هەم سازدانی بزووتنەوەی کرێکاران و هەم ململانێ بۆ بیراز کردن لە نێو چوارچێوەی بۆرژوا-سەرمایەداریدا، ئامادە کردنێک بوون بۆ شۆڕش. ناکۆکیی بنەڕەتی لە نێوان کار و سەرمایەدا، واتە لە نێوان چینی کرێکاران و بۆرژوادا، بە بۆچوونی ئەوان، بەوە لەناو ناچێت بۆرژوا پارێزانێکی بەهێز لە ڕشتەکەی خۆیدا بسەلمێنێ، یان بەوەی گوزەرانی چینی کرێکاران

کەمێک باشتر بێت. سەرکەوتنێکی سیاسیی کرێکاران، ئەگەر لابردنی موڵکایەتیی کەسەکی پێوە نەبێ، سەرکەوتنێکی بۆشە. ڕۆژی هەشت سەعات کارکردن بۆ سوودی کرێکاران بیرازێکی گرنگە، بەڵام ڕشتەکە ناگۆڕێت، چونکە هێشتا هەر داوای ئەوە دەکات کرێکاران مافی خاوەنییەتی زێدەبەهای کاری خۆیان بۆ سەرمایەدار جێهێڵن.

نۆرینێکی بنەڕەتیی زووی مارکسایەتی ئەوەیە کە دەڵێ گۆڕانکاریی بڕیاردەر پەیدا نابێ هەتا هەموو ڕشتەی دامەزراو نەدرێ بە پشتدا.

مارکس و ئەنگیلز، لە باس کردنی چۆنیەتی جێبەجێ کردنی شۆڕشەکەدا، کەمدوون. ئەوان پێیان وایە ئەمە مەسەلەیەکە پێوەندییەکی زۆری بە بار و ڕێکەوتی دەرەکییەوە هەیە. پاش کۆمیونی پاریس (١٨٧١)، مارکس نووسیویەتی:

«ڕاستە ئەگەر شیابا خەبات لە گەمەیەکی هەڵەنەبەری دۆستانەی ڕێکەوتدا بکرایە، یەکجار ئاسان دەبوو مێژووی جیهان هەڵنرێت. بەڵام مێژووی جیهان سروشتێکی سەر بە غەیبی وەردەگرت ئەگەر "ڕێکەوت" هیچ نۆرەیەکیان نەبایە. بێگومان ئەم هەڵکەوتانە دەستیان تەنانەت لە ڕەوتی گشتیی فراژووتندا هەیە و ڕێکەوتی دیکەش دەبنە پارسەنگیان. ئەوجا ئەگەر ڕەوتی فراژووتن خێرا بێت یان خاو بێت، بە ڕادەیەکی فرەوان پەیوەستی "ڕێکەوت" ی لەو بابەتەیە - یەکێک لەو "ڕێکەوت" ـانە ئەوەیە ئایە ئەو کەسانەی لە لووتکەی بزووتنەوەکەدان، چ جۆرە مرۆڤێکن».

هەڵگەڕانەوەی شۆڕشگێڕانە مۆرکی چەندین بارودۆخ و ڕووداوی شەپڕێوانەی پێوەیە و ناکرێ پێشبینی لە ڕەوتیان بکرێ. بە نۆڕینی مارکس و ئەنگیلز، فراژووتنی مێژووکرد پرۆسەیەکی داهێنەرانەیە. بەردەوام شێوە و بنگە و بیری نوێ پەیدا دەبێ و ناشکرێ بە دڵنیاییەوە پێشبینی لە سەنگیان بکرێ. زۆر جار لە ململانێی نێوان شۆڕشگێڕان و بژارخوازانی نێو مارکسایەتیدا، سوود وەرگیراوە لە گوتەی بە ڕواڵەت دژ بەیەکی مارکس و ئەنگیلز کە دەربارەی مافی گشتیی دەنگ دانن و لەویشەوە دەربارەی سەنگی هەڵبژاردەکانی گەل لە پەرلەماندا. پرسیاری سەرەکی ئەمە بوو: ئایە پەرلەمانێک کە چینی کرێکاران تێیدا زۆرینە بێت دەتوانێ ببێتە پلاتفۆرمێک بۆ گۆڕینی کۆمەڵگە بەرەو ڕووگەیەکی سۆسیالیستانە؟ ئەگەر وا بێت ئایە پەرلەمان جێگەی شۆڕش دەگرێتەوە؟

ئەو ڕاوێژەی هاتە کایەوە، لەبەر ئەوەی چەمکی ***دەوڵەت*** ی مارکس و ئەنگیلز دەخرایە پشت گوێ، لە بەشێکی فرەوانیدا بە گۆشەنیگای ناجۆر دەگەیشت. مارکس و ئەنگیلز بە ئاشکرا دەڵێن دەوڵەت ئامرازی چینی دەستڕۆیە، ئەدی پەرلەمانی هەڵبژاردەی گەل، گەر بە بنگەیەکی دەوڵەتی دابنرێ، چییە؟

بە نۆڕینی مارکس و ئەنگیلز، سەرەتا و بنەتای دەوڵەت و دەسەڵاتی دەوڵەت هەر دەسەڵاتی سەپاندنە یان دەسەڵاتێکی سەپێنەرە. کۆڵەکەی دەوڵەت و بەشێکی ئاسایی دەوڵەت، هەتا ئەو دەمەی مارکس و ئەنگیلزیش، بریتی بوو لە ئەرتەش، پۆلیس و دادگە – دەوڵەت بەم ئامرازانە دەتوانێ سەپێنەر بێت. ئاشکرایە کە ئەرکی ئەم ئامرازانە ئەوەیە داکۆکی لە ڕشتەی دامەزراو بکەن و ئیمتیازەکانی چینی دەسترۆ بپارێزن. مارکس بۆ نموونە لە ڕەخنەکەیدا لە بەرنامەی گۆتا جەخت دەکات لەسەر پێوەندیی پاسیڤانەی دەوڵەت بە کۆمەڵگەوە.

دەبێ ئەوەمان لە یاد بێت کە پەرلەمان نۆرەیەکی ئەوتۆی لە چەمکی دەوڵەتی مارکس و ئەنگیلزدا نییە. پەرلەمان کاتێک دەبێتە بەشێکی گرنگی دەوڵەت کە سەربەخۆ بتوانێت بڕیار دەرکات، بڕیارەکانی دەسەڵاتی سەپێنەرانەیان هەبێ. پەرلەمانی نەریتی بەو پێکهاتەی کە بریتییە لە نوێنەرایەتییەکی ناجۆر، بەگشتی تەنیا ڕەنگدانەوەیەکی هەلومەرجی چینایەتی و دەسەڵاتی دامەزراوە.

ئەو سەنگەی مارکس و ئەنگیلز دەیدەن بە مافی دەنگدانی گشتی دەبێ بەم جۆرە سەیر بکرێ: ئەگەر نوێنەرایەتی چینەکان لە پەرلەماندا بە گوێرەی ژمارە بێت نەک دەسەڵاتی ئابووری و دەسەڵاتی دیکە، ئەو دەمە پەرلەمان دەبێتە پارسەنگێکی بنگە دەوڵەتییەکانی دیکە. پەرلەمان، بۆ چینی کرێکار، دەبێتە بنگەیەکی بەناو دەوڵەتی کە دژ بە بنگە دەوڵەتییەکانی دیکە کار دەکات.

بەڵام بەمەش پەرلەمان نابێتە خاوەن ئەو دەسەڵاتە سەپێنەرەی دەوڵەت. بڕیارەکانی پەرلەمان، گەر دژ بە هەلومەرجی دامەزراوی دەسەڵات بن، لە لایەن بنگە دەوڵەتییەکانی دیکەوە هەڵدەوەشێنرێتەوە – پەرلەمانیش هەڵدەوەشێنرێتەوە. پەرلەمانێکی بە ڕاست سەربەخۆ کە نوێنەری گەل بێت و بتوانێ لە ناوەوە دەسەڵاتی دەوڵەت بگۆڕێ، هێشتا لە زەمانی مارکس و ئەنگیلزدا نەهاتبووە کایەوە، لەبەر ئەوە هەردووکیان خۆیان لە گوتاری ئاواڵە دەپارێزن. ئەوان تەواو دڵنیانین لەوەی شۆڕش دەبێ چ ڕێگەیەک بگرێتە بەر و سوود لە کام ئامراز وەربگرێ.

بەرانبەر ئەوەش، مارکس و ئەنگیلز، گومانیان نییە لە ئامانجی دەمودەستی شۆڕشی پرۆلیتاریا: ئەویش دامەزراندنی دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریایە. دەوڵەت ئامرازی چینی دەسترۆیە و هەر وەهاش دەبێت. پرۆلیتاریا دەبێ سوود لەو ئامرازی دەسەڵاتە وەربگرێ کە چینی بەر لە خۆی دایان ڕشتووە بۆ ئەوەی خواستەکانی خۆیانی پێ جێبەجێ بکەن. بەڵام دەوڵەت تەنیا هەتا ئەو ڕۆژەی نوێنەری دەسەڵات و بەرژەوەندی یەک چین بێت، دەژی.

پرۆلیتاریا تەنیا لە ماوەی پەڕینەوەدا پێویستی بە دەوڵەتە. ئەنگیلز دەڵێ: «یەکەم کردار، کە دەوڵەت بەڕاستی وەک نوێنەرێکی سەرلەبەری کۆمەڵگە بیکات - واتە دەستاوێژی بەرهەم هێنان بە ناوی کۆمەڵگەوە بگرێتە دەست - دەبێتە دوا کرداری سەربەخۆی دەوڵەت. دەست تێوەردانی دەوڵەت لە هەلومەرجی کۆمەڵایەتیدا، لە بوار دوای بوار، دەبێتە کارێکی ناپێویست و هەر لە خۆوە نامێنێ. لە بری حوکوم کردنی خەڵک، سەرپەرشتی کردنی شتومەک و بەڕێوەبەرایەتی پرۆسەی بەرهەم هێنان دێتە کایەوە. دەوڵەت "لانابرێت" بەڵکوو "دەپووکێتەوە"».

ئەم ڕاوێژە نموونەیەکە لە دیالەکتیکی نێو مێژوونۆریی مەتێریالیستانە. هەموو مێژووی پێشوو، ئەوپەڕی مەرجی لە ناکۆکیی نێوان هێزی بەرهەمهێن و دەستاوێژی بەرهەم هێناندا بووە و لەویشەوە ناکۆکیی نێوان ئەم چین و ئەو چینی کۆمەڵگە بوو. هەموو چینێک بەرژەوەندی خۆی هەبووە داکۆکی لێ بکات بەرانبەر چینەکانی دیکە. پرۆلیتاریا یەکەم چینە شتێکی نەبێت بەشی خۆی بێت و خەباتی بۆ بکات. چینی بۆرژوا دەمێک بوو بە ناوی سەرلەبەری گەلی چەوساوەوە - بە ناوی هەر هەموو «بەرەی سێیەم» ـەوە - دەسەڵاتی گرتبووە دەست. بەڵام کاتێک دەسەڵاتی گرتە دەست، کەوتە پاراستنی بەرژەوەندی خۆی، هەم دژ بە دەسەڵاتدارانی کۆن و هەم دژ بە پرۆلیتاریا. دەبا هەلومەرجی بەرهەم هێنانی خۆ و ڕشتەی سیاسیی خۆ بپارێزێ. هەم دژ بە ڕاست و هەم دژ بە چەپ. پرۆلیتاریا بەرژەوەندی تایبەتیی لەو بابەتەی نییە. تاکە بەرژەوەندی پرۆلیتاریا لەوەدایە دەستاوێژی بەرهەم هێنان بگوێزرێتەوە دەست سەرلەبەری کۆمەڵگە. کاتێک پرۆلیتاریا دەوڵەت بەکار دەهێنێ بۆ ئەوەی «دەستاوێژی بەرهەم هێنان بەناوی کۆمەڵگەوە بگرێتە دەست»، دەوڵەتیش لە دەوڵەت بوون دەکەوێ، چونکە چیدی نوێنەرایەتی بەرژەوەندێکی تایبەت ناکات دژ بە بەرژەوەندێکی دیکە.

گرتنە دەست خۆی دەستاوێژی بەرهەم هێنان لە لایەن کۆمەڵگەوە مەرجە بۆ کۆمەڵگەی بێچین. لە فەرهەنگی مارکسیدا، کە دەگوترێ کۆمەڵگەی بێچین مەبەست لەوە نییە هەموو کەسێک هەموو جۆرە کارێک بکەن (ئەگەرچی مرۆڤی فرەدیو و بگرە هەمەکی بە نموونە دانراوە) مەبەست لە کۆمەڵگەی بێچین ئەوەیە هیچ چینێک مۆنۆپۆلی بەسەر دەستاوێژی بەرهەم هێناندا نەبێ و بەو جۆرەش هیچ چینێک دەرفەتی ئەوەی نەبێ بە زۆر بەرهەمی کاری چینێکی دیکە بۆ خۆی بەرێت.

مارکس و ئەنگیلز پێیان وایە مەرجی کۆمەڵگەی بێچین ئەوەیە هێزی بەرهەمهێن یەکجار بەرز هەڵکشابێت. لە بنەڕەتیشدا ڕشتەی سەرمایەدارە فراژووتنێکی بێوچانی

هێزی بەرهەمهێنی گرتوتە بەر. بەڵام لە ئاستێکی تایبەتیی چڕبوونەوەدا، هەلومەرجی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری دەبێت کۆسپ لە بەردەم فراژووتنی هێزی بەرهەمهێندا. هێزی بەرهەمهێن پێویستی بە پلەیەکی بەرزی هاوکاری هەیە و ئەو ژمارە ڕوو لە کەمبوونەی سەرمایە (و سەرمایەدار) ئەم بارەی پێ هەڵناسووڕێ. پێویستە خەڵک بەرپرسایەتیی هاوکۆ و ڕاستەوخۆی فراژووتن بگرنە دەست.

بەڵام ڕێگەی نێوان شۆڕشی پرۆلیتاریا و ئەو دۆخەی دروشمی «لە هەر یەک بە گوێرەی توانا و بۆ هەر یەک بە گوێرەی پێداویستی» تێدا بەکارە، ڕێگەیەکی درێژە. ئەم دۆخەی دوایی، کە لێنین ناوی لێ نا ***کۆمیونیستانە*** (بۆ جیاکردنەوەی لەوەی پێشتر کە سۆسیالیستانەیە)، پێویستی نەک هەر بە بەرهەم هێنانێکی چوستە بەڵکوو بە پشتگرییەکی بێوچانە لە نێو خەڵکدا. ئەوجا بۆ یەکەم جار لە کۆمەڵگەی وەهادا، بە نۆڕینی مارکسییەکان ، ئازادی و یەکسانی دروست دەچەسپن. ئازادی ئەوە نییە بە ویستی خۆت بکەیت، ئازادی ئەوەیە بە کار کردن بەسەر کۆسپ و سەختیدا زاڵ بیت. «کاری بە ڕاست ئازاد، ئەوەیە لە هەمان کاتدا جیددیترین بابەت و چڕترین ڕەنجدان، بگونجێنیت». ئازاد بوون بەلای مارکسەوە ئەوەیە مرۆڤ خودی خۆی بە ڕاست بگێڕێ. - بەلای هێگلیشەوە هەروەها بوو بەڵام خۆ بەڕاست گێڕان لای مارکس تەواو جیاوازە لەوەی لای هێگل.

### ٦- گرفتی نێو مارکسایەتی

وا پێدەچێ مارکسایەتی لە ڕووی بیرکارییەوە لە هەموو ئەو باوەڕانەی کاریگەریی سیاسییان هەبووە، سەختتر بێت. لەگەڵ ئەوەش لە هەموو باوەڕێکی دیکەی سۆسیالیستانە فرەوانتر کاریگەر بووە. مەسەلەیەکی سەیر نییە کە ڕاڤە دانی هەڵە و نکوولی ناجۆری لەگەڵدا کرابێ. ڕاڤە دانی مارکسایەتی سەختیی زۆری تێدا بووە، ئەمەش زۆربەی جار دەگەڕێتەوە بۆ کەمناسینی بەرهەمەکانی مارکس و ئەنگلز. وا لێرەدا چەند نموونەیەک دەخەمە بەرچاو:

#### ١) *دیمانەی سەر بە چین بوون*

بەلای مێژوونۆڕیی مەتیریالیستییەوە، تەنانەت بیروڕا - و لەویشەوە دیمانە زانستییەکان - لە دوا پلەدا بنجیان لە هەلومەرجی بەرهەم هێناندا هەیە. بیروڕا و زانیاری وەها هەیە دەبنە پشتیوانی بەرژەوەندی چینی دەسترۆ، هەیشە دەبێتە چەک

بەدەست خەباتی شۆڕشگێڕانەی چینایەتیی ژێردەستانەوە دژ بە کۆمەڵگەی دامەزراو. جاری وا هەبوو ئەم بۆچوونە بە شێوەیەکی وەها لێکدراوەتەوە کە گوایە بە نۆڕینی مارکسایەتی، شتێک نییە پێی بگوترێ زانیاری بابەتەکی، بەڵکوو هەموو زانیارێک نیسبییە و بەندە بەوەی سەر بە چ چینێکە. بەڵام ئاشکرایە کە مارکس و ئەنگێلز مەبەستیان وەها نییە. دیمانەی دروست و دیمانەی نادروست هەیە، ئەوەش بەندە بەوەی کێ دیمانەکەی پێ باشە. ئەوجا لە چیندا مەیلێک هەیە بۆ سەلماندنی جۆرە دیمانەیەک و ڕەت کردنەوەی جۆرەکانی دیکە.

با سەیرێکی ئەم نموونەیە بکەین. بە بۆچوونی مارکس و ئەنگێلز، بیریارانی ئابووریی سیاسیی کلاسیک، وێنەیەکی دروست دەدەن دەربارەی شێوازی کار کردنی ڕشتەی سەرمایەداریی زوو، بە هاوچاویی ئازاد و بە کرێکاری و ...هتد. بەڵام سمیت و ڕیکاردۆ و میلل نەیانتوانی باس لە فراژووتنێکی دیکەی سەرمایەداری بکەن کە ڕووی لە مۆنۆپۆل و ناکۆکیی ناوەکیی وەها بوو بەرەو هەڵوەشانی ببات. کەواتە ئەو دیمانەیەی، بە پلەی یەکەم مارکس، دەربارەی سەرمایە دایڕشتووە لە ڕووی بابەتەکییەوە زانیارێکی پتر دەدات وەک لەوەی سمیت و ڕیکاردۆ و میلل دایان ڕشتووە.

بەڵام ئاشکرایە کە دیمانەی ئابووری سیاسیی لە لایەن دەسەڵاتی بۆرژواوە پشتیوانی لێ دەکرێت: لە کۆمەڵگەیەکدا بۆرژوا دەسەڵاتی بەسەر دەستاوێژی بەرهەم هێناندا هەبێت - بە گوێرەی ئابووری سیاسیی کلاسیک - دەبێ فراژووتنی ئابووری و گشتی دنە بدرێ. بەڵام دیمانەی مارکسی پشتیوانی لە داخوازیی شۆڕشگێڕانەی پرۆلیتاریا دەکات.

کەواتە مێژوونۆڕیی مەتێریالیستانە بەهیچ جۆرێک دەرفەتی بوونی زانیاری بابەتەکی ڕەت ناکاتەوە.

### ٢) ناچارەکی و خەباتی شۆڕشگێڕانە

مشتومڕی زیاتر لەسەر ئەوە کراوە کە مارکسایەتی لە لایەک گریمانەی هەیە دەڵێ فراژووتنی سەرمایەداری دەگاتە شۆڕش و لە لایەکی دیکەوە هانی خەباتی شۆڕشگێڕانە دەدات. وا باوە بگوترێ: ئەگەر شۆڕش ناچارەکییە، کەواتە خەڵک دەتوانن بەهێمنی چاوەڕێی بکەن.

ئاسانترین وەرامی ئەم گوتەیە ئەوەیە کە خودی خەباتەکە مەرجێکی پێویستە بۆ شۆڕشەکە (فراژووتنی سەرمایەداری دەگاتە سەختانگ و ئاژاوله بەڵام ناگاتە دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا و بە هیچ جۆرێکیش ناگاتە کۆمەڵگەی بێچین). کاتێک مارکس و

ئەنگیلز پێشبینی شۆڕش دەکەن، ئەوەیان بە مەرج گرتووە کە دەبێ خەباتێکی ئاگادارانەی پرۆلیتاریا لە ئارادا هەبێ. تەنانەت دیمانەکەی خۆشیان مەرجێکی پێویستە بۆ ئەو خەباتە.

### ۳) دیمانە و ئوتۆپی

مارکس و ئەنگیلز زۆربەی دیمانەیارانی سۆسیالیستی بەر لە خۆیان و هاوزەمانی خۆیان ڕەت دەکەنەوە و ناویان دەنێن «ئوتۆپیست». ئەدی ئەمە ئوتۆپی نییە ئەوان باس لە کۆمەڵگەی بێچین دەکەن؟ - واز لەوە بێنە ئەم وێنەیە لە چاو وێنەکەی دوارۆژ کە *Fourier* دایڕشتووە، کەمتر ڕازاوەیە. مارکس و ئەنگیلز دەڵێن، ئەو فراژووتنەی خۆیان نیگاری دەکێشن ئەنجامێکی ڕاستەوخۆی دیمانەکەی خۆیانە دەربارەی فراژووتنی سەرمایەداری. ئەوان کە دەڵێن خەباتی چینایەتی هەر دەبێ بە کۆتابوون بگات، تەنیا ئاکامگرییەکی ڕاستەوخۆی باوەڕەکەی خۆیانە کە دەربارەی خەباتی چینایەتی و هۆکار و شێوازی ململانێی کۆمەلایەتییە.

لەگەڵ ئەوەشدا نکووڵی لەوە ناکەن کە وێنەی کۆمەڵگەی بێچین دنەدەرێکی گرنگە بۆ خەباتی ئازادیخوازانەی پرۆلیتاریا - ئەگەرچی وێنەکە وردەکاریی کەمیشی تێدا بێ. مارکس و ئەنگیلز تەواو بڕوایان بەوە هەیە کە زانیار هۆکارێکی گرنگە تەنانەت لە خەباتی کۆمەلایەتی و سیاسیدا و دەبێ ڕێنمووی کردەوە و خواست و خەونەکانی خەڵک بکات. یان وەک خۆیان دەڵێن: دیمانە و کردەوە کار لە یەکتر دەکەن.

## ١- فاشیزم و نازیزم وەک ئایدیۆلۆگی

وشەی فاشیزم fascism لە fasces (دەسکەدار) ی لاتینییەوە هاتووە و لە رۆمای دێریندا هێمای پاراستنی دەستوور و هێمنی بووە. فاشیزم بە پلەی یەکەم ناوی بزووتنەوەیەکی سیاسییە لە ئیتالیای هاوچەرخدا بە ڕێبەرایەتی بەنیتۆ موسۆلینی Benito Mussolini. پاش شەڕی جیهانیی یەکەم ڕێبازی لەو بابەتە لە تێکرای ئەورووپادا سەری هەڵدا، ئەوەی لە هەمووان گەورەتر و هەژێندەکیتر بوو ڕێبازە ئەڵمانییەکەی سۆسیالیزمی نەتەوەیی national socialism یان نازیزم nazism بوو. شەڕی جیهانیی یەکەم بووە شکانێکی گرنگ بۆ فاشیزم و نازیزم، بەڵام لەم چەند دەساڵەی دواییدا دەرکەوت کە بیروڕای فاشیستانە بە هیچ جۆرێ بنەبڕ نەبووە بەڵکوو هەردەم ڕێبازی نوێ دەگرێتە بەر.

کەواتە چەند ئیدیالێکی سیاسی هەیە دەشێ بە فاشیستانە دابنرێن، لەگەڵ ئەوەشدا ئاسان نییە باس لە ئایدیۆلۆگییەکی فاشیستانە بکرێت بەو جۆرەی باس لە ئایدیۆلۆگیی لیبەڕاڵ و کۆنەوار و سۆسیالیستانە دەکرێ. فاشیزم سەرلەبەری باوەڕێکی دژهۆشەکیەتی anti-Rationalism یە، واتە ڕێبازی شکۆمەندیی لەوەدا دەبینێ کە بنەمای گۆشەنیگای خۆی بە ڕاوێژی هۆشەکی و دیمانەکی بنیات نەنێت. بیرۆکەی ڕێنیشاندەر لە بزووتنەوەی فاشیستانەدا بریتی نییە لە دیمانەیەک دەربارەی سەنگی مانا و هاوکاریی هۆکارە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، بەڵکوو بریتییە لە خواست و ڕەزامەندیی ڕێبەرێک، دوچە Duce یەک یان فورهەر Fürher ێک. فاشیزم مەبەستی نییە بە ڕاوێژی بیرکارانە قەناعەت بە خەڵک بکات بەڵکوو پەنا دەباتە بەر تاوی شاڵاوی هەست و ئەفسانە. لەگەڵ ئەوەشدا چەند دیدێک لە ڕێبازە فاشیستە جیاوازەکاندا هەیە، ڕێبەران ناتوانن بیشێوێنن مەگەر بە تێکدانی خەسڵەتی فاشیستانەی ڕێبازەکە. ئەمانە گۆشەنیگایەکن فاشیستەکان بە ئاشکرا لە بەرپەرچ دانەوەی ڕێبازی سیاسیی دیکەدا بەکاری دێنن و دەشێ بە ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆگیی فاشیستانە دابنرێن. لەبەر ئەوە دەکرێ، لە ڕێی بەراورد کردنی فاشیزمەوە بە ئایدیۆلۆگیی هاوچاوەوە، شائادگاری ئەمیان دیاری بکەین. بیروڕای جیاواز هەیە دەربارەی وێستگەی فاشیزم، نۆڕینێکی باو هەیە دەڵێ فاشیزم کۆنەوارەتییەکی زێدەڕۆیە و ناوی دەنێ «کۆنەوارەتیی سەرپەڕ ultra-conservativism» و «پەرگیرایەتی ڕاسترۆ right wing extremism». بەڵام ئاشکرایە کە فاشیزم خزمایەتی

لەگەڵ هۆشمەندیی نێو کۆنەوارەتیی هێگلدا نییە، تەنانەت لەو خاڵە ساکارەی نێو کۆنەوارەتیدا کە تەنیا داوای پاراستنی بارودۆخی دامەزراو دەکات، فاشیزم لەگەڵ ئەم ڕێبازەدا یەک ناگرنەوە. بەپێچەوانە فاشیزم لە چەند ڕوویەکەوە شۆڕشگێڕانەیە، لەبەر ئەوەشە بە «ڕادیکالیزمی ڕاسترۆ» ناو دەبرێ.

فاشیزم لەگەڵ کۆنەوارەتییەکی تاڕادەیەک هەڵکشاودا لەو باوەڕەدا یەک دەگرنەوە کە دەوڵەت لە زۆور تاکەکەس – و بەتایبەتی لە زۆور چینەکانی کۆمەڵگەوە – دادەنێن. دەوڵەت دەبێ وەها هەڵنرابێت کە دەرفەتی ناکۆکیی کۆمەڵایەتی نەهێڵێت و لە بری ئەوە کارێک بکات چالاکیی هەموو چینێک و هەموو تاکەکەسێک ڕووی لە بەرژەوەندی دەوڵەت بێت. بۆ ئەوەش – بە ڕای فاشیست و کۆنەواران – دەبێ ڕشتەیەکی سیاسی و دەستووری توند هەبێ کە تەنانەت ڕێگە لە هەژاری و دەوڵەمەندی سنووربەدەر بگرێ.

دەوڵەتی ڕاستەکی، بە نۆڕینی فاشیزم، تەنیا ئامرازێکە بە دەست ***نەتەوە*** یان ***گەل***ـەوە. فاشیست لە ناخەوە دەوڵەتی وەک ئەوەی نەمسا (ئوتریش)- هەنگاریا دەدزێنێ چونکە چەندین نەتەوە و گەلی کۆکردۆتەوە (بە فاشیزم دەگوترێ کۆنەپەرست، بەڵام لەم خاڵە نێوەندەکییەدا گۆشەنیگایان تەواو پێچەوانەی نوێنەرانی کۆنەپەرستایەتیی سیاسیی پاش ١٨١٥ یە). ***گەل*** – بۆ نموونە لای فاشیستەکانی ئیتالیا – بە پلەی یەکەم یەکەیەکی مێژووکردە. لەگەڵ ئەوەشدا دەشێ گەل بە یەکەیەکی بایۆلۆگیانە یان بە ڕەگەز دابنرێ. ڕەگەزپەرستایەتی racism لە پروپاگەندەی فاشیستەکانی ئەڵمانیا، واتە نازیستەکاندا یەکجار بەرچاو بوو.

فاشیزم بەم ڕوو کردنە گەل و نەتەوە تەواو خۆی دابڕیوە لە بەشێکی بەرفرەوانی کۆنەوارەتی. هەڵبەت ئەمە ڕێ لەوە ناگرێ ڕێبازی ناسیۆنالیزم nationalism و تەنانەت ڕەگەزپەرستایەتیی ئاواڵە لە کۆنەوارەتیشدا گەشە بکات. بەتایبەتی ڕوانگەی بایۆلۆگیانە لە ئایدیۆلۆگیی دیکەشدا جێی خۆی کردبۆوە، بۆ نموونە لە بەشێکی بەرچاوی لیبەڕالیزمدا (لای سپێنسەر). داروینایەتیی جڤاکی (سۆسیال داروینیزم) بنەمایەکی گرنگ بوو بۆ ئایدیۆلۆگیی نازیستانە.

فاشیزم لەبەر ئەوەی لە چەندین دۆزی گرنگدا، بۆچوونی نادیار و دژوەستاوی هەیە، ئاسان نییە جێگەی لە نێو ڕێبازە سیاسییە بەرچاوەکانی دیکەدا دەست نیشان بکرێت. یەکێک لەو دۆزە گرنگانە بواری ئابووریی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە. ئابووری دەبێت کرنوو بەرێت بۆ بەرژەوەندی گەل – و لەوەیشەوە بۆ دەوڵەت، بەڵام چۆن؟ فاشیستەکان لەسەر مولکایەتیی کەسەکی دەکەنەوە بەڵام چەند داوایەکی لێڵی سەر بە هاوبەشایەتیشیان

هەیە. سۆسیالیزم و بەتایبەتی مارکسایەتی بە دوژمنی سەرەکیی خۆیان دەزانن، بەڵام باس لە مەترسیی فراژووتنی بێسنووری بازاڕی کەسەکی و پارەکاریی مەزن دەکەن.

هۆی ئەم ڕاڕا و شلانەوەیە، بە پلەی یەکەم، ناگەڕێتەوە بۆ دژبوونی فاشیستەکان بەرانبەر هەڵنانی بەرنامە و شێوازی کار لەسەر بنەمایەکی دیمانەکیی ڕوون. فاشیستەکان یەکڕەوانە دژ بە نوێنەرایەتی کردنی بەرژەوەندی گروپێکی تایبەتین، ئەوان پێیان وایە خۆیان نوێنەرایەتی بەرزترین و خۆرسکترین مەبەستی هەر هەموو گروپەکان دەکەن. فاشیستەکان داوای پشتیوانی دەکەن لە کرێکار و ئەفسەران، لە وردەبورژوا و کارمەندان. فاشیزم لەمەدا خۆی لە ئایدیۆلۆگییەکانی دیکە دادەبڕێ، ئەوانەی دیکە خۆیان، بە پلەی یەکەم، بە نوێنەری چینێکی تایبەتیی کۆمەڵگە دادەنێن (واز لەوە بێنە کە هیچیان دەست بە ڕووی کەسەوە نانێن گەر سەر بە چینێکی دیکە بێت و بداتە پاڵیان). فاشیستەکان بەگشتی ئەم کۆمەڵگە هاوچەرخەی چینایەتی بە نیشانەی ڕووخان دەزانن و پێیان وایە دەبێ بە ناوی بەرژەوەندی گەل یان بەرژەوەندی نەتەوەوە، دژایەتی بکەن.

ئەوجا فاشیستەکان، لە ڕاستیدا، نوێنەرایەتی بەرژەوەندی چ چینێک دەکەن ئەمە مەسەلەیەکی دیکەیە. ئەگەرچی ڕێکەوت نییە فاشیزم لەو وەڵاتانەدا بەهێزتر گەشەی کردووە کە ڕشتەی کۆمەڵایەتیی سەرمایەداری هەیە و سەرمایەدارەتی تێدا کەوتۆتە بەر هەڕەشەی یان بەر تاوی سەرمایەدارەتی کۆمەڵگەی دیکەوە. فاشیزم پاش هەژەندەکانی شەڕی جیهانیی یەکەم گەیشتە ئەوپەڕی بەهێزی. ئەو دەمە بەرانبەر مارکسایەتیی شۆڕشگێڕ خۆی کردە ڕزگارکاری مرۆڤایەتی و پارێزەری ئابووریی نەتەوەیی لە هاوچاوێکی فرەتوانی نێونەتەوەیی. فاشیزم خۆی دەکردە دەستەبەری کار و جۆرە ئەمانێکی مایەکی بۆ کرێکاران، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی دەکردە دەستەبەری موڵکایەتی تاکەکەس و هێزی هاوچاویی بۆرژواکان.

فاشیزم ئەوسا و ئێستاش، لەملا و ئەولا، لە چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگە کەسانێکی وەها بۆ خۆی ڕادەکێشێ کە پلە و پایەی خۆیان بە بەرهەڕەشە دەزانن و دەیانەوێ ئاسایشی خۆیان بپارێزن. فاشیزم بەو خەڵکەی سەلماندبوو کە دیمۆکراتیی ئەنگلۆسەکسۆنی ڕشتەیەکی بێهێزە و هەروەها ماف و ئازادیی کەسەکی سەنگێکی ئەوتۆیان نییە. تەنیا بە خەباتێکی نەتەوەیی توند و تۆڵ دەکرێ مارکسایەتی بشکێنرێ و هێمنی و ڕێکوپێکی لە کۆمەڵگەدا دامەزرێنرێ.

فاشیزم لە پروپاگەندەی سیاسیدا پەنای دەبردە بەر چەندین نۆرینی باوی ناو خەڵک (و زرەبۆچوون)، سوودی لە بۆچوونی چەوت و ناهۆشەکی وەردەگرت و دنەی دەدان.

فاشیزم ئەو نۆرینانەی وەردەگرت بەبێ گوێ دان بەوەی بنجیان لە چ نەریتێکی فەرهەنگیدا هەیە، ئیلهامی لە زۆربەی ڕێبازە سیاسییەکان وەردەگرت. لەبەر ئەوەیە لیستەی ناوی ئیلهامبەخش و ڕێبەرانی گیانەکیی فاشیزم لیستەیەکی درێژ و هەڕەمەکییە. هەر لەبەر ئەوەشە دۆکیومێنتێک نییە بشێت بە دربڕینێک دابنرێت لە هەموو دنیای بیری فاشیزمدا. بەرنامەی حیزبە فاشیستەکان تەنیا بەشێکن لە پروپاگەندەی فرەوانی حیزبی و هەتا پلەیەکی بەرز تاکتیکین. ئەوانەی گوایە دیمانەیار و ئایدیۆلۆگیستن بەر لە هەر شتێک ئەوەیان نووسیوەتەوە کە ڕێبەرایەتی حیزب بڕیاری لەسەر داوە، بۆ نموونە ئەلفرێد ڕوسەنبێرگ Alfred Rosenberg ی ئەڵمانی.

بەنیتۆ موسۆلینی و ئادۆلف هیتلەر دوو ڕێبەری هەرە گەورەی فاشیزمن، بەڵام لافی ئەوەیان لێ نەداوە کە پیاوی خامە و ڕشتەداری بن. لەگەڵ ئەوەشدا لە ئەدەبیاتە بەرتەسکەکەی میراتی ئەواندا دەربڕینی زیندووی بۆچوونی فاشیستانە دەدۆزرێتەوە. هەر خواستەکانی ئەوانیش بوو کە وردەکاریی نێو ئایدیۆلۆگیی فاشیستانەی ئیتالیا و ئەڵمانیای دەکێشا. لە نێو نووسینەکاندا، *Mein Kampf* (*خەباتی من*، ١٩٢٥) ی هیتلەر پێشەمییەکی تەواوی هەیە و بریتییە لە تێکەڵێکی بیرەوەریی خۆی و بەرنامەی سیاسی. ئەم کتێبە بەو ڕوونبێژییە ڕووهەڵماڵراو و گوێنەدەرە دۆکیومێنتێکی دەگمەنە. ڕاستە *Mein Kampf* چەندین ساڵ بەر لەوەی هیتلەر و سۆسیالیستە نەتەوەییەکان لە ١٩٣٣ دا حوکوم بگرنە دەست، بڵاوکرایەوە و هیتلەر لە حوکومڕانییەکەی خۆیدا لە چەندین بیری نێوەندەکیی کتێبەکە لای دا، بەڵام لەو شەشسەد لاپەڕەیەدا، هیتەر، خەسڵەتە ئاشکراکانی نۆڕینی فاشیزم پێشان دەدات بەتایبەتی هەڵوێستی پراگماتیکی فاشیزم لە ئاست بیردا.

## ٢- گەل و دەوڵەت

چەمکی *گەل* و *ڕەگەز* بنەمای ئایدیۆلۆگیی نازیستانەن. دەوڵەت دەبێ لە ژێر گەل و ڕەگەزەوە بێت، تاکەکەس و دەستەکانی کۆمەڵگەش دەبێ لە ژێر دەوڵەتەوە بن.

هیتلەر دەڵێ: «لەبەر ئەوەی هەردەم بەلای ئێمەوە دەوڵەت هەر شێوەیە و ناوەڕۆکەکەی گرنگە کە گەل و نەتەوەیە، دەبێ هەموو شتێک سەر فروو بێنێ بۆ بەرژەوەندی بەرزی ئەوان». ڕوونیشی دەکاتەوە کە دەوڵەت دەستاوێژێکە نەک ئامانج. ئەو ئامانجەی دەوڵەت دەبێ خزمەتی بکات «ڕەگەزە». واتە دەوڵەتی ئەڵمانی دەبێ ڕەگەزی ئاری بپارێزێ.

هیتلەر و ڕێبەری نازیستی دیکەش، چەند ڕێبازێکی فیکری لە داروینیایەتیی جڤاکی وەردەگرن. فراژووتنی مێژووکردی مرۆڤ لە هەمان کاتدا فراژووتنێکی بایۆلۆگیانەیە و هەڵبژاردنی سروشتەکی و پەلەی ژیان ڕەنگیان تێدا داوەتەوە. هیتلەر دەڵێ:

«ئەرکی مرۆڤی بەهێز ئەوەیە دەسترۆ بێت نەک لەگەڵ بێهێزدا بتوێتەوە و گەورەیی خۆی بدۆڕێنێ. تەنیا ئەوەی بە زگماک لاوازە ئەمە بە دڕیی دادەنێ، دەیسا خۆی هەر مرۆڤێکی بێهێز و سنووردراوە. بە بێ ئەم دەستوورە هیچ جۆرە فراژووتنێک لە گوزەرانی زیندەڵدا بەرەو ئاستێکی بەرزتر، بوونی نەدەبوو».

پەلەی ژیان بەلای نازیستەکانەوە ململانێی نێو ڕەگەزانە، نەک ململانێی تاکەکەس و چینەکانی کۆمەڵگە. ئەرکی سیاسەت ئەوەیە دنەی ئەم ململانێیە بدات و ڕێگەی بۆ خۆش کات نەک لاواز بپارێزێت.

کەواتە باوەڕی سەر بە فراژووتن و ڕەگەز کراوە بە بنەمای هەموو بۆچوونەکە - یان ***جیهانئۆرییەکە*** وەک هیتلەر و هاوبیرانی پێیان خۆش بوو ناوی بنێن. نازیستەکان دەڵێن ئەم باوەڕە بایۆلۆگییەکی تەواوە و دەکرێ گرێ بدرێ بە چەندین بۆچوون و گریمانەی سەر بە خەسڵەتی ڕەگەز و فراژووتنی ڕەگەزەوە، کە لە سەدەی نۆزدەیەم و بیستەمدا لە لایەن چەند بایۆلۆگ، فەیلەسووف و مێژوونووسەوە، هاتنە کایەوە. ئەوجا ئەم گریمانە و بۆچوونانە لە بڵاوکراوە هەمەجۆرەکانی نێو خەڵکدا بڵاو دەکرایەوە و ئەرکی یەکەمیشیان ئەوە بوو کە پشتی بۆچوونی ڕەگەزپەرستانەی، بە پلەی یەکەم، دژەسامی (دژەجوولەکە) anti-Semitic بگرن، ئەمیان لە پێشەوە لە سەرانسەری ئەورووپا و بەتایبەتی لە ئەڵمانیادا بڵاو کرابۆوە. لەگەڵ ئەوەشدا خەسڵەتی بایۆلۆگیانەی باوەڕی ڕەگەزی نازیستەکان دەشێ بخرێتە بەر گومان چونکە لە ڕاستیدا بنەمایەکی هەیە دەچێتەوە سەر نەریتی پێش-بایۆلۆگیی دابەش کردنی ڕەگەز، کە دەگەڕێتەوە بۆ چیرۆکی سێ کوڕەکەی نووحی نێو تەوجیل، سام و حام و جافەت، کە گوایە نەوەکانی سام، سامییەکان، ڕەگەزێکی بایۆلۆگی تایبەتی پێک دێنن. چەندین دیمانەی بایۆلۆگیی لێسەلێنراوی دەوروبەری ئەم سەرەسەدەیە بریتی بوون لە تێکەڵێکی ڕەگەز دابەش کردنی کۆن و نوێ.

بەڵام نازیستەکان و تەنانەت هیتلەریش زۆر ئازادانە مامەڵەتیان لەگەڵ ڕەگەزپەرستترین بایۆلۆگیی ڕەگەزدا دەکرد. ئەمانە کاتێک باسی خەسڵەتەکانی ڕەگەزە جیاوازەکان دەکەن حیسابی داخوازیی بارودۆخ دەکەن. نێزیکەی هەر هەموو سەرنجدانێکیان لە ناکۆکیی نێوان ئاری و سامیدا کۆکردبۆوە. ڕەگەزەکانی دیکە، ڕاست و ڕەوان «نزمتر» بوون. جیاوازیی نێوان ئاری و جوولەکە هەموو بوارێکی دەگرتەوە: ئاری

جوان و بەهێز بوون جوو جوان نەبوون، ئاری ڕۆحی قوربانییان تێدا بوو بۆ هاوڕەگەزانیان جوو تاکەکیی گوێنەدەر بوون (مەگەر لە دەرەوەی خۆیانەوە هەڕەشەیان لێ بکرایە!). ئاری داهێنەرن، جوو لاخۆریی لە خوانی داهێنانی خەڵکی دیکە دەکەن (زانستکارە مەزنەکانی جوولەکە لە ڕاستیدا داهێنانەکانی خۆیان لە ئارییەکانەوە خواستووە). ئاری خاوەن گیانێکی قووڵن، ئەویش ڕەنگدانەوەی نیشتمانە سەرەتاییە چڕەکانی خۆیانە، جوو گیانیان وەک بیابان تەختە. هەتا دوایی.

هیتلەر و نازیستەکان بە شێوەیەکی وەها وەسفی گەلەکۆمەکیی جوولەکە دەکەن بەرانبەر ئاریگەل، جوولەکە دەکەنە ڕەگەزێکی بێسنوور بالادەست، بەو ژمارە کەمەیانەوە توانیویانە ئەم هەموو خراپەکارییە، بۆ نموونە پارەکاریی مەزنی نیونەتەوەیی و مارکسایەتی، بەسەر ئارییەکاندا بسەپێنن و بە شەڕ و بنەبڕ کردن نەبێ نەشکێن.

ئەوجا بەلای نازیستەکانەوە خەباتی ڕەگەزایەتی کافی نییە بۆ دەستەبەر کردنی فراژووتنی دروست و ئایەتی. دەوڵەت دەبێ ڕێککردنی زاوزێی ناو ڕەگەزی ئاری بگرێتە ئەستۆ، بۆ ئەوەی تەنیا مرۆڤی ئاریی خاوەن لەش و دەروونی دروست دەرفەتی هەبێ زاوزێ بکات. «ئەوەی بە ئاشکرا نەخۆشە یان نەخۆشی زگماکی هەڵگرتووە دەبێ ڕێگەی ئەوەی لێ بگیرێ کە منداڵ بخاتەوە، ئەم ڕێگە لێ گرتنەش دەبێ بە شێوەیەکی کارەکی بسەپێنرێ». «جیهاننۆرییەکی نەتەوەیی لە دەوڵەتێکی نەتەوەییدا دەبێ سەردەمێکی بەرزتری وەها دروست بکات، کە لە بری ئەوەی لە خەمی چاک کردنی سەگ و ئەسپ و پشیلەدا بێت، دەبێ لە خەمی بەرز کردنەوەی مرۆڤدا خۆیدا بێت...». کەواتە نازیستەکان پشتگرییان لە ئیدیالی یوجینی Eugenic (زانستی چاک کردنی ڕەگەز) دەکرد – تەنانەت ئەویش کە تەواو لەسەر بۆچوونی بایۆلۆگیی نیو داروینایەتی بنیات نراوە.

لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی نادروستە ئەگەر بڵێین نازیزم تەنیا لەسەر چەند گریمانەیەکی سادەی بایۆلۆگییانە بنیات نراوە. نازیستەکان دوای ماوەیەک چەندین بۆچوونی جۆراوجۆری بایۆلۆگیانەیان هەڵبژارد بۆ دروستاندنی نۆرینەکانی خۆیان. چەند ڕوانگەیەکی بایۆلۆگیانە هەبوو دەگونجا لەگەڵ هەوڵی ئەمان بۆ **تر کردنی** ئادەمیزاد، واتە جەخت کردن لەسەر خەسڵەتە فیزیاویەکانی مرۆڤ، ڕوخساری، لەشی، توانای لەشی، ئارەزووی مرۆڤ بۆ شەڕ – و توانای مرۆڤ بۆ «بەرگەگرتنی لێدان» وەک هیتلەر ناوی لێ نابوو.

ئەوجا ئەم وێنە دڕەی مرۆڤ لەگەڵ ئیدیالێکی فەرهەنگیی وەهادا جووت کرا، کە ناوەندەکەی بریتی بوو لە پێکهاتێکی مرۆڤدۆستانەی ئەڵمانی پاکی هەڵبەستراو.

نازیستەکان ڕابوردووی گەلی ئەڵمانیان یەکجار بەرز دەکردەوە و پێیان وابوو ناسینی ئەو ڕابوردووە گرنگترین هەنگاوە بۆ پەروەردە کردنی گەل.

یەکێک لەو ناکۆکییە ناوەکییانەی نازیزم دەگەڕێتەوە بۆ ناکۆکیی نێوان ئادگاری داروینیایەتیی جڤاکی لە لایەک و خۆشویستنی مێژووی ئەڵمانی لە لایەکی دیکەوە. بە نۆڕینی داروینیایەتیی جڤاکی، فراژووتنی بایۆلۆگی و بەدوا ئەویشدا فراژووتنی مێژووکرد هەر دەبێ بەرەو پێشەوە بڕوات، ئەگەر نەزانیی مرۆڤ ڕێگەی لێ نەگرێ. بەو نۆڕینە بێت، کۆمەڵگەسازیی جێرمانیی سەردەمی دێرین و ناڤین دەبێ بە ساکار و نەڕسکاو دابنرێ. بەڵام نازیستەکان ئەو کۆمەڵگەیانەشیان بە نموونە دەگرت بۆ ئەڵمانیای نوێ.

ئەم دوو هەڵوێست گرتنەی نازیستەکان لە بواری دیکەشدا دەردەکەوت: لە لایەک ژیانی سروشتەکی و وەرزشکارانەی ئادەمیزادیان بە باش دەزانی و لە لایەکی دیکەوە هەتا لە توانایاندا هەبوو سوودیان لە بواری زانستی و تەکنیکی ئەو دەمەی خۆیان وەردەگرت. نازیستەکان دەیان گوت زانست و تەکنیک، مەتێریالیزم و نافەرهەنگییان بەدەمەوەیە، لە لایەکی دیکەوە دەیان گوت ئەمە بەرهەمی داهێنانی ئارییانە، ئەرێ باشترین بەڵگەیە بۆ بالادەستیی ئارییان لە بواری داهێناندا. ئەم حیسابە تەنیا لەوەدا یەکی دەگرتەوە کە تەکنیک و زانست ئەگەر بخرێنە خزمەتی خەباتی گەلی ئەڵمانیاوە خێرە، دەنا شەڕە.

ئەم تێکەڵ کردنەی ڕۆمانتیکی مێژوو لەگەڵ نوێکاریدا، بەگشتی بووەتە خەسڵەتێکی بزووتنەوەی فاشیستانە. فاشیستەکان سوودیان وەردەگرت لەوەی گروپی وەها هەیە لە کۆمەڵگەی هاوچەرخ ناڕازییە، بەڵام سوودیشیان لە توانای کۆمەڵگەی هاوچەرخ وەردەگرت بۆ خزمەتی ئامانجەکانی خۆیان. ئەمانە خەونی شیرینی گوزەرانی ڕابوردووی گەل و نەتەوەیان زیندوو دەکردەوە، لە هەمان کاتیشدا بە یەکسانیی مایەکی و سوودی مایەکی خەڵکیان ڕادەکێشا. نازیستەکان لە لایەک خۆیان بە پارێزەر و زیندووکەرەوەی نەریت پیشان دەدا، لە لایەکی دیکەوە خۆیان بە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی لاوان، بە بزووتنەوەی داهێنەران پێشان دەدا.

نازیزم باوەڕی ڕەگەزی کردووەتە بنەمای باوەڕە سیاسییەکەی خۆی و بەوە خۆی لە زۆربەی ڕێبازە فاشیستەکانی دیکە دابڕیوە. لایەنی ڕەگەزپەرستانە لە زۆربەی فاشیزمدا هەیە و بۆچوونە بنەڕەتییەکە لە هەر هەموویاندا هەیە: خەڵک نرخی هەمەجۆریان هەیە و گرێدراون بەوەی سەر بە چ بزووتنەوەیەکن و چ جۆرە خەسڵەتێکی بایۆلۆگیانەیان هەیە، نرخی هەرە بەرزیش بۆ ئەو کەسەیە کە خزمەتی دڵێرانە بە گەل و ڕێبەری خۆی پێشکەش دەکات.

### ٣- دەوڵەت و چینەکانی کۆمەڵگە

بزووتنەوەی فاشیستی، بە پلەی یەکەم دوو دوژمن لە نێو کۆمەڵگەی هاوچەرخدا دەست نیشان دەکات: مارکسایەتی، کە سۆسیال دیمۆکراتی بژارخوازیش دەگرێتەوە، و سەرمایەی نێونەتەوەیی. ئەم دوو لایەنە کە دەشێ بە دوو لایەنی تەواو جیاواز و یەکنەگرەوە دابنرێن، بەلای فاشیزمەوە، بە نهێنی هاوکارن یان هەر نەبێ هەردووکیان بەرهەمی هەمان فراژووتنی هەژدندەکین. هەردووکیان نێونەتەوەیی و نێونەتەوەخوازن، هەردووکیان مۆشەکی و هۆشەکیخوازن.

بە بۆچوونی نازیزم، سەرمایەی نێونەتەوەیی و مارکسایەتی چەکی جوولەکەن لە ملاملانێی دژ بە ڕەگەزی ئاری و گەلی ئەڵمانیدا. ئەوەی ڕاست بێت لەم گرتەیەدا ئەوەیە تاکوتەرا سەرمایەداری جوولەکە هەبووە و کارل مارکس و چەند مارکسییەکی دیکەی بەرچاو جوولەکە بوون. لە *Mien Kampf* ی هیتلەردا هاتووە: «جارێکی دیکەش دەستم کردەوە بە خوێندنەوەی بەرهەمەکەی کارل مارکسی جوو، ئەم جارەیان لە مەبەست و مەرامی کتێبەکە تێگەیشتم. ئەم جارەیان لە "سەرمایە" کەی تێگەیشتم، هەروەها لەوەش گەیشتم بۆچی سۆسیال دیمۆکراتەکان بەگژ گوزەرانی ئابووریی نەتەوەییدا دەچن و بەتەمان ڕێگە خۆش بکەن بۆ ئەوەی پارەکاری و سەرمایەی بۆرسەی نێونەتەوەیی ڕاستەکی دەستڕۆ بن».

کەواتە نێونەتەوایەتییە کە مارکس و «پارەکاری و سەرمایەی بۆرسەی نێونەتەوەیی ڕاستەکی» کۆدەکاتەوە.

نابێ لە ئاست هەڵوێستی نازیستەکان بەرانبەر ئابووریی خۆماڵیدا بەهەڵەدا بچین: دوژمن بریتییە لە ئابووریی نێونەتەوەیی یان بەگشتی لە ئابوورییەکدایە لە سنووری دەوڵەت و دەسەلاتی سیاسی دەرباز بووبێ. هیتلەر دژ بەو شێوە موڵکایەتییە دەوەستێ کە ڕێگە بۆ نێونەتەوایەتی خۆش دەکات. هیتلەر دەڵێ: «نیشانەیەکی گرنگی دارزانی ئابووری لەوەدا بوو کە وردە وردە لە موڵکایەتیی تاکەکەسی دوور دەکەوتەوە و گوزەرانی ئابووری بەرە بەرە ڕووەو شێوەی شەریکەی پشکداری هەڵدەکشێ». هیتلەر و هەموو فاشیستەکانی دیکە داکۆکی لە موڵکایەتیی تاکەکەسی دەکەن، مەترسی لە چڕبوونەوەیەکی ئابووریدا دەبینن، هەر لە سەرەتای بزووتنەوەی نازیستانەوە دەگوترا هەموو شەریکە گەورەکان دەبێ خۆماڵی بکرێن. بەلام وەهایان لێ نەکرا، زۆربەی شەریکە گەورەکانی ئەڵمانیا وردە وردە کەوتنە دەتس باشترین و بە نرخترین دۆستانی نازیزمەوە.

نازیستەکان، بەر لەوەی دەسەلات بگرنە دەست، لەگەڵ مارکسییەکاندا پێشبڕکێیان لەسەر ڕاکێشانی دڵی چینی کرێکار دەکرد. نازیستەکان دڵگەرمانە دەیانگوت مارکسییەکان لەوەدا ڕاست دەکەن کرێکار دەبێ ئەمانێکی کۆمەلایەتی و گوزەرانێکی لەباری هەبێ. بەلام بەلای نازیستەکانەوە ئەمە تەنیا داخوازییەکی دادپەروەرایەتی نەبوو بەڵکوو جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە هێمنی و ئاسایش هەرگیز جێگیر نابێت ئەگەر کرێکاران - کرێکارانی ئەڵمانی - دەستکورت بن.

ئەم بۆچوونەش لێکدانەوەیەکی دیکەشی هەیە دەڵێ هەتا هەموو ئەڵمانییەک گوزەرانێکی ئەمینی نەبێت، کۆمەڵگەی ئەڵمانی هەر وا خەسڵەتی کۆمەڵگەی چینداری دەمێنێ، واتە کۆمەڵگەیەک گروپانی خەڵک تێیدا هاوکاریی یەک ناکەن بەڵکوو لە ململانێ دان دژ بە یەک.

ئامانج ئەوە بوو چین بکرێ بە بەرە. نازیست و فاشیستەکان بەگشتی، وەک کۆنەوارەکانی سەدەی نۆزدەیەم، ئەو دابەش بوونە کۆنەیان دەسەلماند کە کۆمەڵگەی دەکرد بە چەند بەرەیەکەوە. ئەندامانی چین دەبوونە هۆگری هاوچینی خۆیان لە وەلاتی دیکە. ئەندامانی بەرە ملکەچی یەکەی نەتەوەیی خۆیانن و هۆگرییان بۆ هاوبەرەی خۆیان لە ناو هەمان نەتەوەدا هەیە. هیتلەر دەڵێ: «بەرە و بەرژەوەندی پیشەکی وەک دابڕانی چینایەتی نییە، تەنانەت گەر جوداش ببنەوە لە یەکدی ئەنجامێکی خۆرسکی ژیانی ئابووریمانە، دابەش بوونی کۆمەڵگە بەسەر گروپی پیشەکیدا نابێتە کۆسپێک لە ڕێی هاوکۆییەکی دروستی گەل، چونکە ئەمیان لە هەموو ئەو دۆزانەدا کە پێوەندیی بە نەتەوایەتییەوە هەیە، هەر لە هەستێکی نەتەوییی یەکگرتوودا دەمێنێتەوە».

ئەم ئیدیالە کۆرپۆراتی corporative یەی فاشیستەکان لەوە باشتر ڕوون ناکرێتەوە. ڕشتەیەکی ئابووری سروشتەکی هەیە، جیاوازییەکی ئابووری سروشتەکی هەیە لە نێوان گروپی پیشەکیی هەمەجۆردا و لەویشەوە هاوچاوییەکی سروشتەکی هەیە بۆ وەدەست هێنانی سوودی ئابووری. بەلام ئەم هاوچاوییە دەبێ هەردەم ملکەچی دەوڵەت و نەتەوە بێت. دەوڵەتی فاشیستانە نابێ گۆڕانکاری ئابووریی سەرلەبەر بکات. ئەو شۆڕشەی باس دەکرێ شۆڕشێکی ئابووری نییە بەڵکوو گیانەکییە. ئەوەی دەبێ بگۆڕدرێت هەلومەرجی کۆمەلایەتی نییە، پێوەندیی نێوان گروپی پیشەکیی هەمەجۆر نییە، بەڵکوو پێوەندیی هەموو گروپەکانە بە دەوڵەتەوە و لەویشەوە بە نەتەوە و گەلەوە.

کرێکاری پیشەسازی لە ئەڵمانیا نابێ هاوکاریی کرێکاری ئینگلاند و فرانسە بکات و هەوڵ بدات پێوەندیی دەرەکیی خۆی و هاوشانەکانی خۆی بگۆڕێت، ڕاستە کرێکاری

پیشەسازیی ئەڵمانیا دەبێ داکۆکی لە بەرژەوەندی خۆی بکات، بەڵام بەر لە هەر شتێک دەبێ لەگەڵ بەرزەکارمەند، ئەرتەشکار، سەرمایەدار، وردەکارمەند و جووتیاردا لە ئەڵمانیا و بۆ بەرژەوەندی گەلی ئەڵمان هاوکاری بکات.

فاشیستەکان لە خەباتی ڕووەو ئەم شۆڕشە «ناوەکی» یە، هەوڵ دەدەن سوود لە بنگەکانی کۆمەڵگەی هاوچەرخ وەرگرن. ئەمەش هەر خەسڵەتێکی فاشیستەکانە کە مەبەستیان نییە بنگەی نوێ دامەزرێنن بەڵکوو دەیانەوێ لە ناوەوە بنگە چەسپاوەکان بگۆڕن و بۆ مەبەستی خۆیان بەکاریان بهێنن. فاشیستەکان بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی بەرە دامەزرێنن سوود لە دوو بنگە وەردەگرن، ***سەندیکا*** و ***پەرلەمان،*** ئەگەرچی لە کۆمەڵگەی پێش-فاشیستدا، فاشیستەکان لە ناخەوە شێوەکاری ئەم دوو بنگەیەیان دەدزاند.

بە نۆڕینی فاشیستەکان، سەندیکا کەموزۆر سۆسیالیستەکان گرنگترین مەرجی کۆمەڵگەی هاوچەرخن. سەندیکا خەباتێکی نێونەتەوەیی دژ بە گرووپەکانی دیکە دەکەن و هەوڵ دەدەن هێزی ئابووریی سەرمایەدارەکانی نێو دەوڵەتەکەی خۆیان زەوت بکەن و توانای هاوچاوییان پێ نەهێڵن. بەو جۆرە سەندیکا بنەمای گوزەرانی ئابووریی نەتەوە تێک دەدەن و پەلە لە بە نێونەتەوەکردنی سەرمایە دەکەن و دەبنە لایەنگری دەوڵەتێک سەرمایەداری تێدا فرە هەڵکشابێت.

لەگەڵ ئەوەشدا فاشیستەکان نایانەوێ سەندیکاکان هەڵوەشێننەوە بەڵکوو دەیانەوێ بیانگۆڕن. سەندیکا دەبێ کڕنوو بۆ دەوڵەت بێنێ. ڕاستە سەندیکا دەبێ داکۆکی لە بەرژەوەندی ئابووری ئەندامەکانی بکات بەڵام ئەرکی یەکەمی ئەوەیە ئەندامەکانیان بە بیرێکی نەتەوەیی دەرس دابدەن و جێ و ڕێی خۆیان لە یەکەی نەتەوەییدا پێشان بدەن. هیتلەر دەڵێ:

«سەندیکای سۆسیالیستی نەتەوەیی ئۆرگانێکی خەباتی چینایەتی نییە، بەڵکوو نوێنەری پیشەیە. دەوڵەتی سۆسیالیستی نەتەوەیی "چین" ناناسێ، بەڵکوو لە ڕووی سیاسییەوە تەنیا هاوزێدانی خاوەن مافی تەواو وەک یەک و لەویشەوە خاوەن ئەرکی تەواو وەک یەک دەناسێ، لە تەک ئەمانیشدا، ژێردەستان هەن کە لە ڕووی سیاسەتی دەوڵەتییەوە تەواو بێمافن». کەواتە سەندیکا بە پلەی یەکەم سازمانێکی سیاسییە و وەک هەموو سازمانێکی دیکەی سیاسی تەنیا بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوە ئاواڵەیە، نائەڵمانی تەنیا ژێردەستەیەکی بێمافە و هیچی دیکە.

فاشیستەکان هەوڵ دەدەن پەرلەمانیش بکەنە نوێنەرێکی پیشە و بەرە. فاشیستەکان بێسنوور پەرلەمانەتییان دەدزاند، چونکە پەرلەمانەتی دەسەڵاتی پەرلەمانی بەسەر

حکوومەتدا دەسەپاند. دیموکراتیی وەها کە ماف بە خەڵک بدات، بێ گوێدان بە بەرە و پلەوپایە، بێ گوێدان بە ڕەگەز و نەتەوە، دەنگ بدەن بەم یان بەو ئەندامی پەرلەمانە، بەلای فاشیستەکانەوە داشکانێکە بەلای ئاپۆرەی نەزان و بەرەڵاوە.

ئەوجا یەکەم ناڕازی بوونی فاشیستەکان لە پەرلەمان لەبەر ئەو بێهێزی و کەم کارامەبوونەیەتی. پەرلەمان ناتوانێ ڕووبەڕووی مارکسایەتی و نێونەتەوایەتی ببێتەوە. مارکسییەکان پەرلەمان وەک ئامرازێکی بێخواست بەکار دەهێنن بۆ ئەوەی دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا دابمەزرێنن. نوێنەرانی حیزبە سیاسییەکانی دیکە بۆ خۆیان ڕێگە دەدەن فێڵیان لێ بکرێت. نێزیکەی سەرلەبەری پەرلەمان نەزانینێکی ڕەها دایپۆشیوە. دەبێ لە چەندین دۆزدا - هەر نەبێ بە ڕەسمی - بڕیار بدات و لە زۆربەیاندا شارەزاییەکی دروستی نییە. هیتلەر دەڵێ: «بڕیاری هەرە گرنگی سەر بە سیاسەتی ئابووری دەدرێتە دەست کۆڕێک تەنیا سەدی دەی ئەندامانی خوێندووی ئابوورین».

بەرانبەر ئەوە، پەرلەمانی فاشیستەکان، پەرلەمانی بەرەیە. لەوێدا سوود لە زانیاری تایبەتیی گروپانی کاری هەمەجۆر وەردەگیرێ و بەرژەوەندی هەمەجۆریان ڕەچاو دەگیرێ و هەر هەموو تێهەڵکێشی یەکەیەکی هاوئاهەنگ دەکرێ. بەڵام ئەم پەرلەمانە بڕیاردەر نییە بەڵکوو تەنیا ئامۆژگارە، کاری ئەوەیە ڕا و بۆچوون پێشانی سەرکردایەتی - ڕاستتر وایە بڵێین سەرۆک - ی ڕاستەکی بدات و ببێتە بارۆمەتری بیروڕا.

ئیدیالی کۆرپۆراتی تاڕادەیەک لە ئیتالیای موسۆلینیدا خرایە گەڕ، بەڵام لە ئەڵمانیای نازیستدا لە سنووری بەرنامە دەرنەچوو. نازیستەکانی ئەڵمانیا بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆیان پێویستیان بەوە نەبوو بنگە دامەزراوەکان بەو ڕادەیە بگۆڕن کە خۆیان پێیان وابوو پێویستە.

پەرلەمان و سەندیکا، لەگەڵ ئەوەشدا لە ئایدیۆلۆگیی فاشیستاندا بایەخیان کەمتر بوو. ئەرکیان هەر ئەوە بوو گەل و نەتەوە بکەن بە گشتەیەکی زیندەڵ و خواستی ڕێبەر بگەیەننە خەڵک. ڕێبەر و گەل چەمکی نێوەندەکین لە دنیای بیری فاشیستاندا.

هەڵوێستی فاشیستەکان لە ئاست گەلدا دەشێ بە ڕووگۆڕ بێتە بەرچاو. لە لایەکەوە بە چاوێکی نزم لە ئاپۆرەی خەڵک دەنۆڕن، ئاپۆرە نەزان و خۆشچلەوە و ئەگەر سەربەخۆ ببزوێ ئەنجامی هەژەندانەی لێ دەکەوێتەوە. لە لایەکی دیکەوە بزووتنەوەی فاشیستەکان بزووتنەوەیەکی گەلێرە، داوای پشتیوانیی ئاپۆرەی خەڵک دەکات لە خەباتی سیاسیی خۆی و ئەم پشتیوانییە گەلێرەی کردووەتە مەرجی دەوڵەتی فاشیستانە.

به بۆچوونی فاشیستەکان، خەسڵەتە نایەتییەکانی ئاپۆرە بە بوونی سەرکردایەتییەکی توند و تۆڵ لەناو دەبرێ. زۆربەی خەڵک لە گەلێکی وەها ڕەگەز بەرزدا تەنیا کاری لەشەکی جێبەجێ دەکەن، لەبەر ئەوە مەشق دانی لەشەکییان زۆر پێویستە. ئەوجا دەبێ فێری گوێڕایەڵی بن، فێربن فەرمان جێبەجێ بکەن. جیاوازیی سروشتەکیی خەڵک، بەلای فاشیستەکانەوە ڕاستییەکی بەڵگەنەویستە و دەبێتە هۆی ئەوەی پێویست بێت کار و بەرپرسیی جیاواز بدرێ بە خەڵک. ئەمەش کاری سەرکردایەتییە، هەر مرۆڤێک نۆرەیەکی وەهای بدرێتێ لێی بوەشێتەوە و ڕێگەی خۆدزینەوەشی لێ بگیرێ. کەواتە زۆرینە دەبێ بە شێوەیەکی پاسیڤانە جێگەی خۆیان لە گشتەی دەوڵەت و نەتەوەدا پڕبکەنەوە، ئەوجا چەند «کەسایەتییەکی بەرچاو» ی ژمارە کەم هەن، چەند کەسێکی خاوەن بەهرەی ڕێبەرایەتی هەن دەزانن چۆن گەل بەڕێوە ببەن، لە نێو ئەوانیشدا تاکە یەک ڕێبەری مەزن، دەسەڵاتی بڕیاردەری دەبێ. دەسەڵات گرێ نەدراوە بەم یان بەو کارمەندییەتەوە، پەیوەندیش نییە بەوەی ڕێبەر دەسەڵاتی لە خوداوە وەرگرتووە یان لە گەلەوە، بەڵکوو تەنیا بە خەسڵەتی کەسەکیی ڕێبەرەوە بەستراوە. کەواتە ڕێبەری فاشیستانە ڕێبەرێکی خاوەن کاریزمایە.

سازمانی فاشیستانە سازمانێکی هەرەمی توندە، ڕێبەر لە دوندە و گەلی کارای ساکاریش لە بنارە. سەرکردە هەموو دەسەڵاتێکی لە ئاست ژێرکردەدا هەیە، بەڵام تەنیا ژێرکردە لە بەردەم سەرکردەدا بەرپرسە، هەرگیز بە پێچەوانە نییە. نموونەی ئەم هەرەمییە لە ئەرتەشدا هەیە – بەڵام هەرەمییەکی ئەرتەشی کە هیچ بەرپرسیارەتییەکی لە دەرەوەی خۆی نەبێ.

ئەو وەسفانەی فاشیستە گەورەکان بۆ ڕێبەری دادەنێن تارادەیەک بێبایەخن چونکە بە پلەی یەکەم هەوڵدانێکن بۆ خۆڕەسم کردن. هیتلەر، لە *Mien Kampf* دا باس لە ڕێبەر دەکات و دەڵێ دەبێ ڕەوانبێژ بێت، ورووژێنەرێکی مەزن بێت، بەڵام زانینی دیمانەکیی ڕێبەر هێندە گرنگ نییە. ڕێبەر دەبێ ئاپۆرە جۆش بدات بەڵام دەبێ زاڵیش بێت بەسەریاندا.

باوەڕی ڕێبەر – کەسایەتی مەزن – کە مێژووی خۆی دروست دەکات، وەرامێکی فاشیزمە بەرانبەر کۆیەکیی مارکسایەتی. هیتلەر دەڵێ:

«جیاوزیی فیکریی نێوان جیهاننۆڕیی نەتەوەیی و مارکسی ئەوەیە یەکەمیان نەک تەنیا سەنگی ڕەگەز بەڵکوو سەنگی کەسایەتیش ڕەچاو دەگرێ و ئەمەش دەکاتە شاکۆڵەکەی هەموو هەڵنانەکە و هۆکارێکی باربەر لە جیهاننۆڕییەکەدا».

## ٤- ئەفسانە

لە بەرهەمە بەرچاوەکانی فاشیزمدا، زۆر چاک دەکرێ چەندین گۆشەنیگای سەر بە هەلومەرجی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی بگرین. بەڵام گۆشەنیگای ئەوتۆ تەنیا تارادەیەک خەسڵەتەکانی فاشیزم دەنوێنن. فاشیستەکان بە پلەی یەکەم مەبەستیان ئەوە نییە تێبینی هۆشەکی بۆ چۆنیەتیی سازدانی گوزەرانی سیاسی هەڵێنن. ئەوان پەیامی خۆیان لە مەزنایەتیی ناهۆشەکیدا چڕدەکەنەوە: فاشیستەکان پێیان وایە هاوکۆیی نەتەوەیی و گەلیر، نابێ بە پلەی یەکەم بە چەمکی دیمانەکی دابنرێن بەڵکوو بە دیاردەیەکی وەها کە تارادەیەک خۆ بە دەست هۆشەوە دەدەن و پتر جۆشینی هەست و هەڵمەتن. فاشیستەکان نکوولی لە بوونی ڕاستیی دیمانەکی ناکەن، پێشیان وایە خۆیان خاوەنی چەندین ڕاستیی لەو بابەتەن. بەڵام پێیان وایە دنە دانی کردەوە دەبێتە یەکەم ئەرکی ڕاستی. ڕاستییەک تەنیا ببێتە جێی ڕامان، ئەمان لە ناخەوە دەیدزێنن.

ئەوجا ڕاستیش بەتەنیا بەش ناکات بۆ ئەوەی گەل بخرێتە بزاوتن، بەڵکوو دەبێ چەندین ئەفسانەشی بخرێنە پاڵ، ئەفسانە لە لایەن گەلی نەزانەوە بە ڕاستی دادەنرێ و وزەی بزوێنەری ڕاستی هەیە. تەنیا ئەوانەی بەڕاستی ژیر و پەندیارن دەزانن کامە ئەفسانەیە، بەڵام ئەوان ئەم ئەفسانە بەکەڵکانە ئاشکرا ناکەن چونکە گەر وەها بکەن سەرلەبەری گەل گۆج دەبێت.

زۆربەی باوەڕە گرنگ و سەرسووڕمێنەکانی فاشیزم، لە لایەن ڕێبەرانی بزووتنەکەوە بە ئەفسانە دادەنران. بە نۆڕینی نازیستەکان، باوەڕی ڕەگەز پێوەندییەکی ئازاد بەڵام بەرهەستی بە چەند دیمانەیەکی بایۆلۆگییەوە هەبوو. بەڵام لەوەدا چڕکرابۆوە کە دەیگوت مارکسایەتی و پارەکاریی مەزنی نێونەتەوەیی چەکن بە دەست جوولەکایەتییەوە دژ بە ئاریگەل. ئالێرەدا شێتایەتی ئاشکرا دەبێ، نازیستە گەورەکان و بەر لە هەمووانیش هیتلەر، گەر ئەم گریمانەیەیان بە شێتایەتی دانەنابێ ئەوا بە ئەفسانەیەکی پێویست و بەسوودیان داناوە. هیتلەر هەر زوو لە *Mien Kampf* دا نووسیویەتی:

«ئەوە بەشێکە لە بلیمەتیی ڕێبەری مەزن کە بتوانێت دوو دوژمنی تەواو دوور لە یەک کۆبکاتەوە و وەهایان پێشان بدات کە سەر بە یەکن، بۆ ئەوەی کەسانی ڕاڕا و لاواز بەوەی دوژمن لە لایەنی هەمەجۆرەوە هەیە، لە مەسەلەکەی خۆیان نەکەونە گومان».

بێگومان لە بۆچوونی وەهادا زۆر سەختە بزانین چی بە ڕاستییەکی دروست دانراوە و چی بە ئەفسانە. لە دنیای بیردا گەر ڕاستی هەردەم سەر بۆ کردەوە فروو بێنێ، سنووری نێوان ڕاستی و درۆ لێڵ و بێنرخ دەبێ.

۱- سۆسیالیزمی سەدەی بیستەم

یەکێک لە ڕووداوە بنەڕەتییەکانی مێژووی بیری سیاسی لە سەدەی بیستەمدا، پەرەسەندنی فاشیزم و نازیزمە. یەکێکی دیکەیان پەرەسەندنی سۆسیالیزمە، واتە دووکەرت بوونی بزووتنەوەی سۆسیال دیمۆکراتە: لایەکی بژارخوازانە revisionistic و لایەکی شۆڕشگێڕانە، ئەو دوو لایەنە هەر ئەوانەن ئەمڕۆ پێیان دەگوترێ سۆسیال دیمۆکرات و کۆمیونیزم. لە یەکەم بەشی ئەم باسەدا لەم کەرتبوونە دەدوێین.

ڕووداوێکی سێیەمی ئەم سەدەیە ئەو گۆڕانکارییە کەمتر دراماتیکییە، بەلام بەدەم کاتەوە پتر بنەڕەتییەیە کە بووە هۆی ئەوەی نەتوانین مێژووی بیری سیاسیی سەدەی بیستەم بنووسینەوە بێ ئەوەی باسی بیریارانی دەرەوەی دنیای فەرهەنگی ئەورووپا بکەین.

هەتا ئێرە باسمان لەو نەریتە کردووە کە لە زۆر ڕووەوە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر یەکگرە و بە ئەفلاتون و ئەریستۆ دەست پێ دەکات. هۆ زۆر بوون وەهامان لێ بکەن ڕوانگەیەکی بەرفرەوانتر هەڵبژێرین و بۆ نموونە نەریتی سیاسیی هیندستانی تێهەڵکێش کەین، ئەو نەریتەی لە *Arthas'àtra* ی Kautilya دا گەیشتە ئەوپەڕی بەرزی و هەزار ساڵ پتر لە پێش میر ی مەکیاڤێللییەوە بوو، بەلام لە زۆر ڕووەوە هەڵکشاوتر و پێشکەوتووتر بوو. چین شایەنی ئەوەیە مێژووی بیری سیاسیی سەربەخۆی هەبێ، نەک هەر لەبەر ئەوەی جۆرە بیرکردنەوەیەکی سیاسی-کارەکی هەیە و هەزاران ساڵە خزمەت دەکرێ، بەڵکوو هەر نەبێ لەبەر ئەوەی بیرازکاری دلێری کۆمەلایەتیی وەک وانگ ئانشی Wang Anshi ی سەدەی یازدەیەمی هەیە، گەر بەراورد بکرایە بە شۆڕشەکانی جووتیارانی ئەورووپای سەدەی شازدەیەم و حەڤدەیەم، کارێکی باشی لێ دەردەچووو. تایبەتمەندیی بیرە سیاسییەکانی کالڤین Calvin ئاشکراتر دەبوون گەر لە تەک ئەو بۆچوونەدا دانرابان کە دەڵێ دەوڵەت دەبێ ڕاستەخۆ لە ژێر فەرمانی خودادا بێت، وەک ئیسلام دەڵێ.

فرەواندنی وەها پەلهاوێژی بابەتی بەر لە سەدەی بیستەم هەم خۆشامەدی لێ دەکرا و هەم هۆی ڕەوای دەبوو. بەلام بەم شێوەیەی ئێرەش هەر دەکرێ، باس لە نەریتی ئەورووپی وەک گشتەیەک بکرێ، بەو بڕوایەی ئەم نەریتە پاشخانی فیکری سیاسیی ئێمە پێک دێنێ. لە سەدەی بیستەمدا وێنەکە تەواو دەگۆڕدرێت، ئەمڕۆ ناکۆکیی ئایدیۆلۆژیی وێکچوو لە

هەموو دنیادا هەیە و کاریگەریی گرنگ لە جیهانی سێیەمەوە ڕاستەوخۆ دەگاتە جیهانەکەی ئێمە، ئەو جیهانەی خۆمان پێی دەڵێن یەکەم. هۆی سەرپەڕی ئەم بڵاوبوونەوەیەی ڕشتەی بیری سیاسیی ئەم سەردەمە بە هەموو جیهاندا ناگەڕێتەوە بۆ هێزی خودی بیرەکان. هەر وەک چۆن بازاڕی جیهانی و لەویشەوە سەرمایەدارەتی و کۆمیونیزم بوونە سەروکارێکی جیهانی، ئایدیۆلۆگیش وەها بووە جیهانی.

هیچ تاکە بیریارێکی سیاسی نییە لە ماو زیدۆنگ Mao Zedong باشتر بووبێتە هێمای ئەم گۆڕانکارییە. لە بەشی دووەمی ئەم باسەدا بە وردی لێی دەدوێین.

کاریگەریی مەزنی ماو لە سۆسیالیزم و کۆمیونیزم، پاش سەرەتای حەفتاکان بە توندی سەرەولێژ بوو، هەم لە خودی چین و هەم لە دنیاشدا. لە دەمەو بنەتای هەشتاکاندا، لە یەکیەتیی سۆڤیەت، میخائیل گۆرباتچۆڤ Mikhail Gorbachev و **پێرێسترۆیکا** *Perestrojka* کەی خۆی بوونە تازەترین نوێنەری ئەو دنیایەی پێی دەگوتری دنیای سۆسیالیست. تەمەنی حوکومڕانیی گۆرباتچۆڤ کورت بوو. گوتەکانی گۆرباتچۆڤ دەربارەی سۆسیالیزمێکی کراوەتر و کەمتر نێوەندگر و پتر ڕووەو بازاڕ، کۆمەڵگەیەکی سۆڤیەتیی نوێکراوەی بەدەمەوە نەبوو وەک خۆی بەتەما بوو. ئەو ئەمپراتۆرییەتە مەزنە لاوازتر و دواکەتووتر دەرچوو لەوەی بۆخۆی حیسابی بۆ کردبوو. هێزی هەڵوەشێن گورج بوون. پاش ئەوەی وەڵاتانی ڕۆژهەڵات و ناوەندی ئەورووپا لە ساڵی ١٩٨٩ وە و بە ڕەزامەندیی گۆرباتچۆڤ خۆیان لەو پێوەندبوونەی ساڵانی ساڵ بە سۆڤیەتەوە دابڕیّ، خودی یەکیەتیی سۆڤیەتیش خێرا هەڵوەشایەوە. لەگەڵ کۆتابوونی ساڵی ١٩٩١ دا چیرۆکی یەکیەتیی سۆڤیەتیش کۆتابوو. چەند دەوڵەتی نوێ لە کەلاوەی ئیمپراتۆرییەتەکە پەیدا بوو، هەرە گەورەکەشیان ڕووسیایە کە بۆریس یەلتسین Boris Jeltsin ی کاتی خۆی هاوچاوی گۆرباتچۆڤ بوو، ڕێبەری دەکات.

### ٢- بێرنشتاین و لێنین

سۆسیالیزمی سەدەی نۆزدەیەم تەواو لە یەکبوون دوور بوو. مارکسایەتی یەکێک بوو لە چەندین ڕێباز. لە ئەورووپادا پارتییە گەورەکانی سۆسیال دێمۆکرات لە سەر بەرنامەی مارکسایەتی ڕێک کەوتبوون. لە ئینگلاند، سنووری نێوان لیبەڕالیزمی ڕادیکال و سۆسیالیزم بزێو بوو، کاریگەریی مارکسایەتی سنووردراو بوو، ئایدیۆلۆگە گرنگەکانی پارتی Labour، کە لە *Fabian Society* دا یەکیان گرتبوو، خۆیان هەم بە سۆسیالیست و هەم بە لیبەڕالی تەواو ڕسکاو دادەنا.

حیزبە سۆسیال دیمۆکراتەکان مارکسی بوون - یان پاشان بوون بە مارکسی. ئەمەش مانای ئەوەیە شۆڕشگێڕ بوون. خەسڵەتی شۆڕشگێڕانەی مارکسایەتی مانای ئەوە نییە مارکسایەتی تێکبەربوونی خوێنینی پێ باشە، بەپێچەوانە، لە نۆڕینی مارکسییە بەرچاوەکانەوە ئاشکرایە کە کۆمەڵگەی نوێ لەسەر بنەمای کۆمەڵایەتی کۆن هەڵنانرێ. لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا ناکۆکی نێوان دوو چینی نوێ و پەرەسێنی سەرمایەدار و پرۆلیتاریا لە ئاستێکدایە چارە ناکرێ مەگەر بە گۆڕینی تەواوی هەلومەرجی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگە.

شێوە بیرکردنەوەی مارکسی چەند بە قووڵی کاری لە پارتە سۆسیال دیمۆکراتەکان کردووە، مەسەلەیەکە مشتومڕی لەسەرە. لە هیچە نەبوو کە دەگوترا شۆڕشگێڕیی مارکسایەتی، بە نۆڕینی زۆر کەس، تەنیا پەردەیەک بوو لە پشتییەوە سیاسەتی کارەکیی جیاواز دەبرا بەڕێوە. بەڵام ئەو ناکۆکییە توندەی نێوان لایەنگرانی شۆڕش و بژارخوازان، لە سەرەتادا لە نێو پارتی سۆسیال دیمۆکراتی ئەڵمانیا و پاشان هی ڕووسیا، پێشانی دەدا مارکسایەتی بە فرەوانی کاری لێ کردبوون.

بژارەتی revisionism ش خۆی بە مارکسی دەزانی - نوێنەرانی بژارەتی دەیانویست مارکسایەتی ڕەسەن *بژار* بکەن. دەیانویست بە شێوەیەکی وەهای بگۆڕن کە بگونجێت لەگەڵ ئەو فراژووتنە سیاسی و کۆمەڵایەتییەی سالانی دەوروبەری ئەم سەرەسەدەیە هاتە کایەوە. یەکێک لە گۆڕانکارییە مەزنەکان ئەوە بوو پشت بکرێتە پەیامی شۆڕشگێڕیی مارکسایەتی و ئەو بڕوایەی بخرێتە جێی کە دەڵێ بە بیراز reform ی لەسەرەخۆ دەگەینە کۆمەڵگەی سۆسیالیستانە. لەبەر ئەوەشە زۆر جار بە بژارخوازان دەگوترێ بیرازخواز reformist (ڕیفۆرمیست) ان. (دەبێ ئەوەشمان لەبیر بێت کە بیرازەتی reformism چەمکێکی بەرفرەوانترە لە چەمکی بژارەتی، تەنانەت لیبەڕاڵ و سۆسیالیستی نامارکسیش هەیە خۆ دەدەنە پاڵ بیرازەتی).

بژارخوازی پێشەنگ لە ئەڵمانیا، ئەدوارد بێرنشتاین Aduard Bernstein (١٨٥٠-١٩٣٢) بوو. لە سەرەتادا بێرنشتاین خۆی دابووە پاڵ مارکسایەتی و چەند ساڵێکیش تاراوەیەک لە ئەنگیلزەوە نیزیک بوو. بەڵام Fabian Society ی ئینگلیزی کاری تێکردبوو، لە دوا ساڵی سەدەی نۆزدەیەمدا خۆی وەک ڕێبەرێکی بژارەتی هێنایە پێش - یەکێک لە بەرهەمەکانی ئەم کتێبەیە: *Die Voraussetzungen des Sozialismus und die Aufgaben der Sozialdemokratie* (١٨٩٩).

ڕێبەری سۆسیال دیمۆکراتی ئەڵمانیا August Bebel (١٨٤٠-١٩١٣) و خەڵکی

دیکەش ڕووبەڕووی بێرنشتاین بوونەوە، گفتوگۆی ئەم بوارە پتر لە دە ساڵ بەردەوام بوو و پێی دەگوترا ڕاوێژی بێرنشتاین. بەڵام ناکۆکیی نێوان شۆڕشگێڕان و بژارخوازان تەنیا دیاردەیەکی ئەڵمانی نەبوو. لە نێو پارتی سۆسیال دیمۆکراتی ڕووسیشدا دووبەرەکییەکی لەو بابەتە و قووڵتریش پەیدا بوو لە نێوان بۆلشەڤیک (نوێنەری زۆرینە) ی شۆڕشگێڕ و مەنشەڤیک (نوێنەری کەمینە).

لینین Vladimir Iljiti Lenin (١٨٧٠-١٩٢٤) کە گەورەترین نوێنەری مارکسایەتیی شۆڕشگێڕ بوو، ڕێبەرایەتی بۆلشەڤیکی دەکرد. پاش شۆڕشی ئوکتۆبەری ١٩١٧، بە ڕێبەرایەتی بۆلشەڤیک، نێونەتەوایەتیی کۆمیونیستانە هەڵنرا. بەوەش دووبەرەکی ڕێگەی گەڕانەوەی نەما: سۆسیال دیمۆکراتی کۆن، لایەکی بوو بە سۆسیال دیمۆکراتی بژارخواز و بیرازخواز و لایەکی دیکەش بوو بە کۆمیونیزمی شۆڕشگێڕ. ئەو بژار کردنەی مارکسایەتی کە بێرنشتاین و هاوبیرانی نوێنەرایەتییان دەکرد بژار کردنێکی قووڵ بوو، دیمانەی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵناسیشی دەگرتەوە.

بژارخوازان داوایان دەکرد دیمانەی ئابووریی مارکس، بەو شێوەیەی لە ***سەرمایە*** دا باس کراوە، دەبێ هەم بنەماکانی، یان دەستکاری بکرێن یان هەر نەبێ لایەنی دیکەیان بخرێتە سەر، هەم ئەو ئاکامگرییەی بواری فراژووتنی سەرمایەدارەتی دەبێ بنەڕەتانە گۆڕانکاری تێدا بکرێت.

مارکس لایەنگری دیمانەیەکی بابەتەکی objective ی بەها بوو: بەهای گۆڕینەوەی شتومەک پەیوەستی ئەو کاتەیە کە لە دروست کردنی شتەکە (واتە بابەت object ەکە) دا سەرف کراوە. بێرنشتاین، لە سەر ڕێی Fabian Society، پێی وابوو بەهای ئابووری دەکرێ، و بگرە چاکتریش دەکرێ، بە دیمانەیەکی نوێ، ***دیمانەی لێواری سوود***، ڕوون بکرێتەوە. ئەم دیمانەیە زاتەکی subjective بوو: بەهای شتومەک لە ئەنجامدا، لە لایەن پێویستی و داواکردنەوە (واتە زات subject ەوە) دیاری دەکرێ. جگە لە ئەنجامی دیمانەکی - ئابووری، جیاوازییەکی ئایدیۆلۆگیش لە نێوان دیمانەی بەهای بابەتەکی و زاتەکیدا هەبوو. لە یەکەمیاندا سەرنج ڕووی لە دەستووری بابەتەکیی ئابوورییە و لە چینەکانی کۆمەڵگەیە، لە دووەمیاندا سەرنج ڕووی لە زاتگەل و خواستەکانیانە. دیمانەی لێواری سوود، لەگەڵ تاکەکیەتی و باوەڕهێنان بە هەڵکردنێکی هاوئاهەنگی چینەکانی کۆمەڵگە، ئاسانتر ڕێک دەکەوێ.

بەڵام گرنگترین بژار کردنی دیمانەی ئابووریی مارکسی لە بواری سەر بە فراژووتنی سەرمایەداریدایە. بێرنشتاین و بژارخوازانی دیکە دەیانگوت فراژووتن لە وەڵاتانی

سەرمایەداری، لە دەمەو بنەتای سەدەی نۆزدەیەمدا پیشانی دا کە ئاکامگرییەکانی مارکس هەڵەن، یان هەر نەبێ زێدەڕۆییان تێدایە. یەکەم خاڵ ئەوەیە کە چڕبوونەوەی سەرمایە هێندە خێرا نەبوو وەک مارکس پێشبینی لێ دەکرد. چەندین سەرمایەی بچووکتری نوێ پەیدا بوون. خاڵی دووەم ئەوەیە کە ناوتوێژی نێوان کرێکار و سەرمایەداران لەناو نەچوو، بگرە بەپێچەوانە، چ لە ڕووی ژمارەوە و چ لە ڕووی دەوڵەمەندییەوە هەڵکشا. خاڵی سێیەمیش نزم نەبوونەوەی ئاستی ئابووریی چینی کرێکارە و بگرە بەرزبوونەوەیەتی.

گەر وەها بێت دەبێ لایەنی کۆمەڵناسیش لە دیمانەی مارکسدا بگۆڕدرێت. ئەو باوەڕەی دەڵێ ململانێی چینایەتی هەتا بێت توندتر دەبێ، لەوە نەدەچوو ڕاست بێت. ئەگەرچی هەلومەرجی چینی کرێکار یەکجار خراپە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەرەو باشتر چووە. هەڵکشانی ئابووری دەشێ خێری هەموو چینەکانی تێدا بێ. لەوە ناچێت فراژووتنەکە ڕووی لە ڕشتەیەکی دووچین بێت بەپێچەوانە ڕووی لە فرەچینییەکی دەوڵەمەندترە.

تێبینییە شارەزاکییەکانی بێرنشتاین بەگشتی دروست بوون. فراژووتن لە وەڵاتە پێشەنگەکانی پیشەسازی، لە دەوروبەری ئەم سەرەسەدەیەدا تاڕادەیەک خێرا و هێمن بوو. بەڵام ئاکامگرییەکانی دەشێ بەرگومان بن. بە پلەی یەکەم لینین سەرلەبەری بژار کردنی دیمانەی ئابووری و کۆمەڵناسیی مارکسیانە ڕەت دەکاتەوە.

بەگشتی لینین پێی وا بوو، بژارەتی بەرهەمێکی ئەو فراژووتنە تاڕادەیەک ئاشتیخوازانەی ماوەی نێوان ساڵانی ١٨٧٠ و ساڵانی بەر لە شەڕی جیهانی یەکەمە و جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە ڕوانگەی بژارخوازان یەکجار بەرتەسکە. بژارخوازان تەنیا چاویان لە ماوەیەکی کەمخایەنی فراژووتنە، لە چەند دەوڵەتێکی پیشەسازیدا.

لینین دەیگوت سەرمایەدارەتی هێشتا زۆری ماوە بگاتە دۆخی خلەفان و بزووتنەوەی کرێکاران لەسەرەخۆ و بە هێمنی ژێرپێی بۆش بکەن، بەپێچەوانە سەرمایەدارەتی گەیشتۆتە بەرزترین ئاست - ئاستی ئیمپێریالیستی. لەم ئاستی ئیمپێریالیستییەدا هەموو دنیا ڕاپێچی دنیای سەرمایەداری کراوە. وەڵات و ناوچەی دەرەوەی وەڵاتانی پیشەسازی بەرز بوون بە ڕەخسێنی کەرەستەی خاو و بە یارمەتی ئەوان سەرمایە توانی تاڕادەیەک هەڵکشێ، ئەمەش بۆ بەردەوامبوونی سەرمایە کارێکی پێویست بوو. تەنانەت زاڵبوونی سەرمایەدارەتی بەسەر سەختانگە ئابوورییەکاندا هەر دەگەڕێتەوە بۆ ناردنی ئەو زێدەبەرهەمەی هۆکاری سەختانگ بوون، بۆ ناوچە دوورە کەمگەشاوەکانی ئیمپێراتۆرییە

ئابوورییەکە. کەواتە ڕشتەی ئیمپێریالیستی نرێگەی نەدا ڕەوتەکە بگاتە وێستگەیەکی شۆڕشگێڕانەی وەها کرێکاران تێیدا بتوانن دەسەڵات بگرنە دەست.

دیمانەی ئیمپێریالیزمی لینین، لە چەندین گوتەی مارکس و ئەنگیلزەوە پشتیوانی لێ دەکرێ. لە یەکەم دەساڵی سەدەی بیستەمدا گوتوبێژ لەسەر هۆ و نرخی ئیمپێریالیزم یەکجار گەرم بوو. J.A. Hobson (١٨٤٨-١٩٥٠)، ئابووریناسێکی لیبەڕالی ئەنگلیز بوو، کتێبێکی بە ناو ***ئیمپێریالیزم*** *Imperialism* (١٩٠٢) دانا. ئەم کتێبە تاڕادەیەک بایەخدار بوو بۆ لینین. هۆبسۆن لە دەراوێکی لیبەڕالانەی گشتییەوە بەرپەرچی ئەو باوەڕانە دەداتەوە کە دەڵێن گەشەندی گەلی ئینگلیز، بە دادۆشینی کۆلۆنی و ناوچەکانی سەرانسەری دنیا، پەیدا دەبێ. هۆبسۆن پتر لە خەمی ئابووریی نیشتمانەکەی خۆیدا بوو نەک لە خەمی ئەو مەینەتییەی ئیمپێریالیستەکان دەیان هێنا بەسەر خەڵکی وەڵاتاندا. هۆبسۆن دەڵێ: «ئیمپێریالیزم بەرهەمی ئابوورییەکی چەوتە». «"بیرازی کۆمەڵایەتی" ئەوەیە ئاستی بەرهەمبەری ‹ئیستهلاک› ی کەسەکی و گشتیی نەتەوە بەرزکرێتەوە بۆ ئەوەی نەتەوە بەو شێوەیە بگاتە بەرزترین ئاستی بەرهەم هێنان». کەواتە هۆبسۆن پێی وایە بیراز کردنی کۆمەڵایەتی، دانیشتوانی وەڵات دەکاتە بەرهەمبەرێکی باشتر و بەو جۆرەش بەرهەم هێنان زیاد دەکرێت. کۆلۆنی، کە ئیمپێریالیستەکان پروپاگەندەی بۆ دەکەن، دەبنە هۆی دەوڵەمەندبوونی تەنیا چەند سەرمایەدارێکی ژمارە کەم.

لینین دەڵێ، هیچ بیرازێکی کۆمەڵایەتی ناتوانێ جێی ئیمپێریالیزم بگرێتەوە، ئیمپێریالیزم پێویستە بۆ پەل هاویشتنی سەرمایە. لە سایەی ئیمپێریالیزمدا، خەڵکی ئەم دنیایە زیاتر و زیاتر دەبنە پرۆلیتار و دەچنە خزمەتی سەرمایەوە. لە ژێر سایەی ئیمپێریالیزمدا پێوەندیی نێوان سەرمایە و دەوڵەت دەگۆردرێت. سەرمایە ئەو دەوڵەتەی چنگ دەکەوێ کە پێویستیەتی، دەوڵەت دەستاوێژی دەسەڵات دەخاتە خزمەت سەرمایەوە. بەوەش هاوچاویی لەسەر بازاڕ دەکەوێتە نێوان نەتەوەی پیشەسازەوە. لینین شەڕی جیهانیی یەکەم بە ئەنجامێکی ئەو ململانێ پەرەسێنەی نێوان نەتەوە سەرمایەدارەکان دەزانێ. هاوچاویی سەرمایەی جودا بووەتە هاوچاویی دەوڵەتی جودا.

لینین یەکرەوانە لە ڕوانگەیەکی جیهانییەوە دەڕوانێتە فراژووتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و لەوانیشەوە فراژووتنی سیاسیش. سەرمایەدارەتی لە ئاستی هەرە بەرزیدا بووەتە دیاردەیەکی جیهانی. خەباتی نێوان سەرمایە و کار مەسەلەیەک نییە تەنیا گرێدراوی دەوڵەتانی پیشەساز بێت.

شابەرهەمی لینین دەربارەی ئیمپێریالیزم کتێبێکە بە ناوی ***ئیمپێریالیزم بەرزترین***

*ئاستی سەرمایەدارەتییە* و لە ١٩١٦ لە ڕۆژگاری گرگرتووی شەڕی جیهانیی یەکەمدا نووسیویەتی. ئەو دەمەش پازدە ساڵ زیاتر بوو ململانێ لەگەڵ بژارخوازاندا بەردەوام هەبوو.

بەرانبەر گوتەکانی بژارخوازان، لینین دەڵێ، گەر لە چەند وەڵاتێکی سەرمایەداریدا کرێکاران باریان سووکتر بووبێ ئەوا مەسەلەیەکی کاتەکییە و بەر لە هەر شتێک بۆ خامۆش کردنی پشکۆی شۆڕشگێرانەی کرێکارانە و بۆ ئەوەیە کرێکاران بکرێنە هۆگری دەوڵەتی سەرمایەدار. لینین دەڵێ جۆرە *کرێکارێکی ئەریستۆکرات* خەریکە پەیدا دەبێ، واتە جۆرە کرێکارانێک کە لە ڕێی مووچە و دەستکەوتی دیکەوە پتر هۆگری بۆرژوای وەڵاتەکەی خۆیانن نەک پرۆلیتاریای نێونەتەوەیی. ئەم دەستەیە داوای ڕێبەرایەتی هەموو پرۆلیتاریا دەکەن و هەڵبەتە بۆرژوا و بەدوا ئەوانیشەوە بنگەی دەوڵەتی نەتەوەییش پشتیان دەگرن. ئایدیۆلۆگیی خۆرسکی ئەمانە، سۆسیال دیمۆکراتیی بژارخوازانەیە.

لینین، لە فراژووتنی ڕۆژگاری شەڕی جیهانیی یەکەمدا، بەڵگەیەک بۆ گریمانەکەی خۆی دەهێنێتەوە: پارتە سۆسیال دیمۆکراتەکان – وێڕای هەموو بیروڕا و پەیمانێک – گەر ڕاستەوخۆ پشتگری شەڕەکە نەبووبن ئەوا نۆرەیەکی پاسیڤانەیان هەبووە. لینین لە بەرهەمە گرنگەکەیدا *دەوڵەت و شۆڕش*، کە ساڵی ١٩١٧، پاش ڕمانی تسارفەرمانیی ڕووسیا و بەر لەوەی بۆلشەڤیک دەسەڵات بگرنە دەست، نووسیویەتی، لەوێدا دەڵێ، بژارەتی ئێستا بووەتە شۆڤینیزمی جڤاکی social chauvinism. شۆڤینیزمی جڤاکی «بە گوتار جڤاکییە و بە ڕەوتار شۆڤینیزمە». شۆڤینیزمی جڤاکی نیشانەیە بۆ «خۆگونجاندنی نزم و نۆکەرانەی ڕێبەرە سۆسیالیستەکان نەک تەنیا لەگەڵ بەرژەوەندی بۆرژوای نەتەوەکەی "خۆیان" دا بگرە لەگەڵ بەرژەوەندی دەوڵەتەکەی "خۆشیان"دا».

بژار کردنی مارکسایەتی لە لایەن بژارخوازانەوە تەنیا دیمانەی ئابووری و کۆمەڵایەتی نەگرتبۆوە بەڵکوو دیمانەی سیاسیش، بگرە بە پلەی یەکەم ئەمیانی، گرتبووە. بژارخوازان بە پێشەنگیی بێرنشتاین، پێیان وا بوو، گەر فراژووتنی ئابووری ڕووەو مۆنۆپۆلی سەرمایەدارەتی و نابووت کردنی تەواوی چینی کرێکار و لە ئەنجامیشدا سەختانگی هەژەندانەی ئابووری نەچێت، دەبێ بزووتنەوەی کرێکاران هەموو چالاکیی خۆیان بگۆڕن. لە بری ئەوەی چارەسەری نێزیک تەنیا بە خۆ ئامادەکردنێک بۆ ڕۆژی لەیەک دانی مەزن دابنرێت، دەبێ ئەم خەباتە سنووردراوەی دژ بە کۆمەڵگەی سەرمایەداری و بورژوا ببێتە هەنگاوی سەرەکی. بێرنشتاین شاعیراسا دەڵێ، بزووتنەوەکە خۆی هەموو شتێکە نەک ئامانج. بزووتنەوەکە و فراژووتنی هەنگاو بە هەنگاو، نابێ کڕنوو بۆ ئامانجی دوور بەرێت.

بەم جۆرە، ئەو شێوازانەی چالاکی و خەباتەی جاران بە پێویست دەزانران بۆ ئامادە کردنی چینی کرێکار بۆ شۆڕشی مەزن، دەبێ ببنە شێوازی سەرلەبەری چالاکیی چینی کرێکار. هەڵبەتە ئەم گوتانە ئەو خەباتە سەندیکاگەرییەش دەگرێتەوە کە لە پێناوی مووچە و دەستکەوتی دیکەدایە. بە دیدی بێرنشتاین ئەم خەباتە هەتا ئێستا ئەنجامێکی باشی هەبووە و دەبێ دەرفەتی مایەکیی چینی کرێکار بە ڕۆشن دابنرێن. بەشداری کردنی پارتە سۆسیال دیمۆکراتەکان لە هەڵبژاردندا لایەنێکی بەرچاوی ئەم بیرەیە. بە نۆڕینی ئەنگیلز، هەڵبژاردن و کاری پەرلەمانی سەنگێکی ڕاستەوخۆی هەبوو بۆ پێوانی «ڕەسینی چینی کرێکار». بەلام گەر سەنگێکیان لە پرۆسەی گۆڕانکاریی شۆڕشگێڕانەدا هەبێ ئەوا مەسەلەیەکی بەرگومانە. بەلام بێرنشتاین دەیگوت، ئەگەر سۆسیال دیمۆکرات لە پەرلەماندا زۆرینە وەدەست بێنن، ئەوا دەتوانن سیاسەتێکی بیرازخوازانە بسەپێنن و بەو جۆرە جێپێی سەرمایەدارەتی و بنگەکانی بورژوا بلەرزێنن و لە ئەنجامدا لەناویان بەرن. کەواتە ئامانجەکە بەلای بێرنشتاینەوە هێندە ناگرنگ نەبووە. دەبێ ئەوەشمان لەبیر بێت کە بژارخوازانی زوو، بەپێچەوانەی بەشێکی زۆری سۆسیال دیموکراتی درەنگتر، بەهیچ جۆرێک لایەنگری بیرۆکەی ئابووریی تێکەڵ نەبوون، کە داوا دەکات سەرمایە و کۆمەڵگە هاوبەشک، یان نیزیکە هاوبەشک بن.

بێرنشتاین و کەسانی دیکەش دەیانگوت ئەگەر مافی دەنگ دانی گشتی بسەپێنرێ، چینی کرێکار بە هۆی ژمارە زۆرییەوە، لە پەرلەماندا خێرا زۆرینە وەدەست دێنێ. لەبەر ئەوە بژارخوازان لە زۆر وەلاتدا - بۆ نموونە لە سوێد - بوونە هاوکاری لیبەڕالەکان، چونکە ئەمانیش داوای مافی گشتی و وەکیەکی دەنگ دانیان دەکرد. بەلام هۆی هاوکارییەکە تەنیا تاکتیکی نەبوو. مەودای نێوان بژارخوازان و پەیڕەوانی لیبرالیزمی جڤاکی هێندە فرەوان نەبوو. ئامانجیان جیاواز بوو بەلام هەردوو لا بڕوایان بە یەک جۆر دەستاوێژ هەبوو، ئەوجا ئەگەر بزووتنەوەکە لە ئامانج گرنگتر بێت ئەوا هاوکاری ئاسانە.

بەو جۆرە سۆسیال دیمۆکراتی بژارخواز لە مەسەلەی بڕوا هێنان بە دیمۆکراتیی ڕۆژاوایانە بوونە هاوبیری لیبەڕالە ڕادیکالەکان.

بەوەش دەبێ نۆڕینە مارکسییەکەی جاران دەربارەی پێوەندیی دەوڵەت بە ژێرخانی ئابووری و کۆمەلایەتییەوە لە بنەڕەتەوە بگۆڕدرێت. بە نۆڕینی مارکس و ئەنگیلز دەوڵەت هەردەم ئامرازێکە بە دەست چینی دەستڕۆوە. لەبەر ئەوە هەتا سەرمایەدارەتی بمێنێ ئەرکی دەوڵەت دەبێت خزمەت کردن و پاراستنی پلە و پایەی بورژوا بێت.

بەڵام لە بۆچوونی بژارخوازاندا، هەر نەبێ پەرلەمان جۆرە بێلایەنییەکی پەیدا کرد، چونکە ئەو ڕێبازە سیاسییەی لە پەرلەماندا زۆرینەی هەبێ، ئەو دەسەڵاتەی دەکەوێتە دەست کە بە ڕەسمی دراوە بە پەرلەمان. کەواتە دەشێ هەموو کۆمەڵگە لە پەرلەمانەوە بگۆردرێت. ئەگەر سۆسیال دیمۆکرات زۆرینەی دەنگی لە پشت بایە، دەکرا بە خەباتێکی تەواو گونجاو لەگەڵ دەستووره باوەکانی گەمەی سیاسیدا، سەرمایەدارەتی بشکێنێ - وێرای توانای مەزنی ئابووریی ئەمیان.

*دەوڵەت و شۆڕش* ی لینین مامەڵەتێکی توند و تیژە بەرانبەر ئەم نۆڕینە. دیمۆکراتیی ڕۆژاوا، دیمۆکراتییەکی ڕۆژاوایانەیە. ئەم جۆرە دیمۆکراتییە «باشترین سەرپۆشی سیاسییە بۆ سەرمایەدارەتی» و دەسەڵاتی سەرمایەدارەتی بە شێوەیەکی وەها پتەو دەکات کە «نە گۆڕینی مرۆڤ، نە بنگە، نە حیزب ... ئەم دەسەڵاتە ناهەژێنێ». لەبەر ئەوە تەنیا یەک ڕێگە هەیە بۆ نەهێشتنی ئاغایەتیی سەرمایە و چەوساندنەوەی چینایەتی و هەڵمشتن: ئەویش دیکتاتۆرییەتیی پرۆلیتاریایە، کە بە چوستی دەرفەتی باڵادەستیی لە چینە دەسترۆکانی پێشووتر دەستێنێ. ئەوجا ڕێگە ئاوالە دەبێ بەرەو کۆمەڵگەیەکی کۆمیونیستانەی بێچین. لەم بارەوە لینین دەڵێ: «لە کۆمەڵگەی کۆمیونیستانەدا، کاتێک بەرگری سەرمایەدارەتی بەجارێک دەشکێ، کاتێک سەرمایەداران نامێنن، کاتێک چین نامێنێ (واتە کاتێک لە پێوەندیی ئەندامانی کۆمەڵگە بە دەستاوێژی بەرهەم هێنانی کۆمەڵایەتییەوە، هیچ جۆرە جیاوازییەک لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگەدا نامێنێ) - ئەوجا "دەوڵەت بوونی نامێنێ و دەشێ باس لە ئازادی بکرێ". ئەو دەمە دیمۆکراتییەکی تەواو ڕسکاو و ڕاستەکی و بێ هیچ جۆرە ڕیزپەڕییەک، مومکینە و بەڕاست گەڕاوە».

کەواتە ئامانجی دەمودەستی بزووتنەوەی کرێکاران شۆڕشە. باوەڕی لینین دەربارەی سازمانی پارتی شۆڕشگێڕ جیاوازە لەوەی مارکس و ئەنگیلز. بە نۆڕینی لینین حیزب دەبێ بەرلەشکر و **پێشڕەو** *Avant-garde* ی پرۆلیتاریا بێت، واتە حیزب سەرلەبەری پرۆلیتاریا کۆناکاتەوە بەڵکوو دەبێتە نوێنەری بەرژەوەندی پرۆلیتاریا. حیزب دەبێ شۆڕشەکە ساز بکات و بەڕێوەی ببات. گرنگیشە ئەندامانی حیزب خۆیان دوور ڕاگرن لەو نرخاندنانەی نێو کۆمەڵگەی دامەزراو، دەنا ناتوانن بنگەیەکی دەوڵەتیی نوێ دامەزرێنن و ناتوانن بناخەی کۆمەڵگەی بێچین دارێژن.

ئەم *دیمانەی پارتی* یەی لینین بوو بە ناوەڕۆکی ئەوەی پاش مردنی خۆی ناوی لێ نرا لینینایەتی Leninism یان مارکسایەتی-لینینایەتی Marxism-Leninism. ڕاستە شۆڕش و ڕزگار کردنی چینی چەوساوە کاری چینەکان خۆیانە، بەڵام پارتی کۆمیونیست لەسەر

داخوازیی چینی کرێکاران کار دەکات، چونکە پارتەکە خاوەن دیمانە و بەرنامەی کارە. بە نۆڕینی لینین، دیمانەکە – دیمانەی مارکسایەتی – شتێک نییە لە خۆوە لە بەسەرهاتی چەوساندنەوە و بێدادیی دەمودەست بڕسکێت. لەم بەسەرهاتانە تەنیا ئەوە شێن دەبێت کە لینین پێی دەڵێ هۆشیاریی سەندیکاگەری، یان باوەڕ هێنان بەوەی یەکگرتنی سازدراو و هاوکاری پێویستە بۆ هەلومەرجی کار. دیمانەی کۆمەڵایەتی بەدیمانەی سیاسیشەوە، لە بنەڕەتدا کاری بیرکارانی وەک مارکس و ئەنگیلزە. ئەوجا هەر پارتی خۆشچنراو و، چ لە ڕووی دیمانەکی و چ لە ڕووی کارەکییەوە ئاگادار و، هەردەم ئامادەی کردەوە، دەتوانێ بزووتنەوەیەک ساز بدات ڕووەو کۆمەڵگەی بێچین. لە هەمان کاتیشدا پارتی بە داخوازیی چینی کرێکار دەخەبتێ.

ئەم نۆڕینەی لینین زۆر جار بە نیشانەی سەرتەلایەتی (ئەلیتیزم) elitism دانراوە. پارتی دەستەیەکی هەڵبژاردەیە، سەرتەڵە و ئاپۆرەی خەڵک ناتوانن بەبێ ئەوان کاری خۆیان جێبەجێ بکەن. تەنانەت گوتراویشە کە خودی لۆگیکی دیمانەی پارتی بە ئاسانی دەبێتە هۆی ئەوەی نەک هەموو حیزبەکە بەڵکوو تەنیا ڕێبەرایەتی پارتەکە ببێتە سەرتەڵی بەڕێوەبەر و ئیمتیازی ئەوەی ببێ بە ناوی چینی کرێکارەوە بدوێ، لە ئەنجامیشدا تەنیا یەک ڕێبەری تاک دەبێتە نوێنەری هەموو پارتەکە. بەو جۆرە دیمانەی پارتیی لینین، بە شێوەیەکی تیان دەشیا ببێتە دروستاندنێک بۆ تاکفەرمانیی ستالین Stalin لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا لە دەمەو کۆتابوونی بیستەکانەوە هەتا مردنی لە ١٩٥٣دا.

گەر بگەڕێینەوە سەر گوتەکانی خودی لینین ئەوا بەڵگە بۆ نۆڕینی هەمەجۆر لە ماوەی هەمەجۆردا هەیە. لینین تەنیا داوای مەزنایەتیی پارتی ناکات بەڵکوو دەشڵێ: «هەموو دەسەڵات بۆ سۆڤیەتەکانە». سۆڤیەت ئەو کۆڕانەیە شۆڕشگێڕان لە کارگە و لە ناو ئەرتەشدا پێکیان هێنابوو. دەسەڵات دان بە سۆڤیەتەکان مانای ڕێبەرایەتییەکی گەلیری یەکجار بەرفرەوانە. بەم بۆچوونە بێت، گەلی کارا بۆخۆی حوکوم دەکات.

لە لایەکی دیکەوە، لینین جەخت لەسەر ئەرکی ڕێبەرایەتی حیزب دەکات و تەنانەت سووریشە لەسەر ئەوەی لە نێو حیزبدا بەهیچ جۆرێک نابێ باڵ پەیدا بێت. کەواتە حیزب دەبێ خۆی وەک یەک یەکە بنوێنێ. ئاشکرایە کە لینین جۆرە هاوئاهەنگییەکی بنەڕەتی لە نێوان حیزب و خەڵکی کارای نێو سۆڤیەتەکانی بە مەرج گرتووە. حیزب تێگەیشتووە فراژووتنی مێژووکرد چییە و چی گرنگە بکرێت. بەڵام گەل خودی ئەو هێزە پاڵنەرەیە لە فراژووتنەکەدا. حیزب خاوەنی دیمانەیە، گەل خاوەنی کردەوەی زیندووە. یەکێک لە گوتە بەناوبانگەکانی لینین دەڵێ، دیمانە بێ پراکتیک نابێت و پراکتیک بێ دیمانە نابێت.

لینین ئەم بۆچوونانەی خۆی لە بنەمای *نێوەندەکیەتیی دیمۆکراتیانە* *democratic centralism* دا کۆدەکاتەوە. ئەم بنەمایەی لە سەرەتادا بۆ حیزب تەرخان کردبوو، پاشان پەرەی پێ دا و کردیە بنەمایەک بۆ سازدانی دەسەلاتی دەولەت و گوزەرانی ئابووری. گەر بە ئاسانی لێی بدوێین دەکاتەوە ئەوەی سەرۆکایەتی حیزب هەردەم بەرپرسە بەرانبەر هەموو حیزبەکە و سەرۆکایەتی دەولەتیش بەرانبەر هەموو گەل. سەربەخۆیی کۆمیون ‹ناوچە› نۆرەیەکی گرنگی لە ڕێک خستنی دەولەتدا هەیە: کۆمیونی پاریسی ١٨٧١، بەو جۆرەی مارکس لێی تێگەیشتبوو، لای لینین بووبوو بە نموونە. هیچ کەمینەیەک نابێ بەزۆر بخرێتە ژێر دەسەلاتی دەولەتەوە. لە هەمان کاتدا دەبێ بنەماکانی نێوەندەکیەتی چەسپاو بن. پێشەکی بڕیار دەدرێت و پاشان ڕای گەل بە وردی وەردەگیرێ. بڕیار کە دەرچوو دەبێ بێ دوودلی جێبەجێ بکرێن. وێرای ئازادی و هەمەلایەنی دەبێ هەموو سازمانێک – دەولەت بێ یان حیزب، سەندیکا بێ یان شەریکە– نێوەندێکی چەسپاوی هەبێ.

لایەنێکی دی ئەم بۆچوونە ئەوەیە لینین دیمۆکراتی بە دەستاوێژ دادەنێ نەک بە ئامانج. بەلای لینینەوە، دەستڕۆیی ئاسایی‌ی خەلک لە بڕیارداندا نابێتە هۆکارێکی بنەڕەتی بۆ دابینی و پێشکەوتن و بەهرەمەندبوونی ئەو خەلکە. نێوەندەکیەتیی دیمۆکراتیانە خزمەتی تاکە ئامانجی مەزن دەکات ئەویش ڕێگە خۆش کردنە بەرەو کۆمەلگەی بێچین، ئەو کۆمەلگەیەی لینین ناوی ناوە کۆمیونیستانە.

لە نێوەندەکیەتیی دیمۆکراتیانەدا گرژی لە نێوان خالی دیمۆکراتی و خالی نێوەنددا هەیە. لینین تەواو لەم گرژییە ئاگادار بووە و بە نموونەیەکی دیالەکتیکی دەزانی کە بە نۆرینی خۆی ناوەڕۆکی مارکسایەتییە.

لینین جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە مرۆڤ لە ڕۆژگاری مێژووکردی جۆراوجۆردا، هەلومەرجی جیاوازی هەیە. شۆڕش ڕۆژگاری خەباتی بێبزەی چینایەتییە: ڕۆژگارێکە دژەشۆڕش contra revolution هەردەم هەڕەشە دەکات. لە ناو شۆڕشگێڕاندا ئارەزووی، هەم ڕووەو ڕادیکالیزمی زێدەڕۆ و هەم ڕووەو خۆ گونجاندن، بە تینە. لەبەر ئەوە پشتی یەکتر گرتن و یەکبوون پێویستە. لینین پێشی وەهایە ئەم ڕۆژگارە کەمخایەنە. شۆڕشی ڕووسی حەفت سالی بەسەردا تێنەپەڕی بوو، لینین مرد، بەلام بەلایەوە سەیر بوو دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا لەو ماوەیەدا هەر بەردوام ما. جگە لەوە فراژووتنی دەولەتیش چەوتە حیسابی زۆری تێدابوو بۆ ئەو. نە توندیی بەرگریی ناوخۆ و نە دەست تێوەردان و پێوەندیبڕینی دەولەتانی سەرمایەدار بەلای لینینەوە سەیر بوون، بەلکە بەردەوامبوونی بیرۆکراتیی دەولەتی و مەیلی خۆگۆڕین و تەنانەت تەشەنە کردنیشی لە نێوان پارتی

کۆمیونیستدا سەیر بوون. لینین ئەو بنگە دەوڵەتییەی بۆلشەڤیکەکان لە ١٩١٧ دا گرتیان، بە ئامرازێکی ڕووت، بە «مەکینە» یەکی دادەنا، کە دەسەڵاتدارانی نوێ بتوانن بۆ مەبەستی خۆیان بەکاری بهێنن. بەڵام ئەم مەکینەیە خۆی لە خۆیدا شتێک بوو، مەرجی خۆی هەبوو، بەرژەوەندی خۆی هەبوو.

لینین فریا نەکەوت هێندە بژی تۆڕینێکی سەرلەبەر دەربارەی بیرۆکراتاندن داڕێژێ. پاش مردنی خۆی، لە ماوەی ڕژێمی ستالیندا، بیرۆکراتی تەواو گەشەی کرد.

مارکسایەتیی شۆڕشگێڕی سەر بە ڕێبازی لینین لە ١٩١٧ لە ڕووسیا شۆڕشی هەڵگیرسان و سەرکەوت و ڕێک پاش ئەوەش پەرەی سەند و بووە بزووتنەوەیەک سەرانسەری جیهانی گرتەوە، بەڵام یەکەم کژی دروێنەی سۆسیال دیمۆکراتی بژارخواز کەوتە سالانی ١٩٢٠ . ئەگەرچی پێش ئەو دەمەش پارتە سۆسیال دیمۆکراتەکان، لە چەندین لا بۆ ماوەی کورت حکوومەتیان گێڕا، بەڵام لە ڕۆژگاری ژاکان depression ـەکەی دەوروبەری ١٩٣٠دا، بۆ یەکەم جار سۆسیال دیمۆکرات بووە یەکێک لە بەدیلە سیاسییە گەورەکان. بەدیلی گەورەی دووەم کە لە سەختانگی داتەپانی بۆرسە و نەمانی بازاڕ و بڵاوبوونەوەی بێکاریدا سەری هەڵدا، فاشیزم و نازیزم بوون. بەدیلی سێیەم کۆمیونیزم بوو – گەرچی لەو دەمانەدا لە هیچ جێیەک دەسەڵاتی نەگرتە دەست.

لە ڕاستیشدا بەرنامەی سەختانگرەوێنی سۆسیال دیمۆکرات لە چەند خاڵێکی گرنگدا هاوڕا بوو لەگەڵ New Deal ی پەیڕەوی لیبرالیزمی جڤاکیی نێو کۆدەوڵەتی ئەمەریکای زەمانی فرانکلین د. ڕۆزفیلت Franklin D. Roosevelt. هێڵە سەرەکییەکان یەک بوون: لە ماوەیەکدا گەر هێزی کڕین لە کۆمەڵگەدا لاواز بوو، دەبێ دەوڵەت، لە ڕێی پارە و کار تەرخان کردنەوە ئەم هێزی کڕینە لای خەڵک بەهێز بکات. ڕاستە بەو کارە خەرجیی دەوڵەت لە داهاتی زیاتر دەبێ بەڵام دەرمانێکی باشە، چونکە هەر ئەوەندەی شتومەک و خزمەتگوزاری بازاڕیان گەرم بوو چەرخی بەرهەم هێنان دەکەوێتەوە گەڕ و داهاتی دەوڵەتیی پێ زیاد دەبێ.

ئەم سیاسەتی سەختانگە ئەنجامی دیکەشی بەدەمەوەیە: بەر لە هەر شتێک، دەزگەکانی دەوڵەت و کۆمیون ("دەزگەی ڕەسمی") هەم بە بایەخ و هەم بە ژمارەش، گەورە دەبن، هەم دەستیان لە ڕشتەی کۆمەڵایەتیدا زیاتر دەڕوا و هەم ژمارەی دامەزراوانیان پتر دەبێ. ئەمەش نە بە لای سۆسیال دیمۆکراتەکانەوە و نە بە لای لایەنگرانی New Deal ی کۆدەوڵەتی ئەمەریکاوە، مەترسییەکی ڕاستەکی بوو. چونکە لە بژارەتیدا خاڵێکی سەرەکی هەبوو دەیگوت، دەوڵەت دەبێ لە ناوەوە داگیر بکرێت و وردە وردە بگۆڕدرێت و بکرێت بە

ئامرازێک بە دەست کرێکار و «بۆرەخەڵک» ـەوە. بە بۆچوونی بێرنشتاین، لە ڕشتەیەکدا مافی دەنگ دانی گشتی و وەکیەکی تێدابێ، پەرلەمان دەبێتە ئەو پلاتفۆرمەی کۆمەڵگەی لێوە دەگۆڕدرێت. بە پێی ئەم بۆچوونە نوێیە، دەوڵەتیش لە ڕێی خەریکبوونەوە بە سەروکاری کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە، دەگۆڕدرێت و چیدی نابێتە ئەو ئامرازەی دەستی چینی بۆرژوا.

لەگەڵ ئەوەشدا، خودی ئەو سیاسەتی سەختانگە یەکجار دوور بوو لە نەریتی بژارخوازانەوە. ئەو سیاسەتە، لە مەسەلەی چۆنیەتی زاڵ بوون بەسەر سەختانگی ئابووریدا، بابەتێکی نوێ بوو - چەند لە نۆڕینی نەریتیی مارکسییەوە دوور بوو هێندەش لە بۆچوونی لیبەڕالی کلاسیکەوە دوور بوو. بە نۆڕینی لیبەڕالیزمی کلاسیک - کە بە تایبەتی لە نێو ئابووریناسانی بیستەکان و سەرەتای سییەکاندا باو بوو - دەوڵەت بە پاشەکەوت کردن دەیتوانی چارەی سەختانگ بکات. ئەو سەختانگە بووە هۆی ئەوەی سەرمایەداران دەست بە سەرمایەکانیانەوە بگرن، واتە پارەیان کۆدەکردەوە لە جیاتی ئەوەی (استثمار) بکەن. ئەوجا بێکاریش لە ناخدا، بە بۆچوونی لیبەڕالەکان، دەیکردەوە ئەوەی کرێکاران دەست بە هێزی کارەوە بگرن، چونکە مووچەیەکی ئەوتۆ بەرانبەر کارەکەیان وەرناگرن. کەواتە ئەوانیش بە ئەندازەی سەرمایەداران ئازاد بوون! - دەوڵەت دەبا ڕێگە بۆ پاشەکەوت کردنێکی گشتی خۆش بکات و بەوەش پارە دەکەوێتە ناوانەوە. ئەم پارەیە ئارەزووی (استثمار) لای سەرمایەداران زیندوو دەکاتەوە و مووچەی کار زیاد دەکات و بەو جۆرە سەختانگ دەشکێ.

سیاسەتی سەختانگی مارکسییانە بنەمای لە دیمانەی سەختانگی مارکسدا هەبوو، زووتر بەگشتی لای شۆڕشگێڕان و بژارخوازانیش پەسەند بوو، لە سەختانگی سییەکاندا لە لایەن پارتە کۆمیونیستەکانەوە دڵگەرمانە پەیڕەوی دەکرا. ئەم بۆچوونە دەیگوت، لە ڕشتەی سەرمایەداریدا سەختانگ ماوەماوە سەر هەڵدەدات و هەتا بێت سەختتریش دەبێت. سەختانگ دەرفەتێکە بۆ توند کردنەوەی خەباتی چینایەتی، کرێکار و پارتی کرێکاران دەبێ هەوڵ بدەن ئەوەی بۆیان دەلوێ بەدەستی بێنن و خۆ پتەوتر بکەن.

بەڵام ئەو بۆچوونە نوێیەی سۆسیال دیمۆکرات - و تارادەیەکیش هی پەیڕەوانی لیبەڕالیزمی جڤاکی - هیچ ڕیشەیەکی لە نەریتی مارکسیدا نەبوو. لە ڕاستیشدا لێرەدا بوو پلەی مارکسایەتی لە نێو سۆسیال دیمۆکراتدا لەپڕ داکەوت. ئیدی نەدەکرا باس لە بژارەتیش بکرێ، چونکە لەو مارکسایەتییەی بژار دەکرا تەنیا بەرماوەیەک مایەوە. لە چلەکان و پەنجاکاندا، هەموو ئاماژەیەک بۆ مارکس و مارکسایەتی، لە نێو بەرنامەی زۆربەی پارتە سۆسیال دیمۆکراتەکاندا لابران.

جۆن مایناردی کەینز John Maynard Keynes (١٨٨٣-١٩٤٦) ئابووریناسی لیبەڕالی ئینگلیز بوو کە ئەو سیاسەتی سەختانگەی سۆسیال دیمۆکراتی لە شێوازێکی زانستانەدا دارشت. شاکارەکەی کەینەز، General theory (١٩٣٦) مامەڵەتێکی توندە بەرانبەر بۆچوونی کلاسیکی لیبەڕال کە دەیگوت سەختانگ بە پاشەکەوتی کەسەکی و ڕەسمی لە برسا دەمرێ. کەینز دەیگوت دوو جۆر پارە لە کۆمەڵگەدا هەیە: یەکەم پارەی بەرهەمهێنە، ئەوەی کار و هێزی کڕین دەبەخشێ، دووەم پارەیەکە لە بەرهەم هێنان دابڕاوە، لە قاسەی باج و حیسابی بانکەکاندا هەڵگیراوە. گەر سەرمایەداران پاشەکەوت بکەن بە هیچ جۆرێک سوودی بەرهەم هێنانی تێدا نابێ. لەبەر ئەوە ئەرکی دەوڵەت ئەوەیە پارەی بەرهەمهێن لە کۆمەڵگەدا زیاد بکات. بەو کارە تەنانەت پاشەکەوتیش هێندە خێری نابێ. کەینز بەرپەچی ئەو بۆچوونەش دەداتەوە کە دەڵێ بێکاری جۆرە پاشەکەوتێکی خۆویستانەی کرێکارانە لە هێزی کار. بێکاران دەیانەوێ کار بکەن بەڵام کۆسپی ڕاستەکی هەیە لەبەردەم کارکردنیاندا، ئەویش نەبوونی سەرمایەی بەرهەمهێنە.

دیمانەکەی کەینز و ئەو سیاسەتە ئابوورییەی دیمانەکە بە چاکی دەزانی، ماوەیەکی درێژخایەن بە نموونەیەک دادەنرا لەوەی دیمانەیەکی کۆمەڵایەتی چۆن توانیویەتی بە چوستی ململانێی ئادیۆلۆگیانەی نەریتی دادڕێ، ململانێکەش لێرەدا لە نێوان مارکسایەتی و لیبەڕالیزمی کلاسیکدا بوو. بە کورتی ئەم سیاسەتە دەیگوت دەوڵەت دەبێ لە داهاتی خۆی زیاتر سەرف بکات بۆ ئەوەی بەسەر سەختانگی ئابووری کۆمەڵایەتیدا زاڵ بێت. ئەو دەمەی بازاڕ دیسان گەرم دەبێتەوە، هێزی کار برەو پەیدا دەکاتەوە، گەڕان بەدوای شتومەکدا دەگاتە ئەوەی مووچە و نرخی شتومەک تەواو بەرز بێتەوە، ئەو دەمە پاشەکەوتی ڕەسمی دەبێتەوە بە کارێکی ژیرانە.

کەینزایەتی keynesianism بەو سیاسەتە کۆمەڵایەتییەشەوە گرێ درا کە گرنگترین هۆکار بوو بۆ پەیدا بوونی چەمکی ***دەوڵەتی خۆشگوزەرانی*** *welfare state* ئەمیشیان بەگشتی گەشە کردنی دەزگەی ڕەسمی دەدروستاند.

لە دواسالانی شێستەکاندا ئەوجا کەینزایەتی، لەو دەوڵەتانەی تێیدا برەوی هەبوو، بە جیددی کەوتە بەر گومان. با ئەم باسە بمێنێ بۆ بەشی داهاتوو. جارێ ڕووبەری نیگامان، ڕووەو چین و ماو زیدۆنگ، فرەوان دەکەین.

### ٣- ماو زیدۆنگ

دەربارەی کۆمیونیزمی چینی و دەربارەی ماو زیدۆنگ Mao Zedong (١٨٩٣-١٩٧٦) بەرهەمێکی زۆر و پەرسێن هەیە. باسی سەرەکی لەو بەرهەمانەدا لەوە دەگەڕێ ئایە چ جۆرە مارکسایەتییەک لە چیندا گەشەی کردووە. ئەو بەرهەمانە سەرسەختانە بە دوای ئەوەدا گەڕاون ئایە ماو و لایەنگرانی ماو تا چ ڕادەیەک شوێنپێی بیریارانی ئەورووپی وەک مارکس و ئەنگیلز و لینینیان هەلگرتوتەوە و تا چ ڕادەیەک تاوی نەریتی هەزاران ساڵەی چینیان لەسەرە. پرسیاری: مارکسایەتی کە دەگاتە چین چی بەسەر دێ؟ پرسیارێکی دیکەی گرنگتر و پتر هەڵکەوتەکی شاردۆتەوە: چین کاتێ مارکسایەتی دەیگاتێ چی بەسەر دێ؟

لە باسێکی سەرانسەری وەهادا دەربارەی شابیرەکانی ماو، بەپێویستی نازانم هەوڵ بدەم بە وردی جێگەی ئەو بیرانە لە ئاست نەریتی ئەورووپاییدا دەست نیشان بکەم. لەگەڵ ئەوەشدا چەند پێوەندییەکی ساکار هەیە، دەبێ باس کرێن: ماو لە زەمانێکی درەنگتردا ژیا و ئەوەش ئەزموونێکی دیکە و نوێی داوەتێ. دیمەنی بەرچاوی ماو جیاواز بوو: مارکس دیمانەکەی خۆی لە لەندەنی پێتەختەی سەرمایەدارەتیی ئەو دەمە داڕشت، لینین لە ڕووسیای لاوازترین قەڵای سەرمایەدارەتیی ئەو ڕۆژگارەدا دەستی بە خەبات کرد و بەئەنجامیشی گەیاند، بەڵام ماو هەموو شارەزاییەکی خۆی لە ئەنجامە هەرە دوورەکانەوە هێنا. ماو سوودی لە ئەزموونەکانی شۆڕشگێڕیی ڕووسیا وەرگرتبوو - تەنانەت ئەزموونە تاڵەکانیش -، سەرکەوتنی بەحاڵی بۆلشەڤیک، شەڕی ناوخۆی پاش سەرکەوتنی شۆڕش و ئەوجا پەلاماردانی دەوڵەتانی دەرەوە. شۆڕشی چینی ١٩٤٩، لە پاش خەباتێکی دەیان ساڵەی دژ بە دوژمنی ناوخۆ و دەرەوە، هاتە کایەوە. کاتێکیش شۆڕش دەستی پێ کرد دوژمنەکانی شۆڕش خەریکە بڵێم لەناوچووبوون.

ئەم خاڵە گرنگ و ساکارنە و خاڵی دیکەی لەم بابەتە زیاتر مارکسایەتیی ماو-مان بۆ ڕوون دەکەنەوە وەک لەو بارە تایبەتییەی کە ماو بە زمانی چینی بیروڕای خۆی دەردەبڕێ و لەوەی چەندین شاچەمکی نێو مارکسایەتی، لە نەریتی تەمەندرێژی فەلسەفیی چیندا، بەرانبەری گشتییان هەیە بەڵام ڕێک وەک یەک نین. بێگومان ئەو زمان و ئەو نەریتە کاریان لە فیکری ماو کردووە، پتر کاریان لەوە کردووە ماو چۆن دیمانە سیاسییەکەی خۆی دەردەبڕێ نەک چەمکی وەک دیالەکتیک و دژوەستان چۆن بەکار دەهێنێ. لە نەریتی ئەورووپاییدا وا باوە بیریار ناوەڕۆکی دیمانەکەی خۆی لە شێوەی زانستنامەدا داڕێژێ. ئەریستۆ وەهای کردووە، توماسی ئەکینۆ، لۆک، ڕوسۆ، هێگل وەهایان کردووە. مارکس،

ئەنگیلز و لینین وەهایان کردووە. زمانی مارکس لە ژێر باری ڕێسای زانستنامەی ئەڵمانیدا، چەماوەتەوە.

ماو چەند بەرهەمێکی نووسیوەتەوە، تارادەیەک هاوشانی زانستنامە ئەوروپاییەکانن، بۆ نموونە *پراکتیک* و *ناکۆکی* (هەردوو بەرهەمەکە ساڵی ۱۹۳۷ نووسراونەتەوە). بەڵام ماو و کۆمیونیستانی چین بەگشتی بیروڕای گرنگی خۆیان بە شێوەیەکی وەها دەردەبڕن، جاروبار بە لای ئەوروپاییەوە یەکنەواز ڕادەنوێنن، زۆر جاریش بە داڕشتنێکی شاعیرانە دێنە بەر چاو. شۆڕشگێڕان دەبێ «وەک ماسیی ناو ئاو» لە ناو خەڵکدا هەڵسوکەوت بکەن. جووتکردنی نەریت و نوێکاری، کشتوکاڵ و پیشەسازی، پیشەسازیی بچووک و پیشەسازیی گەورە، چینی و ڕۆژاوایی، پێی دەگوترێ «ڕۆیشتن بە دوو پێ». کاتێک مارکس و ئەنگیلز و لینین لەو بیرۆکە نێوەندەکییەی مارکسایەتی دەدوێن کە دەڵێت شۆڕش لە خۆوە پەیدا نابێ، چەمکی وەک «ڕێکەوت و ناچارەکی» و «ئازادی و پەیڕەوی کردنی دەستوور»... هتد بەکار دەهێنن. ماو ئەو بیرۆکەیە بەم جۆرە باس دەکات:

«لە گوتەی "بەم زووانە ڕووباری شۆڕشگێڕی هەڵدەستێت"، دەربڕینی "بەم زووانە" چۆن لێک بدەینەوە؟... مارکسییەکان فاڵگرەوە نین. مارکسییەکان بۆیان هەیە و دەشتوانن تەنیا شارێبازە گشتییەکانی فراژووتنی گۆڕانکاریی دوارۆژ دیاری بکەن. نابێ و ناشتوانن بە شێوازێکی میکانیکی ڕۆژ و سەعات دیاری بکەن. کاتێک من دەڵێم بەم زووانە ڕووباری شۆڕشگێڕی لە چین هەڵدەستێ، بە هیچ جۆرێک مەبەستم لەو جۆرە گوتەیە نییە کە جاروبار دەگوترێ "لەوانەیە ڕوو بدات"، مەبەستم لە شتێکی خەیاڵی و دوورەدەست، شتێکی لە ڕووی کارەکییەوە بێنرخ نییە. بەڵکوو وەک کەشتیی دووری نێو زەریایە، لە دوورەوە تەنیا بەرزەبەیاخی دیارە. وەک خۆرەتاوی بەیانی ڕۆژهەڵاتە، تیشکی زێڕینی لە چیای بڵندەوە دیارە. وەک زارۆی نێو منداڵدانی دایکە، بەردەوام بزێوە و بەم زووانە دەزێ».

ماو ئەمەی ساڵی ۱۹۳۰، لە پەخشانێکدا نووسیوە بە ناوی: ***یەک پرۆسکە گڕ لە دەشتێک بەر دەدات.***

پارتی کۆمیونیستی چین ساڵی ۱۹۲۱ دامەزرا. دە ساڵ لەوەو پێش یەکەم شۆڕش لە چیندا هەڵگیرسا و حوکومڕانی قەیسەرایەتی ڕما. چوار ساڵ بوو بۆلشەڤیکی ڕووس شۆڕشیان کردبوو. پارتی کۆمیونیستی چین چووە سازمانی نێونەتەوەیی سێیەم، ***کۆمینتێرن*** ی کۆمیونیستانە. لەوێدا مەسەلەی تاکتیک و ستراتیژی پارتی کۆمیونیستی چین، لەو چینە نوێ و ئاژاوڵەدا، هەر زوو بووە یەکێک لەو پرسە گەورانەی ململانێی لەسەر

دەکرا. ئەو دەمە هێشتا بۆچوونێکی گشتی هەبوو دەیگوت شۆڕشی پرۆلیتاریا دەبێ لە وەڵاتە پیشەساز و سەرمایەدارەکاندا سەربگرێ ئەوجا ڕێگەی ئازادی لە بەشەکانی دیکەی جیهان ئاوالە بکرێت. ئەوجا یەکیەتیی سۆڤیەتیش پێوەندیی خۆش بوو لەگەڵ پارتی نەتەوەیی چین گیۆمینداننگ Guomindang (کیۆمینتانگ Kuomintang). شامەبەستی گیۆمیندانگ ئەوە بوو چین بکاتە یەکەیەکی نەتەوەیی بەکار. ئەو دەمە چین ئاژاوڵەیەکی ڕەها بوو: جەنەرالی سەرەڕۆ بە خۆ و بە لایەنگرانیانەوە لە سەرانسەری چیندا سەرگەرمی شەڕی درێوی ناوخۆ بوون، وەڵاتانی بیانیی سەرمایەداریش ئەوەی بۆیان بلوایە بۆ خۆیان گل دەدایەوە. لە ڕووی ئایدیۆلۆگییەوە گیۆمیندانگ یەکجار پەرت بوو. لەم سەری چەپەوە هەتا ئەو سەری ڕاست بیر و بۆچوونی تێدا بوو دەربارەی ئەوەی چۆن چین بکەنە نەتەوەیەکی هاوچەرخ. ئەندامانی پارتی کۆمیونیستی چین، لە سەرەتادا لە گیۆمیندانگیشدا ئەندام بوون و نوێنەرایەتی باڵی چەپیان دەکرد.

ستراتیژێکی یەکرەوانە لەوەدا هەبوو کە کۆمیونیست و هەموو سازمانی نێونەتەویی پشتگرییان لە گیۆمیندانگ دەکرد. پرۆلیتاریای پیشەسازی لە چین هێشتا یەکجار کەم بوو. زۆربەی هەرە زۆری گەل جووتیار بوون. پیشەسازییەکی ئەوتۆ تەنیا لە چەند شارێکی گەورەدا هەبوو کە تەواو لە ژێر دەستی سەرمایەی بیانیدا بوون. ئەگەر بسەلمێنرێ شۆڕشێکی سۆسیالیستانە دەبێ بە ڕێبەرایەتی پرۆلیتاریا بێت، ئەوا دەبێ بشسەلمێنرێ شۆڕشەکە چاوەڕێی بڵاوبوونەوەیەکی فرەوانی پیشەسازی بکات. ئەو بەرپەرچ دانەوەیەش کە دەڵێ ئەدی شۆڕش بۆ لە ڕووسیا بەرپا بوو، خۆ ڕووسیاش لە ڕووی پیشەسازییەوە تەواو دواکەوتوو بوو، بەرپەرچ دانەوەیەکی تێر و تەسەل نەبوو. ڕووسیا، هەر چۆنێک بێت، قۆناخێکی دووری لە پیشەسازیدا بڕیبوو. شۆڕشی ڕووسی لە شارەکاندا سەری هەڵدا و پاشان وردە وردە ترنجایە دەشت و دەر. نەرێتێکی مێژووکردی سافی لە شۆڕشی ١٧٨٩ی فرانسەوە بۆ مابۆوە، کە پێشانی دەدا شار مەڵبەندی خۆرسکی شۆڕشە. بەڵام شارەکانی چین نەدەشیا لە داهاتوویەکی نێزیکدا ببنە مەڵبەندێک بۆ شۆڕشی پرۆلیتاریا.

گیۆمیندانگ نەک کۆمیونیستان دەستپێشکەریان کرد و هاوکارییان پچڕاند. ساڵی ١٩٢٧ لە شەنگەهای، کوشتارێکی گەورە لە کۆمیونیست کرا. کۆمیونیستگەل کەوتنە مەترسییەوە. هەبوو دەیگوت هەرچۆنێک بێت هەر دەبێ هاوکارییەکە بەردەوام بێت، کۆمیونیستیش ڕۆژی خۆی دەبێ بەڵام ماویەتی. هەبوو دەیگوت کاتی ئەوە هاتووە شۆڕشێکی پرۆلیتاریای وەک ئەوەی ڕووسیا هەڵگیرسێت، دەبێ هەر چۆنێک بێت شارەکان ڕزگارکرێن.

ماو، لەو دەمەدا ناچارکرابوو دوور کەویتەوە بۆ هەریمی نشیمەنی خۆی و لەوێ، سالی ۱۹۲۷، بەرهەمێکی بە ناوی *راپۆرتێک دەربارەی لێکۆلینەوەیەک لەمەڕ بزووتنەوەی جووتیارانی هۆنان* نووسی، ئەم بەرهەمە پاشان بووە کاریگەرترین بەرهەمی ماو. کۆمیونیستەکان بێخەبەر نەبوون لەوەی بزووتنەوەیەکی سەیری جووتیاران لە دەشت و دەر، دژ بە دەرەبەگ و ستەمکاری دیکە، بەرپا بووە. بەلام رایان وابوو کە بزووتنەوەی جووتیاران لە پرۆسەی شۆڕشگێڕیدا نۆرەیەکی پاسیڤانەی هەیە، دەبێ لە پێشدا شار رزگار بکرێت و پاشان شۆڕش روو لە گوند بکات. لەبەر ئەوە گەر بۆرەخەلک لە گوندەکان سازمانی خۆیان دروست بکەن، کارێکی باشە بەلام پێویست نییە.

بابگەڕێینەوە بۆ نووسراوەکە. بۆچوونی سەرەکی تێیدا ئەوەیە لە ناوچەی هۆنان سازمانێکی دروست شۆڕشگێڕ و هۆشێکی شۆڕشگێڕانە خەریکە پەیدا دەبێ. ماو پشتی نەکردە ئەو بیرەی دەلێ پرۆلیتاریای پیشەسازی دەبێ ببنە نووکەرمی شۆڕش. بەلام جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە لە چیندا شۆڕش تەنیا بە یەکگرتنی هەموو ستەمدیدە و بەکۆیلەکراوان مومکین دەبێ. ئەوجا دەلێ شۆڕش دەبێ گوند بکاتە مەلبەند و دەراوی خۆی.

ماو دەلێ کۆمیونیستان دەبێ سەربەخۆ کار بکەن. دەبێ لە دەرەوەی گیۆمیندانگ، ئەرتەش و «بنگەی سوور» ی خۆیان هەبێ. هەلبەت ئەم بەرنامەیە لە لایەن گیۆمیندانگەوە بە توندی بەربەرەکانێ کرا. لەشکری گیۆمیندانگ بەردەوام و درندانە پەلاماری ئەرتەش و بنگەکانی کۆمیونیستەکانیان دەدا. سالی ۱۹۳٤، کۆمیونیستەکان بە رێبەرایەتی ماو، ناچار کران بنگەی سەرەکی خۆیان لە باشووری رۆژاوای چین چۆل بکەن و رەوێکی دووری "هەزاران کیلۆمەتر" بکەن. ئەوانەی لەو شەکەتییە رزگاریان بوو و گەیشتنە یانان Yanan (یونان Yunan) لە باکووری چین، بنگەی نوێیان دامەزراند.

ئەوجا «رزگار کردنی شار لە گوندەوە» لەوە تێپەڕی تەنیا بەرنامە بێت و بووە تاکە رێگەی ئاواڵە. لە ماوەی شەڕی داگیرکەرانی ژاپانیدا (۱۹۳٤-۱۹٤٥)، کۆمیونیستەکان داگیرکەری بیانییان بە دوژمنی سەرەکی دەزانی و هەر لەو ماوەی شەڕەدا بە ناو گوندەکانی چیندا بلاوبوونەوە. پاش شکانی ژاپان، سەرە هاتە سەر گیۆمیندانگی دوژمنی ناوخۆ. لە دەمەو کۆتابوونی سالانی چلەکاندا، شارەکانیش کەوتنە ژێر دەستی ئەرتەشی سوورەوە و سالی ۱۹٤۹ کۆماری گەلێری چین مێژووی خۆی دەست پێ کرد.

رێگەی دەسەلات گرتنە دەست لای چینییەکان تەواو جیاواز بوو لەوەی لای رووسەکان. لەبەر ئەوە لەوانەیە سەیر بێت کە چینییەکان پاش شۆڕش لە زۆر رووەوە هەولیان دەدا

لاسایی ئەزموونە سی ساڵ بەتەمەنترەکەی رووس بکەن. ئامانجی یەکەمی چینییەکان فراژووتنێکی ئابووری تیژڕەو و بەتەگبیر بوو. هەموو توانایەک دەبا یەک خرایە. دەزگەی فێرکاری و لێکۆڵینەوە خرانە ژێر رێبەرایەتی نێوەندەکییەوە.

هەڵبەتە یەکیەتیی سۆڤیەتیش نەک تەنیا بەهێزترین هاوپەیمان بوو بگرە گەورەترین بنگەی توانستی تەکنیک و ئابووریش بوو. پسپۆرەکانی رووس چالاکانە کاریان لە گەشە کردنی چیندا دەکرد. لە دووەم نیوەی پەنجاکاندا پێوەندیی نێوان چین و سۆڤیەتیش شل بۆوە و پاشان پچرا، ئەوجا چین کەوتە سەر رێیەک تەواو لەوەی سۆڤیەت جودا بوو.

لە چین هەڵمەتێکی گەورە درا بۆ خۆ تەیار کردن و خۆ کۆکردنەوە بە مەبەستی فراژووتنێکی ئابووریی تیژڕەو، ئەو هەڵمەتە ناو نرا هەڵمەتی مەزن. ڕاستە ئامانجی هەڵمەتەکە ئەو فراژووتنە بوو بەڵام دەستاوێژی هەڵمەتەکە شتێکی دیکە بوو. ڕاستە ئەوەی ناو نرابوو «هێڵی پانی ماو» لەمێژ بوو بانگەوازی بۆ دەکرا، بەڵام بۆ یەکەم جار لەو دەمەدا چین کەوتە ئەوەی پشت بکاتە نێوەندەکیەتی centralism ی چاو لە سۆڤیەت کردوو. هەوڵ دەدرا هەموو گەل خەریک بکرێ و سوود لە شارەزایی و ڕچەشکاندنی ناوچەیەکی وەربگیرێ.

ئەم هەڵمەتە مەزنە، لە رووی ئابوورییەوە تاڕادەیەک ژێرکەوتوو بوو، ژێرکەوتنەکەش نارەوایانە بەسەر نەهاتی هەژەندانەی چەند هاوینێکدا هێنرا. لە سەرەتاکانی شێستەکاندا، ئەو کەسانە هاتنە پێش کە پێیان وابوو سۆسیالیزم تەنیا بەوە دادەمەزرێ کە رێبەرایەتییەکی شارەزا و خوێندوو ئاپۆرەی خەڵک رێک بخات. بەڵام شۆڕشی فەرهەنگیی ساڵی ١٩٦٦ ئەم هەوڵدانەی کۆتا کرد. ڕاستە ئەو بیر و بۆچوونانەی لە پشت شۆڕشی فەرهەنگییەوە بوون ڕیشەیان لە نووسینەکانی ماو و کەسانی دیکەشدا هەبوو، بەڵام بۆ یەکەم جار لەم دەمەدا بوونە بیروڕایەکی سەردەست، ئەو بۆچوونەی لە هەمووان زیاتر نەک هەر دژ بە نرخاندنەکانی سەرمایەدارەتی بوو بەڵکوو دژ بە نرخاندنەکانی سۆڤیەتیش بوو دەیگوت، خێرایی فراژووتنی ئابووری نابێتە پێوەری سەرەکیی پێشکەوتنی ئەو وەڵاتە. ئەندازەی بەرهەم هێنان نابێ ببێتە مەزنایەتییەکی بێلایەن. ئەگەر گۆڕجبوونی بەرهەم هێنان ببێتە هۆی فرەواندنی کەلەبەری نێوان چینەکان ئەوا گۆڕجییەکە ئەو نرخە ناهێنێ. ئەگەر زیادبوونی دەرفەتی مایەکی ببێتە هۆی کەمبوونەوەی دەرفەتی هاوکاری و هۆشیاریی سۆسیالیستانە و ڕچەشکێنیی لە نێو ئاپۆرەی خەڵکدا، ئەو دەمە دەرفەتی فراژووتنی سۆسیالیستانە بەرتەسک دەبێتەوە، بەرینتر نابێ.

بیرۆکەی شۆڕشی فەرهەنگی دەگەڕێتەوە بۆ گەرمە پرسێکی نەریتیی نێو مارکسایەتی کە دەربارەی پێوەندیی نێوان ژێرخان و ژوورخانە. ئەگەر فەرهەنگ بشۆڕشێنرێ و ئەگەر فەرهەنگ بە مانای ئاگای خەڵک بێت، واتە نۆڕینیان لە هەڵکەوت بە کۆمەڵگە و هاومرۆڤانەوە، ئەوا شۆڕشی فەرهەنگی مانای ئەوەیە شۆڕشی سیاسی بۆخۆی بەس نییە بۆ فراژووتنێکی سۆسیالیستانە. لەوەش دەترازێ: ئەم شۆڕشاندنی فەرهەنگە مانای ئەوەیە بەردەوام شۆڕشی تازە دەبێ هەبێ بۆ ئەوەی رێگەی گەڕانەوەی رووەو شێوازی بەرهەم هێنان و دنیای فیکری بەر لە سۆسیالیستی، بگیرێ. خەبات، هەر بەوەی شۆڕشی یەکەم سەرکەوتوو بوو، کۆتا نابێ و هەڕەشەش تەنیا لە دوژمنی دەرەکیی ناسۆسیالیستەوە نییە.

ئەم گوتانە وەها ڕادەنوێنن کە کۆمیونیزمی چینی پشتی کردبێتە بیرۆکەی ژێرخان، واتە ئەوەی دەڵێ بەرهەم هێنانی مایەکی پلەیەکی تایبەتی هەیە. بابزانین ئەم باسە چۆنە.

بە نۆڕینی چەندین خاوەن ڕای ڕۆژاوایی، ماو هەر زوو لە ***ڕاپۆرتێک دەربارەی لێکۆڵینەوەیەک لەسەر بزووتنەوەی جووتیارانی هونان*** دا مامەڵەتێک لەگەڵ شابیرەکانی مارکسایەتیدا دەکات. لە گوتارەکەدا، ماو بە هیچ جۆرێک باس لە بنەمای فیکری ناکات، بەڵکوو لێکۆڵینەوەیەکی شارەزاکی دەربارەی سازمان و ئەنجامەکانی بزووتنەوەی جووتیاران، پێشکەش دەکات.

ماو جەخت لەسەر لایەنی شارەزاکی دەکات: دەڵێ «بەرهەمێکی زۆرم کۆکردۆتەوە»، «زۆر شتی سەیرم بیست و دی» کە تا ئەو دەمە لێیان بێئاگا بووە. ئەوجا دەرئەنجامێکی کارەکیی دووررۆ پێشان دەدات:

«ئەم بزووتنەوەی جووتیارانە هێزێکی ڕاکێشانی مەزنی هەیە. لە ماوەیەکی کورتدا سەدان ملیۆن جووتیاری هەرێمەکانی ناوەند و باشوور و باکووری چین، وەک گەردەلوول، وەک باهۆز ڕادەپەڕن... هەموو پارتێکی شۆڕشگێڕ و هەموو هەڤاڵێکی شۆڕشگێڕ دەکەوێتە بەر ئەزموونی ئەم بزووتنەوەیە و بزووتنەوەکە بڕیاری پەسەندی و ناپەسەندییان دیاری دەکات. ئێمە سێ ڕێگەمان لەبەردەمدایە: بکەوینە پێشیان و ڕابەرایەتییان بکەین؟ یان دوایان کەوین و بکەوینە سەر و دەست بادان؟ یان ڕێیان پێ بگرین و دژیان ڕاوەستین؟».

بێگومان ئەم سێ پرسیارەی پاشکۆ سەر بە ڕەوانبێژین. وەرامەکە ئاشکرایە: پارتی کۆمیونیست دەبێ ڕێبەرایەتی بزووتنەوەی جووتیاران بکات. پارتی کۆمیونیست نابێ لە نێو بزووتنەوەکەدا بتوێتەوە، لە ڕووی چەندایەتییەوە لە نێویاندا ون بێت. پارتەکە دەبێت پێشەنگ بێت. بە نۆڕینی ماو ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی پارتەکە هەر دەبێ پرۆلیتاریای

پیشەسازی بێت، بەڵام ئەگەر کۆمیونیستەکان دەستبەرداری بزووتنەوەی جووتیاران بن یان بگاتە ئەوەی دژایەتیشیان بکەن ئەوا لەوانەیە بزووتنەوەکە لە ڕووی سیاسی و ئایدیۆلۆگییەوە ڕووگەیەک بگرێ دژ بە بەرژەوەندی ئەمان. کۆمیونیستانیش، لە لایەکی دیکەوە، گەر کارێکی وەها بکەن ئەوا دەرفەتی دەسەڵات گرتنە دەست هەتا ماوەیەکی دوور لە دەست خۆیان دەدەن، چونکە تەنیا بە پشتیوانی جووتیاران دەرفەتی وەهایان لێ نێزیکە.

جووتیاران سازمانی خۆیان هەبوو، لەو بوارە بەرتەسکەی خۆشیاندا چوستیش بوون. ئەم سازمانە بە شێوەیەکی بنەڕەتی هەلومەرجی نێو گوندەکانی گۆڕیبوو. توانیبووی لە ڕووی ئابووری و سیاسییەوە ململانێ لەگەڵ زەویداراندا بکات. ڕشتەی گەندەڵی دادپرسیی گوندەکانی ڕووخاندبوو. لە خەباتی دژ بە ورێنەی دینەکیدا مەودایەکی باشیان بڕیبوو، ئەو باوەڕانە کۆسپی گەورەیان لە ڕێی ڕزگار کردنی خەڵکی ستەمدیدە، پێکهێنابوو.

ماویش هەر وەک لینین، پێی وابوو بوونی سازمانێکی چوست مەرجێکی گرنگە لە فراژووتنی شۆڕشگێڕانەدا. سازمانی جووتیاران سازمانێکی ڕادیکال بوو، گەر ڕێبەرایەتییەکی دروستی هەبێ دەبێتە سازمانێکی شۆڕشگێڕ. بەڵام هەر لە خۆوە بە ئامانجی شۆڕشگێڕانە ناگات. مەرجی سەرەکی هەیە بۆ ئەوەی جووتیاری هەژار هەر نەبێ ڕێبازی ڕادیکالانەی خۆیان بپارێزن. مەرجی گرنگ ئەوەیە جووتیاری هەژار پلەیەکی سەردەستانەیان هەبێ: «یەکجار پێویستە جووتیاری هەژار ڕێبەراتی بکات، بەبێ ئەو جووتیارە هەژارانە شتێک نامێنێ ناوی شۆڕش بێت».

ماو لە نووسینێکی دیکەیدا وەها باس لە جووتیاری هەژار دەکات: «کرێجووتیارانن و زەویدار دەیان دۆشن». جووتیاری هەژار هەیە بەشێکی ئامرازەکانی بەکاری دەهێنێ هی خۆیەتی، هەیشە هیچی نییە، هەر دەبێ خۆی قەرزداری زەویداران بکات و هێزی کاری خۆی بفرۆشێ. هەر هەمووشیان بێزەوین، ئەم خاڵە کۆیان دەکاتەوە.

ماو ئەم جووتیارە هەژارانە دەکاتە چینێکی تایبەتی و ناویان دەنێ نیمچە پرۆلیتاریا. ئەم چینە ئەوانەشی دەگرتەوە کە بەشێکی ئەو زەوییەی کاریان تێدا دەکرد موڵکی خۆیان بوو، بەڵام هەر ناچار بوون بە کرێ لای جووتیاری گەورە کار بکەن، جگە لەوانیش وردە سەنعەتکار و وردە فرۆشیاری گەڕۆک و شاگردانی بازاڕیشی دەگرتەوە. بەڵام پرۆلیتاریای دروست تەنیا پرۆلیتاریای پیشەسازیی هاوچەرخ بوون.

دیاره چەمکی چین لە لای ماو ڕێک وەک ئەوەی لای مارکس نییە. چین لای مارکس پەیوەستی شێوازی هەمەجۆری بەرهەم هێنانە: پرۆلیتاریا و سەرمایەدار گرێدراوی سەرمایەدارەتین. وردە سەنعەتکار گرێدراوی فیوداڵەتییە. لە کۆمەڵگەی ڕاستەکی دامەزراودا، ئەو چینانە شان بە شانی یەک بوونیان هەیە، بەڵام لە شیکاریی ئەبستراکتی چینایەتیدا پێوەندییان بە یەکەوە نییە، هەر یەکە پەیوەستی شێوازی بەرهەم هێنانی خۆیەتی. چەمکی چینایەتیی ماو ڕاستەوخۆ لە کۆمەڵگەی دامەزراودا دەخرێتە گەڕ: سنووری چینایەتی وەک ڕاستەهێڵ بەسەر شار و گونددا، بەسەر سەرمایەدارەتی و فیوداڵەتیدا دەکشێ. نیمچە پرۆلیتاریا، لە کاری کرێدا بەرژەوەندیان یەکە.

کەواتە چەمکی چینایەتیی ماو تەواو ساکارترە و بە ڕادەیەکی ئەوتۆش گرێدراوی شیکاریی ئابووری نییە. ئەم دوو لایەنە، لای مارکس، ڕووکارێکی لە یەک دانەبڕاویان هەیە. لای ماو ڕووکاری کۆمەڵایەتی بەهێزترە. دابەشبوونی چینایەتی لە کۆمەڵگەدا ڕەنگدانەوەی هەرەمی کۆمەڵایەتییە، بەرز و نزم، فەرماندەر و فەرمانبەر. ئەم هەرەمەش تەنیا بە پلە و پایەی گرووپەکان لە ڕشتەی بەرهەم هێنانی مایەکیدا، دیاری ناکرێت، بەڵکوو چەندین هەلومەرجی سیاسی و دەستووریش کاری تێ دەکەن، تەنانەت ڕا و بۆچوون دەربارەی ئەوەی فلانە کار پلەی لە کۆمەڵگەدا بەرزە یان نزمە، کار دەکاتە سەر ئەو هەرەمە کۆمەڵایەتییە.

بەوەش چەمکی چین لای ماو، لە ڕووی ئایدیۆلۆگییەوە، نرخێکی بنەڕەتی هەیە. هەرگیز لە مارکسایەتیدا، هۆشیاریی چینایەتی، بە سانایی گرێ نەدراوە بەوەی مرۆڤ سەر بە چ چینێکە، بەڵام لای ماو هۆشیاریی چینایەتی بەشێکی گرنگە لەوەی مرۆڤ سەر بە چ چینێکە. مرۆڤ کاتێک پێوەندی چینێکە بە کردار و بە فیکر لە بەرژەوەندی ئەو چینەدا بێت.

ئەم نۆڕینەی ماو لە چەمکی چین بە ڕوونترین شێوە لە باس کردنی ***گەل*** دا خۆی دەنوێنێ. ئەم چەمکی گەلە لای ماو و بەگشتیش لای کۆمیونیزمی چینی نۆرەیەکی یەکجار سەرەکی هەیە. گەل بریتییە لە بناری هەرەمی کۆمەڵایەتی. گەل، پلەیان لە ڕشتەی بەرهەم هێناندا هەرچییەک بێت، چەندین بەرژەوەندی هاوکۆ کۆیان دەکاتەوە. جگە لە بەرژەوەند، داب و نەرێت و شارەزایی و زانیاری کۆبۆوەی سەدان و هەزاران ساڵەش کۆیان دەکاتەوە. لای مارکس، پرۆلیتاریای شۆڕشگێڕ خۆی لە میراتی فەرهەنگی دابڕیوە، لای ماو، گەل بە پلەیەکی بەرز نەرێتدارە. لە سۆسیالیزمدا دەبێ ئەو فەرهەنگە بە زیندوویی بپارێزرێ – نەک وەک مارکس دەیگوت، زیندوو بکرێتەوە. بە نۆڕینی مارکسایەتیی چینی، جووت

کردنی کۆن و نوێ، تەکنیکی کۆن و نوێ، نەریتی کۆن و نوێ، وەک ئەوەیە مرۆڤ فێر بێت «لەسەر دوو پێ بڕوات». لەبەر ئەوە گەل لای ماو یەکەیەکی هەم کۆمەڵایەتی و هەم فەرهەنگییە. بە واتای یەکەمیان گەل دیاردەیەکی نێونەتەوەییە: گەل بریتییە لە ستەمدیدەی هەموو دنیا. بە واتای دووەمیان گەل پەیوەستی بازنەیەکی فەرهەنگیی سنووردارە. لە یەک کاتدا یەک گەل هەیە و فرە گەلیش هەیە. بەڵام لای مارکس تەنیا یەک پرۆلیتاریای پیشەسازیی نێونەتەوەیی هەیە.

بە نۆڕینی ماو، گەل هەرگیز بە هەموو دانیشتوانی وەڵاتەکە نایەتە ناسین. لە وەڵاتێکدا کە بە شۆڕشی پرۆلیتاریادا تێپەڕ بووبێ و دەستاوێژی بەرهەم هێنان تەواو یان بە ڕادەیەکی فرەوان لە دەست موڵکایەتیی کەسەکی دەرهێنرابێ، هێشتا هەر هەموو دانیشتوانی وەڵاتەکە نابنە بەشێک لە کۆڕی مەزنی گەل. خەباتی چینایەتی تەنانەت پاش شۆڕشیش هەر بەردەوام دەبێت. بەرماوەی سەرچینەکانی پێشوو هەر چاوەڕێی دەرفەتێکن پایەی بەرزی کۆنیان وەرگرنەوە. جگە لەوانیش: لە خودی فراژووتنەکەدا بەردەوام بناخە خۆش دەبێت بۆ دروست بوونی جیاوازیی نوێی چینایەتی و ناکۆکیی نوێی چینایەتی. هەموو کارێکی ڕێکخراو پێویستی بە تەگبیر و ڕێبەرایەتی هەیە، تەگبیر و ڕێبەرایەتیش لەوانەیە ببێتە هۆی دروست بوونی ڕێبەری پەرژیندراو کە لە پشت پەردەی دروشم و گوتەی سۆسیالیستانەوە دەسەڵات پەیدا دەکات و دەست دەخاتە کاری خەڵکەوە و لەسەر حیسابی خەڵکی دیکە سوودی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی خرکاتەوە. ماو دەڵێ ئەم پرۆسەیە، بەر لە شۆڕشی فەرهەنگی، لە چین تەواو کەوتبووە گەڕ، لەبەر ئەوە شۆڕشی فەرهەنگی بەر لە هەر شتێک خەباتێکی چینایەتییە دژ بە سەرچینی نوێی پەرەسێن لە نێو بەڕێوەبەرایەتی و بازارگێری و حیزبدا. لە داهاتووشدا بەردەوام شۆڕشی دیکەی فەرهەنگی پێویستە هەبێت.

بە نۆڕینی ماو و هاوبیرە نێزیکەکانی خۆی، یەکیەتیی سۆڤیەت لەمێژە چینێکی نوێی بۆرژوای تێدا هەڵکەوتووە، یەکیەتیی سۆڤیەت ڕووەو سۆسیالیزم ڕێ ناکات، ڕووەو سەرمایەدارەتی ڕێ دەکات (یەکیەتیی سۆڤیەت گەیشتۆتە پلەی سەرمایەدارەتیی دەوڵەت). بە بۆچوونی مارکسایەتیی سۆڤیەت ڕای وەها ناجۆرە و مایەی گاڵتەجاڕییە. کاتێک دەستاوێژی بەرهەم هێنان دەبێتە موڵکی گشت، ئیدی ئەو دەوڵەتە ڕێگەی گەڕانەوەی بەرەو سەرمایەدارەتی نییە، مەگەر بە دژەشۆڕشێکی سەرلەبەر.

هەڵبەتە ئەم بۆچوونەی سۆڤیەتییەکان لە مارکسایەتیی نەریتەکییەوە نێزیکتر بوو. بەڵام مارکسایەتیی سۆڤیەتی لە دیمانەکانی مارکس و ئەنگێلز و لێنین، لە خاڵێکی دیکەی

نێوەندەکیدا، دوورکەوتبۆوە: خاڵەکەش بریتییە لە خەباتی چینایەتی و دەوڵەت. بە باوەڕی پێشوو بێ، دەوڵەت هەتا ناکۆکیی چینایەتی لە ئارادا بێت بنگەیەکی سەپێنەرە، ئەرکی پۆلیسی و دادپرسی هەیە. بەم باوەڕە تازەیەی کە ساڵی ١٩٦١ لە کۆنگرەی ٢١ ـەمینی پارتی کۆمیونیستی سۆڤیەتدا جاڕی بۆ درا، دەوڵەت بە بنگە سەپێنەرەکانییەوە، لە ماوەی پەڕینەوەی کۆمەڵگە بەرەوە کۆمیونیزم، دەمێنێ و لە خزمەت هەموو گەلدا دەبێت. ئەم ڕایە تەنانەت گۆرباتچۆڤیش دەستی هەر پێوە گرتبوو. گەل *(نارۆدا naroda)* بریتی بوو لە هەموو دانیشتوانی وەڵاتەکە هەر لە بیرۆکرات و کارگێڕەوە هەتا پاکژکاری سەرجادە. گەل لە مارکسایەتیی چینیدا، *(ڕەنمین renmin)*، وەک باسمان کرد بریتی بوو لە بەشێکی دانیشتوان. هەتا ناکۆکیی ڕاستەکیی چینایەتی بمێنێ دەوڵەتیش هەر دەمێنێ.

لە فیکری ماودا ئادگارێک هەیە دەشێ بە گەشەپێدانێکی بوێرانەی دیمانەی ئیمپێریالیزمی لێنین دابنرێ: سەرمایەدارەتی چیدی مەسەلەیەک نییە تەنیا گرێدراوی وەڵاتە پیشەسازەکان بێت. سەرمایەدارەتی بۆ ئەوەی نەمرێ دەبێ بڵاوبێتەوە و هەموو دنیاش بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. سەرمایەدارەتی خەڵکی وەهاش دەخاتە ژێر دەستی خۆیەوە کە یەکجار دوورن لە ڕشتەی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری، جگە لەوەش پرۆلیتاریای ناوخۆش، بە زیاد کردنی داهات، چەک دەکات و دەیانکاتە «کرێکاری ئەریستۆکرات».

لەبەر ئەوە، بە ڕای لێنین، شۆڕش پەرۆشی هەموو ستەمدیدەکانی سەرمایەدارەتییە. بەڵام دەراوی شۆڕش هەر دەبێ نێوەندی سەرمایەدارەتی بێت – ڕووسیاش هەر چۆنێک بێت، هەر دەکەوێتە نێو دنیای سەرمایەدارەتییەوە.

ئالەم دوا خاڵەدایە، ماو لە لێنین تێدەپەڕێ. چین دەکەوێتە دەرەوەی هەموو شاهەرێمێکی ئابوورییەوە. بەڵام ڕێک لەو کەنارە سەرپەڕانەدا، چەوساندنەوە سەختترە و دەرفەتی کۆبوونەوەی شۆڕشگێڕانە مەزنترە. بەسەرهاتەکانی ژیان فێریان کردبوو کە چین دەبێ لە گوندەوە ڕزگار بکرێ. هەر بەو جۆرەش، ماو دەیگوت، دەبێ هەموو دنیا لە دەشت و دەری دەرەوەی پێتەختەکانی سەرمایەدارەتییەوە ڕزگار بکرێ. ئەم بۆچوونە کاری لە چەندین شۆڕشگێڕی جیهانی سێیەم کرد. سەرمایەدارەتیی کۆدەوڵەتی ئەمەریکا لە ماڵی خۆیدا ناشکێ بەڵام لە جەنگەڵستانی ڤیەتنامدا دەبەزێ. شۆڕشەکەی کاسترۆ لە کوبا نموونەیەکە لەم شۆڕشی دەشتی جیهانە. ماو بووە ئیلهامبەخشی خەباتی شۆڕشگێڕان لە ئەمەریکای باشوور و ئەفەریقا.

ئادگارێکی تایبەت بە کۆمیونیزمی ماو و چینی، ئەو ڕوانگە یەکجار بەرفرەوانەی زەمانەیە کە کاریان پێ دەکرد. بۆچوونی گەشبینیایەتیی پێشکەوتن، کە لە ئەورووپای سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەمدا پەرەی سەند، ڕوانگەیەکی زەمانەکی یەکجار بەرتەسکی هەبوو: زانستی ڕسکاو، ڕشتەی کۆمەڵایەتیی هۆشمەندانە، مرۆڤی باش، دەشیا لە ماوەیەکی کورتتر لە تەمەنی مرۆڤێک، بێتە دی. پاش شۆڕشی فرانسی، لە فیکری فراژووتنی سەدەی نۆزدەیەمدا، باس لە پرۆسەی پێشکەوتنی سەدەخایەن دەکرا. کاتێ ئەو گەشبینیایەتییە گەیشتە چین، تێکەڵ بە مێژوونۆڕیی نەریتی چین کرا. پێشکەوتن مەسەلەیەکە هەزاران ساڵ دەخایێنێت.

وێڕای ئەوەش ماو جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە هەموو بیر و بۆچوون و دیمانەیەک نرخیان تەنیا لە وەگەڕخستنی کارەکیی دەمودەستدا هەیە. گوزەرگەی کۆمەڵگەی بێچین ڕاستە بێسنوور درێژە، بەڵام خودی بیروڕای خەباتی چینایەتی و کۆمەڵگەی بێچین مانایان تەنیا لە چوارچێوەی ئەزموونی هەڵکەوتەکیدا هەیە. ماو زوو زوو هێرشی دەبردە سەر ئەو جۆرە مارکسایەتییەی هەوڵی دەدا هەموو باوەڕەکە لە چەند گریمانەیەکی ئەبستراکتی کاتبەدەردا کۆبکاتەوە. تەنانەت لەوەش سڵی نەکردەوە کە بۆچوونێکی ئەنگیلز ڕەت بکاتەوە دەربارەی سێ «دەستووری دیالەکتیکی» ی گشتگر، ئەم بۆچوونە لە مارکسایەتیی سۆڤیەتیدا پایەیەکی بەرزی هەبوو. هەموو دیمانەیەک دەبێ بە ئەزموونی کارەکی تاقیکرێتەوە و دەستکاری بکرێت، تەنیا سەرلەبەری گەل، بەو هەمەلایەنییەی هەیەتی، دەتوانێ ئەو ئەزموونانە جێبەجێ بکات. جیهانۆڕیی کلاسیکی چین دەیگوت هەموو زانیار و ژیری و تێگەیشتنێک لە سەرەوە دێت، لە قەیسەر و کارمەندانی قەیسەرەوە. ماو، بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونە دەڵێ، تەنیا گەلە داهێنەر و پێشخەری زانیار. بەڵام ئەم پێشخستنی زانیارە لەخۆوە هەڵناکشێ، ڕێبەرایەتی سیاسی و ئایدیۆلۆگی - واتە پارتی کۆمیونیست - بیروڕا و گریمانەی گشتی دەخەنە بەردەم ئەزموونی گەل. ئەوجا گەل دەبێ بڕیاری توند و تۆڵیی بڕیارەکان بدات و هەر گەلیشە بڕیار دەدات چ بۆچوونێک پێویستی بە گۆڕانکاری و چاک کردن هەیە.

کەواتە ئەرکی گەل هەر لە بەرهەم هێنانی مایەکیدا نییە بەڵکوو لە بەرهەم هێنانی فیکریشدایە. ئەو جودا کردنەوە تیژەی نێوان کاری دەست و کاری گیان، لای ماو مایەی دزاندنە. ئەم جودا کردنەوەیە بەردەوام هەڕەشەی دروست بوونی جیاوازیی چینایەتیی ڕاستەکی بەدەمەوەیە، لەبەر ئەوە دەبێ بەردەوام کارێکی وەها بکرێت زانستکار و مامۆستا، پزیشک و تەکنیکناس، لە بواری بەرهەم هێنانی مایەکیدا چالاک بن، هەروەها

هەموو کەسێک ئاشنایەتی هەبێت لەگەڵ ئەو زانیار و بۆچوونانەی سوودیان بۆ کارەکەی خۆی هەیە و بۆ بوونی کۆمەڵایەتیی خۆی.

زۆر جار گوتراوە، ئادگارێکی پیوریتانیزم puritanism لە ئایدیۆلۆگی ماودا هەیە. هەموو هەوڵدانێک دەبێ سەر بۆ ئامانجی هاوکۆ فروو بێنێ، هەموو خواستێکی تاکەکیی دەبێ کڕنوو بەرێ بۆ بەرژەوەند و خواستی کۆیەکی. بەڵام لە ڕاستیدا مرۆڤنۆڕیی ماو شتێکی ئەوتۆی هاوبەشی لەگەڵ پیوریتانیزمی دروستی ئینگلیزیی سەدەی حەڤدەیەمدا نییە. گەر لە نەرێتی ئەورووپیدا بۆ بۆچوونێکی وەها بگەڕێین بەراورد بکرێ بەوەی ماو، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ نۆڕینێکی ڕادیکالی سەدەی نۆزدەیەم، کە دەیگوت ئامانجی هەموو مرۆڤێک دەبێ خۆپێگەیاندنی هەمەلایەکی بێت و ئەم هەمەلایەکییە تەنیا بە کار کردن و بەتایبەتی بە کار کردنی کۆیەکی، پەیدا دەبێ. کەواتە چالاکی ڕەنگ لە مرۆڤدا دەداتەوە و تەنیا لە چالاکیدا مرۆڤ بە ئازادی خۆی دەگات. بەڵام ئەم ئازادییە بەدەست نایەت ئەگەر مرۆڤ کار نەکات، کار دەکاتەوە کاری ئازاد و بەدڵی خۆ و هەروەها کارێک کە لەگەڵ کاری خەڵکی دیکەدا ڕێک خرابێ و گونجابێ.

ماو دەڵێ ژیانی وەها تەنیا کار و قوربانی نییە. «"ڕەنج" دەبێتە "خەون" و "خەون" دەبێتە "ڕەنج". هەروەها وچان و هێز کۆکردنەوە پێوەندییەکی وەهای هەیە لەگەڵ خەباتی توند. ڕەنج و خەون، تێفکرین و پەلە کردن یەکەیەک پێک دێنن، وچان و هێز کۆکردنەوە و خەباتی توندیش یەکەیەک پێک دێنن».

شۆڕشی فەرهەنگی، پاش مردنی ماو ساڵی ١٩٧٦، کوژێنرایەوە. بیروڕاکانی شۆڕشەکە و «فیکری ماو زیدۆنگ» ی تا ئەو دەمە سەردەست، خرانە لاوە و ئەوانەی دەیانویست گەشە بەو میراتە بدەن، دران بە دادگە. خودی شۆڕشی فەرهەنگی، چ لە ناو چین و چ لە دەرەوەی چین، کەوتە بەر هەڵسەنگاندنەوەیەکی بنەڕەتی. ئەوەی چاودێران ڕۆژێ لە ڕۆژان بە چالاکی و نوێکارییان دادەنا، لە زۆر بواردا ئاشکرا بوو کە هیستیرایەکی گەلێر و ئارەزووکاری و دڕندەیی بوو.

ڕێبەرانی سیاسیی نوێی چین، بە سەرۆکایەتی دێنگ سیاوپینگ Deng Xiao-ping ی بەساڵداچوو، لە هەوڵی سەپاندنێکی خێرای پیشەسازی و چوست کردنەوە دان و تەنانەت ڕێگە بە موڵکایەتیی کەسەکیی بچووک، دەدەن.

لە دەمەو کۆتای ساڵانی هەشتادا، لەوە دەچوو چین ڕێگەیەکی وەک ئەوەی یەکیەتیی سۆڤیەت بگرێتە بەر. بزووتنەوەیەکی دیمۆکراتی، کە زۆربەی ئەندامانی بیرکار و خوێندکار بوون، هێزی پەیدا کرد. بەڵام ئەم فراژووتنە لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٩، لە

گۆڕەپانی ناوشاری پەکین بە کوشتارێکی دڕندانە کۆتا بوو. ئەمڕۆ چین تاکە زلهێزە کۆمیونیزمی لە بەرنامەدا بێت. هیچ نوێکارییەکی سیاسییش جێ دەستی دیار نییە.

لەوە دەچێ ماو زیدۆنگ لە مێژوودا ببێتە باسێکی لاوەکی. لەگەڵ ئەوەشدا فراژووتنی ئایدیۆلۆگی چین، لە پاش ساڵی ١٩٤٩ وە هێندە بە گۆڕانکاری ڕەنگین بوو، زەحمەتە پێشبینی لە داهاتوویەکی زۆر نێزیکیشی بکرێ.

هەر چۆنێک بێت ماو لە ساڵانی شێست و حەفتاکاندا ئیلهامبەخشێکی ئایدیۆلۆگیی گرنگ بوو نەک تەنیا لە وەڵاتەکەی خۆیدا بەڵکوو لە هەموو ئەوەی پێی دەگوترێ جیهانی سێیەم و تەنانەت لە نێو چەند کۆڕێکی، بە پلەی یەکەم بیرکارانی، ئەم جیهانە دەوڵەمەندەی «یەکەم» یش.

**١- پێشەکی**

ئەگەر لە کەتەلۆگی کتێبخانەی زانستگەی یۆتەبۆری ‹Göteborg یۆتەبۆری دووەم گەورەشاری سوێدە پاش ستۆکهۆلم› لە وشەی کۆنەوارەتی بگەڕێیت، تەنیا ناوی چل بەرهەمێک کەمتر تۆمار کراون (مەبەستم لەو کتێبانەیە کە پاش ساڵی ١٩٥٨ لەچاپ دراون). لە ژێر ناوی لیبەڕالیزمدا لە چل کتێبێک زیاتر هەیە، بەڵام ئەگەر لە سۆسیالیزم بگەڕێیت دەوروبەری ١٧٥٠ بەرهەم ڕیز کراوە.

لە کتێبخانەی هەر بنگەیەکی لێکۆڵینەوە و بیبلیۆگرافیایەکدا بگەڕێ ئەنجامەکەی هەر لەو بابەتە دەبێ. ئەو کتێبانەی لە ئایدیۆلۆگیی سیاسیی هاوچەرخ دەدوێن و باسی ڕێبازە هەمەجۆرەکانی سۆسیالیزم ناکەن، کەمینەن.

ئەمە چی دەگەیەنێت؟ وەرامی ئەم پرسیارە ئاسان نییە. هەڵبەتە ئەو ژمارانە شتێک دەڵێن دەربارەی ئایدیۆلۆگیی سیاسیی هاوچەرخ، هەم گرنگ و هەم چاو لێ پۆشراو. سۆسیالیزم لەچاو هاوچاوەکانیدا لێکدانەوەی زیاتر هەیە، تەنانەت لە وەڵاتانی وەهاشدا کە سۆسیالیزمیان تێیاندا یەکجار کزە، وەک کۆدەوڵەتی ئەمەریکا. وا باوە کە سۆسیالیزم بەرنامە و پلان و پەیمانی زیاترە لەوانەی دیکە، ئەمانەش دەبنە جێی ڕەخنە گرتن و داکۆکی لێ کردن. لەبەر ئەوەش مەیلی دووبەرەکی و ڕێچکە پەیدا کردن تێیدا بەهێزترە، ڕاڤە دانیان پتر و سەختتر دەبن.

ئەم خاڵە لایەکی دیکەشی هەیە دەبێ ڕەچاو بگیرێ: نوێنی لیبەڕاڵ و کۆنەوار زۆر جار خۆیان بە لیبەڕاڵ و کۆنەوار نانووسن بەڵکوو نەخت و پوخت بە خۆیان دەڵێن زانست.

دەبێ ئەو خاڵەی سەرەوەمان لە بیر بێت بۆ ئەوەی لەو بۆچوونە سەرەکییانە بگەین کە دەربارەی ئایدیۆلۆگییەکانی سەدەی بیستەمن – وەک ئەوەی باس لە ***مردنی ئایدیۆلۆگی*** دەکات، یان ئەوەی دەڵێ ئایدیۆلۆگیی سەدەی نۆزدەیەم لەم سەدەیەدا باویان نەماوە. ئەم بۆچوونانە بەردەوام لە لایەن لیبەڕاڵ و ئاڕادەیەکیش لە لایەن کۆنەوارانەوە جەختیان لەسەر کراوە. بەڵام لە نێو سۆسیالیستەکاندا باویان نییە (مەگەر لە نێو سۆسیالیستانی نێزیک سنووری لیبەڕالیزم). نوێنی لەو بابەتە، لەو دەمانەدا لیبەڕالیزم و کۆنەوارەتی برەویان هەبووە، بۆ نموونە ماوەی نێوان ١٩٤٥–١٩٦٥، سەرکەوتووانە جەختیان لەسەر کراوە. سۆسیالیستانی ڕێبازی جیاواز بۆچوونێکی تەواو دژ بەمەیان هەڵنا و دەیانگوت،

فراژووتنی ئایدیۆلۆگی - وەک ئەنجامێکی نیزیکی فراژووتنی ئابووری و کۆمەلایەتی - ڕووی لە ***جەمسەر گرتنە***. لەبەر ئەوە ئاشکرایە کە ***نۆرینی دژ بەیەک دەبنە هەلوێست گرتنی ئایدیۆلۆگی***. بۆچوونی یەکەم دەیگوت هەلوێست گرتنی ئایدیۆلۆگی لە ئارادا نییە (دەنا گریمانەی مردنی ئایدیۆلۆگی لەناو دەچێ)، بۆچوونی دووەم دەیگوت هەلوێست گرتنی ئایدیۆلۆگی دەبێ بێتە کایەوە (دەنا گریمانەی جەمسەر گرتن لەناو دەچێ). لە بەشێکی دیکەی ئەم باسەدا لە مردنی ئایدیۆلۆگی دەدوێین. بەلام باجارێ بگەڕێینەوە سەر باسی فراژووتنی لیبەڕالیزم و کۆنەوارەتی، بۆ ئەو دەمەی تێیدا لێیان جیابووینەوە، لای میلل و هێگل.

لێرەدا بەتایبەتی لە ***لیبەڕالیزمی جڤاکی*** *social liberalism* و ***کۆنەوارەتیی جڤاکی*** *social conservatism* دەدوێین. لە دوابەشی ئەم باسەدا لەو جۆرە نوێیانەی لیبەڕالیزم و کۆنەوارتی دەدوێین کە لەم چەند دەسالەی ڕابوردوودا بوونە بار. بەوەش فراژووتنێکی زەمانی دەکەوێتە بەرچاو: ماوەیەک لیبەڕالیزمی جڤاکی و کۆنەوارەتیی جڤاکی نۆرەیەکی سەرەکییان هەبوو، پاشان چەند دەسالێک نۆرینێکی تازەبابەت لە لایەن پێشەنگەکانی لیبەڕال و کۆنەواری هێمنکارەوە هەلنرا و دەیگوت زەمانی ئایدیۆلۆگی نەما، بەتایبەتی لە کۆمەلگەی سەرمایەداری لیبەڕالی پێشکەوتوودا. ئەوجا دیسان ئایدیۆلۆگیی کۆن بووژێنرانەوە، نوێلیبەڕالیزم neo liberalism ێکی تێکۆشەر و نوێکۆنەوارەتی neo conservatism ێکی تێکۆشەر هاتنە پێش و خێرا هەلکشان، بە تایبەتی لە ئاستی سیاسەتی پارتایەتی ڕەیگەن Ronald Reagan ی کۆدەولەتی ئەمەریکا و مارگەرێت تاتچەر Margaret Thatcher ی بەریتانیا، نوێنەری نموونەکی ئەم ڕێبازانەن. پاش هەلگەڕانەوەکانی ڕۆژهەلاتی ئەورووپا، سالی ١٩٨٩، ئەو ئایدیۆلۆگییانە بەلای لایەنگرانی خۆیان و خەلکی دیکەشەوە بە سەرکەوتووی مەیدان دانران. گریمانەی مردنی ئایدیۆلۆگی باوی نەما، چونکە هەر نەبێ دوو ئایدیۆلۆگیی نیزیک بە یەک ماونەتەوە. لە بری ئەوە باوەڕێکی دیکە برەوی پەیدا کرد، ئەمیان لە ***کۆتابوونی مێژوو*** دەدوا. ئەم دەربڕینە یەکەم جار لە لایەن هێگلەوە بەکار هێنرا و ئەمجارەیان بە ناوەڕۆکێکی تازە لە وتارێکدا - کە پاشان فرەواندرا و کرا بە کتێبێک - لە لایەن فرانسیس فوکویاما Francis Fukuyama ی ئەمریکییەوە هێنرایەوە پێش. بە نۆرینی فوکویاما، زۆرانبازیی نێوان فاشیزم و کۆمیونیزم و سەرمایەدارەتیی پەیوەست بە دیمۆکراتیی سیاسییەوە، خەسلەتی ئەم سەدەیە بوو. لە سەرەتادا فاشیزم شکێنرا، پاشان کۆمیونیزم مەیدانی چۆل کرد. تەنیا سەرمایەدارەتی و دیمۆکراتی، یەکگرتوو و بەهێز مانەوە. داهاتوو یەکگرتنێکی دیکەی وەها بەهێزی

بەدەمەوە نابێ. ڕژێمی سیاسی دەگۆڕدرێن، بار دەگۆڕدرێ - بەڵام گۆڕانکارییەکە هەر چییەک بێت، سەرمایەدارەتی و دیموکراتی هەر دەمێنن.

## ٢- لیبەڕالیزمی جڤاکی و کۆنەوارەتیی جڤاکی

لە لای جۆن ستیوەرت میلل John Stuart Mill تووشی زاراوی لیبەڕالیزمی جڤاکی هاتین. میلل بە باوکی ئەم ڕێبازە دادەنرێ، بەڵام چەندین دیمانەیاری ئینگلیزیش گەشەیان پێ داوە، وەک Thomas Hill Green (١٨٣٦-١٨٨٢) و Leonard T. Hobhouse (١٨٦٤-١٩٢٩). لێرەدا بە کورتی لە نۆرینی هیلل گرین دەدوێین، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە گشتیش باسێکی ئەو نەریتەی لیبەڕالیزمی جڤاکیش دەکەین کە هەتا ئەم دەمەش ڕەواجی هەیە.

لە بواری کۆنەوارەتیی جڤاکیدا، دیسان دەشێ لە ڕۆژگاری کۆنەوە ناوی چەند مامۆستایەک بێنین، بۆ نموونە فەیلەسووف و ئابووریناسی ئەڵمانی Lorenz von Stein (١٨١٥-١٨٩٠) و دەوڵەتگێڕ و نووسەری ئینگلیز Benjamin Disraeli (١٨٠٤-١٨٨١). من لێرەدا باسێکی ئەوتۆی بیری ئەمانە ناکەم - هەوراز و نشێوی کۆنەوارەتیی جڤاکی، لە زۆر ڕووەوە، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمەوە هەتا ئەم ڕۆژگارە جیاوازییەکی ڕەهایان بەسەردا نەهاتووە.

ئەم لاوشە هارکۆیەی «جڤاکی social»، کە چووەتە سەر شاوشەی «لیبەڕالیزم» و «کۆنەوارەتی» هەم وردەکاری و هەم سنوورێکیش دەدات بە شاوشەکە. لیبەڕالیزم، کە لە سەرەتاوە بێ ئەو لاوشەیە خۆی دەناساند، جەختی لەسەر ئازادی دەکرد، بەتایبەتی پیرۆزیی ئازادی لە هەموو بوارێکدا، هەم بواری ئابووری و کۆمەڵایەتی و هەم بواری سیاسی و ئایدیۆلۆگی. مرۆڤ دەبێ لە بەرهەم هێنان و کڕین و فرۆشتندا ئازاد بێ، بە ئازادی لە نێوان دەوڵەتان و پیشەکاندا ببزوێ، لە خۆڕوون کردنەوەدا بێسنوور ئازاد بێت، لە بڕوا هێنان یان نەهێنان بە هەر بارەڕێک ئازاد بێت، لە دەنگ دان و خۆ پاڵاوتندا بۆ ئەنجومەنە سیاسییە کارگێڕەکان ئازاد بێت. لیبەڕالیزم زادەی فراژووتنی سەرمایەدارەتی بوو کە بەرهەم هێنانی ئازاد و بازاڕی ئازاد و بازاڕی کاری ئازاد بنەماکانی بوون. لە هەمان کاتدا بە توندی پەیوەستی پەیدابوونی ڕۆژنامەگەری، کۆڕی گرتوبێژ و دەزگەی هەمەجۆری دانوستاندنی بیرکارانە بوو. لیبەڕالیزم پاش بڵاوبوونەوەی پیشەسازی و پاش شۆڕشی فرانسی، شێوەی چەسپاوی خۆی وەک ئایدیۆلۆگییەکی تایبەتی، گرت. بە هەمان

شێوه کۆنەوارەتی بەم مانا هاوچەرخەیەوە دەشێ بە بەرتەکێکی ئەو «جووت شۆڕش»ـە دابنرێت کە یەکیان شۆڕشی پیشەسازی بوو و ئەوەی دیکەش شۆڕشی فرانسی ۱۷۸۹ و ڕۆژگاری دوای شۆڕشەکە بوو (ناوی کۆنەوارەتی و لیبەڕالیزم لە سالآنی ۱۸۱۰ دا پەیدا بوون).

هەڵبەتە لیبەڕالیزمی جڤاکی و کۆنەوارەتیی جڤاکی بەرتەکی فراژووتنی پاش ئەو ماوەیە بوون. ئەنجامە کۆمەلآیەتییەکانی بلآوبوونەوەی پیشەسازی هەر زوو ئاشکرا بوون. پرۆلیتاریایەکی ئەندازە نادیار لە شارە پیشەسازەکاندا کۆبوونەوە. ژینگەی دەرەکیی پرۆلیتاریای پیشەسازی سەخت بوو. بلآوبوونەوەی پیشەسازی فراژووتنێکی هێنایە کایەوە، ئەنجامەکانی لەوە دەچوون بەربین بن. ئەم ئەنجامانە بوونە لایەنی سەرەکیی ئەوەی پێی دەڵێن *دۆزی جڤاکی* و هەر لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم و بەم لاوە بە گەرمی گوتوبێژی لەسەر دەکرا. دۆزی جڤاکی هەر ئەوە نەبوو خزمەتی تەندروستی و گوزەرانی کرێکاران بکات و لە خەمی لەش و گیانی ئەواندا بێت. بەڵکوو تەگەرە لەوەدا بوو کە لە نێو ئەم ئاپۆرەیەدا هێزێکی شۆڕشگێڕانە ئاشکرا بوو. نائارامییەکی سیاسی و جڤاکی سەری هەڵدا و گەلێ جاریش ڕووەو شۆڕش هەڵدەکشا. سۆسیالیزم و باوەڕی دیکەی شۆڕشگێڕانە لێی کۆدەبوونەوە.

لیبەڕالیزمی جڤاکی و کۆنەوارەتی جڤاکی هەوڵدانێک بوون بۆ چارەسەر کردنی ڕووکارە هەمەجۆرەکانی ئەم دۆزە جڤاکییە.

وەک باسمان کرد، میلل Mill دەیگوت فراژووتنی سیاسی دەبێ بخرێتە پێش فراژووتنی ئابوورییەوە، بە کورتی لیبەڕالیزمی سیاسی گرنگتر بوو لە لیبەڕالیزمی ئابووری، ئەگەر ئەم دووانە تووشی ناکۆکییەک ببووان دەبا ئەمەی دووەمیان سەر بۆ یەکەمیان فروو بێنێ. فراژووتنی ئازادییە سیاسییەکان، تەنانەت ئازادییەکی سیاسیی تەواو ڕسکاو بۆ چینی کرێکار، ئەگەرچی ماوەیەکی دەوێت – دەبێتە دەستەبەری فراژووتنێکی هاوئاهەنگی کۆمەلآیەتی. تەنانەت بەلای کۆنەوارەتیی جڤاکییەوە، پێشەمی هەر بۆ چارەسەر کردنێکی سیاسی بوو. وەک باس کرا، *دەوڵەت* لای کۆنەوارەتیی زوو بە دەستەبەری ڕشتەیەکی کۆمەلآیەتی باش دادەنرا. لەبەر ئەوە کۆنەوارەتیی جڤاکی دەڵێ دەستڕۆیی و ئەرکی دەوڵەت دەبێ فرەوانتر بێت. دەوڵەت دەبێ جڵەوی پیشەسازی بگرێتە دەست و نەیەڵێت کەس لە کۆمەڵگەدا لە برسا بمرێ و لە سەرما ڕەق بێتەوە، ناچار بێت ڕوو بکاتە گوزەرانێکی تاوانکارانە یان ڕەدووی بیروڕای وەها بکەوێت کە هەم دژ بە ڕشتەی چاکەیە و هەم دژ بە ئاکار و دینە.

باجاری باسێکی لیبەڕالیزمی جڤاکی بکەین و لە ئازادییەوە، کە شاچەمکی لیبەڕالیزمە، لێی نێزیک بینەوە.

لیبەڕالیزمی سەدەی نۆزدەیەم ئەو چەمکی ئازادییەی لە سەردەمی ڕۆشناکیدا سەری هەڵدا، کردە دەراوی نۆرینی خۆی. ئەم چەمکە نیشانەی یەکسانیی خستبووە نێوان ئازادی و مولکایەتیی کەسەکییەوە، بەڵام مولکایەتیی کەسەکی تەنیا شتومەکی نەدەگرتەوە، بەڵکوو لەش و گیان، بیر و بۆچوونی تاکەکەسیشی دەگرتەوە. لە سەدەی نۆزدەیەمدا، ئەم چەمکی ئازادی و مولکایەتییە خۆی پێ ڕانەگیرا. لەوە دەچوو لیبەڕالیزم نوێنەرایەتی دوو جۆر ئازادی بکات: ئازادیی ئابووری و ئازادیی سیاسی. لای میلل ئەم جۆرە ئازادییانە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە تاڕادەیەک سەربەخۆ پیشان دەدران. تەنانەت لە لیبەڕالیزمی درەنگتریشدا ئەم ئازادییانە جودا کرابوونەوە، بەڵام ئەمجارەیان وا باو بوو، کە ئازادیی ئابووری - بەتایبەتی مولکایەتیی کەسەکی - مەرجە بۆ ئازادیی سیاسی. واتە ڕشتەیەکی کەموزۆر سەرمایەدارانە مەرجە بۆ ئەم جۆرە دیمۆکراتییەی ڕۆژاوا.

بەڵام پێوەندیی گرنگ ئەوەیە کە مافی مولکایەتیی کەسەکی و مافی دەربڕینی بیروڕا و هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمان، بە دوو دیاردەی تەواو جیاواز دادەنران. ئەمەش تاڕادەیەک پێوەندیی هەیە بەوەی وشەی «ئازادی» مانایەکی مەیلەو نوێی وەرگرت تەنانەت لە نەریتی لیبەڕالیشدا. لە سەرلەبەری مێژووی بیری سیاسیی هاوچەرخدا، دوو چەمکی جیاوازی ئازادی هەیە: ئازادیی نایەتی و ئازادیی ئایەتی. ئازادیی نایەتی دەکاتەوە ئازادبوون لە گوشاری دەرەکی، لە دەستوور و فەرمان. ئازادیی ئایەتی دەکاتەوە بوونی دەرفەتی ڕاستەکی بۆ گەشە کردنی بەهرە و کارامەیی، ئەمیان داوای فەرمان و دەستووری هەمەجۆر دەکات.

هێگل و مارکس - وێڕای هەموو جیاوازییەکیان - هەردووکیان ئازادیی ئایەتی بەکار دەهێنن. بەڵام لیبەڕالیزمی زوو، بە گشتی وشەی «ئازادی» بە واتای نایەتی بەکار دەهێنێت. ئازادی دەکاتەوە نەبوونی گوشاری دەرەکی.

ئەمەش بۆچوونێکی تەواو لەبارە، گەر شوێنی لیبەڕالیزم ڕەچاو بگرین. لیبەڕالەکان خەباتیان دژ بە کۆمەڵگەی کۆنی ئیمتیازداران دەکرد و شائەرکی خۆیان لەوەدا دەبینی کە کۆسپ و تەگەرە بڕەوێننەوە لە ئاست دەرفەتی تاکەکەس کە خۆی بە تاکەکەس بنوێنێ، تاکەکەس بتوانێت خۆی دەوڵەمەند بکات، هێزی کاری خۆی بە ئازادی بفرۆشێت... هتد.

بەڵام هەر ئەوەندەی کۆمەڵگەی بۆرژوا دامەزرا، لیبەڕالیزمیش لە بەجێ گەیاندنی ئەو ئەرکەی بۆوە. ئەمجا دەبێ دژ بە چەپ و سۆسیالیزم ڕشتەکەی خۆی بپارێزێ. چیدی

نەدەلوا لە کۆمەڵگەی بورژوادا دەست بە چەمکی ئازادیی نایەتییەوە گیر بکات، هەر زووش میلل ڕاڕایی پێوە دیار بوو: لە ڕاستیدا دەبێ دەستوور و فەرمان هەبێ بۆ ئەوەی ببنە دەستەبەری ئازادیی تاکەکەس و هاوچاویی ئازاد. نوێنەرانی لیبەڕالیزمی پاش میلل هەنگاوی دیکەشیان نا. دەسەڵاتی دەوڵەت نابێ تەنیا ئەرکێکی نایەتی هەبێت بەوەی مەیدان ئاواڵە بکات لەبەردەم تاکەکەسدا، چالاکیی و هەوڵ و بیروڕای تاکەکەسدا. دەبێ تارادەیەکیش ئەرکێکی ئایەتی هەبێت، دەبێ جۆرە هاوسەنگییەکیش لە نێو چینەکانی کۆمەڵگەدا ساز بکات، بۆ ئەوەی هەموو کەسێک، سەر بە هەر چینێک بێت، دەرفەتی ئەوەی هەبێت بەو ئامانجانە بگات کە بۆ نرخی مرۆڤایەتی یەکجار پێویستن.

تۆماس هیلل گرین Thomas Hill Green (١٨٣٦–١٨٨٢)ی فەیلەسوفی ئینگلیزی ئەو بۆچوونانەی بە شێوەیەکی ورد و ئەبستراکت لە *Liberal Legislation and Freedom of Contract* ی ساڵی ١٨٨٠ دا دارشتووە. گرین بەرپەرچی ئەو بۆچوونە دەداتەوە کە دەڵێ هەموو جۆرە دەستوورێک دەکاتەوە نائازادی، نموونەیەکی کۆنکرێتیش دەکاتە دەراو: سەرۆوەزیرانی ئەو دەمەی ئینگلیز Gladstone ی لیبەڕال پێشنیازی دەستوورێکی کردبوو بۆ ساز کردنی پەیمانی نێوان زەویدارانی ئیرلاندی و کرێچییەکان. بە بۆچوونی لیبەڕالی نەریتی ئەم دەستوورە دەبا بە پێشێل کردنێکی ئازادی دابنرێ، پێشێل کردنی ئازادیی هەم زەویداران و هەم کرێچیگەل، ئەگەرچی دەستوورەکە ڕێگەی لەوە دەگرت زەویداران خۆیان لە کرێچی بکەنە شێر و نابووتیان بکەن.

نموونەکە تەواو بەهێزە. گرین دەڵێ دەستوورێک ڕێ لەوە بگرێ گروپێک گروپێکی دیکە دادۆشێ، دەستوورێکە ڕێی ئازادی خۆش دەکات. بەڵام ئازادی لێرەدا ئەو ئازادییە نییە کە لە لیبەڕالیزمی نەریتیدا هەبوو. گرین پێشنیازێکی نوێی هەیە بۆ ئازادی: ئازادی دەکاتەوە «توانستێکی ئایەتی بۆ کردن و سوود وەرگرتن لەوەی بۆ کردن و سوود لێ وەرگرتن لەبارە». ئەم ناساندنە لێڵ و گشتگرانەیە، بەڵام بە شێوەیەکی بنەڕەتی لەو ناساندنە زووترەی لیبەڕال جودایە کە دەیگوت هەموو کەسێک ئارەزووی لە هەر چییەک بوو بیکات بە مەرجێک ئازادیی خەڵکی دیکە پێشێل نەکات. کەواتە ئازادی لای گرین ئاڵۆزتر و توندتر بوو لەوەی زووتر هەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا ناشێ بڵێین گرین و هاوبیرانی گرین بە شێوەیەکی بنەڕەتی نۆرینی لیبەڕالیان گۆڕی. بە گشتی، ئەو دەسەڵاتە دەوڵەتییەی ئەمان داوای جۆرە دەست تێ وەردانێکی لێ دەکەن، ئەو دەسەڵاتە فیوداڵ و تاکفەرمانەی جاران نەبوو بەڵکوو دەسەڵاتێکی بۆرژوایانە بوو: لیبەڕاڵەکان باشتر دەتوانن بە دەسەڵاتی خۆیانی بزانن.

ویرای ئەوەش لیبەڕالەکان بە هیچ جۆرێک پشتیان نەکردە بنەماکەی خۆیان کە بریتی بوو لە *تاکەکیەتی*، تەنانەت بەلای گرین و هاوبیرانییەوە تاکەکەس و کردەوەی تاکەکەس دەراوی خۆرسکە لە باوەڕی سیاسیدا.

گرین دەڵێ لە حوکومڕانیی باشدا هاوشانییەک هەیە لە نێوان بەرژەوەندی تاکەکەس و هەوڵدان و ئاواتی هۆشمەندانەی بەرزی تاکەکەس لە لایەک و سازمان و چارەسەرکردنەکانی دەوڵەت لە لایەکی دیکە. ئاوریش لە بۆچوونی هەرە شکۆداری نێو مێژووی بیری سیاسی دەداتەوە – تەنانەت دەگاتەوە سەر گریمانەکەی ئەریستۆ کە دەڵێ «مرۆڤ بوونەوەرێکی سیاسییە» (یان «گیانەوەرێکی سیاسییە» وەک لە تەرجەمەکاندا دەکەوێتە بەر چاو). بەڵام هەردەم تاکەکەسی کردووەتە دەراوی نۆڕینی خۆی. کۆمەڵگە دەبێ وەها ساز درابێ تاکەکەس بتوانێ ئەوە بکات و سوود لەوە وەربگرێ کە بە لای خۆیەوە شایەنی کردن و سوود لێ وەرگرتنە. لە کۆمەڵگەی وەهاشدا دەبێ دەستوور هەبێ، دەستوور ئازادی دەدات بە تاکەکەس نەک نائازادی. گرین پێی وا نییە گوشاری دەستوور دەبێ توند بێت و بۆچوونێکی گەشبینانەی ئاڕادەیەک بێخەمی هەیە لەوەدا کە دەڵێ دەسەڵاتی سیاسی و دەستووری ناسەپێت ئەگەر ڕەزامەندی تاکەکەسی پێوە نەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بۆچوونەی ڕێگەی ئەوەی لێ ناگرێت کە حوکومڕانیی کەم یان زۆر لیبەڕال لە یەک جوداکاتەوە.

لیبەڕالیزم لە قۆناخێکی تایبەتیدا دەستی هەڵگرت لە بەشێک لەو باوەڕی ئازادییەی زووتر هەیبوو، بەڵام دەستی لە تاکەکیەتی هەڵنەگرت. لە دەمەو کۆتابوونی سەدەی پێشوو، لیبەڕالەکان تاکەکیەتییان کردبووە دەراوی خۆیان و لەویشەوە پشتیان کردە هەموو دوودڵییەکی هەیان بوو دەربارەی پیرۆزیی مافی دەنگ دانی گشتی. ئەگەرچی میلل جۆرە نەسەلماندنێکی هەبوو لەو مەسەلەیەدا و دەیگوت خەڵکی نەزان لەوانەیە بە شێوەیەکی ناهۆشەکی دەنگ بدەن، بەڵام مافی دەنگ دانی گشتی مەرجێک بوو لە گیانی لیبەڕالیزمدا. بیرۆکەی «یەک پیاو، یەک دەنگ» لەگەڵ تاکەکیەتیی لیبەڕالیزمدا تەواو لەبار بوو. خەڵک دەبێ وەک تاکەکەس، وەک تاکە بوونەوەر، لە ڕێی هەڵبژاردنەوە کار بکەنە سەر گوزەرانی سیاسی. ناکۆکیی چینایەتی و بەرژەوندی چینایەتی نۆرەی نامێنێ. ئەوەی دەنگ دەدا فلانی کرێکار یان فلانی کارگێڕ نییە بەڵکوو فلانی تاکەکەسە. سەرلەبەری ئەو تاکەکیەتییەی نێو دیموکراتیی ڕۆژاوا، تاکەکیەتیی لیبەڕالەکانە.

ئەو گۆڕانکارییەی ئایدیۆلۆگیی لیبەڕال، کە لە گوتەکانی گرین و کەسانی دیکەشدا دەخوێنرێنەوە، چار نییە هەر دەبێ نۆڕینی سیاسەتی ئابووریش بگرنەوە. چەند

نموونەیەکی ئەم لایەنەش لە بەشی چوارەمی ئەم باسەدا پیشان دەدرێن. لەگەڵ ئەوەشدا، بە گشتی، دەکرێ بڵێین لیبەڕاڵەکانی زوو - بە میللیشەوە - دەیانگوت سیاسەت و ئابووری دەبێ هەتا دەکرێ لە یەک دابڕێن. گوزەرانێکی ئابووری ئازاد بە هێزی خۆی دەتوانێ بگاتە ئاستی هەرە بەرزی ئابووری. ئەگەر دەوڵەت لێرەدا دەستێکی هەبێت، ئەوا تەنیا بۆ پاراستنی ئازادیی گوزەرانی ئابوورییە.

لیبەڕاڵەکانی درەنگتر، نۆرەیەکی ئابوورەکی پتر ئایەتییان داوە بە سیاسەت، بەوەی سیاسەت پێوەندیی نێوان گرووپەکانی کۆمەڵگە ڕێک بخات. ئەمەش گۆڕانێکی کەمبایەخ نییە. لەگەڵ ئەوەشدا لیبەڕالیزم دەستی لە بارەڕی پیرۆزیی موڵکایەتیی تاکەکەس و بەرزیی ڕشتەی سەرمایەداری، بەر نەدا.

بەڵام موڵکایەتیی کەسەکی و سەرمایەدارەتی گۆڕان. لەو دەمە هەرە زووانەی چالاکیی ئازاددا، ئازادیی تاکەکەس بەوە لێک دەدرایەوە کە ئازادیی هەڵبژاردنە لە نێوان دەوڵەمەندی و هەژاریدا. کۆمپانیای مەزنی هاوچەرخ مەگەر بەلای هۆشکولەوە بە ئەنجامێکی تێکۆشین و هەوڵدانی تاکەکی دابنرێن. خودی فراژووتنی سەرمایەداری، یەکێک لە خاڵە هەرە گرنگەکانی باوەڕی ئازادیی ئابووری فرەواندووە.

لە لیبەڕالیزمی هاوچەرخدا، لێرە و لەوێ، مەیلێکی وەها هەیە دەڵێ کۆمپانیای پیشەسازیی بیرۆکراتیی مەزن هەڕەشە لە کەسایەتی تاک دەکات. ئەو مەیلانە زۆر توند نین بەڵام بۆ نموونە لە لای ئابووریناسی ئەمریکایی ناسراو J. K. Galbraith هەن. لەم خاڵەشدا ئایدیۆلۆگیی لیبەڕاڵ بە شێوەیەکی ئاشکرا لەگەڵ خۆیدا دژ دەکەوێ. خواستی ئازادی بەرانبەر خواستی ئازادی دەوەستێ.

ئەو نوێلیبەڕالیزمەی لە دوابەشی ئەم باسەدا لێی دەدوێین، جۆرە هەوڵدانێکە بۆ چارەسەر کردنی ئەم ناکۆکییە. بەڵام با جارێ لە کۆنەوارەتیی جڤاکی بدوێین.

وەک باسمان کرد دەوڵەت شاچەمکە لە کۆنەوارەتیی سەدەی نۆزدەیەمدا. زۆر جار دەگوترێ و ڕاستیش دەکەن، هەر ئەو کۆنەوارەتییە، لە نێو پارتە ڕاستڕۆیەکانی ئەورووپا و باکووری ئەمەریکادا برەوی هەیە، لە سەدەی بیستەمدا فراژووتنێکی سەیر دەکات، هەتا ئەوەی لە بواری نێوەندەکیدا گومان دەخاتە سەر کارامەیی دەوڵەت، تەنانەت نۆرینی دەوڵەتنەیارانە دەهێنێتە کایەوە. بە تایبەتی لە بواری ئابووریدا، کۆنەواران ماوەیەکی درێژخایەن، بەهێزترین دوژمنی بازاڕی ئازاد و فراژووتنی بێسنووری سەرمایە بوون، بەڵام ئەمرۆ لە ڕۆژاوای ئەورووپا و کۆدەوڵەتی ئەمەریکا و جێی دیکەش، بەپێچەوانەی ئەو دەمە، کە دەگاتە سەر داکۆکی کردن لە هەمان بازاڕ و هەمان سەرمایە لە هەمووان پتر

نەسازێنن. هەڵبەتە ناشێ بڵێین کۆنەوارەتی ئەمڕۆ هەر ئەو لیبەڕالیزمە نەسازێنەی دوێنێیە. هەیشە دەڵێ کۆنەوارەتی، هەر بەو شێوەیەی سەد ساڵ لەمەوبەر داوای پاراستنی کۆمەڵگەی نیمچە فیودالی دەکرد، ئەمڕۆ داوای پاراستنی سەرمایەدارەتی دەکات. ئەم گوتەیەش چاو هەم لە بەردەوامی و هەم لە جۆری نوێکاریی نێو کۆنەوارەتی دەپۆشێ.

بەر لە هەر شتێک دەبێ بزانین کە ئەو چین و گروپانەی لە کۆمەڵگەدا هەڵگری ئایدیۆلۆگیی کۆنەوارانەن، لەم ماوە درێژخایەنەی باسی لێ دەکرێ، تەواو گۆڕاون. بنەمای بەرینی کۆنەوارەتیی جاران بریتی بوو لە ئەریستۆکراتی گرێدراری زەویداران و کارمەندانی بەرزی دەوڵەت و مەزنەجوتیاران. تەنانەت لە نێو کڵێسەی سەر بە دەوڵەت و چەند بەشێکی بیرکارانی نێوچین، کۆنەوارەتی لایەنگری هەبوو. پاشان وردە کۆنەوارەتی لایەنگری لە نێو پیشەساز و خەڵکی دیکەی وەها کە بەرژەوەندی لە فراژووتنی سەرمایەدا بوو، دۆزییەوە. لە ئینگلاند، ئەم فراژووتنە زوو دەستی پێ کرد و ئاشکراش بوو. گەلێ جار زەویداری مەزن سەرمایەداریش بوون. زۆر کەس لەوانەی خاوەن فابریکە بوون و بەو کارە دەوڵەمەند بووبوون، زەوییان کڕی. بەو شێوەیە جۆرە یەکیەتییەک لە نێوان بەرژەوەندی زەوی و سەرمایەدا فراژووت. ناسیۆنالیزم، کە لە دەمەو بنەتای سەدەی هەژدەیەمدا لە سەرانسەری ئەورووپادا هەڵکشا، خەسڵەتێکی کۆنەوارەتی هەبوو. ناسیۆنالیزم هێمای نەتەوەیی دەهێنایەوە پێش، داکۆکی لە بەرزەڕەوشتی جەنگاوەرانە و دینی شکۆداری نەریتی دەکرد. ئەمیش وەک سۆسیالیزم بەرەو بزووتنەوەیەکی گەلێر گەشەی کرد و ئاپۆرەی بەرینی خەڵکی لەگەڵ خۆی ڕاپێچ دا.

بەم جۆرە پشتیوانیی کۆنەوارەتی لە نێو کۆمەڵگەدا هەم گۆڕا و هەم فرەوانتر بوو. ئەم ڕەوتە لە سەدەی بیستەمیشدا بەردەوام بوو، ئەوجا پارتە کۆنەوارەکان زیاتر و زیاتر دەچوونە پاڵ سیاسەتی ئابووریی لیبەڕالی نەریتییەوە. بازاڕی ئازاد و هەلومەرجی موڵکایەتیی سەرمایەدارانە بوونە سەروکارێکی کۆنەوارانە، هەتا گەیشتە ئەوەی، پاش شەڕی جیهانی، پارتە کۆنەوارەکان لە هەمووان زیاتر داوای ئابوورییەکی سەرمایەدارانەی ڕەهایان دەکرد.

لایەنێکی دیکەش هەیە، زۆر جار چاوی لێ پۆشراوە، لێرەدا دەبێ لە یادمان بێت، ئەو دەسەڵاتە دەوڵەتییەی کۆنەوارەتیی زوو دەیپاراست، لە چاو دەسەڵاتی دەوڵەتیی سەدەی بیستەمدا ڕووبەرێکی یەکجار بەرتەسکی هەبوو. دەوڵەت ئەمڕۆ پەلوپۆی زیاترە و ئەرکەکانی یەکجار فرەوانترن. نێوەندە گرنگەکانی دەوڵەتی سەدەی نۆزدەیەم، تەنیا لە

چەند ئەرکێکی جڵەوگیردا کۆببووبوونەوە: دەسەڵاتی ئەرتەش، دادپرسی و لە تەک ئەویشدا پۆلیس. جگە لەوە ئەرکی ئایدیۆلۆگیی دەوڵەت، بە پلەی جۆراوجۆر چاودێریی باوەڕ و فیکر و نەریتی دانیشتوانی دەکرد.

کۆنەوارەتی لە نێزیکەی هەموو ڕێگوزەری خۆیدا ***داکۆکی لە دەسەڵاتی جڵەوگیری دەوڵەت کردووە***. بەدەگمەن نەبێ کۆنەوارەتییەک نادۆزیتەوە، ناوی کۆنەوارەتی لێ ڕەوا بێت و داکۆکی لە دەسەڵاتی ئەرتەش نەکات و داوای ئەوپەڕی گوێڕایەڵی و ڕێکوپێکی نەکات و بگرە داوای زیاد بوونی ئەو دەسەڵاتانەش نەکات. وا باوە کۆنەواران لایەنگری نەریتی نەتەوەییش بن، بە شێوەیەکی ڕازاوە داکۆکی لە پاشایەتی دەکەن ئەگەر هەبێت، تەنانەت ئەگەر دڵگەرمیی دینەکیش ساردبووبێتەوە ئەوان بە وشەی شیرین لە مەسیحایەتیی باو و باپیران دەدوێن.

ئەم نەگۆڕییەی کۆنەوارەتی شایەنی جەخت لەسەر کردنە، چونکە زۆر جار لە بیران دەچێتەوە. گۆڕانکاریی مەزن لەم ئایدیۆلۆگییەدا، وەک باس کرا، سیاسەتی ئابووریی نێو کۆمەڵگە دەگرێتەوە.

کۆنەوارەتیی زوو پێی وا بوو کۆمەڵگە بریتییە لە هەرەمێکی نموونەکیی چەند چینێک (یان وەک خۆیان پێیان خۆش بوو بڵێین چەند بەرەیەک) هەر چینێکیش ئەرک و مافی تایبەتیی خۆی هەبوو. بەرەی بەرز دەبا ڕێبەرایەتی نزمەکان بکات و بیان پارێزێت، بەرەی نزمیش دەبا گوێڕایەڵی بەرزەکان بێت و ڕێزیان بگرێت. هەر بەرەیەک بژێوی خۆی هەیە، ئاستێکی ئابووری خۆی هەیە. توێژی نزمی کۆمەڵگە دەبا بەرگەی جۆرە هەژارییەک بگرن، بەرزەکانیش دەبا خۆشی لە جۆرە تەڕایەتییەکی ژیان بنۆشن. کەواتە جۆرە دابەشینێکی ئابووریی سروشتەکی لە کۆمەڵگەدا هەیە و ئەرکی دەوڵەتیش لەوەدایە دابەشینی سامان لەم دابەشینە سروشتەکییەوە نێزیک بخاتەوە. ئەگەر تەرازووی تێکچوو دەبێ دەوڵەت دەستی تێ وەردا.

هەڵبەتە بڵاوبوونەوەی پیشەسازی گوشارێکی زۆر دەخاتە سەر ئەم دابەشینە نەریتییە. چینێکی نوێی دەوڵەمەند هەڵکشا و چینێکی نوێی هەژار پەیدا بوو. بێگومان کۆنەوارەکان، لە بارێکی وەهای گەشە کردندا کە یەکجار بە هەرا و پەلەیە و بە ڕوواڵەتیش ئارەزووبازە، داوای دەست تێ وەردانی دەوڵەتی دەکەن لە بواری ئابووریدا.

پاش ئەوە چەند ڕێبازێکی جۆراوجۆری ئەوەی ئێمە پێی دەڵێین ***کۆنەوارەتیی جڤاکی***، پەیدا بوون. ئەوەش هەوڵدانێکی کۆنەواران بوو بۆ چارەسەر کردنی «دۆزی جڤاکی». لە ڕاستیشدا ئەو ڕێبازانە بریتی بوون لە چەند پێشنیازێکی چارەسەر کردن. خاڵی هاوکۆی

نێوان ئەم ڕێبازانەی کۆنەوارەتیی جڤاکی، ئەو باوەڕە بوو کە دەیگوت دەوڵەت (و لک و پۆی دەوڵەت وەک کڵێسە و بنکەی ناوچەیەکیی هەمەجۆر) دەبێ کارێکی وەها بکات هەژاری نەگاتە ڕادەی دەستکورتییەکی ڕەها. بەڵام تا چ ڕادەیەک دەوڵەت بۆی هەیە دەست بخاتە نێو بەرهەم هێنان و بازاڕەوە، ئەمەیان مەسەلەیەک بوو جێی ڕا و بۆچوونی جیاواز بوو. هەبوو دەیگوت تەنیا لە باری تەواو سەرپەڕدا ئەوجا دەوڵەت دەبێ فراژووتنی سەرمایەداری پاشەکشە پێ بکات و ئابووریی فیوداڵ دامەزرێنێتەوە. ڕێسای هەمەجۆر پێشنیاز دەکرا. بەرژەوەندی پیشەسازی دەبا کرنوو بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت بەرێ. لەبەر ئەوە دەبا پەرژینی گومرگ هەڵچنرێ، *پاراستنایەتی* *protectionism* بە تایبەتی لە دەمەو بنەتای سەدەی نۆزدەیەمدا بوو بە خەسڵەتێکی کۆنەواران. کشتوکاڵی خۆماڵی دەبا بە چەندین شێوە بپارێزرێ.

ئەوجا لە نێو پەیڕەوانی کۆنەوارەتیی جڤاکیدا هەبوو لەوەش زیاتریان داوا دەکرد، دەیانگوت ئەگەر فراژووتنی سەرمایەداری بخرێتە ژێر ڕێبەرایەتی نەتەوەییەوە، ئەوا دەبێتە دیاردەیەکی بەسوود و لەنرخاندن نایەت. ئەم بۆچوونەیان، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە، لە ئەڵمانیا گەشەی کرد و بیسمارک Otto von Bismarck (١٨١٥-١٨٩٨)ی سیاسەتمەدار پێشەنگیی دەکرد. لە ئەڵمانیا، لە سەدەی نۆزدەیەم و هەتا شەڕی جیهانیی یەکەم، فراژووتنێکی پیشەسازیی مەزن ڕووی دا، ئەم فراژووتنە بە گومرگ دەپارێزرا و لە ژێر سایەی پاراستنی دەوڵەتیدا ڕێک دەخرا، بە زانست و کارامەییی تەکنیکی نێو زانستگە و دەزگەکانی دەوڵەت یارمەتی دەدرا. هەر ئەو دەمەش بوو سۆسیال دیمۆکرات لە ئەڵمانیا بوو بە بزووتنەوەیەکی گەلێر. سۆسیال دیمۆکرات، لە لایەن بیسمارک و دەستەی کۆنەوارانی جڤاکییەوە بە بەرهەڵستی سەرەکی دادەنران. بەڵام بیسمارک و هاوبیرانی و ئەوانەی پاش خۆی ڕێچکەی ئەویان هەڵگرتەوە، بە مەبەستی ڕێ گرتن لە سۆسیال دیمۆکرات، کەوتنە پاراستنی ئابووری و کۆمەڵایەتیی کرێکاران، بۆ ئەوەی هۆکارە دەمودەستەکانی نارەزایی کەم بکەنەوە. بۆ نموونە ڕشتەیەکی ساکاری سیاسەتی خۆشگوزەرانیان دارشت، کە بریتی بوو لە دابین کردنی مووچە و مزە بۆ خانەنشین و باری کۆمەڵایەتی تایبەتی. بەڵام ئەم سیاسەتە زیانێکی وەهای لە سۆسیال دیمۆکرات نەدا. وەک باسمان کرد هۆکاری دیکە بوون گەشەیان بە بزارەتی دا. لەگەڵ ئەوەشدا دەشێ بڵێین ئەم سیاسەتە بسمارکییە لەگەڵ گیانی کۆنەوارەتیی جڤاکیدا دەگونجا.

کۆنەوارەتی، پاش شەڕی جیهانیی یەکەم، خەسڵەتی خۆی گۆڕی. ئەو نۆرینەی نێو کۆنەوارەتیی جڤاکی، کە دەیگوت دەوڵەت دەبێ هاوسەنگیی کۆمەڵگە ڕاگرێ و ڕێ لە

هەژاریی توند بگرێ، هەر ما بەڵام بڕوا بەوەی پێی دەگوترا بازاڕی ئازاد هەڵکشا. لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازییەک هەر هەبوو لە نێوان نۆڕینی کۆنەوار و لیبەڕاڵدا، دەربارەی پێوەندارییەتی نێو کارگە. کۆنەوارەتی وای پەسەند دەکرد پێوەندیی نێوان خاوەن کار و کرێکاران پێوەندییەکی باوکسالاری بێت: خاوەن کار وەک باوکێکی توند بەڵام دڵسۆز بەرانبەر منداڵەکانی خۆی بجووڵێتەوە. لیبەڕاڵەکان پێیان وابوو پێوەندیی نێوان کرێکار و کڕیاری کار پێوەندییەکی بازرگانییە، دەبێ لە شێوەی پەیماننامە و بابەتی ئەوتۆدا ڕێک بخرێ.

سۆسیال دیمۆکرات و کۆمیونیستەکان هەوڵیان دەدا لە ڕێی سیاسییەوە بگەن بەوەی تەرازووی داهات و سامانی نێو کۆمەڵگە ڕێک بخەن، کۆنەوار و لیبەڕاڵەکان لە دژایەتی ئەم هەوڵدانەدا یەک بوون. کۆنەوارەتیی جڤاکی هەرگیز داوای ئەوەی نەکردووە دەوڵەت هەوڵ بدات هاوشانییەکی ئابووریی ڕاست بێنێتە کایەوە، یارمەتیی دەوڵەت تەنیا بۆ ئەو کەسانەیە کە بە هیچ جۆرێ بێ یارمەتیی دەوڵەت ناتوانن خۆیان بژێنن. سیاسەتێکی کۆمەڵایەتی کە داوای دابەشکردنەوەیەکی مەزنی سامان بکات هەرگیز کۆنەوارانە نەبووە. کۆنەوارەتی هەردەم پێی وا بووە دابەشینێکی سروشتەکیی سامان لە کۆمەڵگەدا هەیە. بە دوا کاتەوە بڕوایان بەوە ڕاهێزا کە سەرمایە دەتوانێ ئەو دابەشینە دابمەزرێنێ.

ئادگارێکی کۆنەوارەتیی هاوچەرخ، کە زۆر جار ڕەپێش دەخرێ، ئەوەیە دیمۆکراتیی ڕۆژاوایی سەلماندووە، مەبەستیش لەو دیمۆکراتییە هەڵبژاردنی گشتیی سیاسییە، ئازادیی بیروڕا و دەربڕینی تاڕادەیەک دەستووربەندە ... هتد. ئەمەش بەگشتی ڕاستە. پارتە کۆنەوارەکان ماوەیەکی درێژخایەن و سەرسەختانە دژ بە فرەواندنی مافی دەنگ دان بوون، بەڵام کە ئەم کارانە سەریان گرت، ئەوجا سەلماندیان. ئەم سەلماندنەش هاوکات بوو لەگەڵ پەیدا بوونی هەڵوێستی پتر ئایەتییان دەربارەی سەرمایەدارەتی، هەڵبەت ئەو سەلماندنە دوور نەبوو لە کارتێکردنی ئەم هەڵوێستەیان. ئێستە کۆنەواران خۆیان بە لەبارترین پارێزەری ماف و ئازادیی سیاسی و بازاڕی سەرمایەداری دادەنێن.

### ٣- ئایە ڕاستە ئایدیۆلۆگی خەریکە لەناو دەچێت؟

لە دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا، باڵی هەمەجۆری کۆنەوارەتیی جڤاکی و لیبەڕالیزمی جڤاکی، لە زۆر وەڵاتدا، نۆرەیەکی بەرچاویان هەبوو، جیاوازیشیان هێندە فرەوان نەبوو هەمیشە دیار بێت. بەرهەڵستی سەرەکییان لە کایەی سیاسیدا سۆسیال دیمۆکرات بوو. سۆسیال دیمۆکراتیش هەم ڕێسای گەمەی سیاسیی دیمۆکراتیانە و هەم ئەو سەرمایەدارەتییەی بەلایانەوە بەربیراز بوو، پەسەند کردبوو. پاش شکانی فاشیزم، ناکۆکیی ئایدیۆلۆگیانە هێندە بە ڕوونی نەدەکەوتنە بەر چاو، ئەوەی لە کایەدا مایەوە تەنیا کۆمیونیزم بوو. لە ماوەی «شەڕی سارد» دا کۆمیونیزم بە مەسەلەیەکی تایبەت و ڕیزپەڕ دادەنرا.

ئەمەیە پاشخانی ئەو بۆچوونەی لە مردنی ئایدیۆلۆگی دەدوا و لە کۆدەوڵەتی ئەمەریکا و ڕۆژاوای ئەورووپا و تەنانەت لە سوێدیش، پاش شەڕی جیهانیی دووەم، برەوی سەند. دەگوترا، سیاسەت خەریکە دەبێتە هونەرێکی ئەندازیارانە، کێشانە و پێوانەی وردی دەوێ نەک تەنیا بیروڕای نەرێتەکی. بە کردەوە ئایدیۆلۆگییەکانی سەدەی نۆزدەیەم وێڵ کراون. ڕێککەوتنێکی بەرفرەوان هەیە لەسەر دۆزە سیاسییە بنەڕەتییەکان و هەتا دێ ئەو ڕێککەوتنە فرەوانتریش دەبێ.

بەڵگەکانی ئەم باوەڕی مردنی ئایدیۆلۆگییە هەمەجۆر بوون:

١) ئەگەر فراژووتنی ئابووری لە کۆمەڵگەدا باش بێت و خێری هەموو چینەکانی کۆمەڵگەی تێدا بێ، ناکۆکیی سیاسی کز دەبێتەوە. ئەوەی پێی دەگوترێ دیمۆکراتیی ڕۆژاوایی نموونەیەکی ئەو فراژووتنە ئایەتییەیە کە داماڵینی ئایدیۆلۆگی بەدەمەوەیە.

٢) خودی حوکومڕانیی دیمۆکراتیانە بە هەڵبژاردنی گشتی و...هتد ڕێگە بۆ داماڵینی ئایدیۆلۆگی خۆش دەکات. ئەو ڕێبازە سیاسییانەی ڕێسای گەمەی دیمۆکراتیانە پەسەند دەکەن، بەر لە هەر شتێک، «بان-ئایدیۆلۆگی» یەکی هاوکۆ بۆ خۆیان دەسەلمێنن. ئەوجا خودی ئەو ڕێسای گەمەیەش داوای سازان و داوای جودا کردنەوەی بزووتنەوە سەرپەڕەکان دەکات. دیمۆکراتی داوای کۆبوونەوەی ڕووەو ناوەڕاست دەکات.

٣) داماڵینی ئایدیۆلۆگی تەنیا چەند دەوڵەتێکی ڕۆژاوای ئەورووپا و باکووری ئەمەریکا ناگرێتەوە بەڵکوو لە ئەنجامدا هەموو دنیا دەگرێتەوە. زلهێزەکان باس لە هاوژیانێکی ئاشتیخوازانە دەکەن و لە چەندین دۆزدا، کە جاران جێی ناکۆکییان بوو، ئێستە ڕێکن. هۆیەکی گرنگی ئەم ڕێککەوتنەش دەگەڕێتەوە بۆ هاوسەنگیی تیرۆر: ئایدیۆلۆگیی یەکنەگری بلۆکەکانی دەسەڵات دەبێ لەناو بچن دەنا شەڕێکی هەژەندانەی بەدەمەوەیە.

٤) له سایەی پێشکەوتنی زانستەکانی کۆمەڵایەتیدا، زانیار دەربارەی سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵگە زیاد بووە. ئەو تەگەرانەی جاران دەبوونە هۆی جیابوونەوەی ئایدیۆلۆگی و حیزبایەتی، ئێستە لەبەر ئەوەی دەزانین چۆن چارە دەکرێن، ئەو نۆرەیەیان نەماوە.

بەڵگەی یەکەم و سێیەم، لە سالانی ١٩٥٠ و سەرەتاکانی ١٩٦٠ دا، ئەو دەمەی گریمانەی دامالینی ئایدیۆلۆگی تەواو بەهێز بوو، نۆرەیەکی گرنگیان هەبوو. ئەو بیرەی دەیگوت بە زیادبوونی تەژەند ناکۆکیی ئایدیۆلۆگی لەناو دەچێ، لە رۆژگاری گەشانەوەی گورجی ئەورووپا و باکووری ئەمەریکادا هەتا سالانی ١٩٦٥ و ١٩٦٦، دەنگی دلێر بوو. ئەو دەمە هەولێکی هەمەجۆری ئەوەش درا کە بەلگەی یەکەم و دووەم بدرێن لە یەک و دەگوترا گوایە دێمۆکراتیی رۆژاوا دەستەبەرێکیشە بۆ پێشکەوتنی بواری ئابووری (بۆ نموونە دەگوترا هیندستان دەبێ لە چین خێراتر گەشە بکات چونکە هیندستان حوکومڕانییەکی هەیە لە شێوەی ئەورووپای رۆژاوا).
ئەم گریمانەیەی دەڵێ ناکۆکیی سیاسی و ئایدیۆلۆگی، لە رۆژگاری فراژووتنی باش و هاوئاهەنگی ئابووریدا، رووی لە کزبوونە، بۆچوونێکی تاڕادەیەک سەیر نییە. لێنین، کە لایەنگری ئەم بۆچوونی مردنی ئایدیۆلۆگییە نییە، وەک باسمان کرد، پێی وابوو هەلکشانی خێرای دەمەو بنەتای سەدەی نۆزدەیەم هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ پەرەسەندنی بژارەتی.
بەڵگەی دووەم، کە باس لەوە دەکات حوکومڕانیی دێمۆکرات مەیلی رێکەوتنی هەیە لەسەر «بان–ئایدیۆلۆگی» یەکی هاوکۆ، لە هەمووان پتەوتر دەرچوو و هەتا ئێستەش بەرژیانە. بەلام ئەمیشیان بێتەگەرە نییە. کاتێ دەگوترێ «دێمۆکراتی بان–ئایدیۆلۆگی پێک دێنێ» گوتەکە فرەواتا دەردەچێ، چونکە چەمکی «دێمۆکراتی» بۆخۆی فرەواتایە. دێمۆکراتی دەشێ بە واتای شێوەیەکی سیاسیی دیاریکراو بەکار بێت، بەلام دەشێ بەواتای رشتەیەکیش بێت تێیدا خەلک، بێ گوێدان بە پلە و پایەی کۆمەلایەتی، نەک تەنیا بە رووالەت بەلکوو بەڕاستیش دەستی لە بڕیار و چارەسەرکردندا هەبێت و بەو جۆرەش ئازادییەکی بەرفرەوانیان هەبێت. کەواتە بان–ئایدیۆلۆگیی دێمۆکراتی دەشێ واتایەکی قووڵتر و بنجیتری هەبێت، هەتا قووڵتریش بێت پتر جیاوازیی دەخاتە نێو حیزبەکانەوە.
ئەوەش مەسەلەیەکی جودایە لەوەی دەڵێ دێمۆکراتیی رۆژاوا داوای چارەی سازێن و یەکگرتنی ئایدیۆلۆگیانە دەکات. ئاشکرایە کە ئەو پرسانەی جاران پارتەکانی لەیەک جودا دەکردەوە ئێستە بەو جۆرە نین. ئەوەش ئاشکرایە کە حیزبەکان کاتی هەڵبژاردن بەرنامەی

وەها لێڵیان هەیە هاوچاویی لەگەڵ بەرنامەی حیزبەکەشدا دەکات. لە گوتوبێژی سیاسیدا، لایەنی ئایدیۆلۆگی بووەتە ڕانواندنێکی یەکنەوازانەی چەند وشەیەکی شکۆدار - وەک دیموکراتی، ئازادی و یەکسانی. ژیانی ڕۆژانەی نێو پەرلەمان خەسڵەتی سازێن و ڕێککەوتنی وەرگرتووە.

بەڵام مەرج نییە ئەم مەیلی هاوڕێبازییە هەتا هەتایە بەردەوام بێت. مەرجیش نییە، هەر لەبەر ئەوەی پارتە سیاسییە سەرکەوتووەکان نەیان توانیوە ئایدیۆلۆگی بە زیندوویی بپارێزن، ئیدی ئایدیۆلۆگی دەبێ بمرێ.

بەڵگەی چوارەم، کە دەڵێ هەڵکشانی زانیار دەربارەی هەلومەرجی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی بواری ناکۆکیی ئایدیۆلۆگی بەرتەسک دەکاتەوە، لە هەمووان هۆشگیرترە. باوترین نموونەی ئەم بەڵگەیە لە بواری سیاسەتی ئابووریی دەهێنرێتەوە. ئەو دیمانە ئابوورییەی ناوی کەینز Keynes ی هەڵگرتووە و لەمەوبەر لێی دواین و دەڵێ بە زانیاری ورد دەربارەی چۆنیەتیی کار کردنی ڕشتەی کۆمەڵایەتی، دەتوانین بەسەر ململانێی ئایدیۆلۆگیدا زاڵ بین، نموونەیەکی ئەم باسەیە بەڵام تاکە نموونە نییە. زۆر جار گوتراوە زانیاری سەر بە سایکۆلۆگی و کۆمەڵناسی ڕێگەی خۆلادان لە ناکۆکیی کۆمەڵایەتی پێشان دەدەن، سایکۆلۆگیی پیشەسازی و کۆمەڵناسیی پیشەسازی یارمەتیمان دەدەن زاڵ بین بەسەر هەموو ئەو هۆکارانەی ناکۆکی و ناڕەزایی و دڵتەنگیی نێو کارگەیان بەدەمەوەیە، لێکۆڵینەوەی هەڵکشاو دەربارەی هاوژیانی دەبنە یاریدەرەێک بۆ ئەوەی خەڵک لە هەلومەرجێکی هاوئاهەنگدا بژین.

لە دەمەو بنەتای شێستەکاندا، پاشەکشە بەم ڕێبازە فیکرییە کرا کە دەیگوت زانیار بە جۆرە تەکنیکێکی کۆمەڵایەتی بەکار دەهێنرێت. ئەم پاشەکشەیە کەینزایەتی و تەنانەت ئەو بوارانەی دیکەشی گرتەوە کە لە سەرەوە باسمان لێ کردن. ئەمەش بووە هۆیەکی گرنگ بۆ وەلانانی گریمانەی مردنی ئایدیۆلۆگی. هۆیەکی دیکەی گرنگتر ئەوە بوو کە لە چەندین بواردا ناکۆکیی ئایدیۆلۆگیی ئاواڵە پتر بەرهەستتر دەبوون. پەشێویی نێو بازاڕی کار، بەتایبەتی بە هۆی هەڵکشانی بێکارییەوە، تەنانەت لە دەوڵەتە پیشەسازەکاندا، پەرەی سەند. ئەو حیزبانەی تا دوێنێ بوو ڕێک بوون، ڕێکنەکەوتنێکی بیرەکیی قووڵیان لێ ئاشکرا بوو. دینی هەمەجۆر لە هەموو لایەکی دنیادا نۆرەی هەڵکشاویان پەیدا کرد: لە کۆدەوڵەتی ئەمەریکا، مەسیحییە بنەماگرەکان هەوڵیان دا دیمانەی فراژووتنی داروینی لە وانەی فێرگەکان دەرهاوێژن. لە ئێران و چەندین دەوڵەتی موسوڵمانی دیکە هەوڵ درا قورئان بکەنە سەرچاوەی بەرزی هەموو سەروکارێکی گرنگی سیاسەت و دادپرسی. لە

پۆلۆنیا کڵێسەی کاتۆلیک، کە بەردەوام لەوێ بەهێز بووە، توانی بزووتنەوەی بەرهەڵستان دژ بە ڕژێمی ئەرتەشیی وەڵاتەکە ڕێک بخات. چەندین کەشیش و مەسیحییانی دیکەش لە ئەمەریکای لاتین، لە نێو بەرهەڵستانی چەپدا کاریان دەکرد دژ بە ڕژێمی ڕاسترۆ و ڕژێمی ئەرتەشی.

ماوەی دەمەو کۆتابوونی هەشتاکان مۆرکی زیندووبوونەوەی ئایدیۆلۆگی پێوە بوو. لە دەورووبەری ساڵی ١٩٧٠دا، بەر لە هەمووان، سۆسیالیزم خۆی ڕەپێش خست، بەتایبەتی لە نێو خوێندکار و بیرکارانی بەرچاودا. لە زۆر لای ئەم دنیایە باس لە بووژاندنەوەی مارکسایەتی دەکرا. پاش ئەوە، لە دەمەو بنەتای حەفتاکاندا، بووژاندنەوەی ئایدیۆلۆگیانە، لیبەڕالیزم و کۆنەوارەتی گرتەوە، بەتایبەتی لە وەڵاتە سەرمایەدارەکاندا. دەسترۆیی سیاسیی ئەم ڕێبازانە تەواو مەزن بوو. ڕۆناڵد ڕەیگەن بۆ سەرۆکایەتی کۆدەوڵەتی ئەمەریکا هەڵبژێردرا و مارگەرێت تاتچەر بوو بە سەرووەزیرانی بریتانیا. ئەم دووانە پتر لە دیمانەیاری دەوڵەتی و ئابووریناس و فەیلەسووفان، نوێنەرایەتی نوێلیبەڕالیزم و نوێکۆنەوارەتی دەکەن.

**٤- نوێلیبەڕالیزم و نوێکۆنەوارەتی**

لە مانگی کانوونی دووەم ‹ژانیوەری› ی ساڵی ١٩٨٥ دا، لە بریتانیا، قانوونێکی نوێ بۆ فێرگەکان دەرچوو. ئەم قانوونە دەڵێ بڕیاری لێدان یان لێنەدانی شاگردی مەکتەب مەسەلەیەکە بە ڕەزامەندیی دایک و باوکاوانەوە گرێدراوە.

ئەمە نموونەیەکە پڕ بە پێستی دەستووری نوێلیبەڕالانەیە. نوێلیبەڕالیزم دەڵێ هەموو مرۆڤێکی ڕسکاو خۆی دەتوانێ و خۆیشی دەبێ بڕیاری سەروکاری خۆی و منداڵانی نەڕسکاوی خۆی بدات. کەواتە دەستوور دانان دەبێ، لە باری وەهادا، بڕیاری گشتی نەدا بەڵکوو ڕێگە بۆ تاکەکەس ئاواڵە بکات.

نوێلیبەڕالیزم، لە زۆر ڕووەوە ئایدیۆلۆگییەکە تێگەیشتنی یەکجار ئاسانە. یەکێک لە دەراوە هەرە گرنگەکانی گریمانەیەکە پێی دەڵێن *مرۆڤی ئابوورەکی* *homo economicus*. ئەم گریمانەیە مێژوویەکی کۆنی هەیە – و لە لیبەڕالیزمی هەرە کۆنیشدا جێیەکی نێوەندەکی هەبوو. گەلێ جار مانای ئەم گریمانەیە شێوێنراوە و زبرێنراوە. هەیە دەڵێ مەبەستی ئەم گریمانەیە ئەوەیە کە تەنیا بەرژەوەندی ئابووری دنەدەری مرۆڤە. بەڵام نە لیبەڕالیزمی کۆن و نە لیبەڕالیزمی نوێ وەها بیر ناکەنەوە.

به کورتی مەبەستی لیبەڕالەکان ئەوەیە هەموو مرۆڤێکی ڕسکاوی بە ڕادەیەکی ئاسایی گەشەکردوو، کە لەژێر گوشاری دەرەکیی قانوونی یان هەر کۆسپێکی دیکەدا نەبێت، تەواو لەبارە بۆ ئەوەی لە هەموو سەروکارێکی خۆیدا بڕیاری چاکەی خۆی بدات. واتە مرۆڤ لە بنەڕەتدا هۆشەکییە و توانایەکی بێسنووریشی هەیە بۆ بینینی ئامانجی ژیانی خۆی. ئەم هۆشەکییەی مرۆڤ هێندە بەرتەسک نییە تەنیا بواری ئابووری بگرێتەوە. نوێلیبەڕالی پەرگیر هەیە هەوڵ دەدەن بیسەلمێنن کە تەنانەت بڕیاری بەرووالەت سۆزیارانەش، وەک ژنهێنان و شووکردن و تەنانەت خۆکوشتنیش، پێوانەی هۆشەکیان لە پشتە. خۆکوشتن دەشێ وەها لێک بدرێتەوە کە ئەنجامی حیسابێکە، خۆکوژ بەردەوامبوونی ژیانی تێدا بە زیانێکی کەسەکیی خۆی دەبینێ، کەواتە مردن باشترە چونکە ئەنجامەکەی سفرە، نە سوودە نە زیان! لەگەڵ ئەوەشدا گەورەترین سەرکەوتنی نوێلیبەڕالیزم لە بواری ئابووریدایە. لایەکی ئەو سەرکەوتنە دەگەڕێتەوە بۆ پاشەکشەی کەینزایەتی.

نوێلیبەڕالی ئابووریناسی پێشەنگ فرەیدمان Milton Friedman (ساڵی ١٩١١ زاوە) و خەڵکی کۆدەوڵەتی ئەمەریکایە، خەباتێکی درێژخایەن و سەرسەختانە دژ بە لێکدانەوەکانی کەینز Keynes دەکات، کە دەربارەی ژاکانە گەورەکەی دەوروبەری ١٩٣٠یە و بەگشتی دژ بە ڕاڤەی کەینزایەتیی سەختانگ و سیاسەتی سەختانگە. فرەیدمان دەیگوت نۆڕینی دروست نۆڕینی لیبەڕالیی نەریتەکییە. لە ڕۆژگاری سەختانگدا، کۆمپانیا ناتوانێ بەرهەمی خۆی لە بازاڕدا بفرۆشێ و ناچارە خەڵکی دامەزراوی خۆی لە کار دەر بکات، هەموو لایەنەکان دەبێ تەواو خۆیان برسی بکەن بۆ ئەوەی بتوانن بەسەر سەختانگی وەهادا زاڵ بن. سەرمایەدار دەزانێ چیدی ناتوانێ (استثمار) بکات و پارەکەی خۆی لە بەرهەم هێنان دەکێشێتەوە و پاشەکەوتی دەکات بۆ دەرفەتێکی داهاتووی سازگارتر. کرێکار دەگاتە ئەو باوەڕەی کە ئەو مزەیەی لە بری کارەکەی خۆی وەری دەگرێ زۆر کەمە - وای پێ باشترە هێزی کاری خۆی پاشەکەوت بکات، واتە بێکاری هەڵدەبژێرێ! تەنانەت دەوڵەتیش - هەر وەک لیبەڕالە کۆنەکان دەیانگوت - دەبێ مەسرەفی خۆی کەم بکاتەوە. بەر لە هەر شتێک دەبێ بڕی پارە لە نێو کۆمەڵگەدا کەم بکاتەوە. چونکە لە کاتی سەختانگی وەهادا، پارەیەکی زیاد لە پێویست لە کۆمەڵگەدا هەیە. فرەیدمان مەنیتاریست monetarist ـە، واتە پێی وایە بڕی پارە بڕیاری خولی سەختانگ و تەنانەت بڕیاری خولی ڕاهێزانی ئابووریش دەدات. لەبەر ئەوە فرەیدمان بەرپەرچی ئەو جودا کردنەوەیەی پارەی بەرهەمهێن و نابەرهەمهێنی کەینز دەداتەوە و دەڵێ، هەموو جۆرە پارەیەک هەر یەک سەنگیان لە خۆشگوزەرانیی ئابووریدا هەیە.

ئەو سیاسەتە ئابوورییەی نوێلیبەڕالەکان داوای دەکەن بەگشتی هەر ئەوەیە لە

بریتانیای تاتچەردا خراوەتە کارەوە. لە کۆدەوڵەتی ئەمەریکای ڕەیگەندا، بنەما فیکرییەکان جودا بوون بەڵام چارە کارەکییەکان هاوجۆری ئەوانەی بریتانیا بوون. بەر لە هەر شتێک، لە بریتانیا و کۆدەوڵەتی ئەمەریکا، هەوڵ درا مەسرەفی ڕەسمیی دەوڵەتی کەم بکرێتەوە، بە تایبەتی ئەو مەسرەفانەی دەچێ بۆ یارمەتیی کۆمەڵایەتی، تەندروستی و فێرکاریی گشتی. بەمەش هەژاران هەژارتر و دەوڵەمەندان دەوڵەمەندتر بوون. بە نۆڕینی نوێلیبەڕاڵ دەبا تەنانەت تەندروستی و فێرگەکانیش، بە شێوەیەکی فرەوان، بدرێنە دەست لایەنی کەسەکی، چونکە کارێک لە لایەن تاکەکەسی سەرساردی هۆشەکیخوازی ژمێریارەوە ببرێت بەڕێوە چاکتر و چوستتر و هەرزانتر دەبرێ بەڕێوە وەک لەوەی بدرێتە دەست کۆیەکییەک بەرژەوەندی نادیاری هەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا یەک بوار هەیە هەر هەموو نوێلیبەڕالەکان - ئەرێ هەر هەموو ئەو نوێلیبەڕالانەی تاویان هەبووە - تێیدا ڕادەوەستن، ئەوەش بنگەی سەپێنەری دەوڵەتە: ئەرتەش، پۆلیس، دادپرسی. نوێلیبەڕالەکان، لەم بوارەدا، تەواو لە لیبەڕالی «پەتی» ی کلاسیک، بۆ نموونە لە لیبەڕالانەی مانچێستەری بەناوبانگ، دادەبڕێن. لیبەڕالی کلاسیک دوژمنی هەرە گەورەی دەسەڵاتی سەپێنەری دەوڵەت بوون و دەیانگوت هەر ئەوەندە بازاڕی ئازاد لە هەموو بوارێکدا دامەزرا دەبێ ئەو دەسەڵاتانە نەمێنن.

نوێلیبەڕالەکان جاروبار گازەندە لەو مەسرەفە گرانانەی ئەرتەش دەکەن، مەسرەفی هێزی بەرگری بۆ ژمێرکاریی هۆشەکیانەی ئەوان بووە بە تەگەرەیەکی گەورە. تەگەرەش دەکەوێتە ئەو یەکڕەوییەی نێو خودی باوەڕەکەشەوە، کە بەگشتی یەکڕەوییەکی ئاسانی هەیە. بۆچی مرۆڤی ئابوورەکی، هەژار بێت یان دەوڵەمەند، لاو بێت یان پیر، لە مەسەلەی نەخۆشیدا بتوانێ گەشە بە هۆشمەندیی خۆی بدات بەڵام هەمان هۆشمەندی، لە مەسەلەی بەرگریدا، بخاتە دەست ئەرتەشەوە؟ تەنیا دەستەیەکی بچووک بەناوی سەرمایەدارانی ئەنارکی anarcho capitalists، کە زۆربەیان لاو بوون، ئەوپەڕی ئاکام لە بنەما فیکرییەکانی خۆیان دەگرن و هەموو دەزگەیەکی دەوڵەتی، بە دەزگەی بەرگری و پۆلیس و دادپرسییەوە، ڕەت دەکەنەوە. بەڵام کاریگەری ئەم ڕێبازە سیاسییە کەمە.

کاتێ دەسەڵاتدارانی نوێلیبەڕال بە پرسیاری لەو بابەتە سەغڵەت دەکرێن، نوێکۆنەوارەتیی خزمیان فریایان دەکەوێ. ئەم دوو ئایدیۆلۆگییە لە دەستەخوشک دەچن، لە چەند بوارێکی بنەڕەتیدا تەواو وەک یەکن و لە بواری دیکەشدا جودان. لە سیاسەتی کۆنکرێتدا زەحمەتە لەیەک جودا کرێنەوە.

نویکۆنەوارەتی بە گشتی لایەنگری ئەو نۆرینە ئابوورییەن کە نویلیبەراڵەکان باوەڕیان پێیەتی. ئەمانیش داوای بازاڕی ئازاد و سەرمایە هەڵنانی ئازاد و...هتد دەکەن. بەڵام ئەو «مرۆڤی ئابوورەکی» یەی ئەمان باسی لێوە دەکەن بواری بەرتەنگترە وەک لەوەی نویلیبەراڵەکان. نویکۆنەواران دەڵێن ژمێرکاریی سەرساردانە لە چەند بوارێکی نێوەندەکیدا دەکرێ بەڵام نەک لە هەموو بوارێکدا. بیریاری نویکۆنەواری پێشەنگ Irving Kristol (١٩١٦ زاوە) و ئەمیش هەر خەڵکی کۆدەوڵەتی ئەمەریکایە، دەڵێ هۆشمەندیی پەتی کافی نییە. مرۆڤ پێویستی بە *ئەفسانە* یشە. کریستۆل بە پلەی یەکەم لە دوو ئەفسانە دەوێ: یەکەم دینە، کە بە نۆرینی کریستۆل دین بۆ ئەوەی مانایەک بدات بە ژیانی مرۆڤ تەواو پێویستە. دووەم ئەفسانەی نەتەوەیە.

نویلیبەراڵ لە خەمی دۆزی دینەکیدا نین – چونکە ئاسان نییە حیسابێکی هۆشەکی بۆ باوەڕی دینەکی هەڵنێن بێ ئەوەی بکەونە داوی سینیزم cynicism ـەوە – بەڵام نویکۆنەوارەتی باوەشی بۆ ئەو تەوژمە دینەکییە نوێیە بەرهەستە گرتوتەوە کە بەتایبەتی لە کۆدەوڵەتی ئەمەریکای ئەمڕۆدا ڕەواجی پەیدا کردووە. ڕاستە کەسانی وەک کریستۆل پشتگری لەو ناهۆشەکیەتی irrationalism و دژەبیرکارەتی anti-intellectualism یە ناکەن کە زۆر جار لەوێدا دێنە کایەوە، چونکە نۆرینی بواری ئابووریان ڕێگەی ئەوەیان لێ دەگرێ، بەڵام ئەو بیریارانە ڕەزامەندیی خۆیان بەرانبەر پلە و پایەی بەهێزی دین دەربڕیوە. دین لە جیهاننۆڕیی ئەواندا جێوڕییەکی دیاریکراوی خۆی هەیە و ئەوەش بەلایانەوە مەسەلەیەکی پەسەندە.

ئەم بیریارانە، هەر بەو جۆرەش پشتگری لەو تەوژمی ناسیۆنالیزمەش دەکەن، کە هەر لە سەرەتای حوکومڕانیی ڕەیگەنەوە کۆدەوڵەتی ئەمەریکای گرتەوە و تا سەختانگە قووڵەکەی نەوەدەکان ئەوجا کزبۆوە. ئەم ئەفسانەی نەتەوەیە، ئەفسانەی نیشتمانی مەزن و بەهێزە، دەرفەتی ئەوەشیان بۆ دەرەخسێنێ کە ئەو بودجە مەزنانەی بۆ دەسەڵاتی بەرگری تەرخان دەکرێن، بدروستێنن. هەڵبەتە ئەرتەش گەورەترین دەستەبەری مەزنی و دەسەڵاتدارییەتی نەتەوەیە. کریستۆل لەم خاڵەدا تووشی ئەو زەحمەتییەی فرەیدمانی لیبەڕاڵ نایەت.

بەڵام بەوە هەموو تەگەرەیەک نارەوێتەوە. ئەگەرچی نویکۆنەوارەتی دروستاندن هەم بۆ ئابوورییەکی سەرمایەدارانەی ڕەها و هەم بۆ مەسرەفێکی مەزنی ئەرتەشی دەهێنێتەوە، بەڵام خودی ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆگییەکە لەرزۆکە. بۆچی هۆشەکیەتی لە چەند بوارێکدا هەبێت و باوەڕێکی ناهۆشەکیی بە ئەفسانە لە بوارێکی دیکەدا هەبێ؟ مرۆڤی نویکۆنەوار

چۆن دەتوانێ کاتێک خەریکی پارەیە ببێتە ژمێریارێکی بێخەوش، بەڵام هەر ئەوەندەی چاوی بە ئاڵای وەڵاتەکەی کەوت یان گوێی لە ناوی خودا بوو، بە سۆزی لەرزۆک مەست ببێت؟

**١- سۆسیالیزمی هەشتاکان**

گەر شێستەکان و حەفتاکانی ئەم سەدەیە، لە سەرانسەری گۆی زەویدا بە پێشکەوتنێکی بەهێزی بزووتنەوە و فیکری سۆسیالیزم ناسرابێ، ئەوا هەشتاکان، لای زۆربەی چاودێران، بە پتەو بوونی ڕاستڕۆیی دادەنرێت. ڕێژیمی ڕاستڕۆ حوکومڕانیی دەوڵەتە سەرمایەدارە پێشەنگەکانی دەکرد: کۆدەوڵەتی ئەمەریکا، ژاپان، ئەڵمانیای ڕۆژاوا و بەریتانیا. یەکیەتیی سۆڤیەت و هاوپەیمانانی ڕۆژ بە ڕۆژ لایان سەختتر دەبوو شان بە شانی دنیای سەرمایەدار ڕێ بکەن. بەتایبەتی لە حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکاندا، لە زەمانی برێژنێف Brezhnev دا، ڕژێمی سۆڤیەتی تەواو تێکچوو. بیرۆکراتی، خۆی لە خۆیدا یەکجار گەورە بوو، مەزنتر و پتر ناکارامەتر و پتر هەوەسبازتر بوو. گوشاری سەر ئەوانەی خاوەن بیروڕای جودا بوون گرانتر بوو. لە ڕووی سیاسەتی دەرەکییەوە، یەکیەتیی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٧٩ وە خۆی لە شەڕی ئەفغانستانەوە گلاند کە هێندەی شەڕی ئەمەریکا لە ڤیەتنامدا دڕندانە و سەرشۆڕانە بوو. ئایدیۆلۆگیی مارکسی - لینینیی لیسەلمێنراو نەبووە هۆی دڵکێشی خەڵک، نە لە ناو بلۆکی ڕۆژهەڵاتدا و نە لە جێی دیکە. ئەو نوێکارییەی لە کۆمەڵگەی سۆڤیەتی و دیمانەکانیدا کرا و لە ڕۆژگاری میخائیل گۆرباتچۆڤەوە دەستی پێ کرد، هیچ بابەتێکی سەر بە دنیای بیری سیاسی-ئایدیۆلۆگیی یەکجار نەبوو بۆ گشت جیهان نوێی پێ.

ئەو دەوڵەتانەی ئەفەریقا کە سۆسیالیزمیان کردبووە بەرنامە، لە دەوڵەتانی خاوەن ڕژێمی لیبەڕال و کۆنەپەرست خراپتر چارەسەری هەژەندی نەهاتی و برسێتییان کرد. تاکە قارە کە سۆسیالیزمی هێشتا تێدا بە گوڕ بوو، باشوور و نێوەندی ئەمەریکا بوو، لەوێش ساندینیستەکان Sandinist ی نیکاراگوا، نەک کوبای کاسترۆ Castro، بوونە هێمای سۆسیالیزمی سەرکەوتوو.

سۆسیال دیمۆکرات، کە تەنیا لە وەڵاتە دەوڵەمەندە پیشەسازەکانی سەرمایەداردا برەوی هەبوو، پاش ئەو ساڵانی خێر و بێرەی بە سیاسەتی سەختانگی سییەکان دەستی پێ کرد و لە ماوەی نێوان ١٩٤٥-١٩٦٥ دا تەواو هەڵکشا، کەوتەوە تەنگانەوە. ئەو سیاسەتە ئابوورییەی ناوی کەینزی هەڵگرتووە و بە تەکنیکێکی بەرز دادەنرا بۆ زاڵ بوون بەسەر هەموو سەختانگێکی ئابووریدا، نەک تەنیا ژاکان و کەمکاری، بەڵکوو تەنانەت

ئاوسان inflation و «فرە گەرم بوون» یش، لە دەمەو کۆتای شێستەکانەوە کەوتە بەر ڕەخنەی کوشندە. ئەوەی ڕووی دا ڕێک ئەوە بوو کە بە تێوڕینی کەینز نەدەبا ڕوو بدات: هاوکات لەگەڵ هەڵکشانی بێکاریدا، ئاوسانیش زیادی کرد. کەینز دەیگوت بێکاری و بەرزبوونەوەی نرخ دوو تای تەرازوون، هەتا کار زیاتر بێت نرخیش لەگەڵی هەڵدەکشێ.

کاتێک تێوڕینەکانی کەینز کەوتنە بەر گومان، ململانێی کۆنی نێوان بۆچوونی لیبەڕالی کلاسیک و مارکسیی کلاسیک هاتەوە کایە، پاش ئەوەی لە سەرەتای سییەکانەوە، بەتایبەت لە ئەورووپادا، تێزەیەکی ئەوتۆی نەمابوو. گوتمان، لە کۆدەوڵەتی ئەمەریکاوە شێکارییەکی سەختانگ بە ناوی نوێلیبەڕالەوە، کە لە ڕاستییدا زۆر نێزیک بوو لە بۆچوونە کۆنەکانی لیبەڕالیزم، بە هەموو دنیادا بڵاوبووە. تێوڕینی مارکسایەتیی کلاسیک، کە دەیگوت سەختانگ دەرفەتە بۆ هەڵمەتێکی سۆسیالیستانە، پلەیەکی توندی لە کەناری چەپدا گرت و بووە ئیلهامبەخشی خەڵکی دیکەش نەک تەنیا هی مارکسییەکان. پارتی سۆسیالیستی فرانسە، ساڵی ١٩٨١، بەو پەیمانە هاتە سەر حوکوم کە سوود لە سەختانگ بێکاری وەرگرێت و پلەی چینی کرێکاران پتەو بکات و دەسەڵاتی هەوەسبازی سەرمایە لە فرانسەدا تەواو کەم بکاتەوە. ئەم سیاسەتە هەڵمەتبەرەی سەختانگ نێزیکەی دوو ساڵی خایاند، بەڵام کاتێ ئەو ئامانجانەی لێی چاوەڕێ دەکرا نەهاتنە دی، سۆسیالیستەکان یەکاویەک سیاسەتیان بەرەو سیاسەتێکی ئابووریانەی سەر بە لیبەڕالی کلاسیک گۆڕی.

پاشەکشەی کەینزایەتی و سەرنەکەوتنی سۆسیالیستەکانی فرانسە لە بەڕێوەبردنی سیاسەتێکی هەڵمەتبەری سۆسیالیستانەدا، ڕێگەی ئاواڵەی لە بەردەم سۆسیال دیمۆکراتە بیرازخوازەکاندا تەواو کەم کردەوە. هەڵکشانی لایەنی کاری ڕەسمی – واتە هەڵکشانی لایەنی کاری دەوڵەت و کۆمیون چ لەڕووی ژمارەوە و چ لە ڕووی فرەوانبوونی بواری ئەرکەکانییەوە – هەر زوو بوو بە تەگەرەیەکی گەورە بۆ سۆسیال دیمۆکرات. چ سەیریش لەوەدا نییە کە سۆسیال دیمۆکرات لە خاڵێکی وەها گرنگدا دووچاری تەگەرە ببێت. بێرنشتاین، وەک باسمان کرد، دەیگوت لە ڕێی دەوڵەتەوە، لە ڕێی پەرلەمانی هەڵبژاردەی خەڵکەوە، سۆسیالیزم دادەمەزرێ. ئەم بۆچوونە بەڵگەی دیکەشی کەوتە پاڵ: هەر لە سییەکانەوە سیاسەتی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فێرکاریی ژێر سایەی دەوڵەت بە باشترین شێواز دادەنران بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەی – ئەگەر سۆسیالیستانەش نەبێ – ئەوا یەکسان و دادپەروەر. ئەوجا ئەگەر ئەم بنگە دەوڵەتییە پەرەسێنە لە لایەن ئاپۆرەی

خەڵکەوە بە کۆسپ و مەترسیی لە ڕێی چەندین بواری گرندا دابنرێن، بێگومان تەگەرە بۆ پلە و پایەی سیاسیی سۆسیال دیمۆکرات پەیدا دەبێ.

هەتا نەوەدەکانیش، لە نێو سۆسیال دیمۆکراتیی ئەوروپای ڕۆژاوادا، زەحمەتە بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفت بیروڕای نوێ بدۆزینەوە. سۆسیال دیمۆکرات لە لایەک هەوڵی ئەوە دەدات کەینزایەتی بپارێزێ و کەموکوڕی و پاشەکشەکانی کەینزایەتی بە دیاردەیەکی کاتەکی دابنێت، لە لایەکی دیکەشەوە سۆسیال دیمۆکراتە حوکومڕانەکان سیاسەتێک دەگرنە بەر نێزیکە لەوەی لیبەڕالەکان داوای دەکەن، بەڵام بەو ڕوونییە نا: پاشەکەوت و کەمخەرجیی دەوڵەت ئەرکی یەکەمە، چارووباریش دەنگ بەرزدەبێتەوە و داوا دەکات چەند بوارێکی دەوڵەتی وەک تەندروستی و چاودێری منداڵ بفرۆشرێ بە لایەنی ئەهلی .

هەر لەو ڕێبازەشدا بیروڕای دیکەش هەڵنرا داوای پاراستنی کۆمەڵگەی بچووکی خۆرێبەری دەکرد. سۆسیال دیمۆکراتی چەپ لەم باوەڕە کۆبووبۆوە بەڵام لە هیچ جێیەک ڕەواجێکی ئەوتۆی پەیدا نەکرد. ئەم لاڕێبازە لایەنی وێکچووی هەبوو لەگەڵ کۆمیونیزمی ئەوروپای ڕۆژاوادا کە بە ناوی یورۆکۆمیونیزم eurocommunism ناوی دەرکرد و لەوەدەچێ هیچ نۆرەیەکی نەمابێ. لای هەردووکیان، سۆسیال دیمۆکراتی چەپ و یورۆکۆمیونیزم، دوو خاڵ بە ئاشکرا دیارە، یەکەم هەڵوێستێکی ڕەخنەگرانە بەرانبەر دەسەڵاتی نێوەندەکیی دەوڵەت و بەتایبەتی بنگە زۆردارەکانی دەوڵەت، دووەم: فرەواندن و ڕەپێشخستنی ئەو ئادگارەی نێو شیکاریی چینایەتیی سەر بە مارکسایەتیی کلاسیک بۆ پشتگری کردنی ئەوەی پێی دەڵێن نیوتوێژ و بریتییە لە دامەزراوانی دەوڵەت و کۆمیون. بەڵام دیسان لە مەسەلەی شۆڕشی سۆسیالیستانەدا نۆڕینیان جودایە. سۆسیال دیمۆکراتی چەپ بیرازخواز و ناشۆڕشگێڕە، یورۆکۆمیونیزم بڕوای بە پێویستیی گۆڕانکارییەکی شۆڕشگێڕانەی کۆمەڵگەی سەرمایەدار هەیە. بەڵام شۆڕش بەلای ئەمیانەوە جیاواز بوو لەوەی زووتر لە کۆمیونیزمدا باس دەکرا. شۆڕش لای ئەمیان نەی دەکردەوە دەسەڵات گرتنە دەستێکی زۆر خێرا کە ببێتە هۆی گۆڕانێکی دەمودەست لە بواری سیاسەت و کۆمەڵایەتی و ئابووریدا، بەڵکوو گۆڕانکارییەکی بنەڕەتیی درێژخایەنە. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە وەهای کرد یورۆکۆمیونیستان بە ڕادەی جۆراوجۆر چاوێک بخشێننەوە بە بۆچوونە کۆنەکاندا دەربارەی نۆرەی دیمۆکراتیی ڕەسمی و پەرلەمان پاش و پێش هەر شۆڕشێکی لە داهاتوودا ڕوو بدات.

بۆچوونەکەی ئەنگیلز کە دەیگوت هێزی پارتە سۆسیالیستەکان لە پەرلەماندا پێوەرێکە بۆ ڕسکانی چینی کرێکار، باوی نەما. لە بری ئەوە نۆرەیەکی گرنگ درا بە پەرلەمان و

هەڵبژاردنی گشتی بە تایبەتی لە وەڵاتە سەرمایەدارە هەڵکشاوەکاندا. کۆمیونیستەکان دەبێ بە پشتیوانی زۆرینەی خەڵکی دەنگدەر دەسەڵات بگرنە دەست نەک بە هەوڵی سەرتەڵێکی خۆشسازمان. جگە لەوە نۆرێنێکی ئایەتییان هەبوو دەربارەی ئەو ئازادیی دەربڕینە ڕەسمییەی لە زۆربەی وەڵاتە سەرمایەدارە لیبەراڵەکاندا هەبوو، بەڵام بۆ نموونە لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا بڕوایان بەو نۆرینە کۆمیونیستانە نەرێتەکییە هەر هەبوو کە دەیگوت هەتا سەرمایە دەست بە سەر دەزگەی ڕاگەیاندندا بگرێت و هەتا دەزگەی زۆرکاریی دەوڵەت، هەر ئەوەندەی بیروڕای ڕەخنەگرانە ڕوو لە کردەوە بکات، لە بەرهەڵستکاران بدات، ئازادیی دەربڕینی کارا هەر بەرتەسک دەبێت.

یورۆکۆمیونیستان ئەو گریمانەیەشیان ڕەت دەکردەوە کە دەیگوت پاش شۆڕش دەبێ دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا بۆ ماوەیەک دابمەزرێ. ئەم ڕەت کردنەوەیەش ئەنجامێکی خۆرسکی هەڵوێستی تازەیان بوو بەرانبەر ئازادی و مافی لیبەراڵانە. لەگەڵ ئەوەشدا خەباتی چینایەتییان لە هەموو کۆمەڵگەیەکی چینداردا بە مەسەلەیەکی بنەڕەتی دادەنا، لەبەر ئەوەش شیکاریی سەختانگ لای ئەوان جۆرێکی مارکسیانەی کلاسیک بوو. بەڵام ئایە چینە گەورەکان بە نۆرینی ئەوان کامانەن؟ لە وەڵاتانی پیشەسازدا ژمارەی کرێکاری پیشەسازی کەم دەبێتەوە، ژمارەی کارمەندان زیاد دەکات. بەشێکی پەرەسینی لاوانی ئەورووپا، بە هۆی بێکارییەوە هەرگیز ئاشنایەتییان لەگەڵ هیچ جۆرە کارێکدا نەبووە. ئایە دەشێ بۆچوونەکانی سەر بە پرۆلیتاریا هەر پەیڕەوی بکرێن؟ ڕاستە یورۆکۆمیونیستەکان - بەتایبەتی لە ئیتالیا - هەر پرۆلیتاریای پیشەسازییان بە دڵی ئەو چینە ستەمدیدەیە دەزانی کە دەبا کۆمەڵگەی سەرمایەدار وەرگەڕێنێ، بەڵام لە تەک پرۆلیتاریاشدا زۆربەی دامەزراوانی دەزگەی ڕەسمی و ئەهلی و بێکارانی کۆمەڵگەی پیشەسازییان دەخستە ڕیزی خەڵکی چەوساوەوە. لەگەڵ هەموو جیاوازییەکی نێوانیشان دەشێ بڵێین یورۆکۆمیونیزم، وەک ڕێبازەکەی ماو زیدۆنگی نێو کۆمەڵگەی چین، ڕێگەی نەرماندن و فرەواندنی چەمکی چینایەتیی مارکسیانەیان گرتە بەر. ئەم چەمکی چینایەتییەی ئەمان ڕیشەی پتر لە شیکاریی کۆمەڵناسیدا هەبوو وەک لە شیکاریی ئابووریدا.

لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا یورۆکۆمیونیزم بووە یەکێک لە بەدیلە سیاسییە سەرەکییەکان. ئەمڕۆ، پاش هەڵوەشان و ڕمانی یەکیەتیی سۆڤیەت، ئەو ناوە ناوەرۆکێکی ئەوتۆی نەما. وشەی «کۆمیونیزم» لە ناوی زۆربەی پارتەکاندا سڕایەوە. ئەو پارت و بزووتنەوانەی بەردەوامی بە نەریتی یورۆکۆمیونیزم دەدەن، جەخت هەم لەسەر بڕوایان بە دیمۆکراتی و هەم لەسەر بڕوایان بە سۆسیالیزم، دەکەن.

وەک باسمان کرد، ئادگارێکی گرنگی بەرهەڵستکارانی سۆسیالیستی ئەمڕۆ لەوەدایە کە ڕەخنە لە نێوەندەکیەتیی دەوڵەتی و لە چڕبوونەوەی توندی سەرمایەدارەتی دەگرن. یورۆکۆمیونیستانیش لەم ڕەخنانەدا بەشدار بوون بەڵام پێشەنگ نەبوون. لە نێو سۆسیالیستانی لاودا، زیاتر ئوتۆپیستەکانی سەدەی نۆزدەیەم - و بەر لە هەمووشیان Fourier - کە باسیان لە یەکەی سیاسیی یەکجار بەرتەسک دەکرد، برەوی پەیدا کردۆتەوە. ڕاستە وشەی کۆمیونیزم لە کۆمیون ـەوە هاتووە، کە دەکاتەوە کۆمەڵگەیەکی ناوچەیەکیی بەرتەسک و ڕاستیشە کۆمیونی پاریس بەلای کۆمیونیزمەوە نموونەیەکی مێژووکردە، بەڵام بە کردەوە بە دەگمەن نەبێ ڕەخنەی کۆمیونیزم لە دەوڵەتی نێوەندەکی لەوە تێپەڕی نەکردووە کە لە دەزگەی زۆرکاریی دەوڵەتی دەگرێ، «دەوڵەتاندن» بەلای ئەمان و بەلای سۆسیال دیمۆکراتیشەوە وشەیەکی گرفترەوێن بوو. ئایدیۆلۆگییەکی سۆسیالیستانەی نانێوەندەکیاندن decentralization هێدی هێدی سەر لە نوێ سەری هەڵدایەوە و تۆڕینەکانی Fourier دیسان برەویان پەیدا کردەوە.

**٢- گۆرباتچۆف**

میخائیل گۆرباتچۆف Mickail Gorbachev (سالی ١٩٣١ زاوە)، لە سالانی فەرمانڕەوایی خۆیدا (١٩٨٥-١٩٩١) تەواو سەرنجڕاکێش بوو. دەزگەی ڕاگەیاندنی زۆر خێرا و ڕووالەتخواز پێوەی خەریک بوون. زەردەخەنەی گۆرباتچۆف، هەر وەک پالاوتەکانی سەرۆکایەتی کۆمار لە کۆدەوڵەتی ئەمەریکا، هەم فرەوان و هەم ناچارەکی بوو. لە کۆنفرانسی ڕۆژنامەگەریدا بە سەبر و ناسک بوو، بەڵام وەهاشی ڕادەنواند کە تەواو جیددییە و ئامانجی خۆی باش دەناسێ.

میخائیل گۆرباتچۆف بێئاگا نەبوو لەوەی دەزگەکانی ڕاگەیاندنی بەرفرەوان هەڵسوکەوتێکی وەها دەخوازن لەگەڵ پەیامی مەبەستدا بگونجێت، لەبەر ئەوە کاتێ لە **گلاسنۆست** *Glasnost*، واتە کراوەیی و ئاشکرایی، دەدوا هەوڵی دەدا بە هەڵسوکەوتیش کراوەیی بنوێنێ. گۆرباتچۆف ئاشقی وشەی «دیالۆگ» بوو، بەردەوام لە دەزگەکانی ڕاگەیاندندا لە دیالۆگدا بوو. ئەوانەی پێش خۆی بە ڕووخسارێکی دڕندانە لە ئاشتی دەدوان، ئەم یەکجار ناسک و هێمنانە لەو پەیامە دەدوا.

ئەم، لەچاو سکرتێرە گشتییەکانی دیکەدا، نوێنەرایەتی شێوازێکی نوێی دەکرد. لە ناو چاودێراندا هەبوو دەیگوت ئەوەی نوێ بێت لای گۆرباتچۆڤ تەنیا ئەو خۆ ڕانواندنەیەتی. هەبوو دەیگوت گۆرباتچۆڤ بیرازخوازێکە وەک ئەوانەی دیکەی مێژووی یەکیەتیی سۆڤیەت، کە پێشنیازی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیی گرنگیان کردووە بەڵام پاش ماوەیەکی کورتی گەشە کردن ڕووبەڕووی بەربەرەکانێی یەکجار بەهێزی دەفتەری سیاسی بوون. هەبوو چاوەڕێی ئەنجامی بەرز و بەهێز بوو لەو پرۆسەیەی گۆرباتچۆڤ ڕێبەرایەتی دەکرد. هەبوو لە گۆڕانکارییەک دەدوا کە سەرلەبەر بێت و گیانی لینین هەڵگرتبێ. هەبوو دەیگوت گۆرباتچۆڤ هەرچی ڕەنگ و بۆی سۆسیالیزم و کۆمیونیزم هەبێ بە یەکیەتیی سۆڤیەتەوەی ناهێڵێ.

بە دواکاتەوە ئاشکرا بوو ئەم دوا ڕایە لە هەمووان پتر نێزیکی ڕاستی بوو. ئەو شارەزایانەی دەیانگوت گۆرباتچۆڤ تەنیا بێژەرێکی نایابە یان بیرازخوایکی بێدواڕۆژە بە هەڵەدا چووبوون، بەڵام ئەوانەیش کە بەتەما بوون یەکیەتیی سۆڤیەت ببێتە بەهەشتی گوتوبێژی بە جۆش و ئارەزووی ئەزموونکاری و گیانی پێشکەوتنخوازانە، دڵسارد مانەوە. شکۆمەندیی گۆرباتچۆڤ بووە نیشانەی کۆتابوونی مێژووی هەموو دەوڵەتەکە: گۆرباتچۆڤ پێشەنگیی پرۆسەیەکی گۆڕانکاریی وەهای کرد ئەنجامەکانی بە هیچ جۆرێک لەگەڵ خواست و مەبەستەکانی خۆیدا نەگونجان.

لەو بیرازانەی گۆرباتچۆڤ بەتەمایان بوو تەنیا بەشێکی کەمیان جێبەجێ کران. سەرلەبەری ڕشتەیەی ئەو نیازی بوو نوێکاری تێدا بکات، وەها وشک و ڕزیوو بوو بەرگەی گۆڕانکاریی بنەڕەتی نەدەگرت. لە زۆر لاوە بە توندی بەربەرەکانێی بیروڕایەکانی ئەم دەکرا، خۆیشی لە دەمەو کۆتای ماوەی حوکومڕانیی خۆیدا هەتا دەهات ڕاڕا و دوودڵ دەبوو. لە تەک گۆرباتچۆڤدا نوێخوازی دیکە سەریان هەڵدەدا و تەمایان لەم زیتر بوو، هەراسانیان دەکرد. ئەمیش بۆ ئەوەی چەکیان بکات دەکەوتە دڵدانەوەی پارێزەرانی ڕشتەی کۆن. بارەکە لە توانای گۆرباتچۆڤ گرانتر بوو و یەکڕەویی کردەوەکانی تێکدا.

ئەوجا ئەم پرۆسەی نوێکارییە هێزێکی دیکەی بووژاندەوە کە ئاشکرایە گۆرباتچۆڤ حیسابێکی وەهای بۆ نەکردبوو: ئەویش ناسیۆنالیزمە. ئەو مۆزاییکە مەزنەی کۆمار و گەلانی هەمەجۆری یەکیەتیی سۆڤیەت نێزیکەی حەفتا ساڵ بە توندی خرابوونە ژێر ڕشتەیەکەوە کە ڕووی لە یەکڕەنگی و یەکیەتی بوو. ئەو ئازادیی دەربڕین و کردەوە پەرەسێنەی ڕۆژگاری گۆرباتچۆڤ لە زۆر لاوە بە مەبەستی سەرخۆبوونی نەتەوەیی سوودی لێ وەرگیرا. ناسیۆنالیزمی تا ئەو دەمە خامۆش و خاو دەرفەتی وەرگرت و ئازادانە کەوتە

گەڕ و هەر زووش ئەفسانە و بۆچوونی چەوتی نەتەوەیی بەرفرەوانی لەگەڵ خۆی هێنا. سەختانگی خێرا بە ناخداچووی پیشەسازی و ئابووری، نۆرینی وەهای لای خەڵک ساز دەکرد کە گوایە ژیانێکی نەتەوەیی سەربەخۆ چارەی ئەم گیروگرفتانەش دەکات. ڕووس هەر لە سەرەتاوە لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا سەردەست بوون، لەبەر ئەوە گەلانی دیکە بۆ ڕزگاربوون لە ئاغایەتی سۆڤیەتی-ڕووسی ئەم بارەیان بە دەرفەت زانی. لە ڕووسیا خۆیدا، هەستی مەزنەڕووسایەتی، کە هەر لە سەردەمی ستالینەوە دەمێک هان دەدران و دەمێک لێ دەدران، شەپۆلی کەونە خەونی ڕووسیای مەزن و ئەرکی ڕێبەرایەتی گەلانی ڕۆژهەڵاتی بەرپا کرد. دەراوسێکانی ڕووس هەستیان بە مەترسیی ئەم تەمایانە دەکرد و ناحەقیشیان نەبوو. بەڵام ئەوانیش لە ناو خۆیاندا کەوتنە هەڕەشە لە یەک کردن، باسیان لە مەزنی و هەڵبژاردەیی خۆیان دەکرد، باسیان نەک تەنیا لە سەربەخۆیی بەڵکوو لە هەڵکشانی دەسەڵاتیش دەکرد.

لە لایەن ڕۆژاوای یەکیەتیی سۆڤیەتەوە، گۆرباتچۆف بە قارەمان دادەنرا چونکە بێ ئەوەی دەست بەرز بکاتەوە ڕێی بە دەوڵەتانی نێوەند و ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا دا ڕێگەی خۆیان بگرنە بەر. هەرچەندە ئێستلاند و لێتلاند و لیتوانیا، لە سەردەمی ستالیندا بە تالانی شەڕ داگیرکران، بەڵام گۆرباتچۆف ڕووبەڕووی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی ئەو دەوڵەتانەی بەلتیک بۆوە. لەوانەیە ئەمیان گەورەترین هەڵەی گۆرباتچۆف بووبێ. باڵی کۆنەواری پارتی کۆمیونیستی سۆڤیەتی، کودەتایەکی بێسەروبەری سەرنەگرتووی لە ئەرگوستی ساڵی ١٩٩١ دا، دژ بە گۆرباتچۆف کرد و بەوەش پەلەیان لە کەوتنی خۆی و ڕمانی هەموو یەکیەتیی سۆڤیەت کرد. ڕزگاری ئەوگوستی بۆریس یەلتسین Boris Jeltsin ی کۆنە دوژمنی گۆرباتچۆڤی کردە قارەمان. یەلتسین پاش سەری ساڵی ١٩٩١-١٩٩٢ بە کردەوە گۆرباتچۆڤی لابرد و یەکیەتیی سۆڤیەتیشی هەڵوەشاندەوە. لە بەرماوەکانی سۆڤیەت سازمانێکی شل بە ناوی OSS، کۆدەوڵەتە سەربەخۆکان، لە چەندین دەوڵەتی سەربەخۆ هەڵنرا و داهاتووشی یەکجار نادیارە.

گۆرباتچۆف بیری سیاسیی خۆی لە کتێبی **پێرێسترۆیکا** *Perestrojka* دا، ساڵی ١٩٨٧ دارشت، ئەم کتێبە کاتی خۆی جێی مشتومڕێکی بەرفرەوان بوو. ئەگەر بیری سیاسیی گۆرباتچۆف بەو پاشخانی فراژووتنە توندەوە بگرین کە باسمان کرد، لەوانەیە کەمبایەخ دەرچێ. ڕاستە کاریگەری ئەو بیرانە بە ڕادەیەکی یەکجار بەرتەسک هاوشانی مەبەستی ئەو بیرانە بوون، بەڵام ناڕاستەوخۆ نۆرەیەکی یەکجار گەورەیان هەبوو لەوەدا کە بوونە هۆکارێکی کارا لە یەکێک لەو پرۆسە هەرە بنەڕەتییانەی گۆڕانکاریی مێژووی نوێ.

تەنیا ئەو ئاڵوگۆڕانەی زەدەی شەڕی وێرانکار بوون دەشێ بەراورد بکرێن بەو گۆڕانکارییانەی لە چەند ساڵێکی کەمی هەشتاکان و نەوەدەکاندا، لە بەرلینەوە هەتا ڤلادیڤۆستۆک Vladivostok ی گرتەوە.

یەکەم لایەنی بیری سیاسیی گۆرباتچۆڤ بریتییە لە ***گلاسنۆست***، کراوەیی. یەکیەتی سۆڤیەت بە دەیان ساڵ لە ژێر دیکتاتۆرییەتی بێدەنگیدا دەژیا. تەنیا دەنگی ڕەسمی و پەسندکراو بۆیان هەبوو بەربیست بن. دەنگێ لە ناجۆریی هەلومەرج بدوایە بێدەنگ دەکرا، ڕاستی هەراسێن دەخرایە ژێر پێوە، ئاماری درۆزنانە وەهای لە هاوزێدان و دنیاش گەیاندبوو کە فراژووتن یەکجار زیاترە لەوەی لە ڕاستیدا هەیە. ئامانجی بیری کراوەیی‌ی نوێی گۆرباتچۆڤ تەنیا ئەوە نەبوو ئەو مافانە دامەزرێنێ کە بۆ نموونە خەڵک لە ئەورووپای ڕۆژاوادا هەیانبوو، بەڵکوو خواستێکی بەهێزی ڕۆشناکیشی تێدا بوو. ئەگەر وشە ئازاد بکرێ، ڕاستیش بەربیست دەبێت و خەڵکی بە زانینی ڕاستی دەزانن چ شتێک باشە بکرێ.

گۆرباتچۆڤ لەم مەبەستی ***گلاسنۆست*** ـەدا سەرکەوتووتر بوو وەک لە بوارەکانی دیکەدا. دەزگەی ڕاگەیاندن لە یەکیەتیی سۆڤیەت لە چەند ساڵێکی کەمدا تەواو گۆڕا. تیڤێ (تەلەڤیزیۆن TV) و ڕادیۆ و ڕۆژنامەکان، کە هەتا ئەو دەمە تەنیا گوتەی ڕەسمییان دووبارە دەکردەوە و هەوڵیان دەدا بە خەڵکی بسەلمێنن کە لە کۆمەڵگەیەکی تەواو ڕسکاودا دەژین، پڕ بوو لە ئاشکرا کردنی بەدکاری و گزیکاریی دەسەڵاتداران. گرفتی کۆمەڵایەتی زیانبەخش، کە هەتا ئەو دەمە باس کردنیان کپ دەکرا، بە ئاشکرا گفتوگۆی لە سەر دەکرا. تاریکترین ڕۆژگاری مێژووی وەڵاتەکە، کە ماوەی درێژخایەن و دزێوی ڕژێمی تیرۆری ستالین بوو، بووە مایەی چەندین ڕاپۆرتی دەروون هەژێن.

بەڵام لە تەک کراوەییدا، لایەنی وەهاش گەشەیان کرد کە بەشێک نەبوون لە مەبەستەکانی گۆرباتچۆڤ. دەرفەت نەک هەر بۆ بیروڕای نەتەوەخوازانە ئاواڵە بوو، بەڵکوو خەڵک چاوی کرایەوە و زانی کە ئاستی گوزەران لە ئەورووپا هێندە بەرزترە لەوەی خۆیان بەراورد نەکرێ. ئەمەش بووە بنەمایەک بۆ بڵاوبوونەوەی ئەو بیرانەی داوای گۆڕینی هەموو کۆمەڵگەی سۆڤیەتیان دەکرد بەرەو ڕووگەیەکی سەرمایەداری بنەڕەتی. گۆرباتچۆڤ - وەک هەموو کەسێکی دیکەی کۆتای هەشتاکان - بە گوتەی شیرین لە بازاڕ دەدوا، بەڵام ئامادە نەبوو گۆڕانکاریی وەها بسەلمێنێ مانەوەی کۆمەڵگەی سۆڤیەت بخاتە مەترسییەوە. ئەوەی ئەو پێی دەگوت پێرێسترۆیکا Perestrojka، کە بە ڕووسی دەکاتەوە سازکردنەوە و بیناکردنەوە، لای ئەو سنووری دیاریکراوی هەبوو. بیرازەکان

ئەدەبا هێندە قووڵ بن هەموو باڵەخانەکە برمێنن. بەڵام لە نێو خەڵکدا دەنگی لەو بابەتە زوو زوو بەرز دەبۆوە، بە دواکاتیشەوە، لێمان ئاشکرایە کە ئەو پێشنیازانە سەریان گرت.

بابزانین گۆرباتچۆف مەبەستی لە پێریسترۆیکا چی بوو. گۆرباتچۆف جاروبار لە شۆڕشێکی پێشەنگ دەدوا، بەڵام کاتێک ڕەخنەی لێ دەگیرا بەوەی گوایە ڕەوتی خاوە، دەیگوت نابێ ڕێ بە «ڕەوتی شۆڕشگێڕانە» بدەین. جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە پێریسترۆیکا دەبێ هەموو بوارێک بگرێتەوە، هەر لە ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە هەتا ئاستی زانست و هونەر.

بوار هەبوو، وەک بواری ئایدیۆلۆگیی پەسەندکراوی سۆڤیەتی، گۆرباتچۆف تێیدا زیاتر بێدەنگ بوو، ئەوەش دیاردەیەکی ڕێکەوت نەبوو. ئەگەرچی لەم بوارەشدا گۆڕانکاریی بنەڕەتی کرا - بەڵام زیاتر بەوەی چەمکی تازە، بە بێدەنگی، هاتنە جێگەی چەمکی کۆنی وەها کە تا ئەو دەمە نێوەندەکی بوون - گۆرباتچۆف خۆی نەدا لە گوتوبێژێکی کراوەی ئەوتۆ لە بواری ئایدیۆلۆگیدا.

کەسێک بە چاوێکی کراوە نووسینەکانی خوێندبایەوە و بە وردی گوێی لە گوتەکانی ڕادێرایە دەیتوانی تێبینی بکات کە گۆرباتچۆف تەواو خۆی لە زاراوەی «سۆیالیزمی زانستانە» ی زۆر باوی جاران دەدزێتەوە. ئەم دەربڕینە دەگەڕێتەوە بۆ مارکس و ئەنگیلز و لە سۆڤیەتدا کرابوو بە دەستەبەرێک بۆ ئەوەی کە سیاسەتی وەڵاتەکە لەسەر بنەمایەکی ژیرانە و زانستانەی پتەو دامەزراوە. گۆرباتچۆف تەنیا یەک جار ناوی ئەم زاراوەیە لە ***پێریسترۆیکا*** دا دەهێنێ، ئەویش بەحیساب: «ئەو دیمانەیەی ئێمە پێی دەڵێن سۆسیالیزمی زانستانە». بەرانبەر ئەوە لە جۆرە زانستێکی دیکە دەدوا، باسی لە کەموکوڕیی لێکۆڵینەوەی سۆڤیەت دەکرد، ئاماژەی بۆ ئەو «دۆگما و ڕێساگەل» ـە دەکرد کە لە سۆڤیەت قەناعەتیان بە خەڵک کردبوو. ئاشکرایە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەو ڕێنامە وشکانە دەکات کە لە بنەما و کارپێکردنەکانی مارکسایەتی- لینینایەتی دەدوان و بووبوونە جێی بڵاوکردنەوەی پەیامی دەسەڵاتداران و بیریارانی ئەوان.

گۆرباتچۆف پەرەی بە چەمکی تەرابوون alienation ی نێو کۆمەڵگەی سۆڤیەتی دەدا. ئەم چەمکە کاتی خۆی مارکسی لاو بەکاری دەهێنا. لە سۆڤیەت هەر زوو لە دەمەو کۆتای سالانی پەنجاکاندا ئەو چەمکە ڕەت کرایەوە چونکە زۆر کەس هەوڵیان دەدا لە زمانی ڕەخنەگری و ڕادیکالانەدا بەکاری بهێنن.

لەگەڵ ئەوەشدا، گۆرباتچۆف بە دەگمەن ناوی مارکس و ئەنگیلزی دەهێنا. بەڵام زوو زوو ئاوەڕی لە لینین دەدایەوە و لەمەیاندا جیاوازیی لەگەڵ ڕێبەرانی دیکەی زووتری

سۆڤیەتدا نەبوو. بەلاَم ئەم بە شێوەیەکی یەکرەوانە لە گوتە و کردەوەی دواسالاَنی لینین دەدوا، واتە لەو سیاسەتەی پێی دەگوترێ سیاسەتی ئابووریی نوێ، کە چەندین هەولَی تێدا درا بۆ هێنانەوەی ڕشتەیەکی وەها جێی هەولَدانی تاکەکەس، هەرەوەزایەتی، مولَکایەتیی کەسەکیی سنووردراو و جۆرە هاوچاوییەکی تێدا ببێتەوە. لینین ئەو دەمە، لینینێک بوو شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ ی بەسەر بردبوو، ئەو لینینە بوو باسی مەترسییەکانی بیرۆکراتی و خاوی و لەرزۆکی پرۆسەی پێشکەوتنی کردبوو. ئەو لینینە بوو لە وەسیەتنامەیەکدا خەلَکی لە هەڕەشەی ستالین وریاکردبووەوە.

لەوە دەچێ گۆرباتچۆڤ لەمەی کە لینینی بە نموونە هەلَبژاردووە بیرێکی قوولَتریشی هەبووبێ. سۆسیالیستانی زووتر لە دنیایەکی پێش-سۆسیالیزمانەدا ژیان. لینین یەکەم کەس بوو پاش شۆڕشی ١٩١٧ بەسەرهاتێکی دیکەی لەگەلَ سۆسیالیزمدا بەسەر بردبوو. پاش ئەویش ستالین هات و هەموو شتێکی تێک دا.

گۆرباتچۆڤ زوو زوو ئاماژەی بۆ ئەو گوتانەی لینین دەکرد کە باسیان لە درێژخایەنی و سەختی فراژووتنی ڕێگوزەری کۆمەلَگەی بێستەم دەکرد. زووتر پڕوپاگەندەی سۆڤیەتی بە ئەوپەڕی دلَنیاییەوە لەوە دەدوان چۆن و کەی کۆمەلَگەی کۆمیونیستانە دادەمەزرێ. خرۆچۆڤ Krushchev سالَی ١٩٨٠ ی بۆ دانابوو... گۆرباتچۆڤ بەرانبەر بەوە جەختی لەسەر نائارامیی پرۆسەکە دەکرد. تەنانەت دەیگوت زەحمەتە ئاماژە بۆ «دوائامانجەکانمان» بکەین. تاکە داوای ئەوە بوو «نوێکارییەکی بنەڕەتی هەموو بوارێکی کۆمەلَگەی سۆڤیەتی بگرێتەوە». لەگەلَ ئەوەشدا گۆرباتچۆڤ تەواو دەست بەرداری ڕەوانبێژی سەر بە ناچارەکیەتی determinism نەبوو. چاروبار لە پێویستیی و ناچارەکیی فراژووتنی دەدوا. بەلاَم لەوە دەچوو مەبەستی لەو وشانە ئەوە بووبێ کە بەدیل تەنیا ئاژاوَلە و ڕمانی سەرانسەرییە.

دەیسا گۆرباتچۆڤ دەیویست چ بکات؟

مەبەستی سەرەکەی گۆرباتچۆڤ گۆڕانکارییەکی ئابووری و سیاسیی کۆمەلَگەی سۆڤیەت بوو. ئابووری لە کۆمەلَگەی نۆزدەیەمی پارتی کۆمیونیستی سۆڤیەتیدا بە «گرنگترین بواری ژیان» دانرابوو. لە تەک ئەوەشدا گوترابوو «بیراز کردنی ڕشتەی سیاسیی خۆمان دۆزێکی سەرەکییە». دەشێ بگوترێ هەردوو گریمانەکە لەگەلَ دیمانەی نەریتیی مارکسیدا دەگونجێن. ئابووری - بە واتا بنەڕەتییەکەی دەکاتەوە شێوەی پەیدا کردن و دابەش کردنی پێداویستی ژیانی خەلَک - خودی ژێرخان پێک دێنێ. بەلاَم تەنیا بە سیاسەت هەلومەرجی نێو ئەو ژێرخانە بە شێوەیەکی بنەڕەتی دەگۆڕدرێت.

دڵگەرمیی بیرازخوازانە لە بواری ئابووریدا پتر ئاشکرا بوو و دەشی توانی بەرهەمێنتکی مایەکیی ڕاستەکی هەبێت.

ڕشتەی سۆڤیەتی لە دوو هەرەمی لاتەریبی مەزن پێک هاتبوو: حیزب و دەوڵەت. بە نۆرینی باو دەبا پارتی کۆمیونیست دەست پێشخەری بکات بەلام دەوڵەت - بە هەموو پەل و پۆیەکی ناوچەیەکییەوە - دەسەلاتی دەستوور دانان و بەجێهێنەر و دادپرسیی هەبێت.

گۆرباتچۆڤ نەگەیشتە ئەوەی بە جیددی مۆنۆپۆلی پارتی کۆمیونیست بخاتە بەر گومان. خۆیشی و لایەنگیرانیشی دەیان گوت سۆڤیەت هەر دەبێ دەوڵەتێکی یەک حیزبی بێت. بەڵام دەیویست هەڵبژاردن لە هەموو ئۆرگانێکی حیزبیدا بە دەنگ دانی نهێنی بێت، ئەگەر گەل بۆی نەبێت لە نێوان چەند حیزبێکدا یەکێک هەڵبژێرێ، دەبێ ڕێگەی ئەوەی هەبێت لە نێو چەند پالاوتەیەکی خاوەن ڕێباز و ئیدیالی جودادا، یەکێک هەڵبژێرێ.

ئەو کەسەی هەڵدەبژێردرا چیدی بۆی نەبوو وەک جاران هەتا هەتایە لەو جێگەیەدا بمێنێتەوە، سنوور بۆ ئەو کاتەش دانرا، ئەمەش لەچاو نەریتی وەلاتەکەدا گۆڕانکارییەکی مەزن بوو.

ئەوجا پێوەندیی نێوان حیزب و دەوڵەت دەبا بگۆڕدرێت. حیزب بە پێی ئەو نۆرینە باوە دەبا ئەو پێشڕەو و پێشەنگە بێت کە پلانە گەورەکان دادەڕێژێ، ڕێبەرایەتی دەکات و دنەی دەست پێشخەریی نوێ دەکات. ئەو دیاردەیەی لە زەمانی ستالینەوە سەری هەڵدابوو و ڕێی دەدا بە حیزب دەست بخاتە هەموو وردەکارییەکەوە، بەلای گۆرباتچۆڤەوە نیشانەی داڕزان بوو. ئەو ڕەوتە بووبووە هۆی خنکاندنی هەموو دەست پێشخەرییەکی تاکەکەسی و خودی ئاواتەکانی حیزبیش. حیزب و دەوڵەت لە ئاپۆرەی خاوی و بێچالاکیدا خنکابوون. هەموو وزەیەک لە وردە پلان و چاودێریدا سەرف دەکرا.

گۆرباتچۆڤ لە بەرنامەکەی خۆیدا جەختی نەک تەنیا لەسەر ***گلاسنۆست*** و ***پێرێسترۆیکا*** دەکرد بەڵکوو لەسەر *Demokratizatsija* ***دێمۆکراتاندن*** یش دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا نووسین و گوتارەکانی گۆرباتچۆڤ ڕاڤەیەکی ئەوتۆی ئەو دێمۆکراتییە نادەن بەدەستەوە. گۆرباتچۆڤ دان بەوەدا دێنێ کە «پێرێسترۆیکا شۆڕشێکە لەسەرەوە»، واتە گۆڕانکارییەکە دەستەی دەسەلاتداران خستوویانەتە گەڕ. بەڵام ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە ئەم ڕەوتە بێ پشتیوانییەکی گەلێری فرەوان سەر ناگرێت. گۆرباتچۆڤ دەڵێ «خەڵک مێژووی خۆی دروست دەکات» بێ ئەوەی بڵێت ئەمە گوتەی مارکسە و بێ ئەوەی وشەکانی دیکەی ڕستەکەش تەواو بکات کە دەڵێ «... بەڵام ئەم کارە لە هەلومەرجی تایبەتیدا دەکەن».

له ڕۆژاوای ئەورووپا و کۆدەوڵەتی ئەمەریکا - هەر نەبێ لە نێو سیاسەتمەدار و دەوڵەتناساندا - مەبەست لە «دیمۆکراتی» شێوە حوکومڕانییەکی تەواو دیاریکراوە، بە هەڵبژاردنی گشتی ئازادەوە، بە بڕیاری زۆرینەی ئەنجومەنی بڕیاردەرەوە، بە دەرفەتی ئازاد بۆ هەڵنانی باوەڕی گشتییەوە و بەچەندین مافی چەسپاوەوە. لە ماوەی پێرێسترۆیکای سۆڤیەتیدا وشەی دیمۆکراتی مەیلی ئەوەی پەیدا کرد بەرەو دیمۆکراتیی ڕاستەوخۆ بڕوات. دیمۆکراتیی ڕەها بوو بەوەی هەموو کەسێک کاریگەرییەکی دەموودەستی هەبێ لەو بڕیارانەدا کە پێوەندیی بە سەروکاری خۆیەوە هەبێت. گۆرباتچۆڤ بەم واتایە لە دیمۆکراتیی کارگە دەدوێ و دەڵێ دەبێ کرێکاران و دامەزراوانی دیکە ڕاستەوخۆ سەرکارەکانیان هەڵبژێرن.

بیرۆکەی دیمۆکراتیی ڕاستەوخۆ، کە ڕیشەی لە نەریتێکی ڕادیکالانەدا هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ ڕوسۆ و شۆڕشی فرانسی، تێکەڵ بە چەمکی ***نێوەندەکیەتیی دیمۆکراتیانەی*** لێنین کراوە. مەبەستیش ئەوە نەبوو پشت بکەنە چەمکی نێوەندەکیەتیی دیمۆکراتیانە، بەپێچەوانە، دەبا «بیوژێنرێتەوە و پەرەی پێ بدرێ». گۆرباتچۆڤ دەیگوت زووتر ئەم چەمکە شێوێنرابوو، کرابوو بە «نێوەندەکیەتیی بیرۆکراتیانە».

پێرێسترۆیکا، بە نۆرینی ئەندازیارەکانی خۆی، دەبا ببێتە هۆکارێکی وەها زۆربەی گەل کاریگەرییەکی بەهێزتر و ڕاستەوخۆتری هەبێت لەو بڕیارانەی دەردەچن. جگە لەوەش خەڵک لە کاروباری خۆیاندا کاریگەرتر دەبن. گۆرباتچۆڤ بێمەبەست نییە جووتیاران بەنموونە دەهێنێتەوە و دەڵێ «خۆیان باشتر دەزانن چ جۆرە ڕێبەرایەتی و سازمانێکی خزمەتگوزارییان پێویستە».

ئەگەرچی پێرێسترۆیکا «شۆڕشێکە لە سەرەوە»، بەڵام گۆرباتچۆڤ دەیگوت بیرازکرییە ئابوورییەکان دەبێ لە کەنارەوە، لە چالاکی تاکەکەسەوە، دەست پێ بکەن. جاران گەر شەریکەیەک سەرکەوتنێکی وەدەست هێنابا، هەموو خەڵاتێکی دەکرا ئەوە بوو ئاستی بەرهەم هێنانی پێنج ساڵی داهاتوویان بۆ بەرز دەکردەوە. هەڵبەتە ئەمەش مانای ئەوەیە خەڵک نابێ زۆر زیرەک بێت! پێرێسترۆیکا دەڵێ ئەم بارە دەبێ بگۆڕدرێت، ئەوەی دەستپێشخەر و سەرکەوتووە دەبێ دنە بدرێ و خەڵات بکرێ. دەبێ سنوورێک دابنرێ بۆ هەموو ئەو زیان و خەسارەتەی لە خەڵک وساماندا دەکرێ و دەبێ نوێکارییەکی تەکنیکیی بنەڕەتی بێتە کایەوە. لە بواری تەکنەلۆگیدا، سۆڤیەت بە شێوەیەکی هەژەندانە لە ئەورووپای ڕۆژاوا و کۆدەوڵەتی ئەمەریکا و ژاپان، بەجێ مابوو (بواری ڕیزپەڕ، کە ڕاستی دەستوورەکە دەسەلمێنێ، بواری ئەرتەشی و بواری تەکنیکی گەردوون بوو). گۆرباتچۆڤ

بەردەوام دەیگوت ئەم بوارانە دەبێ نوێکارییان تێدا بکرێ. زانستی هەڵکشاو و تەکنەلۆگیی بەرز دەبێ خەڵات بکرێن. هەر کاتێک گۆرباتچۆف گفتوگۆی لەگەڵ سیاسەتمەدارانی دەوڵەتە سەرمایەدارەکاندا کردبێ، «تەکنیک گۆڕینەوە» ی دەکردە یەکێک لە سەردێڕە بەرزەکانی دانیشتنەکە.

ئەوجا بە بۆچوونی گۆرباتچۆف، ئەم ڕشتە نوێیەی ئابووری چارەیەکیش بۆ دیاردەی کەمیی یەکجار کەمی شتومەکی بازاڕی سۆڤیەت دەدۆزێتەوە.

لە ڕاستیدا لەم پرۆژە گەورەیەی نوێکاریی ئابووریدا هیچ شتێکی ئەوتۆی لێ شین نەبوو. لە ماوەی حوکومڕانیی گۆرباتچۆڤدا، بەردەوام ئابووریی سۆڤیەت خراپتر دەبوو. بەرهەم هێنان کەم دەبۆوە، کەمیی شتومەکی نێو بازاڕ خراپتر دەبوو، بازاڕی ڕەشیش گەرمتر دەبوو. لە ناو گەلدا پلەی خۆشویستنی گۆرباتچۆف تەواو دابەزی. بەڵام لە دەرەوەی سۆڤیەت پتر خۆشەویست دەبوو چونکە سەرکەوتووانە گرژیی سیاسیی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای ڕەواندەوە و ڕێگەی دا وەڵاتانی ڕۆژاوای سۆڤیەت ڕێگەی خۆیان بگرنە بەر و لە پێوەندیی یەکیەتیی سۆڤیەت ڕزگار بن.

### ٣- پاش ڕمانی یەکیەتیی سۆڤیەت

زۆربەی ئەو وەڵاتانەی سەر بە دنیای دەسەڵاتی سۆڤیەت بوون، پاش ڕمانی ڕژێمە کۆمیونیستەکان، ڕێبەری نوێیان تێدا هەڵکەوت. ڕاستە بۆریس یەلتسینی ڕووسیا لە مێژ بوو لە دەستەی دەسەڵاتدارانی وەڵاتەکەی خۆی بوو، بەڵام کاتێک بە سەرکۆماری ڕووسیا هەڵبژێردرا دەمێک بوو دەستی هەڵگرتبوو لە پارتی کۆمیونیست و بووبووە گەورەترین بەرهەڵستکاری ئەو پارتە. لە پۆلۆنیا لێخ ڤاوێلسا Lech Walesa ی ڕێبەری سۆلیداریتێت کە سازمانی سەدنیکای ئازاد بوو، بوو بە سەرکۆمار. لە چەکوسلۆڤاکیا، لە دواساڵی تەمەنی وەڵاتەکەدا بەر لەوەی دوو کەرت ببێت، ڤاسلاف هاڤێل Václav Havel، کە بەناوبانگترین بەرهەڵستکار بوو لە ئەورووپای نێوەند و ڕۆژهەڵاتدا، بوو بە سەرکۆمار. ئەم سێ کەسە، بە سێ جۆری تەواو جیاواز بوونە هێمایەک بۆ فراژووتنی هەڵگەڕانەوەی وەڵاتەکانی خۆیان. لێخ ڤاوێلسا، کرێکاری کارگەی کەشتیسازی بوو، بووە بەرهەڵستکارێکی دڵێر، بەڵام هەرگیز خۆی بە بیریارێکی سیاسی دانەناوە. لە سۆلیداریتێتی هەشتاکاندا خەڵکی دیکە بەرنامەیان دەهۆنییەوە وناملکەی دیمانەکییان دەنووسییەوە. پاش ڕووخانی کۆمیونیزم ئەو سازمانەی جاران یەکگرتوو بوو، فرەبەرەکی

تێکەوت. ڤاوێلسا بەتایبەتی پاش ئەوەی بۆ سەرکۆمارەتی هەڵبژێردرا، بە باڵی کۆنەواری سازمانەکە دادەنرا. ڤاوێلسا هەردەم مەسیحییەکی دڵگەرم بووە و ئەمجا وەک ناسیۆنالیستێکی تەواو ڕسکاوی پۆلۆنی خۆی دەنواند. چەندین کەسی هۆگر و هاوکاری خۆی ڕەخنەی تاڵی لێ دەگرن، بەڵام زۆر بە دڵنیایی و سەنگینانە بەرگی ڕێبەرایەتی کردۆتە بەر و بە ڕواڵەت باکی بە ڕەخنەی دۆستانی نییە.

بوریس یەلتسینیش هەر وەک ڤاوێلسا هەوڵی نەداوە بەرنامەیەکی سیاسیی ڕەسەنی تایبەت بە خۆ دابڕێژێ. کاتێ گەیشتە دوندی دەسەڵات، بە هەڵی زانی و کتێبێکی دەربارەی ژیانی خۆی و ڕێبازی سیاسیی خۆی بە ناوی *دان پیانان* (١٩٩٠) دەرکرد. ئەمەش کتێبێک نییە بیری قووڵی تێدا بێ، بەڵکوو چیرۆکی "کوڕە ئازاکەیە"، باس لە ڕێگوزەری کوڕە هەژار دەکات بەرەو دەسەڵات و شکۆمەندی. لە تەک ئەوەشدا هێرشێکی زۆری تێدایە بۆ سەر گۆرباتچۆف کە گوایە هەتا دەهات نەکردەتر دەبوو. جگەلەوەش پەندی سوێرکراوی خۆشباوەڕانەش پێشان دەدات، بۆ نموونە باس لە کاتی سکرتێریتی خۆی دەکات لە پارتی کۆمیونیستی ناوچەی Sverdlovsk و ئەنجامەکەی وەها کۆدەکاتەوە: «بەر لە هەر شتێک دەبێ خەفەت بۆ ئەو خەڵکە بخوێن کە هەردەم لە پەرۆشی زیاد کردنی بەرهەمدا بوون. ئێستاش ڕام هەر وایە». لە دەستێشی دێ خوێنەران بخاتە سەرسوڕمانەوە: لابەلا دەڵێ چەمکە سەرەکیی گۆرباتچۆف، *پێرێسترۆیکا* و *گلاسنۆست* و هتد، یەکەم جار بەر لە دووسەد ساڵ لە لایەن فەیلەسووفی مەزن ئەمانوێل کانت Immanuel Kant ـەوە، داڕێژراون. یەلتسین ئەم باسەی لە کوێوە هێناوە، مەگەر هەر خۆی بیزانێ.

بەڵام یەلتسین پیاوی کردارە نەک وشە. لەوەدا ئەم لە ڤاسلاڤ هاڤێل جیا دەبێتەوە. هاڤێل نووسەرە و لە ناو هەرسێکیاندا تەنیا ئەمە شتێکی داڕشتبێ بشێ پێی بگوترێ بەرنامە یان هەر نەبێ بەیانێکی بیروڕای خۆی. لە کتێبێ *شێتێک لە پراگدا* (١٩٨٩)، وتار و پەخشانە گرنگەکانی خۆی کۆکردۆتەوە. ئەگەر بڵێین هاڤێل لەوێدا ئایدیۆلۆگییەکی هەڵناوە، لەوانەی خۆی بە شکاندنەوەی بزانێت – خۆی وشەی «ئایدیۆلۆگی» تەنیا بۆ ئەو وەهمکارییە بەکاردەهێنێ کە بووبووە خەسڵەتێکی ڕژێمی کۆمیونیستی چەکوسلەڤاکی و خۆی زۆر سەرسەختانە و لە ئەنجامیشدا سەرکەوتووانە بەرەنگاری بووبووە. بە نۆڕینی هاڤێل ژیانی ژێر سایەی ئایدیۆلۆگی، بەو هەموو وشە ڕەنگینە بەڵام درۆیەی ناڵەباریی هەڵکەوت دەشارێتەوە، «ژیانێکە لە درۆدا». ژیان لە ڕاستگۆییدا دەکاتەوە بەرپرسییەکی ئاکارانەی بێدووڕڵی. هاڤێل پاش «شۆڕشی دۆستانە» ی پراگ نەیسەلماند تاوانی ساڵانی ستەم بخاتە ئەستۆی دەستەیەکی بچووکی دەسەڵاتداران. هەر هەموو تاوانبارن: «ئێمە

هەر هەمووومان خۆمان ڕاهێنا لەگەڵ ئەو ڕشتە تۆتالیتارە و وەک ڕاستییەکی نەگۆڕ سەلماندمان، لە ڕاستیشدا ئێمە بەو کارە حوکمەکەیمان ڕاگرت. کەواتە ئێمە هەمووومان - هەڵبەتە بە پلەی جۆراوجۆر - بەرپرسین لە گەڕانی ئەم کۆچەرخە تۆتالیتارە. هیچ کامێکمان تەنیا قوربانیی ڕشتەکە نین، بەڵکوو هەمووومان، هەم قوربانی و هەم بیناکاریشی بووین». بەم جۆرە هاڤێل دەیەوێ لە بەرهەڵستییەکی ئاگادارانەوە بەرانبەر هەموو ئایدیۆلۆگییە سیاسییەکان، هەر لە چەپەوە هەتا ڕاست، بڵێت سەر و بنی سیاسیەت هەر ئەوەیە کە تاکەکەس لە ڕووی ئاکارەوە بەرپرسە لەوەی هەڵوێست لە ڕشتەی دامەزراو وەربگرێت. کەس مافی ئەوەی نییە، بە بیانووی ئەوەی بیر و کردەوەکانی چ نۆرەیەکیان نییە، خۆی دوورەپەرێز ڕاگرێ. گەر هەموو کەس کۆمەڵگەی درۆزنانە بسەلمێنن، ئەوا هەر دەمێنێ. بەڵام هەر ئەوەندەی بەسە یەکێک هاوار بکات پاشا ڕووتە ئیدی هەموو شتێک دەگۆڕدرێ. لاوازی ڕشتەکە ئاشکرا دەبێت و گۆڕانکاری دەست پێ دەکات.

بابزانین کۆمەڵگەی ستەم بە لای هاڤێلەوە چییە؟ هاڤێل وەسفێکی وردی شێوازی ئەو کۆمەڵگەیە نادات بە دەستەوە. گرنگترین خەسڵەتی کۆمەڵگەی ستەم ئەوەیە، نۆرەی ساختە بەسەر خەڵکدا دەسەپێنێ، بەوەش ناسنامەی ڕاستەکی ئەو خەڵکە پێشێل دەکات و ئازادییان لێ زەوت دەکات. ئەو ناسنامەیەش شتێک نییە بخرێتە چوارچێوەی چەمکی سیاسی یان کۆمەڵایەتییەوە. مرۆڤ، هەر هەمووی، بەرهەمێکی هەلومەرجی دەرەکی نییە، «بەڵکوو بەردەوامیش لە بارێکدایە ئاوڕ لە شتێکی بەرزتر دەداتەوە». دیاریش نییە ئەم گوتەیەی تا چ ڕادەیەک پێوەندە بە چەمکی دینەکیی نەرێتەکییەوە و هاڤێل خۆیشی لێکدانەوەی وەها ڕەت ناکاتەوە. بە هەر حاڵ، ئەم توانا ناوەکییەی مرۆڤە کە دەبێتە هۆی ئەوەی سیاسەت، لە بری ئەوەی بە سازێن و ژمێرکاری و ڕێککەوتنی نهێنییەوە ببێتە «هونەری مومکین»، دەبێتە «هونەری نامومکین، واتە هونەری چاک کردنی هەم خۆ و هەم دنیاش».

«دیمۆکراتی» تاکە وشەی بواری سیاسی-ئایدیۆلۆگیی نەرێتەکییە کە هاڤێل بێدوودڵی بەکاری دەهێنێ. واتایەکی توندیشی دەداتێ: «بەشداریی هەمووان و بەوەش بەرپرسیی هەمووان». بەم دیاری کردنەش دەرفەتی پەلاماردانی نەک تەنیا ڕشتەی کۆمیونیستی دەبێ بەڵکوو ڕشتەی دیمۆکراتیی ئەورووپای ڕۆژاوا و باکووری ئەمەریکاش، چونکە چالاکیی زۆرینە و بەشداربوون لە گوزەرانی سیاسیدا یەکجار کەمە، بڕیار بە دەست بەرهەمبەری (استهلاک) و بازاڕە.

فاسلاف هاڤێل، بەوەی پشت دەکاتە گوتوبێژی سیاسیی ئاسایی و دۆزی ئاکار دەهێنێتە پێش، بووەتە نموونەیەکی سەرەتای نەوەدەکان. زۆر کەس لەگەڵ هاڤێلدا هاوبیرن لەوەدا کە ناکۆکیی نێوان ئایدیۆلۆگیی نەریتەکی بەسەر چووە و ئەمڕۆ، ئەو ناکۆکییە، ژیانێکی نەگۆڕ لە پروپاگەندەی پارتە سیاسییەکاندا بەسەر دەبات. بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی لەبار ڕووبەڕووی گرفتە گەورەکانی ئەم دنیایە ببینەوە، ئەوا دەبێ ڕوانگە و پرسی تەواو نوێ بێنە ناو مەیدانی گفتوگۆوە.

سالانی نەوەدەکان ناونراوە «دەسالی ئاکار». بەلام گوتوبێژی سەر بە ئاکار نەگەیشتە ئەو ئاوازە بەرز و خاوێن و ئایدیالیستانەی لای هاڤێل هەبوو، بەڵکوو ئەرکی ئەوەی گرتە خۆ کە دنیای دزێوی ژمێرکاری سەرسارانە و داڕزین و درۆکاری، پاک بکاتەوە. لای هاڤێل مەرجی ڕاستگۆیی و دەستپاکی، مەرجی ڕەهان، ئەوانەی دیکە هەوڵیان دەدا بە حاڵ پلەی ئاکاری سیاسەتمەدار و کارگێڕان بەرز بکەنەوە. نموونەی ئەم گرژییەی هاڤێل لای بزووتنەوەی ژینگەپارێزانی ئەم سەردەمەدا هەیە کە زۆر جار دۆزی سەر بە ژینگە وەک پرسێکی سەر بە ئاکار دادەڕێژن. سروشت بەلایانەوە نرخێکی ڕەهای هەیە و دەبێ هەر چۆنێک بێت بپارێزرێ. ئەوجا لەبەر ئەوەی ژمێرکاریی ئابووری چ نرخێکی ڕەها ناخوێنێتەوە و نرخ بەلایەوە هەردەم نیسبییە (نرخ یان بەرزە یان نزمە، ڕەها نییە)، فیکری ژینگەپارێزی لەگەڵ مەرجی ئابووریناسان و مەرجی سیاسەتی ئابوورەکیی ئاساییدا دەکەوێتە ناکۆکییەوە. ژینگەپارێزان جگە لەوەش هەوڵ دەدەن ڕوانگەیەکی زەمانەکیی جیاواز لەوەی لەم دنیا بەپەلەیەدا بووە بە باو، بهێننە پێش. ئەوان باس لە نەوەکانی داهاتوو و مافی ئەو نەوانە دەکەن، کەچی سیاسەتی ڕۆژانە بە دەگمەن نەبێ چاوی لە هەڵبژاردنی داهاتوو پتر بڕ ناکات و ئابووریناسانیش لەوە دەچێت ئەودیوی ئەم دۆخە ئابوورییە بەرزە یان نزمە نەبینن.

بزووتنەوەی ژینگەپارێزی و سەرهەڵدان و بەرەوپێش چوونی پارتی ژینگەپارێز لە چەندین وەلاتدا، لەم دەمەو کۆتای سەدەی بیستەمدا، مەسەلەیەکی سەیر نییە. هەژەندی وێرانکەری سنوورنادیاری ژینگە لە ئەورووپا و باکووری ئەمەریکا شالاو دەهێنێ و لە ئەفەریقا بووەتە ڕاستییەکی بەرچاو. فراژووتنی پیشەسازی لە وەلاتانی سەرمایەداردا بووە هۆی دروست بوونی پێداویستی شتومەکی هەمەجۆری سنووربەدەر، لە سۆڤیەتیش دەسەلاتی دروست کرد، لە تەک ئەوەشدا مەرگ و کاولکاریشی بەدەمەوە بوو. ئەم ئەنجامانەی لە ڕووی چەندایەتییەوە مەزنن، بێگومان دەبنە چەک، دەبنە کۆچەرخی

بێسەروبەری شەڕ. پێوەندییەکی ئاشکرا هەیە لە نێوان دەوڵەمەندبوونی دنیای ڕۆژاوا و نابووت بوونی ئەفریقا و ئاسیا و ئەمەریکای لاتین.

هەر لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی پیشەسازییەوە، ڕەخنە لەو ئامانجانە هەبووە. گەورەبەشی ئەو ڕەخنانە مۆرکی، کۆنەوارانەیان پێوە بووە، ئەگەر نەڵێین کۆنەپەرستانە. بەڵام «لە چەپ» یشەوە، لە سۆسیالیزمی تازە پەیدابووەوە، ڕەخنە هەبوو. ڕەخنە زۆرجار، بە یادی گوزەرانی ڕابوردوو، گوزەرانی کشوکاڵ و پیشەی دەستەکی، دەچووە چوارچێوەی ڕەت کردنەوەیەکی ڕەهای گشت فراژووتنی هاوچەرخی تەکنیکی.

جگە لەوەش، لەو دەمەدا جۆرە خۆشەویستییەکی پێشینەخوازانە و پەرۆشێک بۆ سروشت هەبوو، بەڵام شێوەیەکی سیاسییان بە خۆوە نەگرت. بۆ یەکەم جار لەم سەردەمەدا پارتی سیاسیی وەها پەیدا بوو پاراستنی ژینگە بکاتە گرنگترین یان تاکە خاڵی بەرنامەی خۆی. ئەوەی هەتا ئێستا لە هەمووان چەسپاوتر و بەناوبانگترە ***کەسکەکان*** *Die Grünen* ی ئەڵمانیان کە ماوەیەکی درێژخایەنە بوونەتە هێمایەک بۆ هۆشیاریی نوێی ژینگەپارێزی. پاییزی ١٩٨٨، پارتی ژینگە Miljöpartiet ی سوێدیش سەرکەوتنێکی باشیان لە هەڵبژاردندا وەدەست هێنا و چوونە نێو پەرلەمانەوە. لە هەڵبژاردنی ١٩٩١ دا دەنگیان زۆر لەدەست دا بەڵام لەوە ناچێت توانای سیاسییان لەدەست دابێت. ئێستە گومان لەوەدا نەماوە کە پارتی ژینگە بووەتە دیاردەیەکی سیاسی - ئایدیۆلۆگیی نوێ و گرنگ. لە سوێد، ئەم پارتە مەودایەکی نوێی دا بە گوتوبێژی کۆمەڵایەتی. بەرنامەی پارتی ژینگە لە بواری ژینگەپارێزیدا نەسازێنە: هیچ بەرژەوەندێک نابێ ببێتە کۆسپ لە ڕێی ئامانجی بەرزدا کە ژینگەیەکی سازگارترە. دەبێ ژیان لە گۆم و زەریاچەکاندا ببوژێنرێتەوە، دارستانە سیسبووەکان ڕزگار کرێن. لە ئەنجامی بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمی کشتوکاڵ ژەهر پەیدا دەبێ، دەبێ ئەو ژەهرانە لەناوبرێن. بەکارهێنانی ئۆتۆمۆبیل دەبێ کەم بکرێتەوە. لەبەر ئەوە بەرژەوەندە مەزنەکانی سەرمایە دەبێ بەربەرەکانێ بکرێن. لە نێو پارتە ژینگەپارێزە هەمەجۆرەکاندا، بۆ نموونە ئەم پارتی ژینگەیەی سوێد کە لێرەدا باسی لێ دەکەین، مەیلێکی بەهێزی دوژمەزنایەتی هەیە. ئەم مەیلی دژەمەزنایەتییە تەنانەت لە نێو خودی پارتەکەشدا ڕەنگی داوەتەوە، بۆ نموونە نابێ کەس لە نێویاندا سیاسەت بکاتە پیشە و خۆی وەک دەسەڵاتدارێک بناسێنێ و پێوەندیی نەمێنێ بە پیشەی ئاسای مرۆڤانەوە. سەرکردایەتیی پارتەکە دەبێ کۆیەکی Collective بێت، نۆرەکانی نێو سەرکردایەتی دەبێ زوو زوو ئاڵوگۆڕ بکرێن.

لە زۆر لاوە و بەتایبەتی لە نێو ئەندامانی پارتی ژینگەدا وا باوە کە لە سیاسەتدا،

دژی ژینگە، دابەشینی نەریتیی چەپ و ڕاستی هەڵوەشاندۆتەوە. بەڵگەشیان هەیە سەرنجڕاکێشە: لە نێو ئەندامانی ژینگەپارێزدا زۆر کەس هەیە بە سۆسیالیستی نائاسایی دادەنرێن. لە ئەڵمانیای ڕۆژاوا، بەر لە یەکگرتنەکەی ساڵی ۱۹۹۰، پارتێکی بێسەنگی کۆمیونیست هەبوو بەڵام زۆرینەی لاوانی چەپی شۆڕشگێڕی شێست و حەفتاکان چوونە ڕیزی *Die Grünen* ـەوە. لەوەش دەچێ پاش یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا ئەم ڕەوتە هەر بەردەوام بێت. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ئەڵمانیا هەیە لە ڕووی سیاسییەوە ئەوپەڕی ڕاستیان گرتووە و ژینگەپارێزیشن، ئەم دیاردەیە لە سوێد هێندە بەرچاو نییە. ڕەخنەی ئەمانە لە کۆمەڵگەی هاوچەرخ پتر کۆنەپەرستانەیە. ئەمان کۆمەڵگەیەکی جووتیارانەی دوورەدەست بە نموونە دەگرن و خۆ بە بۆچوونی ناهۆشەکیەتیدا هەڵدەواسن، ڕکیان نەک هەر لە هەموو جۆرێکی تەکنیک دەبێتەوە بەڵکوو لە زانستی هاوچەرخیش.

بەم جۆرە گوایە دژی ژینگە جیاوازیی چەپ و ڕاست، کۆن دەکات. بەڵام ئەگەر لێی وردبینەوە بەهیچ جۆرێک وەها دەرناچێ. ئەوەی لەسەرەوە گوترا پێشانی دەدات کە بە ئاسانی ئاشکرا دەبێت ژینگەپارێز چەپی گرتووە یان ڕاست، هەڵوێستێکی زیاتر سۆسیالیستانەی هەیە یان کۆنەوارانە یان لیبەڕالانە. دژی ژینگە ڕاستەی ئایدیۆلۆگی نەشکاندووە، بەڵام بەرەیەکی بەرینی لە سەرروو کەلێنە ئایدیۆلۆگییەکانەوە دروست کردووە، بەرەیەکی وەها ئەگەر سەرکەوتووبێت دەبێ کار بکاتە سەر پارتە سیاسییە کۆنەکان، نەک تەنیا بەوەی وەها یەکڕەوانە دژی سەر بە ژینگە دێنێتە پێش بەڵکوو تەنانەت بەو ڕەخنانەش کە ئاڕاستەی مەزنایەتیی هاوچەرخی دەکات.

دژی ژینگە جێگەیەکی ئاشکرای لە ئایدیۆلۆگیی کلاسیکی سیاسیدا نەبوو، کەچی ئێستە خەریکە کار لە هەمووان دەکات. ئەمە مەسەلەیەکە لە ڕووی بنەمای فیکرییەوە گرنگە. لە سەر ئاستی ڕاستەڕەنگی سیاسیدا، ئەم دیاردەیە مانای چییە؟ وەرامی ئەم پرسیارە ئاسان نییە. جیاوازیی گرنگ و گەورەی نێوان پارتە چەپڕۆ و ڕاسترۆکان بەر لە هەر شتێک دەگەڕێتەوە بۆ ***دابەش کردنی*** خێری ئەم دنیایە لە نێوان چینەکانی کۆمەڵگەدا. ئەم پرسە ئێستەش وەک جاران گرنگە و لەوانەیە ئێستە سەرلەبەری سامانی گۆی زەویش بگرێتەوە. لەم حاڵەیاندا ژینگەپارێزانی هەر نەتەوەیەک ناچار دەبن هەڵوێست وەرگرن و بەوەش ڕووی چەپڕۆ و ڕاسترۆیان ئاشکرا دەبێت.

هەموو دژێکیش ئەم خەسڵەتەی پێوە نییە. بۆ نموونە مەسەلەیەکی گرنگ و تاڕادەیەک پشتگوێ خراو هەیە لە نێوەندەکیەتی centralism ونانێوەندەکیەتی decentralism دەدوێ. لە سەدەی نۆزدەیەمدا، لە هەموو شائایدیۆلۆگییە سیاسییەکاندا، ڕێبازی پتەو هەبوو

داوای حوکومڕانیی نانیوەندەکی دەکرد، بە تایبەتی لە شێوەی کۆمیوندا. بەڵام لە هەموو لایەکیش ڕێباز هەبوو لە گرنگی هەبوونی نیوەندێکیی بەهێز دەدوا. ئەم بابەتە پەیوەستی مەسەلەی چەپڕۆیی و ڕاسترۆیی نەبوو.

لە گوتوبێژی هەشتاکان و نەوەدەکاندا، دەربارەی هەلومەرجی سیاسەت، بەڵگەیەکی کۆن جارێکی دی هاتەوە کایە بۆ پشتگریی نانیوەندەکیەتی و بەرزیی یەکەی سیاسی بچووک. بەڵگەکە دەڵێ ناشێ پێوەری گشتیی هەمەجێ و هەمەکات بەکاربهێنرێن بۆ چۆنیەتی بوون و فراژووتنی کۆمەڵگە. هەلومەرجی مێژووکرد و سروشتەکیی هەر کۆمەڵگەیەک هێندە تایبەتین کە ناشێت ڕێبازی گشتیی مەزنی لێ وەرگیرێ.

کۆمەڵگە بەم شێوەیەی تێیدایە، ئەنجامی چەندین هەلومەرجی لە ژماردن نەهاتووی کۆنکرێتە، کە دەشێ ڕێک بۆ ئەو کۆمەڵگەیە ڕاست و دروست بن، بەڵام نەک بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە.

نوێنەرانی ئەم ڕوانگەیە، بە ئینگلیزی پێیان دەگوترێ *communitarians* (لەوانەیە بە کوردی ***کۆمیونخوازان*** بۆی لەبار بێ). ئەو هێرشەی ئەوان دەیبەنە سەر ئەوەی خۆیان پێی دەڵێن ***هەمەکیەتی*** *universalism* ی فیکری ڕۆشناکی، هێشتا بە خورتی نەگەیشتۆتە گوتوبێژی سیاسیی گشتی، بەڵام بەم زووانە زایەڵەی تێدا دەداتەوە و ئەو دەمە بەڵگەش بۆ نوێنەرانی بیری نانیوەندەکیەتی دەهێنێتە کایەوە.

کۆمیونخوازان بەسەر هەموو ڕاسەتی سیاسیی چەپ - ڕاستدا بڵاو بوونەتەوە. لە سەرەتادا بیروڕایان بە پلەی یەکەم بە خزمی کۆنەوارەتی دادەنرا، بەڵگەوازییان Edmund Burk مان بیردەخاتەوە (ئەگەرچی ئەوان پتر خۆیان بە خزمی ئەریستۆ دەزانن). پێوەندییەکانی نێو وەڵاتێک ئەنجامی چەندین خۆگونجاندنە لەگەڵ چەندین هەلومەرجی ڕاستەکیی هەمەجۆردا. ئەگەر بێتوو بە یارمەتی چەند پێوەرێکی ئەبستراکت هەوڵ بدەین گۆڕانکاریی بنەڕەتیی لەوەدا بکەین کە خۆڕسکانە شێوازی خۆی دۆزیوەتەوە، ئەوا کارێکی نالەبار و خەتەرناک دەکەین.

کۆمیونخوازەتی communalism بیریارانی چەپیشی ڕاکێشاوە. ئەمان پێیان وایە ئەم بیرە داکۆکییە لە خەڵکی دروست بەرانبەر بەو مەزنایەتییەی تەواو کەمتەرخەمە لە تایبەتمەندیی ئەو خەڵکە. ئەمان دەڵێن هەمەکیەتی لە هەموو جێیەکدا خۆی دەنوێنێ - لە یەکڕەنگاندنی standardization سەرمایەدارەتی و لە هەوڵدانی سۆسیالیزمی دەوڵەتی بۆ لەناوبردنی هەموو جیاوازییەکی نێو گەل و نەتەوە و فەرهەنگی هەمەجۆردا. ئەمانە دەیانەوێ بەرانبەر بەو هێزانەی یەکڕەنگاندن مافی خۆیبوون بپارێزن.

ئێستاش مەسەلەی نێوەندەکیەتی و بەرانبەرەکەی بە هیچ جۆرێک ناچێتە چواچێوەی گۆشەنیگای چەپ و ڕاستەوە.

دۆزی ژینگە هەتا ڕادەیەک وەهایە بەڵام نەک هەتا سەر. ئاشکرایە کە لای پارتە کۆنەوارەکان، باسی ژینگە ڕەچاو گرتن، پیشەمییەکی یەکجار نزمی هەیە، بۆ سەلماندنی ئەمەش چ پێویست ناکات بگەڕێینەوە بۆ ڕۆژگاری بریتانیای مارگرێت تاتچەر، ئەوەی بە دوای گوزەرانێکی ئابووریی سەرمایەدارانەی بەهێزەوە بێت، دۆزی ژینگە لە ڕوانگەیەکی ئابوورییەوە دەبینێ: چارە کردنیان چەندی تێدەچێ؟ بەڵام ئەوانەش کە داکۆکی لە دەوڵەتێکی مەزن و بەهێزی وەها دەکەن بتوانێت دەست بەسەر سامانی وەلاتەکەدا بگرێت، ژینگەیان بەلاوە دەکەوێتە پلەیەکی نزمتر. لە دەوڵەتانی سەر بە دنیای دەسەلاتی سۆڤیەت و شوێنی دیکەش، نموونەی ئاشکرا هەیە.

پارتی ژینگەی سوێد، هەر وەک دەستەخوشکەکانی خۆی لە وەلاتانی دیکە، هەلوێستێکی گومانگرانەیان هەیە بەرانبەر باوەڕ بە پێشکەوتنی تەکنیک و خێروبێری فراژووتنی هاوچەرخ، کە ماوەیەکی درێژخایەنە تەواو ڕەنگی لە سیاسەتی ڕۆژاوادا داوەتەوە. هەتا ئێستا گوتوبێژێکی ئەوتۆی بەرزتر لە ئاستی شەڕەسیاسەت و سەرکۆنەی ڕۆژانە نەهاتۆتە کایەوە کە لە هەلوێستی ژینگەپارێزان بدوێ لەم جۆرە بوارانەدا. ئەڵمانیا و کەسکەکانی ئەوێشی لە هەمان باردان.

یەکێک لەوانەی ڕووبەڕووی *Die Grünen* و نۆرینیان لە پرۆسەی پێشکەوتنی ڕۆژاوا بۆتەوە، یورگن هابەرماس Jürgen Habermas (ساڵی ١٩٢٩ زاوە) ی فەیلەسووف و کۆمەڵناسی ئەڵمانییە. ڕەخنەکان دەکەونە دوا بەشی ئەو کتێبە مەزنەی بە ناوی *Theorie des kommunikativen Handelns* (دوو بەرگ، ١٩٨١) دایناوە. هابەرماس ماوەیەکی درێژخایەن نۆرەیەکی سەردەستانەی هەبوو لە گوتوبێژ و زانستی ڕادیکالانەی ئەورووپا و کۆدەوڵەتی ئەمەریکادا و بە توندی لە ژێر تاوی مارکس و مارکسایەتیدایە، جاروبار و بە تایبەتی لەم چەند ساڵەی دواییدا خۆی بە مارکسی دادەنا. لەگەڵ ئەوەشدا چەندین سەرچاوەی ئیلهامبەخشی دیکەشی هەیە، بۆ نموونە فرۆید Freud و شیکاریی دەروونی و ماکس ویبەر Max Weber ی دیمانەیاری کۆمەلایەتی نێزیک لە لیبەڕالەوە.

هابەرماس لە چەند ڕوویەکەوە خۆی لە مارکسایەتیی نەریتەکی جیادەکاتەوە. ئەم دەڵێ هەلاواردنی ژێرخان و ژوورخان لای مارکس - کە سیاسەت و ئایدیۆلۆگی و هونەر بەشێکن لە ژوورخان - بۆ ئەو سەردەمە لەبار بووە کە مارکس لە لەندەنی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا دیویەتی و بریتی بووە لە هاوچاویی ڕەهای سەرمایەدارەتیی. بەڵام ئەو

هەلاواردنە بۆ کۆمەڵگەی هاوچەرخی ڕۆژاوا، کە خۆی ناوی ناوە ***سەرمایەدارەتیی درەنگ***، لەبار نییە. لەم کۆمەڵگەیەدا، دەوڵەت ڕۆڵی گرنگی لە خودی فراژووتنی سەرمایەدارانەی ئابووریدا هەیە، بەردەوام دەست دەخاتە گوزەرانی ئابوورییەوە، بێ ئەو دەست تێ وەردانە بە هیچ جۆرێک ئابووری ناڕوات بەڕێوە. ئەمەش مانای ئەوەیە دنیای سیاسەت (ژوورخان) لە ئاستێکی گرنگدا بڕیاری ژێرخان دەدات.

لەوە ناچێت ئەم ڕەخنەیەی هابەرماس زیانێک بەو هەلاواردنەی مارکسایەتی بگەیەنێت. مارکس لاری لەوە نییە کە سیاسەت بە پلەی یەکەم دنیای چالاکییە. بەلام ژێرخان تەنانەت لە سەرمایەدارەتیی درەنگیشدا دەشێ بڕیاری چوارچێوەی هەموو سیاسەتێکی مومکین بدات و بەوەش سەردەستیی خۆی بپارێزێ.

لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنەی هابەرماس لەوەش قووڵترە و دەڵێ مارکس لە مەتێریالیزمی مێژووکردی خۆیدا چالاکیی مرۆڤایەتی بچووک دەکاتەوە و دەیهێنێتە سەر ***کاری*** ڕووت. هابەرماس لە وشەی «کار» مەبەستی ئەوەیە کە خۆی ناوی ناوە چالاکیی ***ئامرازەکی*** *instrumental*، واتە ئەو چالاکییەی مرۆڤ بە یارمەتی ئامراز و ئامێر، یان هەر دەستاوێژێکی دیکەی «تەکنیکی» پارچەیەکی ڕاستەکی، بە پێی پێویستی و خواستی خۆی، بگۆڕێت. هابەرماس دەڵێ، بە نۆڕینی مارکس ئەو جۆرە کارە، کە تایبەتییە بە هەلکردنی مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا، ***هەموو*** چالاکییەکی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. لێرەدا ئەو ڕەخنەیەی لە هەلاواردنی ژێرخان و ژوورخانی دەگری جارێکی دی بە شێوەیەکی گشتیتر دێتەوە پێش: ئەو شێوازەی مرۆڤ پەیڕەوی دەکات بۆ پەیدا کردنی پێویستییەکانی ژیانی خۆی بووەتە نموونەیەک بۆ هەموو چالاکییەکی دیکەی وەک هەوڵدان لە بواری سیاسیدا بۆ زاڵ بوون بەسەر دۆزی کۆمەلایەتیدا، بۆ ئافراندنی جوانکارانە لە بواری هونەردا و بۆ بیرکردنەوە لە بواری فەلسەفەدا.

بەرانبەر بەمە هابەرماس دەڵێ، جۆرە کارێکی دیکە هەیە هەر لە بنجەوە لەگەڵ کاری ئامرازەکیدا جودایە. ئەم جۆرە چالاکییە لەو بوارەدا دەردەکەوێ کە مرۆڤ پێوەندیی بە مرۆڤی دیکەوە دەکات و لێککاریان دەبێ (هابەرماس ڕێک لە *interaction*، لێککاری دەدوێ). مرۆڤ لە لێککاریی ڕاستەکیدا ناتوانێ ئامراز بەکاربێنێ. تاکە یاریدەری مرۆڤ لەوەدا هەر زمانە و بۆ ئەوەی زمانیش کاری خۆی بکات دەبێ ڕێککەوتنێک هەبێت لەسەر واتای نیشانە هەمەجۆرەکانی زمان. ئامانجی لێککارییەکە لێکگەیشتنە.

بە نۆڕینی هابەرماس فراژووتنی هاوچەرخ بووەتە هۆی ئەوەی کە بواری هاوکاریی مرۆڤایەتی لە لایەن چالاکیی ئامرازەکییەوە داگیر بکرێت. کۆمەڵگە بووەتە مەیدانی جۆرە

هونەرێکی ئەندازیارانەی تایبەتی. لە سەرمایەدارەتیدا مرۆڤ خۆیشی وەک ئامرازێک بۆ دروست کردنی شتومەک بەکار دەهێنرێ. ئەم ئامرازەکیەتی instrumentalism یە بە هەموو لایەکدا بلاو دەبێتەوە، زمانیش دەکاتە ئامرازێکی نێگیان و لێکگەیشتن دەکاتە کارێکی موستەحیل. ئەم فراژووتنە خەلک نائازاد دەکات. ئەمرۆ یەکەم ئەرکی فەلسەفە و فیکری کۆمەلایەتی دەبێ ئازادکردن بێت.

بەلام هابەرماس لێرەدا هیچ بۆچوونێک دەربارەی ئەرکی سیاسەت باس ناکات. هەلوێستێکی نەویستانە وەردەگرێ بەرانبەر بزووتنەوەی جیهانیی کۆمیونیستانە و هیچ باوەڕێکیشی بە سۆسیال دیمۆکرات نییە. تەنانەت لێرەشدا هەر لە لێکگەیشتن و دانوستاندن و ئازادبوون دەدوێ، بەلام لە هەلکەوتی سیاسیی ئەمڕۆدا، گوتەی لەو بابەتە کەمێک نامۆ یان هەر نەبێ ئوتۆپییانە ڕادەنوێن.

هابەرماس بێ ئەوەی بەرنامەیەکی سیاسیی ڕاستەکی هەبێت نورەیەکی گرنگی لە گوتوبێژی سیاسیی چەپی ئەمڕۆی ئەورووپا و باکووری ئەمەریکادا هەیە، ئەمەش شتێکی تایبەت دەربارەی دۆخی سۆسیالیزمی ئەم ڕۆژگارە پێشان دەدات. مارکس گوتوویەتی فەیلەسووفان تەنیا هەولی تێگەیشتنی دنیایان داوە، دەبا بیشیگۆڕن. ئەمڕۆ دەکرێ بلێین لە ڕوانگەیەکی مارکسیانەی کەموزۆر نوێکراوەوە زۆر چاک دەتوانین لە دنیا بگەین، بەلام سەختە بتوانین لە هەمان ڕوانگەوە ڕێگەی گۆڕینی بدۆزینەوە.

بابزانین هابەرماس ڕەخنەی چی لە *Die Grünen* دەگرێ. ڕەخنەکانی هابەرماس بەرانبەر کەسکەکان دەبێ لەگەل ئەو ڕەخنانەی دیکەدا سەیر بکرێن کە هاوکات و زۆر توندتر لە نوێکۆنەوارەتی دەگرێت. نوێکۆنەوارەتی ڕێبازێکە لە بەشی پێشوودا لێی دوایین. ئەم ڕەخنانەش وەک باس کران، لە شابەرهەمەکەیدا *Theorie des kommunikativa Handelns* داڕێژراون. بە کورتی باسی سەرەکی ئەم کتێبە، کۆمەلگەی هاوچەرخی ڕۆژاوایە بە لایەنی باش و خراپییەوە. بە نۆرینی نوێکۆنەوارەکان، هەلکشانی بێسنووری سەرمایەدارەتی بە گشتی شتێکی باشە، لایەنی خراپی ئەوەیە بێنەرێتی دروست دەکات. لەبەر ئەوەشە، بیریارانی نوێکۆنەوارەتی پێیان وایە، بڕێک داب و نەرێتی کۆنی بۆرژاوایەنە بە بڕێکی گونجاو لە دین و ناسیۆنالیزم، دەبنە دەرمانی ئەو لایەنە خراپە. هابەرماس بە گالتەپێکردنەوە دەلێ ئەم پارچەفەرهەنگانە چی لە کۆمەلگەی ڕەقی سەرمایەدار بکەن – مەگەر ببنە نەخش و نیگار و بۆیەی تەنک. نوێکۆنەوارەتی لەمەدا ورێنەی ڕەهای کردووەتە بنەما.

هابەرماس پێی وایە *Die Grünen* بنەڕەتییانە خراپ لە بوونی هێزەکی potencial ی کۆمەڵگەی هاوچەرخی ڕۆژاوا گەیشتوون. هابەرماس پێی وایە کەسکەکان، فراژووتنی تەکنیکیی پەتی و ئامرازەکی لە فراژووتنی لێککاری نێوان مرۆڤگەل، جیاناکەنەوە. لەبەر ئەوەش لایەنی «دژەهاوچەرخ» ی نێو بزووتنەوەی ژینگەپارێزان، نالەبارە. فراژووتنی ئەورووپا، لە سەدەی شازدەیەم و حەڤدەیەمەوە تەنیا هەڵکشانێکی مەزنی تەکنیکی نییە. بەڵکوو هەڵکشانی چەندین بنگەیشە - هەر لە ئەکادیمیای زانستی تایبەتەوە هەتا ڕۆژنامەگەری و کۆشکی مۆسیقا- کە دەکەنەوە دانوستاندێکی دەوڵەمەندتر و هەمەجۆرتری خەڵک لەچاو ئەوەی لە هەر فەرهەنگێکی دیکەدا هەیە. ئەگەر ڕەخنە لە فراژووتنی هاوچەرخ بگیرێ نابێ ئەم لایەنە پشتگوێ بخرێ. هابەرماس دەڵێ ڕاستە تەکنیک و شێوە ژیانی ئامرازەکی، وەک باسمان کرد، دەستی بەسەر چەندین بواری پێوەندارییەتیی نێوان خەڵکدا گرتووە، بەڵام ئازادبوون لە ئامرازەکیەتی دەبێ سوود لەو توانا مەزنە پشتگوێ خراوە وەرگرێ کە فراژووتنی هاوچەرخ سەرپۆشی کردووە. دەنا دەکەوینە کۆمەڵگەیەکی دیکەی لەمەی ئێستە نائازادتر.

ڕەخنەکانی هابەرماس لە زۆر لاوە سەلمێنران، ڕاستە ئەو ڕەخنانە ئاماژە بۆ لایەنی پشتگوێ خراوی فراژووتنی هاوچەرخ دەکەن، کە تەنیا فراژووتنی تەکنیک نییە بەڵکوو هی هۆشی ڕەخنەگرانە و هەمەلایەنیی جوانکاریشە. بەڵام ڕەخنەگرانی هابەرماس دەڵێن هابەرماس دەرفەتی لەبەردەم چالاکیی تەکنیکی و ئامرازەکیدا ئاواڵە کردووە پەلاماری سرووشت بدەن. لەوەدەچێ هابەرماس ڕەوایەتی بدات بەوەی خۆی پێی دەڵێ کار لە پێوەندیی نێوان مرۆڤ و سرووشتدا.

داهاتوو هەرچییەکی بەدەمەوە بێت بۆ پارتەکانی ژینگەپارێز، دۆزی ژینگە لەوە دەچێ نۆرەیەکی سەرەکییان ببێت لە گوتوبێژی سیاسیدا. کۆدۆزێکی دیکە هەیە، بە وزەیەکی نوێوە هاتۆتە کایەی سیاسەتەوە، ئەویش پلە و پایەی ژن و پێوەندیی نێوان ژن و پیاوە. لە نەوەدەکانەوە دەنگ زیاد بووە لە سوێد داوای پارتێکی تایبەت دەکات دەنگی ژنان ڕابگەیەنێت. ڕاستە ئەو پارتانەی لە پەرلەماندا هەن نوێنەری ژنیان هەیە و زۆریشیان سەر بە یەکیەتیی ژنانی تایبەتین، بەڵام هەر نوێنەرانی پیاو و بەرژەوەندی پیاوانەیە لە ئەنجامدا سەردەستە.

یەکسانیی ڕەسمی و ڕاستەکیی ژن و پیاوان داخوازییەکی کۆنە. بەیاننامەی شۆڕشی فرانسی دەربارەی مافی گشتی، ژنانیش دەگرێتەوە و ئەوانەی زوو لە مافی ژنان دەدوان دروشمەکانی شۆڕشەکەیان بە دروشمی خۆ دادەنا. بەڵام لە پرۆسەی شۆڕشگێرانەی

ڕاستەکیدا، خێرا و بەبێ لێدوان، لە بنەما گشتییەکاندا ڕیزبەڕی کرا و بەر لە هەمووانیش ئەم ڕیزبەڕییە ژنانی گرتەوە. ماوەیەکی درێژخایەنی ویست هەتا ژنان مافێکی دەستووری و سیاسیی چەسپاوی وەهایان وەرگرت کە شایەنی بەراورد کردن بێت بەو مافانەی پیاو هەیەتی. مافی دەنگ دانی گشتی پاش خەباتێکی سەخت لە لایەن سازمانە تێکۆشەرەکانەوە، وەدەست هێنرا و بووە مافێکی جێگیر. لە وەلاتانی وەک ئینگلاند و کۆدەوڵەتی ئەمەریکا و سوید مافی دەنگ دانی گشتی پاش شەڕی جیهانیی یەکەم سەلمێندرا، لە فرانسە، بۆ نموونە، درەنگتریش کەوت. لە زۆر وەلاتیشدا، بەتایبەتی لە جیهانی سێیەم، ژن هێشتا مافی دەنگ دانی نییە.

بەلام تەنانەت لەو وەلاتانەشدا کە بە ڕەسمی ژن یەکسانیی دەستووری و سیاسی سەندووە، جیاوازیی ڕاستەکی لە بواری دەسەلات و سامان و دەرفەتی ژیان، لەناو نەبراون. پلەی سیاسیی کارگێڕیی بەرز بەگشتی هەر بۆ پیاوە. ژنان بە گشتی مووچەیان لە پیاوان کەمترە و لە خوێندنی بابەتی شکۆمەندا کەمتر دیارن. کاتی کزیی بازاڕی کاری ژنان زووتر نامێنێ، کاتی گەرمیی بازاڕ کەمیان دەتوانێ لە پێشبڕکێی سوودمەندیدا بەشدار بێت. لە بواری کاری نێومال و بەخێو کردنی منداڵدا، ئەوان ئەرکی سەخت دەکێشن. بەرهەمی زانستانە و هونەرمەندانەیان ئەو بایەخەیان پێ نادرێن کە لێیان دەوەشێتەوە. هەموو جۆرە شکاندنەوەیەکی سێکسییان بەرانبەر دەکرێ. ڕانواندنی ژنشکێن لە دەزگەی ڕاگەیاندندا بلاو دەکرێنەوە. لە زۆر بواردا ژن نەبین دەکرێ. کە خەلک لە مرۆڤ دەدوێ بە گشتی مەبەستیان لە پیاوە، ژن ڕیزبەڕە.

بە گشتی ئەمانەن بنەمای سەرەکی ئەو هێزە دنەدەرەی بزووتنەوەی نوێی ژنان کە لەم بیست ساڵەی دواییەدا هەلکشا. لەم بزووتنەوەیەدا دیمانە و گوتوبێژی دیمانەکی نۆرەیەکی گەورە و گرانیان هەبووە. پێوەندیی نێوان فێمینیزم feminism و مارکسایەتی، نێوان نوێنەرایەتیی زایەندەکی و نوێنەرایەتی چینایەتی، سەنگێکی گرانیان پێ درا بە تایبەتی لە حەفتاکاندا. ئایە چەوساندنەوەی ژنان لە بنەڕەتدا هەر لە جۆری چەوساندنەوەی کرێکارانە؟ ئایە ژنانی چینی هەمەجۆر بەرژەوەندی هاوکۆیان هەیە؟ ئەو بەرژەوەندانە کامانەن؟ شیکاریی دەروونیش هاتە کایەوە. مەبەستیش بەردەوام ئەوە بوو بۆچوونی ساکار دەربارەی جیاوازیی زایەندەکی، کە ماوەیەکی درێژخایەن سەردەست بوون، ڕەت بکرێنەوە. بەلام دادپەروەری تەنیا بە هەلمەتی ڕوون کردنەوەی دژ بە بۆچوونی کۆن، دانامەزرێ. پلە و پایەی ژن و پیاویش لە کۆمەلگەدا بە چەمکی نۆرە Role ("نۆرەی زایەندەکی") وەسف ناکرێت چونکە بە ئاسانی نۆرەیەک بە نۆرەیەکی دیکە دەگۆڕدرێتەوە.

ئەو نۆرینەی ئێستە لە ناو فێمینیستە پێشەنگەکاندا باوە دەڵێ، جیاوازیی زایەندەکیی ڕاستەکی ئەنجامی تۆرێکی یەکجار ئاڵۆزی پێوەندارییەتیی مێژووکردە. بۆ ئەوەی سەرنج لەو بۆچوونەش دوور کەوێتەوە کە هەموو جیاوازییەک کەم دەکاتەوە و دەیهێنێتە سەر تەنیا جیاوازیی بایۆلۆگیی نێوان ژن و پیاو، وا بەباش زانرا وشەی «جنس» لە بەکارهێنندا پشتگوێ بخرێ و وشەی «جین genus» ی لە جیاتی بەکار بهێنرێت (وشەی genus لە وشەی geneder ی ئینگلیزییەوە وەرگیراوە). جینی ژن و پیاو بەردەوام گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە بەڵام هەردەم بنەمایان لە پێوەندارییەتیی دەسەڵاتدا هەبووە و لە هەموو پێوەندییەکی کۆمەڵایەتیدا، کە جیاوازیی زایەندەکی تێدا بەرچاو بووبێت: سیاسی، ئابووری یان خێزانەکی، ڕەنگی داوەتەوە. بەم جۆرەش مافی یەکسانیی ژن ئاڵۆزتر بەڵام کۆنکرێتتر دەبێ وەک لە جاران. چیدی خەبات بۆ ئیدیالێکی ئەبستراکت ناکات، بەڵکوو بوار بە بوار پەلاماری ئەو دەربڕینانە دەدات کە ژن دەچەوسێنێتەوە و وێڵیان دەکات. ئەو وێنە گەشبینەی بڕوای بەوە هەبوو پرۆسەی بێوچان بیروڕای چەوت دەربارەی ژنان ئاشکرا دەکات و هەرگیز ڕێگەی گەڕانەوەیان نادێنێ، گۆڕا بە باوەڕ هێنان بەوەی جیاوازیی نوێ و بێدادیی نوێ بەردەوام لە ڕەوتی فراژووتنی کۆمەڵگەدا پەیدا دەبن.

هەڵبەتە سەیریش نییە ئەم بۆچوونە بنجییە ببێتە ئیلهامبەخشی بیرۆکەی پێویستی پارتێکی تایبەت بە ژنان. جێگەی ژنان لە هەموو بوارێکدا بە گوێرەی ئەم بۆچوونەی ئێستا باوە، دەبێ بێوچان لەبەر ڕۆشنای سیاسەتدا ببێتە بابەتی چاک کردن و بیرازخوازی. ئایە پارتێکی ژنانی بەهێزی وەک پارتی ژینگەپارێزان پەیدا دەبێ یان نا، لە دەمی ئەم نووسینەدا ئاشکرا نییە. بەڵام ئاشکرایە کە دۆزی ژنان لە ماوەیەکی کورتدا سەرنجی سیاسی زیاتر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ.

هەتا ئێرە، گوزەرانی سیاسی، پاش ڕمانی کۆمیونیزم لە ئەورووپادا، بەگوڕە و پڕە لە دەستپێشخەریی نوێ. هاوکاتیش نیشانەی جیدیی ڕووخانیش بەدەر دەکەوێ. دەزگەکانی ڕاگەیاندن، لە هەوڵی گەڕان بە دوای دەنگوباسی تازەدا زۆر بە پەلەن و کەمتر پەرۆشی بیرکردنەوەن. هەڵبەتە گوتوبێژی سیاسی لە بواری وەهادا ڕواڵەتخواز دەردەچێ. ڕۆژ بە ڕۆژ خەڵک کەمتەرخەمتر دەبن بەرانبەر هەڵبژاردنی گشتی. سیاسەتمەدار بەو هەموو پەیمانەی بەجێیان نەهێناوە بوونەتە جێی دزانێکی گەلێری پەرەسێن.

ڕێبازی سیاسیی نوێ سواری باڵی پەیامی هەرزانبەها و بیری چەوت بوون و لە زۆر بەشی ئەم دنیایەدا هاتوونەتە مەیدانەوە. حیزبی بیانینەیار و بە ئاشکرا ڕەگەزپەرست لە فرانسە و ئەڵمانیادا بەرەوپێش دەچن. سوێد لەم پەتایە ڕزگاری نەبوو، حیزبێک کە خۆی

ناوناوه دیموکراتیی نوێ Nydemokrati جێی له پەرلەماندا بووه. شتێکی پێی بگوترێ ئایدیۆلۆگیی سیاسی لەم پارتەدا نییە، بەڵام تێکەڵێکی هەیە له گازەندەی خۆشیرینکەر و هەڵوێستێکی نایەتی له هەموو شتێک به بیانی و نامۆ دابنرێت و چەند پەیمانێکی بێبایەخ بۆ نیزیک بوونەوه له «خەڵکی ئاسایی»، دەست نیشانیشی ناکەن «خەڵکی ئاسایی» چییە. ئەم حیزبه نەک تەنیا دەنگی زۆر پەیدا کرد بەڵکوو لەبەر نرخی ورووژێنەری خۆی سەرنجێکی یەکجار بەهێزی له لایەن بنگەی ڕاگەیاندنەوه درایە.

هاوکات لەگەڵ ئەو بارەشدا جیاوازیی نێوان حیزبه چەسپاوەکان کەم دەبێتەوه لەبەر ئەوەی لەوه دەچێ سیاسەت ڕۆژ به ڕۆژ زیاتر بکەوێتە چنگی ئاسنینی دۆخی ئابوورییەوه. هەتا دێ پارتەکان زیاتر ڕێک دەکەون لەسەر شیکاری سەختانگ. لەباری وەهادا حیزبێکی وەک دیموکراتیی نوێ دەبێتە بەدیلێکی دڵکیش بۆ یەکنەوازیی ئایدیۆلۆگیی.

لەم بارەشدا یەکێک له پرسه گەورەکانی چارەنووسی سیاسەت: سازمانی سیاسیی داڕۆژی ئەورووپا، دەبێ بڕیاری لەسەر بدرێت. ئەو دیموکراتییه سیاسییەی ئێمه دەیناسین، له هەموو وەلاتەکاندا گرێدراوی دەوڵەتی نەتەوەیی هاوچەرخ بوو. دەوڵەت به هێز و به یەکبوونی خۆی مەرجێک بوو بۆ دیموکراتیی سیاسی. بەڵام ئێستا هەوڵ دەدرێ سازمانێکی گەورەی بان-دەوڵەتی هەڵنرێ که یەکیەتیی ئەوروپییه. تەنانەت لایەنگرانی ئەم سازمانەش دەیسەلمێنن که هێشتا «کەمیی دیموکراتی» له EC دا هەیە، که چەندین ساڵه دامەزراوه و به پێشەنگی یەکیەتیی ئەورووپی دادەنرێ. ئایه دیموکراتی لەسەر ئاستی بان-دەوڵەتی ئەو کەمییەی هەر دەمێنێ یان تەواو دەگەشێتەوه؟ دەبێ هەر هەموومان هەڵوێست لەم پرسیاره سەختە وەرگرین. هونەری گاڵتەجاڕیی سیاسی چارەی پرسیاری وەها ناکات.

***

# پێرستی ناو

* * *

# لیستەی زاراوە کوردییەکان

ئابوورایەتی economism
ئابوورەکی economic
ئابووری economy
- مرۆڤی ئابوورەکی homo economicus
ئافراندن: خوڵقاندن.
ئاژاوە chaos
ئاکارەتی moralism
ئاکارناسی ethics
ئاگا consciousness
ئامراز instrument
ئامرازەکی instrumental
ئامرازەکیەتی instrumentalism
ئامانجناسی: تیلیۆلۆگی teleology
ئاوسان inflation
ئایەتی Positive - بڕوانە نایەتی.
ئایدیالیزم idealism
ئەتۆمایەتی atomism
ئەنارکیزم anarchism
ئەندازەناسی geometry
ئیمپیریالیزم imperialism
ئیسکاتۆلۆگی، بنەتاناسی eschatology
بابەت object
بابەتەکی objective
بان-ئایدیۆلۆگی: لە ئایدیۆلۆگی بەرزتر.
بان-تاکەکی: لە تاکەکی بەرزتر.
بان-دەوڵەت: لە دەوڵەت بەرزتر.
بەربیراز reformable

بەرهەمبەر consumer
بەرهەم هێنان production
بەگزادە (نبیل) Noble
بژارخواز revisionist
بژارەتی revisionism
بوونی هێزەکی potential
بیراز: ریفۆرم reform
بیرازخواز reformist
بیرازەتی reformism
بیرازکار reformer
بیرازکاری reformation
بیرکاری intellectual
بیرکارەتی intellectualism
بیرۆکراتاندن bureaucratization
پاراستنایەتی protectionism پاراستنی بەرهەمی خۆماڵی بە سەپاندنی گومرگی بەرز بەسەر بەرهەمی هاوردەدا.

پارەکاری finance
پاکژی (فضیلە) virtue
پەرلەمانەتی parliamentarism
پەرگیرایەتی extremism
پەرگیرایەتی ڕاسترۆ right wing extremism
پەلەی ژیان struggle for existence
پەیمانی جڤاکی social contract
پیوریتانیزم puritanism

پیوریتان puritan پەیڕەوانی پیوریتانیزم
پێشڕەو avant-garde
پێشینەخواز nostalgic
پێوەر norm
پێوەرەکی normative
تاکەکی individual
تاکەکیەتی individualism
تەرابوون alienation
تەژمەند prosperity
تەوجیل: کورتکراوەی تەورات و ئینجیلە
Bible
توتالیتار totalitarian
جڤاکی social
جۆرایەتی quality
جیهانگرایەتی cosmopolitanism
چارەنووس، قەزاوقەدەر predestination
چەندایەتی quantity
خوداناسی theology
خۆئاگا self-consciousness
داروینایەتی darwinism
داروینایەتیی جڤاکی social darwinism
دانانەکی: مافی دانانەکی positive right
دابەش کردن distribution
داواگر: محامی، پارێزەر.
دەروێشایەتی mystic
دەولەتگێڕ statesman
دەولەتی خۆشگوزەرانی welfare state
دژەبیرکارەتی anti-Intellectualism
دژەتاکەکیەتی anti-Individualism
دژەهۆشەکیەتی anti-Rationalism

دژەسامی (دژەجوولەکە) anti-Semitic
دژەشۆڕش contra revolution
دژواتا contrary
دژوەستان contradiction
دوانەتی dualism
دۆخگۆڕکێ metamorphose
دیالەکتیک dialectic
دیمانە theory
دیمانەکی theoretic
دیمانەیار theorist
دێرین: سەردەمی دێرین antiquity
دیمۆکراتاندن democratization
دیمۆکراتیی نوێنەرەکی
representative government
رادیکالیزم radicalism
ڕاهێزان: بەهێزبوون، پێچەوانەی داهێزان.
ڕەشەجوتیار villein (serf)
ڕەگەزپەرستایەتی racism
ڕەهایەتی absolutism
ڕەوایەتی legitimism
ڕەواپەروەر legitimist
ڕسین evolution
ڕووکار aspect
ڕۆشناکی: سەردەمی ڕۆشناکی
enlightenment
زات subject
زاتەکی subjective
زانیار: معرفە knowledge
زانیارستان: ئەنسیکلۆپیدیا encyclopedia
ژاکان depression

ژیار: حضارە، ژیارمەند: متحضر.

ژینگە environment

سازین compromise

ساکارەتی primitivism

ساختار structure

سەختانگ: ئەزمە، قەیران crisis

سەرتەڵ: ئەلیت، دەستەی هەڵبژاردە.

سەرتەلایەتی: ئەلیتیزم elitism

سەرخڕەکان Roundheads: لە شەڕی ناوخۆی ئینگلیزدا بە لایەنگرانی پەرلەمان دەگوترا سەرخڕەکان، ئەم ناوە لە سەرەتادا وەک ناتۆرەیەک بەو پیوریتانانە دەگوترا کە بە پێچەوانەی لایەنگرانی کارلی یەکەم Karl I، پرچیان کورت دەتاشی.

سەرمایە capital

سەرمایەدار capitalist

سەرمایەدارەتی capitalism

سەلێنە axiom

سەندیکا: نقابە.

ستەمکارەتی despotism

سوودخوازەتی utilitarianism

ستۆیکیزم stoicism

سۆسیالیزم socialism

سۆسیالیزمی نەتەوەیی
national socialism

سینیزم cynicism

شارەدەوڵەت: *Polis* مەبەست دەوڵەتەکانی یۆنانی دێرینە کە بریتی بوون لە یەک شار و ناوچەکانی دەوروبەری شارەکە.

شارەزاکی empirical

شارەزاکیەتی empiricism

شەبەنگ: گازی شەبەنگی nebulous

شۆڤینیزمی جڤاکی social chauvinism

غەریزەی خۆپاریزی
instinct of self-preservation

فاشیزم fascism

فەلسەفەی تێکبەستە
synthetic philosophy

فراژووتن development

فیزیۆکراتەتی physiocratism

فیوداڵەتی feudalism

فێمینیزم feminism

کارەکی: عملی

کەینزایەتی keynesianism

کڵێسەدەوڵەت: دەوڵەتێک کڵێسە هەڵیسووڕێنێت.

کۆبەرهەم mass production

کۆچەرخ: machinery

کۆدۆز: کۆمەڵێک دۆز و کێشە.

کۆرپۆراتی corporative

کۆمیون (ناوچە) commune

کۆمیونخوازەتی communalism

کۆمیونیزم communism

کۆنەپەرستی reaction

کۆنەوار conservative

کۆنەوارەتی conservatism

کۆنەوارەتیی جڤاکی social conservatism

کۆنەوارەتیی سەرپەڕ
ultra-Conservativism

کۆیەکی collective

گلادیاتۆر Gladiator بەو کۆیلە و دیلانە دەگوترا کە بۆ ڕابواردنی خەڵک، لە ڕۆما، هەتا مەرگ زۆرانبازییان پێ دەکرا.
گومانایەتی scepticism
لیبەڕالیزم liberalism
لیبەڕالیزمی جڤاکی social liberalism
لێککاری interaction
لێنینایەتی leninism
مارکسایەتی marxism
مارکسایەتی- لێنینایەتی
marxism-leninism
مانەوەی هەرە لەبار
survival of the fittest
مایەکی: ماددی
مەتێریالیزم materialism
مەتێریالیزمی مێژووکرد
historical materialism
مەرکانتیلایەتی mercantilism
مەزنەدەوڵەت: دەوڵەتی یەکجار فرەوانی وەک ئیمپەراتۆرییەتی ڕۆمان.
مەنیتاریزم monetarism
مەنیتاریست monetarist
مرۆڤایەتی humanism
میکانەتی mechanism
نابووتایەتی pauperism
ناچارەکیەتی determinism
نازیزم nazism
ناسیۆنالیزم nationalism
ناڤین: سەردەمی ناڤین middle ages
ناهۆشەکی irrational
ناهۆشەکیەتی irrationalism
ناوتوێژ implication
نانێوەندەکیەتی decentralism
نانێوەندەکیاندن decentralization
نایەتی negative
نایەکڕەو inconsistent
نەبەش: شتێک دابەش نەکرێت.
نەرێت tradition
نەرێتەکی traditional
نەرێتەکیەتی traditionalism
نەرێتەکیەتیی ئەریستۆکراتانە
aristocratic traditionalism
نەرێتەکیخواز traditionalist
نەزموو: تەجرەبەنەکراو، پێچەوانەی ئەزموو.
نموونەدەوڵەت: دەوڵەتی نموونەیی.
نوێنەرەکی representative
نۆرە role
نوێکۆنەوارەتی neo conservatism
نوێلیبەڕالیزم neo liberalism
نیسبییەت relativism
نێوەند centre
نێوەندەکی central
نێوەندەکیەتی centralism
نێوەندەکیەتیی دیمۆکراتیانە
democratic centralism
نێوزاتەکی inter subjective، بڕوانە زاتەکی.
هاوردن import
هاوزێد: هاونیشتمان.
هەبووناسی: ئۆنتۆلۆگی ontology

هەژارانە: پارەیەکە بە یارمەتی دەدرێ بە هەژاران.

هەژەند: کارەسات catastrophe

هەلاواردن distinction

هەمەڕەگەز heterogeneous

هەمەکی universal

هەمەکیەتی universalism

هەناردن export

هۆشگیر interesting

هۆشەکی rational

هۆشەکیەتی rationalism

هۆشەکیخواز rationalist

هۆشی روون common sense

هۆیەکی causal

هێمنکار moderate

یەکڕەنگاندن standardization

یوجینی eugenic

یورۆکۆمیونیزم eurocommunism

***

## زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ساڵی ٢٠٠٤

| ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕانی |
| --- | --- | --- |
| ٢٤٨- مانگی نیوەمۆر | دڵشاد عەبدوڵڵا | |
| ٢٤٩- گەڕانەوە لە خەیاڵەوە بۆ... | عەتا قەرەداخی | |
| ٢٥٠- پەیڤەکانی ڕەنگ | وەهبی ڕەسوڵ | |
| ٢٥١- گۆڕستانی چراکان | شێرکۆ بێکەس | |
| ٢٥٢- چوار شانۆنامە | | هەورامان وریا قانیع |
| ٢٥٣- دەربارەی ئەقڵی مۆدێرن | | ئازاد بەرزنجی |
| ٢٥٤- دوا گفتوگۆکانی بورخیس | ئا: ئوسفالدو فراری | ڕەووف بێگەرد |
| ٢٥٥- چاخی زانیاری | ئازاد حەمە | |
| ٢٥٦- فەرهەنگی هەندەران | ئا:حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ | |
| ٢٥٧- خەیاڵی زمان | عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا | |
| ٢٥٨- بینای کات لە سێ نمونەی ڕۆمانی کوردیدا | نەجم خالید نەجمەددین | |
| ٢٥٩- بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری کوردیدا | سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی | |
| ٢٦٠- ڕشتەی مرواری | عەلائەدین سەجادی | |
| ٢٦١- باخچەیەك لە شیعری .... | | د. فەرهاد پیربال |
| ٢٦٢- کێوی پێنجەم | پالولۆ کۆیلۆ | یاسین عومەر |
| ٢٦٣- جەنگی چوارەمی جیهانی | کانت دمارانش | دلاوەر عەبدوڵڵا |
| ٢٦٤- پزیشکی میللی | د.جی.سی.جارفیش | تۆفیق سەعید محەمەد |
| ٢٦٥- خەونی جەللاد | ئاراس عەبدولکەریم | |
| ٢٦٦-ئێوە بە خۆشەویستیم ئەسپێرن | شێرکۆ بێکەس | |
| ٢٦٧-کوردو کۆمەڵی مەدەنی | کەیوان ئازاد ئەنوەر | |
| ٢٦٨-شەرەفنامە | مهاباد قەرەداغی | |
| ٢٦٩-پۆلێنکردنی پەیژەکانی موزیکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست | سەلاح ڕەئووف | |

**نرخی (٣٠٠٠) دینار**

**سڤێن-ئێریک لیدمان**
Sven Eric Liedman

لە شاری کارلسکرۆنای سوید، ساڵی ١٩٣٩ لەدایکبووە. لە زانستگەی لوند و پاشان لە یۆتەبۆری خوێندوویەتی، ساڵی ١٩٦٦ بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرتووە بووەتە دۆسێنت لە زانستگەی یۆتەبۆری. لە نێوان ١٩٦٦-١٩٦٤، لەشاری مالمۆ بووەتە جێگری سەرۆکی بەشی فەرهەنگیی ڕۆژنامەی Sydsvenska Dagbladet Snällposten لە ١٩٦٨-١٩٧٠، لەشاری لوند و لە ١٩٧٢-١٩٧٩ لەشاری یۆتەبۆری بووەتە دۆسێنت لە مێژووی بیر و زانیاریدا.